# ئیعجازی زانستی
# لە قورئان و سوننەتدا



بەرگی یەکەم





د.کاوە فەرەج سەعدون





زنجیرەی بەرەو دڵنیایی
ئیعجازی زانستی قورئان وسوننەت
١

# ئیعجازی زانستی
# لەقورئان وسوننەتدا

## بەرگی یەکەم

نووسینی:
د. کاوە فەرەج سەعدون

چاپی یەکەم
١٤٤٠ کۆچی – ٢٠١٨ زایینی






ناوی کتێب: ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا–

بەرگی یەکەم

بابەت: زانستی

نوسینی: د. کاوە فەرەج سەعدون

دیزاینی بەرگ: کتێبخانەی گەشە

لە بڵاوکراوەکانی: کتێبخانەی گەشە

نۆرەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٨- ١٤٤٠

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: (٨٠٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرێتی کتێبخانە گشتییەکانی سلێمانی

ژمارەی سپاردنی (١٣٠٩)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە.

کتێبخانەی گەشە بۆچاپ و بڵاو کردنەوەی کتێب

سلێمانی- بازاڕی ئاوباریک- بەرامبەر کاسۆمۆڵ –دوکانی ٧١

 کتێبخانەی گەشە -Ktebkhaney geshe

   ٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣–٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦

قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ
أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ (٥٢) سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا
فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ
أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)

(سورة فصلت)

# پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی کە قورئانی پیرۆزی کرد بە موعجیزەی زیندوو و نوێ بووەوەی کۆتایین نێردراوی خۆی، موعجیزەیەکی عەقڵی و زانستییە کە لە هەموو لایەنێکیەوە تەواوە وبێخەوشە: هەر لە زمانەوانی و بەیان و رەوانبێژیەکەی بۆ ئەو هەواڵدانانەی بۆ رابوردوو داوێتی و ئەوانەشی لە داهاتوودا روودەدەن، موعجیزەیەکە ئەوەندە بابەتی زانستی و یاسای سیاسی و بنەمای ئابووری و وردەکاری کۆمەڵایەتی و مافەکانی مرۆڤ و رژێمە مرۆییەکانی تێدایە کە هیچ کەسێك ناتوانێت هاوشێوەی بهێنێت.

قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەت و رێنموویی مرۆڤەکانە بۆ رێگای راست، پەروەردگاریش بەزانستی فراوانی خۆی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە تا رۆژی دوایی دەزانێت کە زانستی مرۆڤەکان بەرەو پێشکەوتنی بەردەوام دەڕوات بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا ئیشارەت و ئاماژەی بۆ هەموو زانستەکان و سەردەمەکان تێدایە بەمەبەستی نوێبوونەوەی موعجیزەی قورئان لەهەموو سەردەمێکدا: {ونزّلناعليك الكتاب تبياناً لكل شيء....} (سورة النحل:٨٩).

[لَّكِنِ اللهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِوَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً] (النساء:١٦٦)، ئیمامی راڤەکاری قورئان (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "ئەم قورئانە زانیاری و زانستی خودایی تێدایە کە وویستوویەتی نیشانی بەندەکانی بدات، هەروەها زانیاریشی تێدایە بە شتە غەیبی و نەزانراوەکان، لە رابوردوو و داهاتووشدا"*، دەربارەی ئەو مانایەش کە قورئان زانیاریی شاراوەی خودایی تێدایە زۆرێك لە موفەسیران هەمان بۆچوونیان هەیە وەك: (ابن الجوزي، الزمخشري، أبوحيّان، البيضاوي، النَّسَفي، الخازن، الآلوسي، الشوكاني).

---

*بڕوانە: تفسير القرآن العظيم (٥٦٠/١).

پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی ئاماژەیداوە بە بەردەوامی موعجیزەی قورئان، کە لێیدەگێڕنەوە فەرموویەتی: (... ولاتنقضي عجائبه...)** واتە: هەرگیز سەمەرە و سەرسوڕهێنەکانی قورئان تەواو نابن.

ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا خۆی لەو ئاماژانەدا دەبینێتەوە لە قورئان و فەرموودەکاندا پێش ١٤٠٠ساڵ زیاتر بۆ هەندێك لە دیاردەکان و راستییەکان لە ئاسمان و زەوی و خودی پێکهاتەی مرۆڤدا، کە تەنها دوای دەیان و سەدان ساڵ لە توێژینەوەی زانستی لەم سەردەمەدا ئەو راستییانە بۆ مرۆڤەکان دەرکەوتن، ئیعجازی زانستیلەرۆژگاری ئەمرۆماندا بریتییە لە موعجیزە نوێیەکەی قورئان کە زانایان و مرۆڤەکان سەرسام دەکات، بەلاّم لەیادمان نەچێت کە قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەتە و سەرچاوەی زانستی نییە.

لەرۆژگاری ئەمرۆدا دەرخستنی موعجیزەی زانستی قورئان هۆکارێکی گەورەی بانگەوازە بۆلای پەروەردگار و دەرخستنی راستی قورئانی پیرۆز، کاتێك زانایان و پسپۆڕان و خەڵکی بەگشتی ئەو ئاماژە وورد و سەرسوڕهێنەرانە دەبینن لە قورئاندا بۆ زۆرێك لەراستییە زانستییەکان کە تەنها چەند ساڵێك دەبێت دۆزراونەتەوە تەنها ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە کە دان بەوەدا بنێن کە ئەم ووتانە لەلایەن مرۆڤەوە نەهاتووە بەڵکو لەلایەن پەروەردگاری خاوەنی گەردوون و نهێنییەکانیەوە نێردراوە.

دیارە بەکارهێنانی ئەو راستییە زانستیانەی لەلایەن غەیری موسوڵمانانەوە دۆزراونەتەوە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر راستی قورئان ئەوەندەی تر ئیعجازی زانستیی قورئان بەهێزتر دەکات، چونکە ئەگەر ئەم راستیانە لەلایەن

---

** جزء من حديث طويل رواه الترمذي والدارمي والطبراني في المعجم الكبير وابن حبان والحاكم في المستدرك، قال ابوعيسى: هذا حديث لانعرفه إلا من هذا الوجه (سنن الترمذي: ٥/ ٩٨)، والصحيح انه موقوف على ابن مسعود.

موسولّمانانەوە بدۆزرانایەوە ئەوا دەیانووت خۆتـان هـەلّتان بەسـتووە بـۆ بـەرگری کردن لە ئاینەکەتان، بەلاّم کاتێك نەیاران ئەو شـایەتیە دەدەن ئـەوا گومـانی تێـدا نامێنێت (والفضل ما شهدت به الاعداء).

لەلایەکی تریشەوە دواکەوتنی موسولّمانان و بوونیـان بـەبار بەسـەر میللـەتانی تـرەوە لـەبواری زانسـتیدا نابێـت وامـان لێبکـات ئـەم لایەنـەی ئیعجـازی قورئـان فـەرامۆش بکـەین، چـونکە قورئـان کتێبـی هانـدانی زانسـت و پێشـکەوتنە و ئـەو سـەردەمانەی کـە موسـولّمانان ئیسـلامیان لەژیانیانـدا پـەیڕەو دەکـرد و پابەنـدی بـوون هـەرخۆیان پێشـڕەوانی هـەموو بـوارە زانسـتییەکان بـوون، و میللـەتانی تـر شـوێنکەوتە و سـوود وەرگربـوون لەزانسـتە پێشـکەوتووەکانی موسـولّمانان، خەلّکانی بەوەفای ئەمڕۆش شایەتن لەسەر ئەم پێشدەستیەمان لەرابوردوودا.

لەگەلّ ئەم رۆلّە گرنگەی ئیعجازی زانستی و پشتگیری کردنی لەلایەن زوربـەی زانایانی موسولّمانەوە کەسانێکیش هەن کە رەخنەی لێدەگرن، زوربـەیان لەوانـەن کـە نایانـەوێت زیـادڕەوی تێـدابکرێت و سـنووری خـۆی هـەبێت و نەبێتـە هـۆی فەرامۆشـکردنی لێکدانـەوەکانی تـر بـۆ دەقـە شـەرعیەکان کـە زانایـانی تـری بـاوەڕپێکراو لەکۆنـدا پێـی هەسـتاون، ئەمـەش کـارێکی ئاسـاییە و سـوننەتێکی خوداییە لەبوونی را و بیروبۆچـوونە جیاوازەکـان لـەناو مرۆڤەکانـدا بەتایبـەتی لـەو بابەتانەی کە عەقلّ و مەنتیق رۆلّی زیـاتری تێـدا دەبینێـت، {ولا يزالون مختلفين إلا من رحم ربك ولذلك خلقهم} (هود:١١٩)، {وكان الإنسان أكثر شيء جدلاً } (الكهف:٥٤).

ئیعجازی زانستی قورئـان و سـوننەت رۆلّـی گـەورەی خـۆی هەیـە لـە رۆژگـاری ئەمڕۆماندا بۆ نوێکردنەوەی بەلّگەی پێغەمبەرایـەتی و سـەلماندنی نـاردنی قورئـان لەلایەن خوداوە، هەروەها تێگەیشتنێکی باشـتر و فراوانترمـان دەداتـێ دەربـارەی دەقەکانی قورئان و سوننەت و پالّنەرێکە بـۆ موسـولّمانان بـۆ بـەرەوپێش چـوونی

زانسـتی و ئەنجامـدانی دۆزینـەوەی نـوێ، بانگـەواز کـردنیش بـۆلای بەرنامەکـەی پەروەردگار ئاسانتر دەکات لەمرۆڤاندا.

کاتێك لـە رەخنـەکانی نـەیارانی ئیعجازی زانسـتی دەکۆڵینـەوە تێبینـی ئـەوە دەکەین کە تێنەگەیشتنێك هەیە بۆ بابەتی ئیعجازی زانستی و حاڵی نەبوون هەیـە لەو بنەمایانەی کە ئەم لایەنەی لەسەر دامەزراوە، لەگەڵ لێکدانەوەی بەڵگـەکانیان لەم بوارەدا دەگەینە ئەوەی کە ئەم بەڵگانە بابەتەکـە رەتناکەنـەوە بـەڵکو لـەزۆر شوێندا خۆیـان دەبنـە بەڵگـە لەسـەر راسـتیی و گرنگـی توێژینـەوەکانی ئیعجـازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

دەربـارەی تەفسـیری زانسـتیش بـۆ قورئـان کـە چـەندین سـەدە دەبێـت بەکارهێنراوە و گەشەی کردووە، کۆمەڵێك زانای ناسـراو و بـاوەڕپێکراوی مێـژووی ئیسلامیش لەمبوارەدا نووسین و داهێنانیان کردووە، ئەم تەفسـیر کردنـە جۆرێکـە لـە راڤـەکردن بەتێگەیشـتن و بۆچـوونی زانایـان (التفسـیر بـالرأي) کـە بەدرێـژایی مێـژووی ئیسـلام بـەکارهاتووە، کـە پێویسـتە رێکخـەر و سـنووری تایبـەتی خـۆی هـەبێت و زیـادڕەوی تێدانـەکرێت، دیـارە گرنگیـی تەفسـیری زانسـتی لەمرۆڤانـدا ئاشـکرایە کـە دەریـدەخات سـەمەرەکانی قورئـان کۆتاییـان نایـەت و ئیعجـازە زانستیەکەشی ئاشکرا دەکات، هەروەها ئایەتە کەونیەکانی قورئانمانبەشێوەیەکی راست و دروست بۆ راڤە دەکـات دوور لـە تـەئویل و ئەفسـانە، بەمـەش ماناکانیـان جێگیر دەبن [لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ] (الأنعام:٦٧).

لەلایەکی ترەوە دوژمنانی ئیسلام لە کۆنەوە ویسـتوویانە گومـان لـە قورئانـدا دروست بکـەن بـە مەبەسـتی دوورخسـتنەوەی خـەڵك لـە پەیامـە پیرۆزەکـەی، لـە سەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) چـەندین نازناویـان لێـدەنا بـۆ ئـەوەی خـەڵك گـوێی لێنـەگرێت، دەیـانووت جادووگـەر و سـاحیر و شـاعیرە، ئەگـەر ئەمانـە سـوودی نەبووایـە دەیانووت دەنگـەدەنگ بکـەن و قسـەی بێمانـا بکـەن بۆئـەوەی گوێتـان

لێنـەبێت چـونکە دەیـانزانی گـەر گـوێی لێبگـرن و تێبڕامێـنن بێگومـان باوەڕیـان پێـدەهێنا: {وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ} (فصلت:٢٦).

هەندێك کەسیش هەن کە بە مەبەست ئینکاری ئـەوە دەکـەن قورئـان ئامـاژەی زانستی تێدابێت، بەڵام کاتێك ئەمەیان بـۆ نەچـووە سـەر و نـەیانتوانی ئینکـاری و وەڵامی ئەو هـەزاران ئامـاژە زانسـتییە بدەنـەوە کـە لـە قورئـان و فـەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، هەستان بەهەڵبەستنی درۆیەکی تر کە گوایا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە بەوەرگرتنی ئەم زانیارییانـە لـە خـەڵکان ومیللـەتانی تـر، منـیش بەیارمـەتی پـەروەردگار دەمـەوێت وەڵامـی هەنـدێك لـەم گومانانـەش بدەمـەوە و بەشێوەیەکی زانستی و مێژوویی بیسەلمێنم کە ئامازە زانستییەکانی قورئان لـەهیچ سەرچاوەیەکی ترەوە وەرنەگیراون و موعجیزەیـەکی ئاشـکرا و بینـراوی قورئـان و سوننەتە.

وەك نموونەیـەك پرۆسـەی دروسـتبوونی مـرۆڤ لـە قورئـانی پـیرۆزدا زۆر بەشێوەیەکی وورد و زانسـتییانە بـاس کـراوە و بـۆ یەکـەمجار لەمێـژوودا قورئـان وسوننـەت قۆناغبەندیان بۆ ئەم کردارە داناوە و تەنانەت ئەو زاراوانەش کە قورئـان و سوننـەت بۆ ئەم قۆناغانە بەکاریدەهێنن ئەوپـەڕی ووردەکـاریی زانسـتی تێدایـە، بەشـێوەیەك کـە گـەورە زانایـانی کۆرپەلـەزانی ئـەمڕۆ شـایەتیان بـۆداوە، ئـەو بیروبۆچوونەی کە گوایا قورئان ئەم بابەتانەی لە میللەتانی ترەوە وەرگرتـووە بـە تەواوەتی رەتدەکرێتەوە، چونکە هیچ شارستانیەتێکی ئـەو سـەردەمە باسـی ئـەم بابەتـەی نەکردووە بەو شێوەیە، بەڵکو ئەوەی کە هەبووە لـە زانیـاری مرۆڤـەکانی ئەو سەردەمە تەنها پشتبەستو بوو بە ئەفسانە و خورافیات و خەیاڵ.

نووسین لەبواری بنەمادۆزی بۆ بابەتی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سـوننەتدا (تأصـيل الإعجـاز العلمـي في القـرآن والسـنة) و لایەنـەکانی تـری ئیعجـازی قورئـان

بەزمانی کوردی زۆر بوارێکی گرنگ و پێویستە و بەکەمی باسی لێوەکراوە، کە پێویستە ئەم بابەتە درێژەی پێبدرێت بۆ ئەوەی راستیەکان بۆ هاوزمانانمان دەرکەوێت، و پشت ئەستوورین بە بەڵگەی بەهێز لە قەناعەتیان بە ئیعجازی زانستی لە قورئاندا.

هیوادارم ئەم هەوڵە کەلێنێك پڕبکاتەوە لەمبوارەدا و هەوڵی زۆرتری بەدوادا بێت، بەتایبەتی وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە بەهۆی رووکەشییان لە وەرگرتنی زانست و زانیاریی لە هەندێك نووسینەوە و ووردنەبوونەوە لەو زانیاریانە دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان بۆیان و لەدواییشدا بەم زانیارییە کەمەوە رێ بەخۆیان دەدەن رەخنەبگرن و لەمبوارەدا نووسین و گومان بڵاوبکەنەوە.

بابەتەکانی ئەم کتێبە بەشی زۆریان پێشتر لە گۆڤار و رۆژنامە و کۆنگرە زانستییەکاندا بڵاوکراونەتەوە، وەك گۆڤارەکانی: هەیڤ، بەختەوەری، ژینی نوێ، رێگای شەرع، ئایندەسازی، دووانگە، و رۆژنامەکانی: یەکگرتوو، کۆمەڵ، بەیان، رووداو، هەولێر، هەروەها کۆنگرەی (بەرگری لە قورئان) کە لەلایەن (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری) لە سلێمانی ساڵی (٢٠١١) سازکرابوو، کۆنفرانسی زانستی یەکەمی (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا) لەژێر ناونیشانی (ئیعجازی قورئان وسوننەت هاندەرە بۆ توێژینەوەی زانستی) لە سلێمانی ساڵی (٢٠١٧)، هەروەها پەیجی تایبەتی خۆم لە تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك)، پێم باش بوو هەندێك لەو بابەتانەم لە دووتوێی کتێبێکدا کۆیانبکەمەوە پاش پێداچوونەوە و زیادکردنی پێویست بۆ بابەتەکان بە مەبەستی سوودگەیاندنی زیاتر بۆ خوێنەرانی بەڕێز.

کتێبەکە لە چەند بەشێك پێکهاتووە:

لە بەشی یەکەمدا (ئیعجازی زانستی لەنێوان وەرگرتن و رەتکردنەوەیدا) باسی ووتەی ئەوانەم کردووە کە پشتگیریی ئیعجازی زانستی دەکەن لەناو زانایاندا کە

ئەمانــە زۆرینــەی زانایــانی ئیســلامن لــە هــەموو ســەردەمەکاندا و پاشــان ووتــەی نەیارانی ئیعجازی زانستیشم هێنــاوە لەگــەڵ رەتدانەوەیانــدا، هــەروەها دەربــارەی گرنگی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی و سوودەکانیان لەم سەردەمەدا دواوم.

بەشــی دووەم باســی تەفســیری زانســتی بــۆ قورئــان شــیدەکاتەوە و چــۆنێتی گەشــەکردنی ئــەم تەفســیرە دەخاتــەروو لەگــەڵ گرنگــی ئــەم بابەتــە بــۆ رۆژگــاری ئەمڕۆمان و رای جیاوازی زانایانیش لەم بابەتەدا خراوەتەروو.

بەشی سێیەم بریتییە لە هێنانەوەی چــەند نموونەیــەکی جۆراوجــۆر دەربــارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا و دەرخستنی موعجیزەی گەورەی قورئــان و سوننەت لە ئاماژەدان بۆ چەندین بابەتی زانستی وورد و دەرکەوتن و سەلماندنی راستیی ئەم ئامازانە بەپشتبەستن بە نوێترین دۆزینەوە زانستییەکان.

بەشی چوارەم رەتدانەوەی هەندێك گومانی بێباوەڕانە، کە وەك نموونەیــەك بــۆ وەڵامدانــەوەی بێبــاوەڕان وەڵامــی ئــەو بیروبۆچــوونانە دەدەمــەوە گوایــا قورئــان بابەتی دروستبوونی مرۆڤی لــە میللــەتانی تــرەوە وەرگرتــووە، و دەیســەلمێنم کــە بەهیچ شێوەیەك هیچ شارستانیەتێکی ئەو سەردەمە باسی ئەم بابەتەی نەکردووە بەو شێوەیە، بەڵکو ئەوەی کە هەبووە لە زانیاریی مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە تەنها پشتبەستبو بوو بە ئەفسانە و خورافیات.

بابــەتی دروســتبوونی مــرۆڤ لــە قورئــانی پــیرۆزدا زۆر بەشــێوەیەکی وورد و زانســتییانە باســی لێــوەکراوە و لــە بابەتەکــەدا ســەلمێنراوە کــە بــۆ یەکــەمجار لەمێژوودا قورئان و سوننەت قۆناغبەندیان بۆ ئــەم کــردارە کــردووە، تەنانــەت ئــەو زاراوانــەش کــە قورئــان و ســوننەت بــۆ ئــەم قۆناغانــە بەکاریــدەهێنن ئەوپــەڕی ووردەکاریی زانستییان تێدایە.

لە بابەتێکی تردا وەڵامــی ئــەو گومانانــەم داوەتــەوە کــە بێبــاوەڕان دەربــارەی زاراوە و قۆناغی (علقة) لــە قورئانــدا دروســتیدەکەن و بەشــێوەیەکی زانســتییانە و

بەوەرگرتنی نوێترین زانیارییەکانی کۆرپەلەزانی سەلماندوومە کە زاراوەی (علقة) گونجاوترین و ووردترین زاراوەیە بۆ وەسفکردنی شکڵ و سیفەت و کردارەکانی کۆرپەلە لەو قۆناغە سەرەتاییەدا.

هەروەها لە بەشێکی تردا وەڵامی هەندێك گومان دەربارەی ئیعجازی زانستی لە بابەتی پێشەسەر (الناصية) دراوەتەوە.

لە کۆتاییشدا هاوپێچێك دانراوە تایبەت بە وێنە رەنگاورەنگە روونکەرەوەکان بۆ بابەتەکانی ئیعجازی زانستی.

## بەشی یەکەم

# ئیعجازی زانستی لەنێوان وەرگرتن و رەتکردنەوەیدا[1]

[1] ئەم بابەتە پوختەی توێژینەوەیەکە پێشکەشکرا لە کۆنگرەی (بەرگری لە قورئان) کە لەلایەن (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری) بە هاوکاری (پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی) سازکرابوو لە ساڵی (٢٠١١).

قورئانی پیرۆز بەرنامەی پەروەردگارە بۆ ژیانی مرۆڤەکان و لە هەمان کاتیشدا موعجیزەیە، (إعجاز) چاووگە و لە کرداری(أعجَزَ– يُعْجِزُ) و لە (عَجْز)ەوە هاتووە بە مانای دەستەوسان کردن و بێتوانا کردنی مرۆڤەکان بەرامبەر بە شتێك[٢]، موعجیزەش بەپێی مانا شەرعیەکەی بریتیە لە: کردەوەیەکی لە ئاسایی بەدەر کە خوای گەورە لەسەر دەستی یەکێك لە پێغەمبەرانی ئەنجامی دەدات، و خەڵکی دەیبینن و دەستەوسانن کە هاوشێوەی بهێنن، ئەمەش بە مەبەستی بەرامبەرکێ لەگەڵ خەڵکیدا، و بۆ سەلماندنی راستێتی ناردنی ئەو پێغەمبەرە لەلایەن خوداوە[٣].

قورئان لە هەموو روویەکەیەوە موعجیزەیە، لە رووی دەربڕین و رێکخستنیەوە (لەبەر ئەوەی نە شیعرە و نە پەخشانە)، بەڵکو شێوازێکی تایبەتیە لە زمانی عەرەبیدا کە دارشتنێکی ناوازە و رێکخستنێکی بێوێنەی هەیە، کە تەنانەت زمان ناسان و رەوانبێژانی عەرەبیش پێی نەدەگەیشتنەوە و بەرامبەری دەستەوسان بوون (کە خۆیان لە لوتکەی رەوانبێژی و بەلاغەتدا بوون)، و کەسیان نەیانتوانی هاوشێوەی بهێنن.

هەروەها لەرووی بابەتیشەوە موعجیزەیە، کە لە قورئاندا چەندین ئاماژە هاتووە بۆ گەردوون و پێکهاتەکانی و هەندێك لە دیاردەکانی، و لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دۆزینەوە زانستیە نوێکان پشتگیری ئەم راستیانەی قورئان دەکەن، ئەم بابەتەیە پێیدەوترێت ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، وبریتیە لەو ئاماژەدان و هەواڵدانانەی قورئان و سوننەت دەربارەی هەندێك راستی زانستی کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا زانستی تاقیکاریی راستیەکانی سەلماندوون، و سەلماوە کە

---

[٢] بڕوانە: (لسان العرب) لابن منظور/ مادة عجز (٥/ ٣٧٠) دار صادر بیروت، و(المفردات) للراغب الأصفهاني/ ص ٣٢٢.

[٣] بڕوانە: تفسیر القرطبي (١/ ٩٦)، فتح الباري (٦/ ٥٨١).

به هۆكاره ماددییەكانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مەحاڵ بووە ئەو بابەتانە بزانرێن..

ئیعجازی زانستی بریتییە لە یەكێك لەلایەنە گەورەكانی موعجیزە و بەڵگەی قورئان، چونكە خوای گەورە بە زانستی فراوانی خۆی دەزانێت كە رۆژگارێك دێت مرۆڤایەتی دەگەنە ئاستێكی بەرز لە زانینی نهێنییەكان و سوننەتەكانی گەردوون كە هیچ نەوەیەكی پێشتر پێی نەگەشتووە، و ئەمە دەبێتە هۆی بوغرا بوونیان بەو پێشكەوتنە وبەرنامەی پەروەردگاریان بیردەچێتەوە، هەر بۆیە پەروەردگار بۆ ئەوەی بەڵگە و حوججە لەسەر خەڵكی ئەمڕۆ دامەزرێنێت دەبینین لە قورئانەكەیدا لە سەدان ئایەتدا ئاماژەیداوە بە بوونەوەر و پێكهاتە و دیاردەكانی بە ووردەكارییەكی زانستیانەی بەرچاوەوە، كە تەنیا زانستی تاقیكاری نوێ بۆنزیكەی دوو سەدە دەچێت نهێنی ئەمانەی بۆ دەركەوتووە، ئەم دەستپێشخەرییەی قورئانی پیرۆز بریتیە لە زمانی ئاسانی ئاخاوتن لەگەڵ هەمووان‌دا لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ دەرخستنی گەورەیی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەسەر هەموو بیروباوەڕەكانی تردا.

بەهۆی ئەوەی بابەتی تەفسیری زانستی و ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بابەتێكی نوێی ئەم سەردەمەیە، لەلای زانایانی موسوڵمان مشتومڕێك لەسەر بابەتەكە دروستبووە و هەندێك پشتگیریی دەكەن كە زۆرینەن و هەندێكیش پشتگیریی ناكەن، كە لێرەدا رای هەردوو لاكە دەخەینەروو:

## ئەوزانایانەی پشتگیری لە ئیعجازی زانستی و تەفسیری زانستی قورئــان دەکەن:

دوو کۆمەڵەی سەرەکین:

١- ئەوانەی کە تەنها لە باوەڕیانەوە بـە ئیعجازی رەهـای قورئـانی پـیرۆز کـە کۆکەرەوەی راستیەکانە و گەنجینەی زانیاریەکانە باوەڕیـان بـە ئیعجـازی زانسـتی قورئان هەیە، ئەمانیش بەتایبەتی زۆرێك لە زانایانی پێشین بوون کە ئـەو هۆکـارە زانستیانەیان لەبەردەستدا نەبووە کە ئەم راستیەی پێبسەلمێنن.

٢- ئەوانەی پشتگیری ئیعجازی زانستی دەکەن لەباوەڕیانـەوە بـە مـوعجیزەی بەردەوامی قورئانی پیرۆز، کە ئەمان زانستە گەردوونیەکانیان لەبەردەسـتدا بـووە کە بەهۆیەوە لـە ئامـاژە زانسـتیەکانی قورئـان تێگەیشـتوون، کـە یـان خۆیـان لـە پســپۆڕانی زانســتە گەردوونیــەکانن یــان لــەو زانــا ئایینیانــەن کــە زانســتە گەردوونیەکانیان لەبەردەستدایە.

پشـتگیریی کردنـی ئیعجـازی زانسـتی لـە قورئـان و سـوننەتدا لـە چـەند قەناعەتێکەوە سەرچاوەی گرتووە:

١- باوەڕهێنان بە ئیعجازی رەهای قورئانی پیرۆز لە هەردوو لایەنی: زمانەوانی رەوانبێژی، و ئیعجازی بابەتیانەی قورئان کـە ئیعجـازی زانسـتی بەشـێکی لایـەنی دووەمە.

٢- هەموو ئەوانەی قورئـان باسـی کـردوون هـەق و راسـتین، بوونـەوەرەکان و یاسا ورێسا سروشتیەکان یەکانگیرن لەگەڵ ئامـاژە زانستیەکانی قورئاندا کـە بەمـە راســتگۆیی قورئـــان دەســـەلمێنن لـــە باســـەکانی دەربـــارەی گـــەردوون و زیندەوەرەکاندا، ئەمەش بەردەوامی دەدات بـە ئیعجـازی زانسـتی قورئـان بـەوەی هـەرکاتێك راسـتییەك لـە گەردوونـدا دۆزرایـەوە و یـەکانگیربێت لەگـەڵ ئامـاژە زانستیەکانی قورئاندا.

٣- لەگەڵ ئەم بەڵگە ژیرییانەی کە باسمانکرد، چەندین بەڵگەشمان لە قورئـان و سوننەتدا هەیە کە بابەتەکە دەسەلمێنن:

- ووتـــەی پـــەروەردگار:( ما فرّطنا في الكتاب من شيء.... ) [الأنعام: ٣٨]، واتە: هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا (لە قورئاندا).

- (ونزّلنا عليك الكتاب تبياناً لكل شيء.... ) [النحل: ٨٩]، واتـــە: ئێمـــە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆت کە روونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك.

-[إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ، وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ] (ص: ٨٧-٨٨)، واتـە: ئـەم قورئانە بە تەئکید یادخەرەوە و ئامۆژگاریە بـۆ هـەموو خـەڵکی جیهـان لـە هـەموو کات و شوێنێکدا،،بەڕاستی لە داهاتوویەکی نزیکدا هەر لە دونیادا هـەواڵی راستیی و دروستی ئەم ئایینە دەزانن، لە دوارۆژیشدا هەموو شتێك بە تـەواوەتی ئاشـکرا و روون دەبێتەوە.

لـە تەفسـیری (حـین) کـە لـە ئایەتەکـەدا هـاتووە زانـای موفەسـیر (الفـراء) دەفەرموێت: {مەبەستی لە پێش مردن و دوای مردنە، واتە راسـتیی ئـەو ووتانـەی من (مەبەست لـە پێغەمبـەرە ﷺ) دەیڵـێم پـاش ماوەیـەك (لـە داهـاتوودا) بۆتـان دەردەکەوێت}[٤]. (الطبري)یش دەڵێت: {راستترین ووتـە ئەوەیـە کـە بڵـێین خـوای گەورە بێبڕوایانی ئاگادار کردووە بەم قورئانە کە هەواڵەکانی لە داهاتوودا دەزانـن، بـەبێ دیـاریکردنی کـاتێکی دیـاریکراو لـە داهـاتوودا، و خـوای گـەورە بـە ڕەهـایی هێڵاوێتیەوە}[٥].

- [لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ] (الأنعام:٦٧)، واتە: بۆ هەموو هەواڵێك (کـە لە قورئاندا هاتووە) کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیـە، لـە ئایندەشـدا دەزانـن. (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: {بۆ هەموو هەواڵێك جێگیر بوونێـك هەیـە، کـە

---

[٤] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/ ٢٣١).

[٥] بڕوانە: تفسير الطبري (٢٣/ ١٢١).

له کۆتاییدا لەسەری دەوەستێت و راستی و ناڕاستیەکەی یەکلایی دەکاتەوە، کە لە داهاتوودا بۆتان دەردەکەوێت ئێوە ئەی ئەوانەی هەوڵ دەدەن بەدرۆم بخەنەوە}[6]. (ابن کثیر)یش دەڵێت: (ئیبن عەبباس) و زۆر کەسی تر ووتوویانە: بۆ هەموو هەواڵێك راستیەك هەیە، واتە بۆ هەموو هەواڵێك روودانێك هەیە ئەگەر لە ماوەیەکی داهاتووشدا بێت وەك پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ)[7]، ئەمە رای زۆربەی راڤەکارانی قورئانە.[8]

- [قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ، سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ] (فصلت: ٥٢-٥٣)، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، و پاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت! دەزانن چ سەرەنجامێکی سامناك چاوەڕێتانە؟! جا ئیتر کێ هەیە لە ئێوە سەرسەختتر؟! و کێ لاڕێتره لەوەی کە رێگەی جیا و دوور لە راستیی گرتبێتەبەر؟! ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەر ولە خودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان روون ببێتەوە و دڵنیا ببن کە دەسەڵاتی پەروەردگار و قورئانە نێردراوەکەی حەق و راست و رەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!

(الْآفَاق) مەبەستی لەوەیە کە دەردەکەوێت لە ئاسۆکانی ئاسمان و زەویدا، (الشوكاني) دەربارەی (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاق) دەڵێت: {راستیی بەڵگە

---

[6] بڕوانە: تفسير الطبري (٧/ ١٤٧).

[7] بڕوانە: تفسير ابن كثير (٢/ ١٤٤).

[8] بڕوانە: القرطبي (١١/٧)، الشوكاني (١٢٨/٢)، الرازي (٢٥/٧)، القاسمي (٥٧٥/٦٥)، ابوالسعود (١٤٧/٣).

نێردراوەکان لەسەر راستیی قورئان و ئەوەی کە لەلایەن خوداوە هاتووە بۆیان دەردەخەین، ئەویش بە پیشاندانی ئەو بەڵگانە لە خۆیان و لە ئاسۆکاندا}[٩]، (الزمخشري) دەڵێت: (ئەو ئایەتانەی کە خوای گەورە بەڵێنی داوە دەربیخات دەبێت بە چاوی خۆیان بیبینن، کە بەهۆی ئەمانەوە بۆیان روون دەبێتەوە قورئان لەلایەن خوداوە دابەزیوە، ئەو کەسەی کە ئاگاداری هەموو شتێکە و ئەمەش بەڵگەیەکی بەسە لەسەر راستێتی هاتنی لەلایەن خوداوە)، زۆرێك موفەسیری تریش هەمان رایان هەیە، دەربارەی(سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ)لە تەفسیری (الجلالين)دا هاتووە: (مەبەست پێی بەشەکان و پێکهاتەکانی ئاسمان و زەویە لە ئاگر و رووەك و درەختەکان)[١٠].

(وَفِي أَنفُسِهِمْ) مەبەست پێی دانایی و رەنگینیە لە دروستکردنی مرۆڤدا، لێرەدا ئێمە بەردەوام لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی بەڵگەی نوێین لەسەر راستیی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کە بەهۆی ئەمەوە زانیاری وورد و راڤەی تەواوی ئایەتەکان ئاشکرا دەبن، خوای گەورە دەفەرموێت: [وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا] (النمل: ٩٣)، واتە: تۆ بڵێ سوپاس و ستایش بۆ خودا، لە ئایندەیەکی نزیکدا هەموو بەڵگە و نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیناسنەوە (کە هەمووی دەستکار و بەدیهێنراوی خودایە).

دروستکراوەکانی پەروەردگار جۆرێکن لە ئایەت و نموونەی دەسەڵاتی پەروەردگار، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤایەتی بەردەوام لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی نموونەی نوێن لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار و سەلماندنی راستێتی ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.

---

[٩] بڕوانە:تەفسیری (فتح القدير)/ ج٤–ص٥٩٩، (إبن كثير)یش هەمانراڤەیکردووە، بڕوانە (تفسير القرآن العظيم)/ ج٥–ص٤٨٧.

[١٠] بڕوانە: تفسير الجلالين ٦٣٨.

پێغەمبەریش (ﷺ) دەربارى موعجیزەکەى دەفەرموێت: [عَن أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيّ (ﷺ) قَالَ: « مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إلاَّ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ أُومِنَ – أَوْ آمَنَ– عَلَيْهِ الْبَشَرُ ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْياً أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ ، فَأَرْجُو أَنِّ أَكْثَرُهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ »] (رواه البخاري)، واتە : هەموو پێغەمبەرێکى گەلانى پێشوو ئەوەندەى شوێنکەوتوو هەبووە بەپێى ئەو موعجیزەیەى کە پێى درابوو و خەڵکى بینیان، بەڵام موعجیزەکەى من وەحى و سروشێکە خودا پێیداوم، و هیوام وایە زۆرترین شوێنکەوتووم هەبێت لەرۆژى دواییدا.

ئیمامى (إبن حجر) لە راڤەى ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت:

(موعجیزەى قورئان بەردەوامە تا رۆژى دوایى، و لە راددە بەدەرە لە شێوازەکەیدا، و لە رەوانبێژیدا و لە هەواڵدانى بە شتە شاراوەکاندا، کە هیچ سەردەمێك تێناپەرێت ئیللا شتێك پەیدا دەبێت لەوانەى کە هەواڵیداوە دێنەدى، خۆى لەخۆیدا ئەمانە سەلمێنەرى راستى قورئانن، و بەهۆیانەوە سوودى گەورەى قورئان بلاْودەبێتەوە، کە ئامادەبوو و غائیب دەگرێتەوە، و ئەوەى کە بوونى هەیە و ئەوەشى لە داهاتوودا دێتە بوون)[11]، ئایا ئەمە ئاماژە نییە بۆ ئیعجازى زانستى لە رۆژگارى ئەمرۆماندا.

پەیوەندى نێوان موعجیزەکەى پێغەمبەر (ﷺ) کە وەحیە و ئەو ئومێدەى کە زۆرترین شوێنکەوتەى هەبێت لەوەدایە کە ئەم موعجیزەیە گونجاوە بۆ هەموو سەردەمێك و بەردەوامە تا رۆژى دوایى، بەم شێوەیە ئەوانەى کە هیدایەت وەردەگرن بەهۆى موعجیزەکەیەوە چەند نەتەوەیەکى زۆردەبن، ئەمەش دێتەدى بەو کەسانەى کە شوێن راستیەکانى ئاین دەکەون نەك ئەوانەى کە بەبۆماوەیى بۆیان ماوەتەوە.

[11] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) دانراوى (إبن حجر العسقلاني)/ ج١٣–ص ٣٠٥.

**كامەرانیی خودی پێغەمبەر (ﷺ) بە یەکگرتنەوەی وەحی خودایی لەگەڵ واقیعدا :**

ئیمامی (موسلیم) لە (صحیح)ەکەیدا (٢٩٤٢) بۆمان دەگێڕێتەوە: ﴿عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ أُخْتِ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ .... فَقَالَتْ:... سَمِعْتُ نِدَاءَ الْمُنَادِي مُنَادِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يُنَادِي الصَّلاَةَ جَامِعَةً، فَخَرَجْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ الْقَوْمِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَلاَتَهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقَالَ: «لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ». ثُمَّ قَالَ: « أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ ». قَالُوا اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . قَالَ « إِنِّي وَاللهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ لأَنَّ تَمِيماً الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيًّا فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ وَحَدَّثَنِي حَدِيثاً وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ الْمسِيحِ الدَّجَّالِ ...﴾، واتە: لە (فاطمەی کچی قەیس) دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: ڕۆژێك گوێم لە بانگ بوو، کە بانگی موسوڵمانانی دەکرد بۆ نوێژ و منیش بەرەو مزگەوت بەڕێکەوتم، و لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژمان کرد و من لە ریزی ئافرەتاندا وەستابووم کە دەکەوتە دوای ریزی پیاوانەوە، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژ بووەوە چووە سەر مینبەر بە پێکەنینەوە و فەرمووی: با هەموو کەسێك لە شوێنی خۆی دابنیشێت، پاشان فەرمووی: دەزانن بۆچی کۆم کردوونەتەوە، ووتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: سوێند بەخوا من نە لە ترسدا و نە لە ئومێددا کۆم کردوونەتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە کۆم کردوونەتەوە کە (تەمیمی داری) پیاوێکی گاور بوو، هات و پەیمانیدا و موسوڵمان بوو و بابەتێکی بۆ باس کردم کە وەك ئەوەبوو کە من پێشتر بۆم باس دەکردن دەربارەی مەسیحی درۆزن، کە پاشان دەربارەی گەشتەکەی وبینینەکانی بۆیان دوا و دەقاودەق وەك ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کردبوون، بەهەمان شێوەی پێغەمبەریش (ﷺ) موسوڵمانانی ئەمڕۆ دڵخۆش و کامەران دەبن کاتێك کە واقیع و بینینە جۆراو جۆرەکانی ئەمڕۆ یەکدەگرنەوە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت (کە پێش ١٤٠٠ ساڵ دابەزیون) و ڕاستیەکانیان دەسەلمێنن.

## ووتەی هەندێك لەو زانا وكەسایەتیانەی پشتگیری تەفسیر و ئیعجازی زانستی دەكەن[12]:

- حجة الإسلام شێخ (أبوحامد الغزالي) (٤٥٠-٥٠٥ك) دەڵێت:

(العلوم كلها داخلة في أفعال الله وصفاته، وفي القرآن شرح ذاته وأفعاله وصفاته، وهذه العلوم لا نهاية لها وفي القرآن إشارة الى مجامعها، بل كل ما أشكل فيه النظار في النظريات والمعقولات ففي القرآن إليه رموز ودلالات عليه، يختص أهل الفهم بدركها)١٣ واتە: زانستەكان هەموویان دەچنەژێر كردارەكانی خودا و سیفاتەكانی، و لە قورئانیشدا وەسفی زات وكردار وسیفاتەكانی خودای تێدایە، ئەم زانستانەش كۆتاییان نییە و لە قورئاندا ئاماژە بۆ ووردەكاریەكانیان كراوە، تەنانەت هەموو ئەوانەش لە بیردۆزەكان و مەعقولاتەكان كە لێكۆڵەرەوان لێیان بووە بەكێشە، لە قورئاندا ئامـاژەی بـۆ هـاتووە كـە خـەڵكانی خـاوەن تێگەیشـتن پێیـدەزانن و لێـی تێدەگەن.

هەروەها لە كتێبی (جـواهر القـرآن)دا دەڵێـت: ان علـوم الطـب والنجـوم، وهيئـة العالم وهيئة بدن الحيوان، وتشريح أعضائه، وعلم السحر، وعلم الطلسمات وغير ذلك يشـير إليهـا القـرآن بقولـه تعـالى:(وإذا مرضت فهو يشفين) (الشعراء: ٨٠)، وقولـه سـبحانه: (والشمس والقمر بحسبان) (الرحمن: ٥) ونحـوه مـا يشـير إلى علـم الهيئـة (الفلـك)، واتــە: زانســتەكانی پزیشــكی و ئەستێرەناســی و پێكهاتــەی جیهــان و پێكهاتەی ئاژەڵان و توێكاری ئەندامـەكانی و زانسـتی سـیحر و شـتە شارراوەكان قورئان ئاماژەی بۆ داون لە ئایەتەكانیدا.

---

١٢بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم بابەتەی ئینتەرنێت: (الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة: أ. د. كارم السيد غنيم- موقع: موسوعة الإعجاز العلمي- تاريخ المقال : ٢٠١٠/٦/٢١)، ووتـەی ئـەو زانایانەی كە ئاماژە بۆ سەرچاوەكەی نەكراوە لەم بابەتەوە وەرگیراوە.

١٣بڕوانە: إحياء علوم الدين (ج١ ص٢٧٩).

– ئیمامی (فخرالدین الرازي) (٥٤٤–٦٠٦ك) سەرەتا دەیووت قورئان باسی زانست ناكات و تەفسیری زانستی رەتدەكردەوە، بەلاّم كاتێك لێكۆلّینەوەی لە زانستی پراكتیكی كرد تەفسیرێكی دانا لەسەر بنەمای تەفسیری زانستی بەناوی (مفاتيح الغيب)، كەتێیدا دەلّێت: (ربما جاء بعض الجهال والحمقى وقال: إنك أكثرت من تفسير كتاب الله من علم الهيأة والنجوم...)١٤ واتە: لەوانەیە هەندێك گێل و نەزان بێن و رەخنە بگرن وبلّێن تۆ زۆر تەفسیری كتێبی پەروەردگارت بە زانستەكانی گەردوونزانی كردووە، هەروەها كتێبی (نهاية الإيجاز في دراسة الإعجاز)یشی داناوە.

– (محمد بن عبدالله المعروف بابن أبي الفضل المرسي) (٥٧٠–٦٥٥ك) دەلّێت: (ان القرآن جمع علوم الأولين والآخرين...، ثم قال: وقد احتوى علوم مثل الهيأة والنجامة وفيه أصول الصنائع)١٥ واتە: قورئانی پیرۆز زانستی پێشوو وداهاتووشی تێدایە، تەنانەت زانستەكانی وەك گەردوونزانی و بنەمای دروستكراوەكانیشی تێدایە.

– (جلال الدين السيوطي) (٨٤٩–٩١١ك) وەك ئیمامی غەزالی لەگەلّ تەفسیری زانستیدا بووە و لە كتێبەكانی (الإتقان في علوم القرآن) و (الإكليل في استنباط التنزيل)دا بەدرێژی باسی كردووە و بەلّگەی لە ئایەت و فەرموودەوە بۆ هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی، وەك خۆی دەلّێت: (القرآن مشتمل على كل العلوم) واتە قورئان هەموو زانستێكی تێدایە، ووتەیەكی (ابن سراقة) دێنێتەوە لە كتێبی (الإعجاز)دا كە (ابي بكر بن مجاهد) ووتوویەتی: (مامن شيء في العالم إلا وهو في كتاب الله)، واتە: هیچ شتێك لە جیهاندا نیە كە لە كتێبی پەروەردگاردا باسی نەهاتبێت[١٦].

---

١٤بروانە: تفسير (مفاتيح الغيب) (١/١٨٥).

١٥بروانە: الإكليل (ص٢–٥)، الإتقان في علوم القرآن (ص ٧٢٧).

[١٦]بروانە: الإتقان في علوم القرآن (ص ٧٢٦).

– شێخ (محمد بن أحمد الخطيب الشربيني) (٩٧٧ك-١٥٧٠ز) دەڵێت: (لا نهاية لأسرار علوم القرآن، ففي كل زمن يكتشف منها جديد لم يعرفه السابقون)، واتە: نهێنیەکانی زانستەکانی قورئان کۆتاییان نییە، و لە هەموو زەمانێکدا چەندین شتی نوێی لێدەدۆزرێتەوە کە پێشینەکان نەیانزانیوە.

– شێخ (محمود بن عبدالله شهاب الدين أبو الثناء الألوسي) (١٢١٧-١٢٧٠ك) خاوەنی تەفسیری (روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثاني) لە تەفسیرەکەیدا و لەکاتی راڤەکردنی ئەو ئایەتانەی ئاماژەی گەردوونیان تێدایە دەڵێت: (فإنه ذكر فيه جميع ما يحتاج إليه من أمر الدين والدنيا)[17] واتە: خوای گەورە لە قورئانەکەیدا هەموو ئەو شتانەی پێویستمانە باسکردووە لە کاروبارەکانی دین ودونیا.

– شێخ (محمد بن أحمد الطبيب الأسكندراني) (١٣٠٦ك) چەندین کتێبی داناوە کە باسی ئایەتە گەردوونیەکان دەکات لە قورئاندا، کە یەکێك لەوانە کتێبی (كشف الأسرار النورانية القرآنية فيما يتعلق بالأجرام السماوية والأرضية والحيوان والنباتات والجواهر المعدنية) کە تێیدا دەڵێت:

(والقرآن تحدث بهذه العلوم في فروعها المختلفة ونظرياتها واكتشافاتها الحديثة قبل أن يعرفها العلم البشري وهذا من الإعجاز بالأخبار الغيبية)، واتە: قورئان باسی ئەم زانستانەی کردووە لە لقە جیاوازەکانی و بیردۆزەکانی و دۆزینەوە نوێکانیشی پێش ئەوەی کە زانستی مرۆڤەکان ئەمانە بزانێت، کە ئەمەش ئیعجازی هەواڵدانە بەغەیب وشاراوەکان.

– (أحمد مختار پاشا) (١٢٥٣-١٣٣٧ك) کتێبێکی داناوە بە زمانی تورکی، کە (الرافعي) ناویناوە (سرائرالقرآن) کە تێیدا تەفسیری ٧٠ ئایەتی قورئانی کردووە بەتازەترین دۆزینەوەکانی زانستی نوێ لەبوارەکانی سروشتزانی و فەلەکدا کە

---

[17] بڕوانە: تفسير (روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثاني) (١٣/ ٢٨٩).

تێیدا ئاشکرایکردووه که له قورئاندا چەندین ئاماژه و بەڵگەی ئاشکرای تێدایـه لـه مەسەله جیاوازەکاندا که زانسته نوێکان بەردەوام له دۆزینەوەی ماناکانیاندان.

– شێخ (محمد بخيت المطيعي) دەڵێت: (إن القرآن شامل لجميع العلوم الباحثة عن دقائق الأعيان الكونية في العوالم كلها، سماوية وأرضية وجوية وجسمانية... ولا شيء مما قاله علماء الهيئة يصادم شيئاً من الآيات والأحاديث)، واتـه: قورئـانی پیرۆز هەموو ئەو زانستانه دەگرێتەخۆی که بەدوای ووردەکاریەکانـدا دەگـەڕێن لـه هەموو جیهانەکاندا، جا چ ئاسمانی یان زەوی یان جەووی یـان جەسـتەیی بێـت، و هـیچ شـتێك نییــه کــه زانایــانی گــەردوونزانی وتبێتیــان پێچــەوانەی ئایــەت و فــەرموودەکان بێـت، ئـەم ووتانـەی لـه دوو کتێبیـدا هـاتووه بـەناوەکانی: (تنمية العقول الإنسانية لما في القرآن من العلوم الكونية والعمرانية) و (توفيق الرحمن للتوفيق بين ما قاله علماء الهيئة وبين ما جاء في الأحاديث الصحيحة وآيات القرآن).

– شـێخ (محمد الطاهر بن عاشور) کـه لـه تەفسـیرەکەیدا (التحريروالتنوير) دەربـارەی لێکدانـەوه و تەفسـیر کردنـی قورئـان دەڵێـت[18]: ڕووەکـانی ئیعجـازی قورئـان بـۆ ٣ لایـەن دەگەڕێتـەوه: یەکـەم ئەوەیـه کـه گەیوەتـه ئەوپـەڕی پلـەی ڕەوانبێژیی زمانی عەرەبی، دووەم داهێنراوەکانی قورئانـه لـه هونـەرەکانی صـرف لـەڕێزمانی قسـەدا کـه پێشـتر لای عـەرەب ئاشـنانەبووه بـەڵام لـه چوارچێوەی زمانــەوانی نەچـۆته دەرەوه، سـێیەم ئـەو گەوهەرانەیـه کـه تێیـدا دانـراوه لـه حیکمەتەکان و ئاماژەدان بۆ ڕاستیه عـەقڵی و زانسـتیەکان کـه ژیریـی مرۆڤـەکانی سەردەمی هاتنه خوارەوەی قورئان پێی نەگـەیبوون و تـا چـەندین سـەدەش دوای دابەزینی، که ئەم بەشه زانایانی پێشووی ئیعجـازی قورئـان درکیـان پێنـەکردووه، هەندێك کەس لایەنێکی چوارەمیش زیاد دەکـەن کـه ئـەویش بریتیـه لـه هەواڵدانـه غەیبیەکانی قورئان که بەڵگەیه لەسەر ئەوەی لەلایەن (علاّم الغيوب)ەوه هـاتووه،

---

[18] بڕوانه: تفسير التحرير والتنوير – المقدمة العاشرة (في إعجاز القرآن)– (١ / ١٠٤).

دوو لایەنەکەی یەکەم بەتایبەت بۆ عەرەبە و روو لەوان دەکات کە رەوانبێژ و زمانەوانەکانیان دەستەوسان دەکات، لایەنی سێیەمیش بۆ هەموو مرۆڤایەتیە و لە هەموو سەردەمەکاندا بەردەوامە، و ئەم لایەنەش بۆ دەرخستنی رووی ئیعجازەکەی پێویستی بە زانیارییە دەربارەی بنەماکانی زانست، کە بۆ خەڵکی وورده وورده دەردەکەوێت وەك دەرکەوتنی رووناکی بەیانیان، ئەویش بەگوێرەی ئەوەی لێی تێیدەگەین و راددەی پێشکەوتنی زانستەکان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووە چونکە کەسێکی نەخوێندەوار هێناویێتی.[19]

– زانای ناسراوی کورد ماموستا (سەعیدی نوورسی) لە کتێبی (مەکتووبات)ەکەیدا دەڵێت: بەشێك لە ئایەتەکانی قورئان بە تێپەربوونی کات و پێشکەوتنی زانستەکان روونتر دەبێتەوە، ئەمە مانای ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز گەنجینەیەکە گەوهەرەکانی نازمێردرێن و سەمەرەکانی کۆتاییان نایەت، چەند دەقێکی جێگیری هەیە کە مانا و ئەحکامەکانی ناگۆرێن لە هەموو زەمانێکدا، بەڵام لە هەمان کاتدا چەند مانایەکی تریشیان هەیە کە ئیشارەت بۆ هەندێك راستی زانستی دەکەن، و وورده وورده ئاشکرا دەبن بەپێی پێشکەوتنی ئاستی زانستی مرۆڤەکان، ئەو راستیە ئاشکرایانەش کە پێشینی صالحمان روونیان کردووەتەوە بە پارێزراوی ماونەتەوە و گومان روویان تێناکات.

– شێخ (محمد عبدالعظيم الزرقاني) دەڵێت: "القرآن يحض على الانتفاع بالكون...أجل ان القرآن حض على معرفة علوم الكونوصنائع العالم .... قال سبحانه وتعالى: {قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ} (يونس:١٠١)" واتە: قورئانی پیرۆز هانمان دەدات بۆ سوود وەرگرتن لە گەردوون،بەڵێ قورئان هانی فێربوونی زانستەکان و سوود وەرگرتنی لە گەردوون داوە.

---

[19] بڕوانە: تفسير التحرير والتنوير – المقدمة العاشرة– (١ / ١٢٧).

هەروەها لە بەشێكی تری كتێبەكەیدا لەژێر ناونیشانی (إعجاز علميّ للقرآن)دا دەڵێت: "ان القرآن الكريم في طريقة عرضه للهداية والإعجاز على الخلق قد حاكم الناس الى عقولهم، وفتح عيونهم الى الكون وما في الكون من سماء وارض، وبر وبحر، وحيوان ونبات، وخصائص وظواهر، ونواميس وسنن. وكان القرآن في طريقة عرضه هذه موفقاً كل التوفيق، بل كان معجزاً أبهر الإعجاز، لأن حديثه عن تلك الكونيات كان حديث العليم بأسرارها، الخبير بدقائقها، المحيط بعلومها ومعارفها، على حين أن هذا الذي جاء بالقرآن رجلٌ أميّ، نشأ في أمة أميّة جاهلة، لاصلة لها بتلك العلوم وتدوينها، ولا إلمام لها بكتبها ومباحثها. بل ان بعض تلك العلوم لم ينشأ الا بعد عهد النبوة ومهبط الوحي بقرون واجيال. فأنى يكون لرجل امي كمحمد (ﷺ) ذلك السجل الجامع لتلك المعارف كلها ان لم يكن تلقاه من لدن حكيم عليم؟ قال سبحانه مقرراً لهذا الإعجاز العلمي: {وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ، بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ} (العنكبوت: ٤٨-٤٩) ..... يقول الله تعالى: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ) [النور: ٤٣].

قل لي بربك ألا يمتلكك العجب حين تقرأ هذا النص الكريم الذي يتفق وأحدث النظريات العلمية في الظواهر الطبيعية: من سحاب ومطر وبرق؟!".

واتە: ..... بڕوانە ووتەی پەروەردگار (ألم أن الله يزجي سحاباً ....) توخوا پێم ناڵێیت ئایا تۆ تووشی سەرسوڕمان نابیت كاتێك ئەم دەقە دەخوێنیتەوە كە یەكانگیرە لەگەڵ نوێترین بیردۆزە زانستیەكانی دیاردە سروشتیەكاندا لە هەور و باران و هەورە بروسكەدا؟!.[٢٠]

---

٢٠بڕوانە: مناهل العرفان في علوم القرآن / ص ٢٥-٢٧.

- شێخ (محمد مصطفى المراغي) شـێخی پێشـووی ئەزهـەر (١٣٦٤ك) دەڵێـت: (والزمان كفيل بتأييد قضايا الكتاب الكريم مهما طال عليها الأمد، وكلما تقدم العلم ذكر صدق ما أخـبر بـه)، واتـه: زەمـان کەفیلـه بـه پشـتگیریی کردنـی بابەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز هەرچـەندێك زیـاتری بەسـەردا تێپـەڕێت، هەرچـەندێکیش زانسـت بەرەوپێش بچێت راستی ئەوەی کە هەواڵی پێداوە دەردەخات.

- (مصـــطفى صـــادق الرافعـــي) (١٢٩٨-١٣٥٦ك) لەلایـــەنگرانی تەفســـیری زانستییه و لە کتێبەکەیدا (إعجاز القرآن) چـەندین لاپـەڕەی تایبـەت کـردووه بـه ئیعجازی زانستی، لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیشـی بـۆ بابـەتی (قورئـان وزانسـتەکان) تەرخان کردووه کە تێیـدا رایگەیانـدووه: قورئـانی پـیرۆز موعجیزەیـه لـه مێـژووی زانستدا لەسەر رووی زەوی، لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوه تا ئـەوەی خـودا ویستی بێت، دوای پشت بەسـتن بـه زانسـته نوێکـان ئەگـەر تێبڕوانینـه قورئـان و لێیبکۆڵینەوه زۆرێك ئاماژەی لێدەردەهێنین کە ئیشـارەت دەدەن بـۆ راسـتیەکانی زانست.[21]

- دکتـۆر (عبـدالعزيز اسماعيـل) دانـەری کتـێبی (الإسـلام والطـب الحـديث) کـه بریتیه لـه کۆمـەڵێك مەقالـه کـه لـه گۆڤـاری (الأزهـر)دا بڵاویکردووەتـەوه و سـاڵی (١٣٥٧ك) چاپکراوه، تێیدا دەڵێت: لەراستیدا قورئانی پیرۆز کتێبێکـی پزیشـکی و ئەندازیاریی و گەردوونزانی و هیچ زانستێکی سروشـتی نییـه، بـەڵام لـه دوو توێیـدا چـەندین ئایـەت هەیـه کەباسـی زۆرێـك راسـتی کـردووه کـه زانایـان تـەنها دوای پێشکەوتنی زانستی نوێ درکیان پێکرد، ئەویش دوای هەزار سـاڵ لـه دەرکـەوتنی ئاینی ئیسلام، چەندین ئایـەتیش هەیـه کـه زانسـتەکان تـا ئێسـتاش نـەیانتوانیوه تەفسیری بکەن و تەنها دواتر دوای زیاتر پێشـکەوتنی زانسـتەکان روونـدەبنـەوه[22]،

[21] بڕوانه: إعجاز القرآن ص ١٠٨.

[22] بڕوانه: الإسلام والطب الحديث ص١١٢.

شێخ (محمد مصطفى المراغي) لە پێشەکی ئەم کتێبەدا دەڵێت: نابێت ئایەتەکان بەزۆر پەلکێش کەین بۆ زانستەکان، بەڵام ئەگەر مانای ئایەتێك لەگەڵ راستیەکی زانستی جێگیر یەکیانگرتەوە ئەوا تەفسیری ئایەتەکەی پێدەکەین، ناشمەوێت بڵێم قورئان هەموو زانستێکی بەکۆکراوەیی و بەدرێژیی لەخۆگرتووە، بەڵکو چەند بنەمایەکی گشتی هێناوە بۆ هەموو ئەوانەی گرنگە بۆ مرۆڤ بیانزانێت بۆ ئەوەی بگاتە پلەی کامڵبوون لەهەردوو لایەنی جەستەیی و رۆحی، ئیتر دوای ئەمە دەرگای بەکراوەیی بەجێهێڵاوە بۆ ئەوانەی بە زانستە جۆراوجۆرەکانەوە خەریکن تاوەکو لە هەموو سەردەمێکدا بەپێی تواناکانیان بۆ خەڵکی دەربخەن، هەروەها دەشڵێت: کتێبی (الإسلام والطب الحديث) کاریگەرییەکی گەورەی هەیە بۆ دەرخستنی ئیعجازی قورئان لەلایەنی پزیشکیدا."[٢٣]

– شێخ (محمد عبدالله درّاز) دەڵێت: قورئانی پیرۆز راستیە گەردونییە بەردەوامەکانی بەکارهێناوە بۆ بانگەواز کردن بۆ باوەڕهێنان ورەوشتبەرزی، و ئەو راستیانەی کە باسیان دەکات هەمیشە و بە بەردەوامی لە لوتکەدان.

– دکتۆر (عبدالرزاق نوفل) دەڵێت: "ئیعجازی زانستی قورئان تەنها بەوە ناوەستێت کە ئایەتێك باسی راستیەکی زانستی دەکات و پاشان زانست پاش سەدان ساڵ دەیسەلمێنێت، بەڵکو دەبینین کە تەنها ئایەتێك ئاماژە بۆ چەندین راستی زانستی دەکات کە ئەمەش روویەکی ئیعجازی زانستی قورئانە".

– دکتۆر (عفيفي عبدالفتاح بارة) دەڵێت: قورئان کتێبی هیدایەت و رێنموونیە.. لەگەڵ ئەمەشدا ئایەتەکانی خاڵی نیە لە باسکردنی زۆرێك راستی زانستی لەبوارەکانی سروشتزانی و پزیشکی و جوگرافی، کە هەنێك لە نهێنیەکانی لە سەردەمی نوێدا دۆزراونەتەوە.

---

[٢٣] بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

- شێخ (محمد الغزالي) ئاشکرایکرد لە نهێنیەکانی ئیعجازی قورئانی پیرۆز بریتیە لەوەی کە نهێنی زانستی لەخۆی گرتووە کە ژیریی مرۆڤ تەنها دوای سەردەمی قورئان و بەیارمەتی ئامێر و هۆکارە وردەکان پێیگەیشت.

- (أ.د.محمد أحمد الغمراوي) دەڵێت: زانستی گەردونیی تەفسیری ئایەتە گەردوونیەکانی قورئان دەکات، لەقورئاندا چەندین راستی زانستی هەیە کە تەنها لەمڕۆدا سەلمێنراون، کە هەموو ئەمانە موعجیزەیەکی زانستی قورئانە و بە عەقڵ و هەستەکان هەستمان پێکردوون نەك تەنها بە زمانەوانی، زانینی ئەم ئایەتە کەونیانە ئاسانکارییە بۆ بانگەواز بۆ لای دینی پەروەردگار لەم سەردەمەدا کە سەردەمی زانستە، تەفسیری زانستیش داهێنراوێکی موسوڵمانانی ئەم سەردەمە نییە، بەڵکو دەبینین لەنێوان موفەسیرە پێشینەکانیشدا کەسانێك هەبوون کە ئەم مەنهەجەیان بەکارهێناوە وەك: (الزمخشري و الفخر الرازي) کە تەفسیرەکەی پڕە لە لێکدانەوەی زانستی و شێخ (محمد عەبدە) و (الآلوسي) لە تەفسیرەکانیاندا ...

- شێخ (عبدالمجيد الزنداني) دەڵێت:

"ئیعجازی زانستی قورئان بریتیە لە عیلمی خودایی کە وەسفی نهێنیەکانی دروستکراوەکان دەکات لەهەموو ئاسۆکاندا، سەرەتاکان دیاری دەکات و وەسفی نهێنیەکانی حازر دەکات و غەیبی داهاتووش ئاشکرا دەکات کە حاڵی هەموو دروستکراوەکانی لەسەر دەبێت، کاتێکیش مرۆڤ چووە سەردەمی دۆزینەوە زانستیەکانەوە وبووە خاوەنی ووردترین ئامێرەکانی توێژینەوەی زانستی و دەستیکرد بە گەڕان بەدوای نهێنیە شارراوەکان لە ئاسۆکانی ئاسمان و زەویدا، و لەبوارەکانی پێکهاتەی مرۆڤدا، کاتێکیش کە وێنەکە کامڵ بوو و راستیەکان ئاشکرابوون ئەوکاتە موفاجەئە گەورە دەرکەوت و رووناکیی نیگای خودایی کە پێش دەیان سەدە بۆ سەر سەروەرمان محمد (ﷺ) دابەزی پرشنگیدا بە باسکردنی ئەم راستیانە یان لە ئایەتێکی قورئاندا یان لە فەرموودەیەکی

پێغەمبەرماندا بە ووردەکارییەکی زانستی پڕ لە ئیعجاز و کۆمەڵێك دەستەواژەی روونی پرشنگدار.

تەفسیری زانستی بریتیە لە دەرخستنی مانای ئایەتێك یان فەرموودەیەك لەژێر رۆشنایی ئەو راستیە زانستیە گەردوونیانەی کە راستیەکانیان لەمرۆدا سەلمێنراون، بەلاَم ئیعجازی زانستی بریتیە لە هەواڵدانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەراستیەك کە زانستی تاقیکاریی ئەمرۆ لەکۆتاییدا سەلماندوویەتی و ئاشکراشە کە مەحاڵ بووە بە بەکارهێنانی هۆکارە مرۆییەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) درك بەمە کرابێت، ئابەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەریش چەندین راستی گەردوونیان تێدایە و بە تەواوەتی مانای ئایەت وفەرموودەکە دەردەکەوێت، ومرۆڤەکان راستیەکانیان لە گەردووندا بەچاوی خۆیان دەبینن، و بەهۆی ئەمەوە تەفسیرەکەی جێگیر دەبێت و لێکدانەوەکەی بەتەواوەتی دەزانرێت، وەکپەروەردگار دەفەرموێت: [لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ] (الأنعام:٦٧)، لەوانەشە چەندین دیمەنی گەردوونی تر ئاشکرابن بەتێپەڕبوونی سەدەکان کە مانا جێگیرەکان روونتر وقووڵتر وفراوانتر بکەن، ئەویش لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پوختترین و فراوانترین و کۆکراوەی ووتەکانی پێدراوە (... وأوتيت جوامع الكلم...) (رواه مسلم وأحمد)، و ووشەکانی قورئانیش چەندین مانایان هەیە".[٢٤]

– دکتۆر (مۆریس بۆکای)[٢٥] دەڵێت: کاتێك لێکۆڵینەوەم کرد لە قورئان بەتایبەتی ئەو وەسفەی دەیکات بۆ زۆرێك لە دیاردە سروشتیەکان، لەراستیدا

---

٢٤بڕوانە : المعجزة العلمية في القرآن والسنة (تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)/ لاپەڕە ١١ و دواتر، هەروەها (إنه الحق)/ لاپەڕە ١٠٦ ودواتر.

٢٥(موریس بوکای) پزیشکێکی هەناوی بەناوبانگی فەرەنسیە (١٩٢٠–١٩٩٨ز)، لەسەر ئاینی مەسیحی گەورەبوو، دوای ئەوەی لە کتێبە ئاسمانیەکانی جولەکە و گاور وموسوڵمانی کۆڵیەوە دەربارەی چیرۆکی فیرعەون و بەراوردی کرد لەگەڵ زانستی نوێدا موسوسڵمان بوونی خۆی ئاشکراکرد، و کتێبی

سەرمسوڕما لەو ووردەکاریەی کە هەندێك لەو دیاردانەی پێباسکراوە، کە مەحاڵ بووە بۆ هەر مرۆڤێك لە سەردەمی (محمد)دا کە بچووکترین زانیاریی دەربارەیان هەبوبێت، بەتەواوەتی سەرمسوڕما لە یەککگرتنەوەی ئەو ئاماژانە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنانەی ئەمڕۆ هەمانە دەربارەی ئەو دیاردانە.

دوای ئەمەش چەندین نوسراوم خوێندەوە کە چەند نوسەرێکی موسوڵمان دەربارەی لایەنە زانستیەکانی قورئان نوسیویانە، یەکەم شتێك کە مایەی تێڕامان و سەرسوڕمانی ئەو کەسانەیە کە رووبەرووی ئەم دەقانە دەبنەوە بریتیە لە دەوڵەمەندی ئەو بابەتانەی کە باسیان لێوەکراوە: لەوانە لایەنی بەدیهاتن و گەردوونزانی و خستنەرووی هەندێك بابەت دەربارەی زەوی، وجیهانی ئاژەڵ و رووەك، و زاووزێی مرۆڤ.

ئێمە لەکاتێکدا هەڵەی گەورەی زانستی لە تەوراتدا دەدۆزینەوە لە قورئاندا هیچ هەڵەیەك نادۆزینەوە، ئەمە وایلێکردم کە پرسیار بکەم کە ئەگەر نووسەری قورئان مرۆڤێك بووایە، باشە چۆن توانی لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا چەند شتێك بنووسێت کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا بۆمان دەرکەوتووە یەکانگیرە لەگەڵ زانیارییە زانستیە نوێکاندا.[٢٦]

- دکتۆر (رۆجێە گارودی)[٢٧] دەڵێت: من بەدوای هەموو ئەو ئایەتە قورئانیانەدا چووم کە پەیوەندیان هەیە بەو زانستە پراکتیکی و پزیشکیەی کە من خوێندوومە

---

(تەورات و ئینجیل و قورئان و لێکۆڵینەوەیان لەژێر رۆشنایی زانستی نوێدا) نووسی کە بۆ ١٧ زمان وەرگێردراوە.

٢٦ بڕوانە: القران الكريم والتوراة والانجيل والعلم/ ص ١٥٠- ١٥٢.

٢٧ (روجیە گارودی) (بە فەرەنسی: Roger Garaudy) یان (رجاء Raja) لە (١٩١٣/٧/١٧)ن لە (مەرسیلیا- فەرەنسا) لەدایکبووە، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسا، سەرەتا شیوعی بووە و باشان بوو بە مەسیحی و لەساڵی (١٩٨٢)دا موسوڵمان بوو و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (رەجا)، و دەڵێت تەنها ئیسلام دامەزراوی پێبەخشیم و گەیاندمی بە خاڵی یەکتاپەرستی، زیاتر لە ٤٠ کتێبی نوسیوە، لەوانە: (وعود الإسلام، الإسلام دين المستقبل، المسجد مرآة الإسلام).

و زۆرباش دەیانزانم، بینیم ئەم ئایەتانە بەتەواوەتی یەکدەگرنەوە لەگەڵ زانستە نوێکانمان، بۆیە من موسوڵمان بووم چونکە گومانم نەما لەوەدا کە محمد (ﷺ) راستیەکی ئاشکرای بۆ هێناوین لەپێش زیاتر لە ١٠٠٠ ساڵ، ئەگەر خاوەنی هەر هونەرێك لە هونەرەکان یان زانستێك لە زانستەکان هات و بەراوردی کرد لەنێوان هەموو ئەو ئایەتە قورئانیانەی کە پەیوەندیان بەو زانستەوە هەیە کە ئەو خوێندوویەتی و دەیزانێت، ئەوا بێگومان موسوڵمان دەبێت بەو مەرجەی دووربێت لە مەبەستی تایبەتی.

– شێخ (محمد محمد أبوشهبة) دەڵێت: ئەگەر موسوڵمانان لەوە تێگەیشتنایە کە لە قورئاندا هەیە و سوودیان لێوەرگرتایە ئەوا دەبوونە لەپێشترین نەتەوە لە دۆزینەوە زانستیەکان و داهێناندا.

– لەو کەسایەتیانەی تریش کە باسی گرنگیی تەفسیری زانستی و دەرخستنی ئیعجازی زانستی قورئانیان کردووە: محمد متولي الشعراوي، محمد عبدة، د.مصطفى محمود، د. کارم غنيم، نظمي أبوالعطا، د. زغلول النجار، د. عبدالجواد الصاوي، د. صالح الكريم..... و زۆری تریش.

ئەوانەی لە سەرەوە باسمانکردن لە لایەنگرانی ئیعجازی زانستین کە وەك ووتمان جیاوازن لە رۆشنبیرییدا لەنێوان پسپۆڕانی زانستە دینیەکان و پسپۆڕانی زانستە گەردوونیەکان، لە ووتەکانینەوە ئەم پوختەیەمان دەستدەکەوێت:

١– قسەکردن دەربارەی ئیعجازی زانستی بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی هەبووە، زۆرێك لە موفەسیرە پێشینەکان هەستاون بە تەفسیر کردنی زانستیانەی قورئانی پیرۆز، کە ئەمە داواکاریەکی سەردەمیانەشە و پسپۆڕانی زانستە دینیەکان و پسپۆڕانی زانستە کەونیەکان کۆکن لەسەری، وباوەڕیان وایە کە دۆزینەوەکان و زانیارییە زانستیە نوێکان یارمەتیدەرن لە تێگەیشتن و تەفسیر کردنی ئایەتە گەردوونیەکان لە قورئانی پیرۆزدا.

٢- لایەنگرانی ئیعجازی زانستی کۆکن لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەتە و سەرچاوەیەکی فێرکردنی زانستە کەونیەکان نییە، و ئەو ئامـاژە زانستیانەشی تێیدا هاتووە تەنها لەلایەنی ئیستیعاب کردنی راستیە گەردوونیەکانە، و قورئان هەستاوە بە بەکارهێنانی ئەو راستیە گەردوونیانە بۆ بانگەوازکردن بۆ باوەڕهێنان و فەزیلەت کە ئەم راستیە گەردوونیانە دەبنە شایەت لەسەر راستیی قورئانی پیرۆز، و بە بەردەوامی بەڵگەن لەسەر خەڵکی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی زانستە سروشتیەکان، و هەر ئەمەش دەبێتە فاکتەری زیندوویی و نەمرێتی پەیامەکە.

## ئەوانەی رەخنە لە ئیعجازی زانستی دەگرن و وەڵام دانەوەیان:

بریتین لە ٣ دەستە لەرووی پاڵنەرەکانیان بۆ رەخنەگرتن و رەتکردنەوەی تەفسیر و ئیعجازی زانستی:

**دەستەی یەکەم:** ئەوانەن کە دەترسن راستگۆیی قورئان گومانی تێبکەوێت ئەگەر بێتو تەفسیرەکەی پابەند بکرێت بە زانستە گەردوونیەکانەوە کە بەردەوام زانیارییەکانی دەگۆڕێت، ئەمە کاریگەریی دەبێت لەسەر جێگیربوونی تەفسیری زانستی قورئان، هەروەها لەوەش دەترسن کە مانای ووشەکان بابدرێت و ملکەچ بکرێت بۆ ئەوەی زانستە گەردوونیەکان پێیگەیوە، کەواتە ئەمان ئیعجازی زانستی و تەفسیری زانستی رەتدەکەنەوە بەهۆی خەمخۆرییان بۆ قورئانی پیرۆز.

**دەستەی دووەم:** ئەوانەن کە هیچ بەڵگەیەك نابینن لەسەر ئیعجازی زانستی، و ئەمان تەنها رازین بە ئیعجازی زمانەوانی و رەوانبێژی قورئان.

**دەستەی سێیەم:** ئەوانەن کە ئیعجازی زانستی رەتدەکەنەوە بەهۆی بێباوەڕیان و کافربوونیان بە قورئان، یان بەهۆی قین و ئیرەییان لە قورئان کە زاڵبووە بەسەر هەموو کتێبە ئاینیەکانی تر بەهۆی ئیعجازی هەمەلایەنیەوە کە ئیعجازی زانستیش بەشێکێتی.

دەستەی یەکەم هەمیشە جێی ئومێدی خێرن و دڵسۆزی قورئانن، بەڵام دەستەی دووەم بابزانن کە زۆرێك وەك ئەوان قەناعەتی بە ئیعجازی زانستی نەبووە بەڵام دوای لێکۆڵینەوە و تێفکرین و سەیرکردن و گەڕانەوە بۆ رای پسپۆڕانی زانستە گەردوونیەکان گەیشتنە راستی و باوەڕیان بە ئیعجازی زانستی هێنا.

دەستەی سێیەمیش پێویستە مێشکیان بخەنەگەڕ و وازبێنن لە کەللەڕەقی و خۆیان پاکبکەنەوە لە ئیرەیی و قین، ئەوکاتە بەئاشکرا راستییان بۆ دەردەکەوێت و دەگەنە حەقیقەت، و دەبێت بابەتی ئیعجازی زانستیش بە بیرکردنەوەیەکی زانستییانەی پوخت وەرگرن، کەسانی زۆر لەوان بەتواناتر لە بواری زانست و داهێناندا (وەك زۆرێك لە زانا ناسراوە ناموسوڵمانەکانی رۆژئاوا) دانیاننا بە موعجیزەی قورئاندا و شایەتیاندا کە ئەمە لەدانانی بەشەر نییە و لەسەروو تواناکانی مرۆڤەکانەوەیە.

## ووتەی هەندێك لە نەیارانی ئیعجازی زانستی و تەفسیری زانستی:[28]

دیاردەی رەتکردنەوەی ئیعجاز و تەفسیری زانستی هەمووی یان بەشێکی بریتیە لە بابەتێکی بیروبۆچوونی جیاواز کە سیفەتێکی بیرکردنەوەی مرۆڤە، لەوکاتەوە سەریهەڵدا کە هەندێك موفەسیر هەستان بە بەکارهێنانی زانستە گەردوونیەکان لە تەفسیرکردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا وەك پێشەوا فەخری رازی، ئەمیش لەبواری ئیجتیهاد و فراوانکردنی تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە باسی دیاردە گەردوونیەکان دەکات، ئەمەش بەلای ئەوانەوە دەرچوونە

---

٢٨بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم بابەتەی ئینتەرنێت: (الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة: أ. د. كارم السيد غنيم– موقع موسوعة الإعجاز العلمي– تاريخ المقال : ٢٠١٠/٦/٢١).ووتەی ئەو زانایانەی کە ئاماژە بۆ سەرچاوەکەی نەکراوە لەم بابەتەوە وەرگیراوە.

لـەو مەنهەجـە تەقلیدیـەی دەیناسـن بـۆ تەفسـیر، و زیادڕەوییـە لەبـەکارهێنانی زانیارییە زانستیەکاندا.

– (ابراهیم بن موسی النجمي) ناسراو بـە (شـاطیبی) (٧٩٠ك وەفـاتی كـردووە) لەكۆتایی سەدەی هەشتەمی كۆچی سەرمەشقی بزوتنـەوەی ڕەتكردنەوەكـە بـوو، كە ڕەخنەكانی لەسەر زیادڕەوی و لەسنوور دەرچوونە، تـا ئـەمڕۆش هەنـدێك زانـا بەهۆی ئەم زیادڕەویەوەیە كـە ئیعجـازی زانسـتی ڕەتدەكەنـەوە، بـەلاَم بابزانرێـت لایەنگرانی ئیعجاز و تەفسیری زانسـتیش داوادەكـەن كـە پرۆگرامێكـی هەمەلایەنـە دابنرێت بۆ هەڵسوكەوت و لێكۆڵینەوە لە قورئانی پـیرۆز و هـەموو زیادڕەویـەكیش لە تەفسیری زانستیدا ڕەتدەكەنەوە.

ئیمـامی (شـاطیبی) بـەناوبانگترین نـەیارانی پێشـووی ئیعجـازی زانسـتیە، زۆر كەسیش لەدوای ئـەو تـا ڕۆژگـاری ئـەمڕۆشمان كاریگـەر بـوون بـە بۆچـوونەكانی، لەكتێبی (الموافقات في أصول الشریعة)دا دەڵێـت: (إن كـثیراً مـن النـاس تجـاوزوا في الدعوی علی القرآن الحد، فأضافوا إلیه كل علم یذكر للمتقـدمین أو المتـأخرین: مـن علوم الطبیعیات والتعالیم والمنطق وعلم الحروف، وجمیع ما نظر فیه النـاظرون مـن هذه الفنون، وأشباهها، وهذا إذا عرضناه علی ما تقدملم یصح)، واتـە: "زۆر كـەس زیادڕەویـان كـردووە لەسـەر قورئـان و هـاتوون هـەموو زانسـتەكانی پێشـین و داهاتوویان بۆ زیادكردووە، لە زانستە سروشتیەكان و مەنتیق و زانستی ووشـەكان و زۆر هونەری تریان خستۆتە پاڵی، كە ئەم كارە ئەگـەر بـەراوردی بكـەین لەگـەڵ ئـەوەی پێشـتر باسمـان كـرد كـارێكی ڕاسـت نیـە"، هـەروەها لـە شـوێنێكی تـردا دەڵێت: "پێشینی ئەم ئوممەتە لە هاوەڵەكان و شوێنكەوتووانیان و دوای ئەوانیش شارەزاتر بوون بەقورئان و زانستەكانی و لەوانـەوە بەدەسـتمان نەگـەیوە كـە لـەم بابەتەدا قسەیان كردبێت".[29]

---

٢٩بڕوانە: الموافقات (٣/ ٦٢).

بـابزانین هـاوەڵان و تابیعییـەکان زۆر بـەووردی لـە قورئـان تێگەیشـتوون، لـە تەشـریعات و پەرسـتنەکان و لایەنـە رەوشـتیەکەی، هـەروەها لـە ئایەتـە گەردوونیەکانی قورئانیش تێدەگەیشتن و بەشێوەیەکی گشتی بـەبێ ووردەکـاریی لێکیان دەدایەوە لەژێر رۆشنایی مانا زمانەوانیەکانی ووشەکان، و هیچ پێویسـتیان بە چوونە ناو ووردەکاریی زانیارییـە گەردوونیـەکان نـەبووە چـونکە لـە سـەردەمی ئەواندا باسی نەبووە و لە رۆشنبیریی ئەو کاتەدا نەزانراوە.

سـەبارەت بـە ئیعجـازی قورئـانیش ئـەوان باوەڕیـان بـە ئیعجـازی رەهـای هەمەلایەنـەی قورئـان هـەبووە، چ لەلایـەنی زمانـەوانی و چ لایـەنی نـاوەڕۆك و بابەتیانەی، لە ئیعجازی زانستیشدا قـووڵ نەبوونەتـەوە لەبـەر شـارراوەیی ئامـاژە زانستیەکانی قورئان بۆیان لەو سەردەمەدا، و کەمیی ئەو زانستە سروشتیانەی کە لەسەر بنەمای دۆزینـەوەکان و توێژینـەوە زانسـتیەکان دامـەزراوە لـەو رۆژگـارەی ئەواندا.

ئەوەی تێبینی دەکرێت کە (شاطیبی) لە زانایانی سـەدەی هەشـتەمی کۆچـیە، کە تێیدا ئەم زانایانە پەیدابوون: (إبن الزملكاني) خاوەنی کتێبی (التبيان في إعجـاز القرآن)، (ابن تيمية) کە خاوەنی کتێبی (جواب أهل العلم والإيمان)ە لـە ئیعجـازدا و (محمد بن عبد الرحمن الخطيـب القـزويني) خـاوەنی کتـێبی {(تلخـيص المفتـاح في المعاني والبيان) وهو تلخيص لـ(مفتاح العلوم) لأبو يعقوب يوسف السكاكي}.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە شاطیبی زیادڕەوی کـردووە لـە داتەکانـدنی لایەنە بابەتیەکان لە قورئان بەشێوەیەکی گشتی، تەنانەت لە کتێبی (الموافقات)دا دەڵێت: کە شەریعەت نەخوێندەوارە (إن هذه الشـريعة أمّيـة لأمـة أمّيـة) و قورئـان تەنها لەو زانستانەی تێدایە کە هاوشێوەی زانسـتەکانی عەرەبەکانـە لـەو کاتـەدا و هەرئەوانیش لێی تێدەگەن.[30]

---

[30] بڕوانەکتێبی (مفهوم الإعجاز القرآني) (ص ٢٤٣).

لـەو کەسـانەی کـە وەڵامـی ئەمـەی داوەتـەوە (محمـد الصـادق عرجـون)ە کـە دەڵێـت: "ئیمـامی شـاطیبی ڕێچـکەیەکی نـامۆی گرتـووە کـە ناگونجێـت لەگـەڵ پلەوپایەی لە زانستدا، ووتەکەی دەربارەی نەخوێندەواری شـەریعەت وەرناگیرێـت چونکە هیچ پەیوەندیـەك نیـە لـەنێوان نەخوێنـدەواریی خـودی پێغەمبـەر (ﷺ) و فراوانی قورئان و شەریعەتەکەیدا".[31]

هـەروەها خـاوەنی کتـێبی (القـرآن یتحـدی) وەڵامـی ئـەم ووتەیـەی (شـاطیبی) دەداتەوە لە چەند ڕوویەکەوە:

١-بـەکارهێنانی سـیفەتی (الأميّـة) بـۆ شـەریعەت موجازەفەیـەکی بێبەڵگەیـە، چونکە قسەکەی ئێمە دەربارەی ئەو زانستانەیە کە لە قورئاندا هەیە و ئاشکراشـە کە زانستەکانی قورئان ناتوانرێت حەصر بکرێن لەبەرئەوەی ووتەی پـەروەردگارە، حەصر بوون سیفەتی ئێمەیە نەك قورئانی پیرۆز.

٢- هـیچ کەسـێك ئیـدعای ئـەوەی نـەکردووە کـە ووردەکارییـەکانی زانسـتە کەونیـەکان لـە قورئـان دەردەهێنێـت، وەك بیرکـاریی و فەلـەك، بـەڵکو گفتوگۆکـە لەوەدایە کە قاڵبوون لە زانستە کەونیەکاندا چەند ڕوویەکی ئیعجازی قورئانمان بـۆ دەردەخات کە لە سەردەمە کۆنەکاندا نەزانراوە.

٣- لەوانەیە هەندێك کەس کە ئـەم مەنهەجـە جێبـەجێ دەکـەن تووشـی هەڵـە بووبن و ئەمەش سیفەتی مرۆڤە لە هەموو مەسـەلەکاندا و مانـای بـوونی عەیبنییـە لـەم مەنهەجـەدا، بـەڵکو ئـەو کەسـانەن کـە بـە ناتـەواوی جێبـەجێی دەکـەن و زیادڕەوی دەکەن.[32]

---

٣١بڕوانە: نحو منهج لتفسير القرآن (ص٥٠).

٣٢بڕوانەکتێبی (القرآن يتحدى) دانراوی (عزالدين أحمد)- دار السعادة.

پێش ئەمیش شێخ (محمد الطاهر بن عاشور)[٣٣] کە یەکێکە لە موفەسیرە تونسیەکانی ئەم سەردەمە لە تەفسیری (التحریر والتنویر)دا وەلآمی داوەتەوە و دەڵێت: ووتەکەی (شاطیبی) (إن هذه الشریعة أمّیة لأمة أمّیة) زۆر لاوازە بەهۆی ئەم خاڵانە:

١- ئەوەی لەم قسەوە وەردەگیرێت ئەوەیە کە قورئان مەبەستی نەبووە عەرەب لە حاڵێکەوە بگۆڕێت بۆ حاڵێکی تر و ئەمەش راست نیە چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿تلك من أنباء الغیب نوحیها إلیك، ما كنت تعلمها أنت ولا قومك من قبل هذا..﴾ (هود: ٤٩)، ئەمەش ئاشكرا باسی ئەوە دەكات كە قورئان زۆر راستیی تێدایە کە خەڵکی سەردەمی پێغەمبەر نایانزانیوە و فێریان دەکات، کە بریتیە لە هەواڵە شارراوەکان لێیان و موعجیزاتەکان.

٢- مەبەستەکانی قورئان دەگەڕێتەوە بۆ گشتگیریی بانگەوازەکەی، کە موعجیزەیەکی زیندووشە، بۆیە پێویستە ئەو بابەتانەشی تێدابێت کە بۆ تێگەیشتنی ژیریی ئەو مرۆڤانە بشێت کە لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی زانستەکاندا دەژین.

٣- پێشینانی چاکمان ووتوویانەکە قورئان سەمەرەکانی کۆتایی نایەت، کە مەبەستیان لە ماناکانێتی، ئەگەر بەو شێوەیەش بوایە کە (شاطیبی) دەیڵێت ئەوا سەمەرەکانی پێشتر تەواو دەبوو بە حەصر بوونی جۆری ماناکانی.

---

٣٣(محمد الطاهر بن عاشور) (١٨٧٩- ١٩٧٢ز) زانایەکی ناسراوی تونسیە، لە زانکۆی (زەیتونە) خوێندوویەتی کە دواتر بوو بە یەکێك لە گەورەترین مامۆستاکانی، لە ساڵی (١٩٣٢ز) بوو بە موفتی تونس و پاشتریش بوو بە (شیخ الإسلام المالکي)، پاشان بوو بە سەرۆکی زانکۆی زەیتونە و بەهۆکاری سیاسی لابرا ساڵی (١٩٤٥ز)، دوای سەربەخۆیی تونس گەڕایەوە بۆ کارەکەی تا ساڵی (١٩٥٦ز)، خاوەنی چەندین دانراوی زانستیە لەوانە: (تفسیر التحریر والتنویر، أصول الإنشاء والخطابة، موجز علم البلاغة، ألیس الصبح بقریب، أصول النظام الاجتماعي في الإسلام، مقاصد التشریع الإسلامي، الوقف وآثاره في الإسلام).

٤- یەکێك لە خاڵەکانی تەواویی ئیعجازەکەی ئەوەیە کە بە چەند ووشەیەکی کەم ئەوەندە مانای لەخۆ گرتووە کە بەچەند بەرگێك لێکنادرێتەوە.

٥- ئەوانەی سەرەتا قورئان ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن لە مانا سەرەکی و بنەڕەتیەکەی تێدەگەیشتن، ئەوەشی لەم مانا سەرەکیەی زیادە لەوانەیە هەندێك کەسی تر تێیبگەن و هەندێکی تریش تێیناگەن.[٣٤]

بائێستاش بچینە سەر باسکردنی رای شێخ (محمد الغزالي) دەربارەی ووتەکەی (شاطیبی) کە دەڵێت[٣٥]:

"زۆر بابەتی گرنگ پێشتر باسکراوە وەك مەسەلەی نەخوێندەواری شەریعەت کە (شاطیبی) باسیکردووە، کە بریتیە لە مەسەلەیەکی خەتەرناك، چونکە ئەگەر بەرەهایی وەریگرین دەبێتەهۆی گەمارۆدانی ژیریی، ئایا مەعقولە کە ئەم نەخوێندەواریە بەردەوام بێت؟ یان تەنها قۆناغێکی کاتی عەرەبەکان بووبێت و دوایی کۆتایی هاتبێت و ئوممەت بووە میللەتێکی خوێندەوار و نووسەر و حیسابکەر، منیش وای دەبینم کە ئوممەت لە قۆناغێکی ژیانیدا نەخوێندەوار بووە و پاشان حاڵی دەگۆڕێت بۆ قۆناغێکی تر و دەبێتە ئوممەتێکی زانا و خوێندەوار، ئایا دەبێت ئوممەت تەنها هۆکارە ئوممیەکان بەکاربهێنێت لەتێڕوانینەکانی و بڕیاردان و زانستدا؟

ئوممەتمان لەمڕۆدا بووەتە خوێندەوار و نووسەر و ژمێریار، هەربۆیە بڕیاردان لەسەرئەوەی کە نەخوێندەواریی سیفەتێکی بەزۆر و هاوەڵی ئوممەتە باوەڕم وایە کە شتێکە ناگونجێت لەگەڵ سروشتی ژیان و بەردەوامیەکەیدا، هەروەها دژوارە لەگەڵ نەمریی پەیامەکە و توانای بۆ وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی رۆژگار.

---

٣٤بڕوانە (تفسیر التحریر والتنویر) دانراوی (محمد الطاهر ابن عاشور).

٣٥بڕوانە: کیف نتعامل مع القرآن: سلسلة قضایا الفکر الإسلامي (٥) – المعهد العالمي للفکر الإسلامي– ص ١٩٩– ٢٠٠.

بابەتی سووربوونی هەندێك زانا لەسەر ئوممەیت شتێکی سەرسوڕهێنەرە، کە ئەمە بووەتە هۆی وەستان لەسەر هەندێك تێگەیشتن و لانەدان لێیان،فەرموودەی (إنا أمة أمية لا تكتب ولا تحسب) مانای ئەوە نیە کە ئوممەت بە هەتاهەتایی نەخوێندەواربێت و نەنووسێت، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە لە دەستکەوتی زانستی بەدووربین کە یەکەم ئایەتێك دابەزی خوێندەواریی و وەرچەرخان بەرەو خوێندن و نووسینی پێویستکرد، هەروەها دەپرسین: دوای دابەزینی قورئان ئایا ئوممەت هەر بە نەخوێندەواری دەمێنێتەوە؟ بەڵێ سەرەتا نەتەوەیەکی ئوممی بووە، پاشانیشکە ئەم زانستە زۆر و چەند هێند و قووڵە لە قورئانی پیرۆزدا هات، ئیتر چۆن دوای ئەمە بە ئوممی دەمێنێتەوە؟! بێگومان ئەمە شتێکی مەحاڵە، ئەگەر بڕوانینە هەندێك ئایەت و فەرموودەی تر دەگەینە ئەم راستیە:

- (ولئن اتبعت أهواءهم بعد الذي جاءك من العلم ...) [البقرة: ١٢٠]، کە قورئانی بە زانست ناوزەد کردووە.

– کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە (ئوبەی کوڕی کەعب) کرد دەربارەی باشترین ئایەت لەلای ووتی: ئایەتی کورسیە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ليهنك العلم أبا المنذر)٣٦ واتە: ئەم زانستەت بەردەوام بێت و دڵخۆش بیت پێی.

– پەروەردگار دەفەرموێت: (وإذا جاءهم أمر من الأمن أو الخوف أذاعوا به ولو ردوه إلى الرسول وإلى أولي الأمر منهم لعلمه الذين يستنبطونه منهم) [النساء: ٨٣]، کەواتە عیلم و زانیاریی سیفەتی قورئانە، و سیفەتی ئەوانەشە کە پێوەی خەریکن، ئیتر چۆن دەووترێت ئوممەت نەخوێندەوارە لەگەڵ قورئاندا؟ ئەمە شتێکی مەحاڵە، بواری عیلمی خودایی و حیکمەتی خودایی لە قورئاندایە ئیتر چۆن دەووترێت شەریعەت نەخوێندەوارە!؟

---

٣٦رواه مسلم وأحمد.

عەرەبەکان لەو سەردەمەدا میللەتێکی نەخوێندەوار بوون، کە ئەم ئوممیەتە هەرگیز بەردەوام نابێت، ئەمە شتێکە، شتێکی تریش ئەوەیە کە ئەم گوتارە تەنها بۆ عەرەب نیە بەڵکو بۆ هەموو خەڵکیە، خوێندەوار وئەوانی تریش، هەروەها بۆ یەك سەردەمیش نیە بەتەنها، عەرەبەکان نەخوێندەواربوون، بەلاَم فارس و رۆمەکان رۆشنبیر بوون، کاتێکیش سەیری فارس و رۆمەکان دەکەین دەبینین لەو کاتەدا چەندین گومراییان هەبووە کە عەرەبەکان نەیانبووە و لەم بوارەدا ئەمان لەوان باشتربوون لەو نەخوێندەواری و نەفامیەشیاندا (الله أعلم حيث يجعل رسالته) (الأنعام: ١٢٤).

ووتەی پێغەمبەر (ﷺ): (إنا أمة أمية ...)٣٧ مانای ئەوەیە کە ئوممەت نووسین و ژماردن لە سەردەمێکی تایبەتیدا نازانێت، و مەبەست لەوە نیە کە بە بەردەوامی بە نەخوێندەواری بمێنێتەوە، قورئانیش گوتارێکی نەمرە و نەبەستراوەتەوە بە کات و زەمەنێکی دیاریکراوەوە، بیرۆکەی نەخوێندەواریی شەریعەت و سووربوون لەسەر مانەوەی قۆناغی دەشتەکی و بەردەوامبوونی مەقبول نیە و رەتدەکرێتەوە، ئوممەتێك کە پێشوازی لە قورئان کرد بێگومان ئوممیەتەکەی بە قورئان خۆی لاچوو، ئەگەربێتو قورئان رێنیشاندەرمان بێت بۆ سەرچاوەکانی زانیاریی نوێ ئیتر چۆن نەخوێندەوار دەبێت؟ ئەمە شتێکی وەلاخراوە.

قورئان تەنها بۆ عەرەبەکان دانەبەزی و بۆ کاتێکی دیاریکراویش نەبوو بەڵکو زیندووە بەتێپەڕ بوونی رۆژگار، ئیتر چۆن خاوەنانی دەستکەوتە زانستی و زانیارییەکان سوودی لێوەرگرن لە داهاتوودا ئەگەر تەنها بە گوتارێك بۆ نەخوێندەواران بدرێتە قەڵەم؟!

---

٣٧رواه البخاري ومسلم.

ئـەوەی مایـەی سەرسـوڕمانە ئەوەیـە کـە (شـاطیبی) لەگـەڵ توانـا عەقڵیـە بەرزەکانی لە دیاریکردنی مەبەستەکانی شـەریعەتدا هـەر ئـەوە کـە ئـەم قسـەیەی کردووە ! "[٣٨]

لێـرەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە گرنگیـدانی ئیمـامی شـاطیبی بەزانسـتەکانی قورئان و شەریعەت و پێشڕەویی لەم بوارەدا وایلێکردووە کە واز لەبواری ئیعجازی بابەتیانەی قورئان بهێنێت، لەوانەشە ئـەم رەتکردنەوەیـەی بـۆ ئیعجـازی زانسـتی پەیوەندی هەبووبێت بەو زیادڕەوی وئیسرافەی لەم بابەتەدا کراوە لەلایەن هەندێك لە موفەسیرەکانەوە و نەبوونی پرۆگرام و رێکخستن لەم لایەنەدا.

– (محمد رشید رضا) خاوەنی تەفسیری (المنار) بەپشت بەستن بـە ووتـەکانی شاطیبی تەفسیری زانستی رەتکردووەتەوە بـەهۆی زیـادڕەوی کردنـی هەنـدێك لـە موفەسیرەکان لەم بوارەدا، و وایدادەنێت کە مرۆڤ سەرقاڵ دەکـات لـە هیدایـەت و تەشریعاتەکانی قورئان و دەڵێـت: پێویسـتە لەسـەر ئەوانـەی کـە ئـەم رێڕەوەیـان گرتووە (وەك:الرازي) و شوێنپێ هەڵگرەکانی کە بەخۆیاندا بچنەوە، ئـەم رایانـەی خۆی لە سەرەتای (تفسیر المنار)دا باسکردووە.[٣٩]

بەڵام ئیعجازی زانسـتی رەت نەکردۆتـەوە و دەڵێت:(قورئـانی پـیرۆز زۆرێـك لـە نیشانەکانی دەسەڵاتی خودای دەرخستووە لە هەموو دروستکراوەکاندا لە بێگیـان و رووەك و گیاندار و مرۆڤدا، رۆژگارەکان نەیانتوانیوە هـیچ لەمانـە هەڵوەشـێنێت، قورئانی پیرۆز زۆر مەسەلەی زانسـتی و مێـژوویی لـەخۆگرتووە کـە لـە سـەردەمی هاتنە خوارەوەیدا نـەزانراوە و دوایـی دۆزرانـەوە بـەهۆی ئاشـکرابوونی سروشـتی

---

٣٨بروانە: کیف نتعامل مع القرآن– محمد الغزالي– ص ١٩٩– ٢٠٠.

[٣٩]بروانە: موقف الأصولیین والعلماء (قداماهم ومحدثیهم) مـن التفسـیر العلمـي– د.محمـد فتحـي الدریني– مجلة أسماء (١) هـ (١٩٨٨م).

گــەردوون و ســوننەتەکانی خــودا لــە دروســتکراوەکانیدا بــۆ لێکۆڵــەرەوان و توێژەرەوان).[٤٠]

– شێخ (محمود شلتوت) دەربارەی تەفسیری زانستی دەڵێت: " کۆمـەڵێك لـە رۆشنبیران کە هەندێك زانستی نوێیان وەرگرتووە پاشان سەیری قورئانیـان کـرد و لێکدانەوەیان بەشێوەیەك بۆ کرد کەوای لێکـردن بلـێن دەسـتکەوتێکی نوێمـان بـۆ قورئـان بەدەسـت هێنـاوە، ئەمـە بـووە هـۆی خراپبـوونی پەیوەنـدییان لەگـەڵ قورئاندا، کە ئەم تێڕوانینە بۆ قورئان بێگومان هەڵەیە لەبەرئەوەی خـودا قورئـانی نـەناردووە کـە کتێبێـك بێـت باسـی بیردۆزەکـانی زانسـت و وردەکارییـەکانی هونـەرەکان و زانیارییـە جۆراوجۆرەکـان بـۆ خـەڵکی بکـات، هـەروەها بێگومـان هەڵەیە" چونکە وا لە خاوەنەکانی دەکات کە مانای قورئان بەشێوەیەك بکـەن کـە وانیـە و پێچـەوانەیە لەگـەڵ ئیعجازەکـەی بەشـێوەیەك کـە زەوقـی راسـت قبـوڵی ناکات".

بەڵێ قورئان کتێبی هیدایەتـە و خـوای گـەورە نـەیناردووە بـۆ ئـەوەی خـەڵکی فێری مەسەلە گەردوونیەکان بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا کـە هاتووەتـە خـوارەوە چەندین ئایەتی تێدایە کە ئاماژە بە هەنـدێك بابـەتی کـەونی دەدات، کـە بێگومـان دەبێت باسـکردنەکە راسـت و ورد و دەرخـەری راسـتی بێـت، کـە ئەمـەش مانـای ئەوەیـە بێگومـان لـە قورئانـدا باسـی زۆر راسـتی زانسـتی کـراوە لـە دووتـوێی ئایەتەکانیدا.

– (عبـاس محمـود العقـاد) دەڵێـت: (داوانـەکراوە لـە کتێبـەکانی عەقیـدە کـە یەکبگرنەوە لەگـەڵ مەسـەلە زانسـتیەکاندا کاتێـك بـۆ هـەر نەوەیـەك بابـەتی نـوێ پەیـدابێت، و داوانـەکراوە لـە هـەڵگرانی کـە لـە کتێبەکانیانـدا وردەکـاریی ئـەو

---

[٤٠] بڕوانە: التفسـير العلمـي للقـرآن، بـين المجيـزين والمـانعين– محمـد أمـين ولدالشـيخ– المـؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي – إسلام أباد، ١٤٠٨هـ .

زانستانە دەربهێنن هەروەك چۆن لە تاقیگەكانی لێكۆڵینەوە و خوێندندا پیشانیان دەدرێت)، هەروەها دەڵێت:(كارێكی باشە كە سوود لە راستییە زانستیەكان وەربگیرێت بۆ راستكردنەوەی مانای ووشە قورئانیەكان بەبێ ئەوەی بەزۆر بخزێنرێنە ناو قورئانەوە) كە لێرەدا بەشەرمەوە رازییە لەسەر تەفسیری زانستی.

– (د.محمد حسین الذهبي) دەربارەی تەفسیری زانستی دەڵێت: بریتیە لەو كارەی كە دەستەواژەكانی قورئان ملكەچی زاراوە زانستیەكان دەكات و كۆشش دەكات بۆ دەرهێنانی زانستە جۆراوجۆراو بۆچوونە فەلسەفیەكان لەقورئانەوە، زیاتر كاریگەر بووە بە بۆچوونەكانی (شاطیبی) لەم بوارەدا كە رەخنەی لەوانە گرتووە كە زانستی پێشینان و پاشینانیان داوەتە پاڵ قورئان، لەگەڵ ئەوەشدا كە لە كتێبەكەیدا (التفسیر والمفسرون) بەتوندی وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە كە زیادرەوی دەكەن لە تەفسیری زانستیدا بەڵام لە قسەكانیدا دیارە كە دژی فیكرەكە نیە بەشێوەیەكی گشتی، چونكە لە كۆتایی نوسینەكەیدا دەڵێت: "تەنها ئەوەندەیان بەسە كە بزانن لە قورئاندا هیچ دەقێكی ئاشكرا نیە دژبێت لەگەڵ راستییەكی زانستیی جێگیردا، و ئەوەندە بەسە بزانن كە قورئان بەردەوام دەتوانرێت هاوئاهەنگ بكرێت و كۆبكرێتەوە لەگەڵ هەموو بیردۆز و یاسا زانستیەكان لە ئێستا و داهاتوودا بەو مەرجەی ئەو زانستە لەسەر بنەمایەكی راست دامەزرابێت و دۆزرابێتەوە".[٤١]

– (عبدالكریم الخطیب) لە بۆچوونەكانیدا كۆكردنەوەی كردووە لەنێوان وەرگرتن و رەتكردنەوەی ئیعجازی زانستیدا، ئەوەتا لە شوێنێكدا پشتگیریی دەكات ودەڵێت: (ئەو ئایەتانەی كە بۆ خەڵكی رووندەبێتەوە لە بوونەوەردا رێگا دەكەنەوە بۆ ووتنی قسەی راست دەربارەی كتێبی پەروەردگار، ئالێرەدا خەڵكی دەبینن كە ئەم قورئانە بریتیە لە راستیی هەتاهەتایی لەلایەن خوداوە، ئەگەر

---

[٤١] بڕوانە: التفسیر والمفسرون (٢/ ٣٢١-٣٢٣).

قورئان کتێبی عەقیدە و شەریعەت بێت ئەمە ڕێگر نییە لەوەی کە مەبەستی تری لەدواوە بێت کە ئەو کەسانەی بەدوایدا دەگەڕێن دەستیان دەکەوێت، هیچ زەرەر نیە بۆ قورئان کە لە پێکهاتەکەیدا بەڵگەی ئیعجازەکەی تێدابێت بەوەی کە خوای گەورە تێیدا داناوە لە نهێنی و ڕاستیەکان کە ئاخاوتن لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن لە هەموو سەردەم و نەوەیەکدا).

بەڵام لە شوێنێکی تردا ڕەتیدەکاتەوە و دەڵێت: (خاوەنانی تەفسیری زانستی زیادڕەوی دەکەن لە شێوازی تێگەیشتنیان لە کتێبی پەروەردگار و دەستکاری لێکدانەوەی ئایەتەکانی دەکەن بۆ ئەوەی بڵێن کە قورئان هەموو زانست وزانیارییەك لەخۆی دەگرێت، کە لەم کارەیاندا زوربەی کات زاراوەکان لە ماناکانی خۆیان دەردەکەن، هەندێك کەس لەوانەیە بڵێن: باشە ئەگەر قورئان هەموو نهێنیەکانی بوونەوەری لەخۆگرتووە ئەی باشە بۆ ئەمە شارراوە بوو لە پێشینانی ئەم ئوممەتە و هەستیان پێنەکرد، و ئەگەر هەستیان پێکردبێت ئەی بۆ سوودیان لێوەرنەگرت؟ ئەگەر قورئانیش بۆ ئەوە هاتبێت کە کتێبێکی زانستی بێت بۆچی بەم شێوازە خاوەن ئاوازە هات، بەڵکو دەبوایە بەشێوازی زانستی بهاتایە کەتێیدا ڕاستیە زانستیەکان بەقاڵبێکی تایبەتی زمانەوانی ڕێکدەخرێن هەروەك ژمارە بیرکاریەکان)[٤٢].

ئەم ڕاڕا بووە لەنێوان وەرگرتن و ڕەتدانەوەدا، هەڵوێستێکی هاوبەشە لەنێوان زۆرێك لە ڕەخنەگران لە ئیعجازی زانستی بەهۆی ڕوون نەبوونەوەی فیکرەکە لە مێشکیاندا، ئەو ڕەخنانەشی باسی دەکات تەنها جیدالێکی لاوازە چونکە لایەنگرانی ئیعجازی زانستی مەنهەج و چوارچێوەی تایبەتیان بۆ داناوە کە پابەندە بە زمانی قورئان و مانای ووشەکان، هەروەها تێگەیشتن و کۆکردنەوەی

---

[٤٢] بڕوانە: الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة:د. كارم السيد غنيم- موقع موسوعة الإعجاز العلمي- تاريخ المقال : ٢١/٦/٢٠١٠.

هەموو ئەوەی لە قورئاندا هاتووە لە راستیە زانستیەکان تەنها تایبەت نیە بەوانەی قورئانیان لە سەرەتادا بۆ دابەزی بەڵکو ئەمانە کۆمەڵێك زانیاریی و زانستن کە بەندەکانی پەروەردگار هەریەکە و بەپێی توانا و گونجان بۆی لێیان تێدەگات، موسوڵمانە یەکەمەکانیش ئەوەندەیان لێزانی کە گونجاو بوو لەگەڵ تێگەیشتن و توانا زانستیەکانی ئەو سەردەمە بەو ئەندازەیەی بۆ ئیمان و رێنموونیان پێویست بێت.

خوای پەروەردگاریش هەندێك لە نهێنی و راستیەکانی پاشەکەوت کرد بۆ ئەوەی بە ماوەی جیاواز دەریانبخات و بۆ ئەوەی هەموو نەوەیەك ئەوەی کە گونجاوە لەگەڵ سەردەمیاندا وەریبگرن بەو ئەندازەیەی کە ببێتە بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار و بەڵگە بۆ قورئانە مەزنەکەی، بەم شێوەیە قورئان بەرهەمی بەردەوام و هەمووکات قەناعەتدەر و هەمیشە خاوەن موعجیزە دەبێت، هەروەك چۆن پێشینە یەکەمەکان قەناعەتیان بە ئیعجازی زمانەوانی و دەربڕینی هێنا، ئەوانەی دوای ئەوانیش بە ئیعجازە زانستیەکەی قەناعەت پێدەکات بە بەردەوامی.

## گرنگی توێژینەوەکان دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا و سوودەکانیان لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەبیننەوە:[٤٣]

### ١- نوێکردنەوەی بەڵگەی پێغەمبەرایەتی لە رۆژگاری دۆزینەوە زانستییەکاندا:

خەڵکی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی خۆیان چەندین بەڵگەی ئاشکرایان لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتیەکەی بینی، و بۆیان دەرکەوت قورئان حەق و راستییە.

هەربۆیە لەمڕۆدا پەروەردگار موعجیزەیەکی نوێی قورئانی دەرخستووە کە دەگونجێت لەگەڵ رۆحی سەردەمدا و بریتیە لە ئیعجازی زانستی، کە خەڵکی ئەمڕۆ بۆ زانست زیاتر لە هەموو شتێك ملدەنێن بە جیاوازی وڵات و نەتەوەکانیانەوە، توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی بە ویستی پەروەردگار بەهێزترین و ئاشکراترین بەڵگە نیشان دەدەن بۆ هەر کەسێك کە بەدوای هەق و راستیدا بگەڕێت، و لە هەمان کاتدا باوەڕی باوەڕداران بەهێزتر و زیاتر دەکات [وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً] (الأنفال:٢)« واتە: کاتێك ئایەتەکانی ئێمە بەسەر ئیمانداراندا بخوێنرێتەوە ئەوا ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات.

### ٢- راستکردنەوەی ڕێڕەوی زانستی تاقیکاریی لە جیهاندا:

خوای پەروەردگار داوای تێڕوانینی لە دروستکراوەکان کردووە، و بە ڕێگایەك داینراوە بۆ ناسینی خۆی و پێغەمبەرەکەی و باوەڕپێهێنانیان، بەڵام خاوەنی ئاینە دەستکاریکراوەکان (گاور و جوولەکە) دژایەتی زانستیان کرد و ڕێگاکانیان بە

---

[٤٣] بڕوانە: تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة – من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة بإسلام آباد–باكستان – ١٩٨٧ز – ص ٣٢.

پووچەڵ دادەنا و رابەرانی زانستیان تووشی ئەشكەنجە دەكرد، هەربۆیە ئەم زانستە تاقیكاریانە شالاوی هێرشیان كردە سەریان و دژایەتیان كردن و درۆ و دەلەسەكانیان بۆ جیهان ئاشكرا كرد، ئیتر مرۆڤایەتی كەوتە گێژاوەوە و سەرگەردان بوو و دەستی كرد بە گەڕان بەدوای ئاینی راستدا، ئەو ئاینەی كە هانی مرۆڤایەتی دەدات بۆ گەڕان بەدوای زانستدا و زانستیش رێنومایی مرۆڤەكان دەكات بۆ لای ئەو.

موسوڵمانان لەمڕۆدا دەتوانن بێنە پێشەوە بۆ راستكردنەوەی رێڕەوی زانست لە جیهاندا و دانانی لە شوێنی راستی خۆیدا، كە بریتیە لە رێگایەك بۆ باوەڕهێنان بە پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی و سەلماندنی راستی قورئان و بەڵگەیەك بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام و شایەتێك بۆ دەستكاری كردنی ئاینەكانی تر.

مرۆڤایەتی پێویستی بە ئاینی راست هەیە بۆ ئەوەی رزگاری بكات لەوەی كە بەسەریدا هاتووە لە خاڵی بوونی رۆحەكان و فەوتانی هەستەكان و ناڕەحەتی ژیان، پێویستی بەو ئاینە هەیە كە ئاین و زانست، و ماددە و رۆح كۆدەكاتەوە، و یاسا و رەووشت و خۆشبەختی لە دونیادا و پاداشتی چاك لە پاشەرۆژدا دەستەبەر دەكات، لە هەمان كاتیشدا پێویستی بە بەڵگەیەكی زانستی هەیە كە راستی ئەم ئاینەی بۆ بسەلمێنێت، كە لە توێژینەوەكانی ئیعجازی زانستیدا ئەم وەلامەی دەستدەكەوێت.

ئەوەی كە دڵخۆشی دەبەخشێت لەرێی گەیشتن بەم ئەنجامەدا ئەوەیە كە ژمارەیەكی زۆر لە زانایانی گەردوونیی سەرڕاست و دادپەروەر هەن، كە دوودڵی نانوێنن لە دەربڕین و ئاشكرا كردنی ئەوەی كە قەناعەتی پێدەكەن لە راستییەكان، كە ئەمان خاوەنی ووتەی بیستراون لە وولاتانی خۆیاندا، و لەوانەشە كە هۆكانی راگەیاندن هۆكارێك بن بۆ گەیاندنی ئیمان و زانست بۆ خەڵكی ئەو وولاتانە.

### ٣- تێگەیشتنی باشتر و فراوانتر لە دەقەکانی قورئان و سوننەت:

قورئان و سوننەتی پیرۆز بۆ ئەوە هاتوون کە ئێمە بەپێی توانا لێیان تێبگەین و کاریان پێبکەین.

دەقە گەردوونیەکان لە قورئاندا ناتوانرێت بەڕاستی و تەواوەتی لە ماناکانیان تێبگەین تەنیا لە چوارچێوەی زمانەوانیدا، بەڵکو پێویست دەکات کە ئەم زانستە تاقیکارییە نوێیانە بڕەخسێنرێن، و لەژێر ڕۆشنایی راستیە زانستیەکاندا دەتوانین بە تەواوەتی لە مانا و مەبەستی دەقە پیرۆزەکان تێبگەین، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە لە سەردەمانی کۆندا خەڵکی بە تەواوەتی لە هەندێك دەقی قورئان و سوننەت تێنەدەگەیشتن کە باسی دیاردە گەردوونیەکان دەکات، بەڵام بابشزانین کە ئەم تێنەگەیشتنە ئەگەربووبێت هیچ زیانێکی ئەووتۆی لە بیروباوەڕ و دەرهێنانی ئەحکامەکان نەداوە .

### ٤- چالاك کردنی موسوڵمانان بۆ ئەنجامدانی دۆزینەوە گەردوونییەکان بەهۆی پاڵنەرە ئیمانیەکەوە:

بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی پەروەردگار جۆرێکە لە پەرستن، و لە هەمان کاتدا بیرکردنەوە لە مانای ئایەت و فەرموودەکانیش هەر جۆرێکە لە پەرستن، و گەیاندنی بە خەڵکی برینیە لە بانگەواز کردن بۆ لای خودا، کە ئەمانە هەمووی دێنەدی لە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستیدا، کە خۆی لەخۆیدا هاندەرێکە بۆ موسوڵمانان بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی گەردوون بە پاڵنەرێکی ئیمانیەوە، کە هیوادارین ببێتە هۆی پەرینەوەمان لەو سەردەمی دواکەوتنەی کە ماوەیەکی زۆرە تێیدا دەژین.

بەدڵنیاییەوە دەڵێین کە توێژەرەوە موسوڵمانەکان لە ووتەکانی پەروەردگاردا دەربارەی نهێنیەکانی دروستکراوەکان بە ئەندازەی ئەوەندە دەدۆزنەوە کە ببێتە

هۆی ڕێنومایيکەريان لە توێژینەوەکانیاندا و یارمەتیدەريان بێت بۆ نزیکبوونەوە لە ئامانجەکانیان و بەفیڕۆنەدانی هەوڵ و کۆششیان لە شتی بێسووددا.

## ٥- بەهێزکردنی بانگەواز بۆ ئیسلام بە بەکارهێنانی بابەتەکانی ئیعجازی زانستی:

بەکارهێنانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بریتیە لە گونجاوترین ڕێگا بۆ بانگەواز کردن بۆ بەرنامەکەی پەروەردگار لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کە سەردەمی پێشکەوتنی زانستییە و خەڵکی بەهۆی زانستەوە فریو دراون و وازیان لە ئاین هێناوە.

هەروەها دەتوانین بەهۆی ئەم زمانی زانستەوە وەلامی ئەو هێرشەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا بدەینەوە کە بۆ سەر ئیسلام دەیکەن و بیسەلمێنین کە ئیسلام کۆتایین بەرنامە ئاسمانیەکانە و تەنها ئەمە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤەکان نێردراوە، ئەویش بە بەڵگەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

# چەند وەڵامێك بۆ ڕەخنەگرانی موسوڵمان دەربارەی ئیعجازی زانستی[٤٤]

**ڕەخنەی یەکەم:**

بریتیە لەو ووتەیەیان کە قورئانی پیرۆز کتێبی ڕێنموونی و تەشریعە و کتێبێکی زانستی و زانیاریی گەردوونی نیە، بابزانرێت کە هەموو ئەوانەی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەن لە ئیعجازی زانستیدا باوەڕیان وایە کە قورئان کتێبێکی عەقیدە و پەروەردە و تەشریعە، و زۆر دوورە لە باسکردنی زانست بەشێوەی پرۆگرامێکی فێرکردن، هەروەها باوەڕیان وایە کە ئایەتە قورئانیەکانی بابەتە گەردوونیەکان تەنها بۆ ئەوە هاتوون کە سەرنج رابکێشن بۆ پێکهاتەکانی ئاسمان و زەوی و پاڵپشت بن بۆ باوەڕهێنان بەخودای بەدیهێنەر و دروستکەر و ئەندازە بۆ دانەر، لەبەرئەوەی کە قورئان بە هەق و ڕاستی دابەزیوە لەلایەن خودای زانا و شارەزاوە ئەوا دەبێت هەڵگری ڕاستیەکان بێت، و تەنها بریتی نیە لە چەند دەستەواژەیەی دارێژراوی وەسفی کە باسی ڕواڵەتی شتەکانی کردبێت.

بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیە دەڵێین: یەکێك لەلایەنە گرنگەکانی هیدایەتی خودا بۆ مرۆڤەکان لە قورئاندا بریتیە لە هاندانیان بۆ بیرکردنەوە و تێڕوانین لە دروستکراوەکانی گەردوون، ئایا حیکمەت چیە لە هەموو ئەو ئایەتانەی باسی دیاردەکانی کەون دەکات؟

هەموو ئەم دیاردە و دروستکراوانە شایەنی ئەوەن مرۆڤ لێیان بڕوانێت و بیربکاتەوە لە گەورەیی دەسەڵاتی دروستکەرەکەیان بۆ ئەوەی بگاتە قۆناغی

---

[٤٤] بڕوانە: بابەتی: الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة: الدكتور كارم السيد غنيم، هەروەها بابەتی: المعارضون للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (مناقشة الآراء ودحض الحجج)– د. كارم السيد غنيم– موقع موسوعة الإعجاز العلمي– تاريخ المقال : ٢٠١٠/٦/٢١.

ترسان و خۆپارێزی، کە ئەگەر ئەو کەسە لە کەسانی پسپۆڕ بوو لەزانستدا ئەم ترسانە دەگاتە ئەوپەڕی و خۆشەویستی پەروەردگار دڵ ودەروونی پڕدەکات.

ئەو بیرە لاوازەی کە قورئان کتێبی هیدایەتە و پەیوەندی بە زانستە گەردوونیەکانەوە نیە بۆچوونێك پەرەی پێدا کە دەڵێت باسکردنی قورئان بۆ دیاردە گەردوونیەکان پەرش وبڵاوە لەناو ئایەت و سورەتە جیاوازەکاندا، بەپێچەوانەی نوسراوە زانستیەکان و لەمەوە وتیان کە ئەم بەشانەی بابەتەکان پەیوەندیان بەیەکەوە نیە.

ئەوەی لەم کەسانە شاراوەیە ئەوەیە کە ئەم جیاکردنەوەیە مەبەستی لەپشتەوەیە و حیکمەتێکی گەورەی قورئانە، چونکە ئەم ئایەت و بەشە پەرش وبڵاوانەی هەر بابەتێکی زانستی لەقورئاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بابەتە زانستیەکانیش بەشێوەی جوزئیات و بەش بەش راستیە زانستیەکانیان دەچەسپێت بەهۆی توێژینەوەکانەوە و پاشان لەم بەشە پەرش وبڵاوانەوە زانستەکان کۆدەکرێنەوە و بنەما و یاساکانیان جێگیردەبێت.

**رەخنەی دووەم:**

ئەو وتەیەیانە کە دەڵێت: گرنگیدان بە ئیعجازی زانستی خەڵك دوور دەخاتەوە لەگرنگیدان بە زانستە تەقلیدیەکانی قورئان، و تەفسیری زانستی پێچەوانەیە لەگەڵ پرۆگرامی تەفسیر کردن.

ئیعجازی زانستی لەوە دەرناچێت کە روویەك بێت لە رووەکانی ئیعجازی قورئان، و لێکۆڵینەوە لەبارەیەوە بریتیە لە زیادکردنێك و دەوڵەمەند کردنی زانستەکانی قورئان، ئەوانەشی پێوەی سەرقاڵن کۆمەڵێك زانان کە هاوکاری هەموو ئەوانەی ترن کە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەن لە زانستەکانی قورئاندا، هەموو یەکێکیش لە بوارەکەی خۆیدا کاردەکات بەبێ ئەوەی کاریگەریی خراپی بۆ سەر

ئەوی تر هەبێت یان خۆی بەسەریدا هەڵکێشێت، ئەمەش بۆ ئەوەی دیاردەی چڕکردنەوەی مەعریفی روونەدات کە بووە هۆی فەرامۆشکردنی زۆر لایەنی ئیعجاز بەتایبەتی لایەنی ئیعجازی زانستی.

سەبارەت بە تەفسیری زانستیش هیچ جۆرە دژبەیەکیەکی نیە لەگەڵ تەفسیری تەقلیدیدا، بەڵکو دەوڵەمەند کردنێتی و فراوان کردنی تێگەیشتنمانە دەربارەی قورئانی پیرۆز، بەتایبەتی لەو ئایەتە کەونیانەی کە پێشتر لە گێژاوی تەئویلی ماناکانیان و مەجاز و دانەپاڵی رووداوەکانی رۆژی دواییدا بوون.

**رەخنەی سێیەم:**

بریتیە لە تاوانبارکردن بە پابەند نەبوون بە مانا زمانەوانیە راستەکانی دەقە قورئانیەکان، و دوورخستنەوەی ووشە قورئانیەکان لە ماناکانیان بەو شێوەیەی کە بە ملکەچ کردنی ئایەکان (ليّ أعناق الآيات) ناسراوە کە ئەمە دەستەواژەیەکە بەردەوام رەخنەگرانی ئیعجازی زانستی دووبارەی دەکەنەوە.

شتێکی زانراوە کە چەندین یاسا و پرۆگرام و رێکخەر وسنوور هەیە پێویستە ئەوانەی بە ئیعجازی زانستی و تەفسیری زانستی قورئانەوە سەرقاڵن پابەندی بن، کە لە گرنگترینیان: رێزگرتنە لە سەرجەم بابەتە زمانەوانیەکان، زۆر پێویستیشە کە زانایانی گەردوونیی و زانایانی دین و زانایانی زمانەوانی هاوکاربن لەو لێکۆڵینەوە قورئانیانەدا لەگەڵ پابەندبوون بەو پرۆگرامی لێکۆڵینەوەیەی لەسەری رێککەوتوون، ئەگەر کەسانێکیش هەبن کە لەم یاسا و رێکخەرانە دەردەچن ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوانەی پابەندن بە مەنهەجیەتی لێکۆڵینەوە قورئانیەکان.

**رەخنەی چوارەم:**

قورئانی پیرۆز بۆیە دابەزی بۆ ئەوەی عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلام لێی تێبگەن، ئێمەی موسوڵمانیش دەبێت شوێنپێی ئەوان هەڵگرین لە تێگەیشتنیان بۆ

ئایەتـەکان بـەپێی مانـای ووشـەکانی، لەبەرئـەوەی ئـەوان عـەرەب بـوون و ئـەوان شارەزاتر بوون بە زمانی خۆیان و مانای ووشەکانی لـە ئێمـە، ئیعجـازی زانسـتیش زەرەر دەدات لە بەلاغـەت و رەوانبێـژی قورئـان، لەبەرئـەوەی ئـەو کەسـانەی کـە قورئان گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن کاتی دابەزینی ئەگـەر ئـەم مانایانـەیان نەزانیایـە ئەوە مانای ئەوەیە کە قورئان رەوانبێـژ نیـە چـونکە بـاری ئـەو کەسـانەی قسـەی لەگـەڵ کـردوون بەهەنـد وەرنـەگرتووە، ئەگـەر خـەڵکیش پێشـتر ئـەم مانایانـەیان بزانیایە ئەی بۆچی راپەڕینی زانستی عەرەب لەو رۆژەوەی قورئان دابەزی دەستی پێنەکرد، ئەینالێن قورئان زانستی پێشینەکان وداهاتووشی تێدایە؟!

**وەڵام:**

١- قورئانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابەزیوە تـا رۆژی دوایـی بـە جیـاوازی رۆشنبیریی و زانیارییان، کاتێکیش گفتووگۆ لەگەڵ هەموو ئـەم ژیریبانـەدا دەکـات هەر کەسە و بـەپێی توانـای خـۆی سـوودی لـێ وەردەگرێـت، ئەگـەر ژیریـەکانیش بێتوانـابوون لـە تێگەیشـتنی مانـای هەنـدێك لـە ئایەتـەکان ئـەوا پێویسـتە پشـت ببەستین بە گەورە زانا و لێکۆڵەرەوان چـونکە پـەروەردگار دەفـەرموێت: (فاسألوا أهـل الـذكر إن كنـتم لا تعلمـون) [النحل: ٤٣]، زۆر جـاریش زانایـانی فیقــە و لێکۆڵەرەوان چەندین یاسا و حوکمیان لـە ئایەتەکانـەوە دەرهێنـاوە کـە خـەڵکانی پێشـین نـەیانزانیوە، ئـەویش لەبەرئـەوەی قورئـان: (ولاتنقضي عجائبه) وەك لـە فەرموودەدا هاتووە.

٢- یـەکێك لەلایەنـەکانی ئیعجـازی قورئـان بریتیـە لـەوەی یـەك دەسـتەواژە چەندین مانا دەبەخشێت، کـە لەوانەیـە هەنـدێکیان لـە سـەردەمێکدا دەرکـەوێت و هەندێکی تریشی لە زەمەنێکی داهاتوودا دەردەکەوێت لەگـەڵ بـەرەوپێش چـوونی دۆزینـەوە زانسـتیەکاندا و پێویسـتە لەسـەر زانایـانی موسـوڵمان لـە هـەموو

سـەردەمێکدا کـە ئـەم مانایانـە بـۆ خـەڵکی روونبکەنـەوە بـەپێی ئـەو زانسـت و زانیاریانەی لەبەردەستیاندایە.

٣- کاتێـك زانیـاریی و زانسـتە گـەردوونی و سروشـتیەکان بـەکاردەهێنین بـۆ روونکردنـەوەی ئایەتـە قورئانیـەکان و دەرخسـتنی لایـەنی گـەورەیی و ئیعجازیـان ئـەوا ئێمـە بـەم کارەمـان وەك کـاری زمانەوانـەکان و رەوانبێـژان دەکـەین، خـۆ لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەکارهێنانی زانستە زمانەوانیەکان لـە دەرخسـتنی رووەکـانی ئیعجـازی قورئانـدا نـەبووە و سـەردەمانی دواتـر پەیـدابوو، کـە هـەموو زانایان کۆکن لەسەر بەکارهێنانیان بۆ روونکردنەوەی لایەنەکانی ئیعجازی قورئان، کەواتە بۆچی ئێمە رێبدەین بە زانایانی زمانەوانی و رێنەدەین بە زانایانی گەردوون و سروشـت کـە زانسـتەکانیان بخەنـە خزمـەتی دەرخسـتنی لایەنـەکانی ئیعجـازی زانستی ئایەتە گەردوونیەکان لەقورئاندا؟!

مامۆستا (عمر عبيد حسنه) دەڵێت[45]: " یەکێك لە ترسـناکترین ئـەو دەردانـەی تووشی ژیریی مرۆڤی موسوڵمان بـووە و رێگربـووە لـە تێـڕوانین و شـکاندنی کـۆت وبەندەکان و هێنانەدی تێڕوانینی گشتگیری قورئان و بەکارهێنانی بـۆ چارەسـەری ئێستا و درێژبوونەوە بۆ داهاتوو، ئەو وەهم وخەیاڵەیـە کـە ئـەو بنـەما فیکریانـەی پێشـتر لـە قورئانـەوە وەرگـیرا لـە سـەردەمی یەکەمـدا ئـیتر کۆتـایی هەوڵەکانـە و تێگەیشـتن لـە دووریـەکانی دەقـەکان بەمانـەوە بەسـتراوە لـە هـەموو شـوێن و سـاتێکدا، کـە ئەمـە مایـەی گـەمارۆدانی دەقـە قورئانیەکانـە و کورتکردنـەوەی تێگەیشتنە لێی بە سەردەمێکی دیاریکراوەوە و بەندکردنی ژیریەکانە بـەتێڕوانینی ئەو سەردەمە و کۆت وبەند کردنی عەقڵە و ترساندنە لەبیرکردنـەوە، ئەمـە رێگـری لە مرۆڤ دەکات کە تێبفکرێت و تێبڕوانێت بەو شێوەیەی دەقە قورئانیەکان خۆیـان داوایدەکـەن، ژینگـەی شـوێنکەوتن و تـەقلیـد بووەتـە میراتمـان و بووەتـە هـۆی

---

[45] بڕوانە: (كيف نتعامل مع القرآن: الشيخ محمد الغزالي – المعهد العالمي للفكر الإسلامي– ص ١٦.

پەكخستنی ئیجتیهاد و كۆشش و داهێنان و دەستكەوتەكانمان بۆ چەندین سەدە، تەنانەت لە ئاستی هەڵس وكەوتیش نەماوین لەگەڵ قورئاندا و لە سوننەتەكانی تێناگەین لە ئاسۆكان و نەفسەكاندا، وكورتمان كردۆتەوە لەلایەنە فیقهی و تەشریعەكانی، بەڵام ئایەتەكان چەندین مەبەستیان هەیە: پەروەردەیی و كۆمەڵایەتی و دەروونی و گەردوونی و هۆكارەكانی دۆزینەوەی زانستی، كە لایەنی تەشریعی تەنها یەك لایەنی ئەم مەبەستانەیە".

٤- لەلایەكی ترەوە بابزانین كە هاوەڵەكان و پێشینان لەم ئامـاژە زانستیانەی قورئـان تێدەگەیشتن، بۆ نموونە كە پەروەردگار دەفەرموێت: (مرج البحرين يلتقيان، بينهما برزخ لايبغيان) (الرحمن: ١٩) كە مەبەست پێی ئاوی سوێرە چونكە بەحر بە رەهایی لە قورئاندا بەمانای ئاوی سوێر هاتووە، (مرج) بە مانای (خلط) واتە تێكەڵی كردن ، (بينهما برزخ) واتە بەربەستێك لەنێوانیاندایە، (لا يبغيان) واتە (لا يطغيان) واتە بەسەریەكدا زاڵنابن، هەربۆیە هاوەڵەكان لەوە تێدەگەیشتن كە دوو ئاوی سوێر هەیە كە تێكەڵدەبن بەربەستێك لەنێوانیاندایە كە نابێتە هۆی زاڵبوونیان بەسەریەكدا، ئەم رستەیە بە ووشەكانیەوە لای هاوەڵان و موفەسیرانی پێشین زانرابوو، بەڵام شێواز و چۆنێتیەكەیان نەدەزانی لە دەریاكاندا، چونكە زۆر راستیی هەیە لەگەڵ تێپەربوونی كاتدا چۆنێتیەكەی دەزانرێت، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: (بل كذبوا بما لم يحيطوا بعلمه ولما يأتهم تأويله) (يونس:٣٩) واتە بێباوەڕان ئەو شتانەیان بەدرۆ دەخستەوە كە زانیارییان پێی نەبووە و بۆیان دەرنەكەوتووە، (ولما يأتهم تأويله) (بمعنى: بيان كشفه) واتە: بینینی دەركەوتنی، هەروەها كە پەروەردگار دەفەرموێت: (وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ)، (نبأ) لێرەدا مەبەست پێی تەئویل و روونبوونەوەی رووداوەكەیە، ئایا ئەم (نبأ) هەواڵە چیە؟ بریتیە لە بینین و دڵنیابوون، وەك چۆن پەروەردگار لە چیرۆكی (یوسف) علیه السلام بۆمان باس دەكات كە پێشتر خەوێكی بینیبوو بەڵام كە خەوەكەی هاتەدی

فـەرمووی (هذا تأويل رؤياي من قبل ...) واتـە ئەمـە هاتنـەدی خەوەکەمـە کـە بەچاوی خۆمان بينيمان، کەواتە تەئويل لێرەدا بەمانای هاتنەدی هاتووە.

کەواتە بابزانين مانای هەموو ئايەتەکان کراوە و موفەسيرەکان هيچ ئايەتێکيان بـەبێ راڤـەکردن بەجێنەهێشـتووە، بـەڵام دەرکـەوتنی راسـتی هەنـدێ ئايـەت و بينينيان بەتێپەڕبوونی کات روودەدات، تەنانـەت هەنـدێك ئايـەت هەيـە کـە خـەڵك نايـانزانن چـۆنە تـاوەکو نـەيانبينن، جـا چ لـە دونيـا يـان لـە دوارۆژدا بێـت، موفەسيرەکان هەوڵی زۆر باشياندواە لە تێگەيشتنی ئايەتـە گەردوونيـەکان بـەپێی زانيارييـەکانی رۆژگـاری خۆيـان، تەنانـەت گەيشـتوونەتە زانينـی هەنـدێك راسـتی زانستی پێش دۆزينەوەی، بۆ نموونە (ئيبن عەبباس) لە تەفسيری ئايەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبيـاء: ٣٠) بڕياری ئەوە دەدات کە ئاسمانەکان و زەوی پێکـەوە بـوون پاشـان جياکرانـەوە، ئەمـە پـێش ئـەوەی کـە خـەڵکی ئەمـە بدۆزنـەوە بـە ١٤٠٠ساڵ، ئەوەی ئێمە زيادمان کـردووە تـەنها ئەوەيـە کـە ئـەم راسـتيە زانسـتيە لەمڕۆدا بۆ ئێمە سەلماوە و شوێنەوارەکەيمان بينيوە، ئيتر ئەمە مانـای ئـەوە نيـە کە ئێمە لەوان باشتر و زاناترين.

کەواتە ئێمە هەندێك لەم زانستە لەوانـەوە وەردەگرين و بـەس ئەوەنـدە هەيـە ئێمە دەيانبينين لەمڕۆدا.

## رەخنەی پێنجەم:

بريتيە لە ترسان لە بەستنەوەی نێوان تەفسـيری قورئـان و بابەتـە گەردوونيـە بەردەوام گۆڕاوەکان، کە کاردەکاتە سەر راستگۆيی قورئان.

ئێمە ئەم ترسە لـە پەرۆشـيەوە بـۆ قورئـان دەبيـنين، و دەڵـێين: ئەوانـەی بـە تەفسيری زانستی قورئانەوە خەريکن پابەندن بـە بـەکارهێنانی زانيارييـە زانسـتيە

جێگیر و دامەزراوەکان کە گەیشتوونەتە قۆناغی راستیی و دڵنیایی و وەك یاسایان لێهاتووە یان بیردۆزە زاڵبووەکانن، تەنانەت ئەگەر گۆڕانکاریش لەو زانیاریانەدا رووبدات هیچ زەرەرێکی بۆ قورئان نیە، چونکە ئەم جۆرە تەفسیرە کۆشش و ئیجتیهادێکە لە راڤەکردندا و دەتوانرێت بە راڤەکردنێکی تر راست بکرێتەوە لەژێر تیشکی زانیارییە نوێکاندا، بینیویشمانە کە دەقە قورئانیەکان هەموو ئەو دۆزینەوە نوێیانەی لەخۆگرتووە، چونکە دەقە قورئانیەکان بەکۆمەڵێك زاراوەی گشتگیر هاتوون کە هەموو مانا راستەکانیان لەخۆگرتووە، و ئەوە دوای ئەوە بۆ مرۆڤەکان دەردەکەوێت.

بابزانین کە روونکردنەوەی ئەمە هەر لە قورئان خۆیدا هەیە کە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ ...) کە دەرکەوتنی راستیەکانی بە بینین و سەیرکردنەوە بەستووەتەوە، چونکە هەر راستیەك کە کەوتە بواری بینینەوە ئیتر گومانی تێدا نامێنێت، کەواتە زەمانەتەکە بریتیە لە بینین، بۆنموونە بەربەستی نێوان دەریاکان ئەمڕۆ بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە بینراوە و پێوانەی بۆدەکرێت، هەرچەندێکیش زانست بەرەوپێش بچێت بینین و سەیرکردن بەجێگیریی دەمێنێتەوە و هیچ کاتێك زانست نایەت بڵێت بەربەستی نێوان دەریاکان بوونی نیە.

کەواتە ئیعجاز و تەفسیری زانستی بەو راستیە زانستیانە دەکرێت کە بینراوە و جێگیربووە.

ئەوانەی بە زانستەکانی قورئانەوە سەرقاڵن دەزانن کە تەفسیر کردنی قورئان هەوڵێك و کۆششێکی مرۆڤە هەربۆیە موفەسیرەکان زۆر جار جیاوازن لە تەفسیر کردنی هەندێك ئایەتی قورئان بەهۆی جۆراوجۆریی مانای وشەکان، بۆ نموونە: دەربارەی {وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ} (الطور:٦)، هەندێك دەڵێن بەمانای: (المملوء) واتە دەریای لێوانلێو، هەروەها لە ماناکانی تری بریتیە لە: (الملتهب) واتە دەریای

سوتێنراو یان کڵپەگرتوو[٤٦]، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا سەلماوە لەڕووی زانستییەوە کەبنی دەریا و زەریاکان بەهۆی بوونی هەزاران گڕکان کە بە بەردەوامی ئاگر و ماددەی تواوە دەکەنە دەرەوە بۆ ژێردەریاکان بەفیعلی داگیرساوە و سووتێنراوە، کە بە بەکارهێنانی ژێردەریاییە پێشکەوتووەکان لەمڕۆدا توانراوە تەنانەت وێنەی ئەم دیاردەیەش بگیرێت، (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ( ٤٨٧-٤٨٨ ) لە هاوپێچی وێنە ڕەنگاوڕەنگەکان** )، کە ئەمە ماناکەی تری ئایەتەکە دەسەلمێنێت و ئیعجازی زانستی ئەم ئایەتە دەردەخات.

یان جیاوازیەکە لەوانەیە بەهۆی یاسا نەحویەکانەوە بێت، جیاوازی لە تەفسیر کردندا هۆکاری زۆرە لای موفەسیرەکان کە لە تەفسیرەکانیاندا ڕەنگیداوەتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا کەس ڕەخنەی لەم جیاوازیە نەگرتووە یان داوای کردبێت کە تەفسیرکردن بوەستێت.

---

٤٦ يقول إمام المفسرين محمد بن جرير الطبري ماملخصه (أغلبُ معاني السَّجْرِ وأولاها معنيان الإيقادُ والامتلاءُ ثم رجح أن المَسْجُوْرَ: معناه المملوء وقال: لأنَّ البحرَ غيرُ موقدٍ اليومَ! !) (تفسير الطبري ٢٢/٤٥٩)، وأشار ابن كثير(رحمه الله) " واختلف في معني المسجور فقال بعضهم المراد أنه يوقد يوم القيامة نارا كقوله تعالي: وإذا البحار سجرت أي أضرمت فتصير نارا تتأجج محيطة بأهل الموقف كما روي عن علي وابن عباس، وقال قتادة: المسجور المملوء، وذكر صاحبا تفسير الجلالين (رحمهما الله) (والبحر المسجور) أي المملوء وذكرا أنه قول قتادة. وقالا: قال مجاهد: الموقد، وقال صاحب الظلال (رحمه الله) كلاما مشابها يشير إلي أن البحر المسجور هو المملوء بالماء في الدنيا، وذكر صاحب صفوة البيان لمعاني القرآن: (غفر الله له) في تفسير قول الحق (تبارك وتعالى): (والبحر المسجور) ما نصه: أي المملوء ماء، يقال: سجر النهر، ملأه، والمراد: أي أوقدت نارا، من سجر التنور يسجره سجرا، أحماه، وذكر أصحاب المنتخب في تفسير القرآن الكريم: إن البحر المسجور هو المملوء. قال الشوكاني رحمه الله: أي الموقد من السجر وهو إيقاد النار في التنور، وممن قدم ذكر هذا القول: القرطبي وأبوحيان والبغوي والخازن والرازي والشنقيطي وغيرُهم، قال صاحب المحرر و الوجيز: وإلى هذا يعود القول الأول لأن قولهم (سَجرْتُ التَّنُّورَ) معناه: ملأتَها بما يحترقُ ويتقدُ، وقال أبوحيان: ولا ينافي ما قاله مجاهد: لأن سَجرتُ التَّنور معناه: ملأته بما يحترق.

زۆرێك له موفەسیرەكان لەكاتی راڤەكردنی ئایەتە گەردوونیەكاندا پەنادەبەنە بەر تەئویل یان مەجاز یان بە چەند زانیاریەكی سادە راڤەیان دەكەن، كاتێكیش پسپۆڕانی زانستە گەردوونیەكان هاتن و بە تەواوەتی لە ئایەتەكان تێگەیشتن تەفسیریان كردن بەبێ تەئویل، و بەئاشكرا مانا راستەكانیان دەرخست كە لەگەڵ زانیاریی و قەناعەتی مرۆڤی سەردەمدا دەگونجێت.

دڵنیاین كە هیچ ترسێك نیە لە گۆڕانی زانیارییە گەردوونیەكانی بەكارهاتوو لە تەفسیردا، لەبەرئەوەی دەقە قورئانیەكان جێگیر و پارێزراون، هەر هەڵەیەكیش لە تەفسیردا پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ راڤەكاران بەبێئەوەی كار لە راستگۆیی قورئان بكات، تەفسیریش گۆڕانكاریی بەسەردا دێت لەبەرئەوەی هیچ تەفسیرێكی جێگیر نیە كە موسوڵمانان بەدرێژایی سەردەمەكان لەسەری كۆكبووبن، تەنها ئەوانە نەبێت كە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمانگەیوە.

ئەگەر بشڵێین خۆ خەریك كردن بە ئیعجازی زانستیەوە موسوڵمانان دوور دەخاتەوە لە هەوڵدان و داهێنانی زانستی و تەكنیكی وپێشكەوتن لەبوارە زانستیە جۆراوجۆرەكاندا، ئەوا دەڵێین: كە زوربەی ئەوانەی هەوڵدەدەن لەبوارەكانی ئیعجازی زانستیدا كەسانێكی زانستین كە شایەتیی توانای زانستیان بۆ دراوە لەبواری پسپۆڕیاندا، چەند زانایەكن كە ئەگەربێتو هاوئاهەنگی لەنێوان كارەكانیاندا بكرێت و بواری تەواویان بۆ برەخسێت وەك چۆن لە رۆژئاوا (شوێنی كۆچكردنیان) بۆیان دەرەخسێنن، ئەوا دەیانتوانی شارستانیەتێكی زانستی و تەكنیكی گەورە بخوڵقێنن كە رابوردووی درەوشاوەی ئوممەتیان دەبەستەوە بەداهاتوویەكی گەشاوەی چاوەڕوان كراوەوە، زوربەی ئەو زانایانەی لەئیعجازی زانستیدا كاردەكەن یان لە دەرخستنی لایەنێكیدا داهێنان دەكەن خاوەنی پلەیەكی بەرزی رەوشتی ئیسلامین و عەقڵیەتێكی زانستی فراوان و بیرێكی تەكنیكی سەركەوتوو و هەستێكی دینی بەرزن.

**رەخنەی شەشەم:**

ئەوەیە کە دەڵێن ئیعجازی زانستی یان تەفسیری زانستی هیچ سوودێکی نیە، لەراستیدا ئەم رەخنەیە زۆر سادە و سەتحیە چونکە لێکۆڵینەوە لە ئیعجازی زانستیدا پەیوەستە بە راستیەکەوە کە پێویستە روونبکرێتەوە، کە ئەمە کارێکی پێویستە لە هەموو لقەکانی مەعریفەدا بەتایبەتیش کە پەیوەندی بە قورئانی پیرۆزەوە هەبێت کە موعجیزەی ئیسلامە، سوودەکانی زانینی ئیعجازی زانستیش زۆرە بەتایبەتی لەبواری عەقیدە و بیروباوەڕدا و بواری بانگەواز کردن و قەناعەت پێکردن لەم سەردەمەی رۆشنبیریە زانستیەکاندا.

دەربارەی تەفسیری زانستیش بێگومان لێکدانەوە و روونکردنەوەی ئایەتە گەردوونیەکانی تێدایە کە دەبێتە تێگەیشتنێکی راست بۆیان دوور لە گێژاوی تەئویل و لێکدانەوەی رووکەشیانە، ئەمەش دەبێتە زیادبوونی تێگەیشتنی راستمان بۆ قورئانی پیرۆز کە شتێکی گرنگ وداواکراوە.

**رەخنەی حەوتەم:**

دەڵێن ئیعجازی زانستی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، نە بەڵگەی نەقڵی و نەبەڵگەی عەقڵی، و پێغەمبەر (ﷺ) هیچ باسی ئەمەی نەکردووە.

دەربارەی بەڵگەی ژیریی زۆر ئاشکرایە و لەکەس شاراوە نیە، بریتیە لەوەی قورئانی پیرۆز چەندین ئایەتی گەردوونی لەخۆگرتووە کە باسی چەندین راستی و ئاماژەی زانستی دەکات کە پێشتر نەووتراوە و لەکاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا نەزانراوە، پاش تێپەڕبوونی سەدان ساڵ و لەسەردەمی نوێدا بە تایبەتی زانایانی گەروون ـ چ موسوڵمان بن یان نا ـ توانیان بیان ناسنەوە و تەئکیدیان کرد لەسەر یەکگرتنەوەیان لەگەڵ دۆزینەوەکاندا و ئەمەیان ئاشکرا کرد لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی زانستی جیهانیدا، و لە توێژینەوەکانیاندا تۆماریان کردن و بەمە

بابەتەكە ناسرا و جێگیربوو، و دەیان كتێب دەربارەیان نوسرا لەبواری ئیعجازی زانستیدا.

بەڵگەیەكی عەقڵی و نەقڵی تر لە باوەڕبوون بە موعجیزەی قورئانەوە سەرچاوەی گرتووەو چونكە ئەگەر قورئان موعجیزەكەی رەهابێت، بۆچی تەنها دەیبەستنەوە بەلایەنی زمانەوانی و رەوانبێژی و لایەنی بابەتیانەی دەشارنەوە؟ ئەگەر باوەڕیان بە لایەنی ئیعجازی بابەتیانەی قورئان هەبێت بۆچی دەبێت تەنها چەند بابەتێكی زانیاریی لەخۆبگرێت و بابەتەكانی تر فەرامۆش بكرێت؟ ئەی بۆچی راستیە گەردوونیەكانی دەشارنەوە و لایەنی ئیعجازی زانستی ئینكار دەكەن؟!

ئەوەش كە دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئیعجازی زانستی نەكردووە بەوە رەتدەكرێتەوە كە خۆی دووپاتی كردووەتەسەر موعجیزەی رەهای قورئان و هاوەڵەكانیش باوەڕیان پێبووە، ئیتر نەچوونەتە ناو ووردەكاریی لایەنەكانی ئیعجاز، پاشانیش زانایان هاتن لەدوایدا و لێكۆڵینەوەی دوورودرێژیان دەربارەی قورئان كرد لەوانەش لایەنەكانی ئیعجازەكەی.

هەروەها هیچ حیكمەتێكی تێدانەبووە كە پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئیعجازی زانستی بۆ هاوەڵەكانی بكات چونكە رۆشنبیریی ئەوكاتە ئەمەی هەڵنەدەگرت، و زانیارییە گەردوونیەكان و راستیە زانستیەكان بۆ هەموو جیهان نەزانراوبوو، ئەگەر باسی ئەمەی بۆ بكردنایە دژواریی بۆ ژیرییان دروستدەكرد.

پێغەمبەریش (ﷺ) سوور بووە لەسەرئەوەی بەپێی توانا عەقڵی و ژیرییەكانی خەڵكی سەردەمی خۆی قسەبكات، هەربۆیە وازی لە هاوەڵان هێنا كە بۆخۆیان و بە بەكارهێنانی مانا زمانەوانی و ناسراوەكان لە ئایەتە گەردوونیەكان تێبگەن، و ئەوەی بۆ روونبوونەوەی زانستی و دۆزینەوە گەردوونیەكان جێهێلا كە لایەنی ئیعجازی زانستی قورئان دوای ماوەیەك دەربخات، ئەمەش دوای تێپەڕبوونی زیاتر

لە ١٠٠٠ ساڵ هاتـەدی، و خـوای پـەروەردگاریش راسـتی فـەرمووە: (وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَحِينٍ).

**ڕەخنەی هەشتەم:**

دەڵـێن باشـە ئەگـەر ئیعجـازی زانسـتی بـۆ زانـا گەردوونیـە ناموسـوڵمانەکان ئاشکرابووە، ئەی بۆ ئەوانە موسوڵمان نەبوون؟

دەرکەوتنی راستیە زانسـتیەکان لەسەردەسـتی زانایـانی رۆژئـاوا نوقسـانیە بـۆ موسـوڵمانان خۆیـان نـەك بـۆ قورئـان، چـونکە ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ کتـێبی موفەسیرەکان شتی زۆر سەیر دەبینـی، دەبینـی موفەسـیری سـەدەی یەکـەم یـان دووەمی کۆچی بەشێوەیەك باسی راستیەکانی گەردوون دەکات وەك پسپۆڕێك لەم بوارەدا چونکە شارەزایە لە زانستەکانی سەردەمی خـۆی، و هـەموو ئـەو شـتانەی پەیوەسـتە بەبابەتەکەیـەوە ولەبەردەسـتیدایە لێـی تێگـەیوە، ئابـەم شـێوەیە موسـوڵمانان بـوون بـە سەرمەشـقی زانسـت لـە سـەردەمی خۆیانـدا، بـەڵام کاتێـك موسـوڵمانان خـەویان لێکـەوت لەکاتێکـدا پـەروەردگار داوای بیـنین و تێفکرینیـان لێدەکات {قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ...} (یونس١٠١) ئـەوەبوو خـەڵکی تر پێشیدانەوە لە زانستدا، بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆدا سەرەتاکانی پێشکەوتنەوەی موسـوڵمانان لـە زانسـت و تەکنـەلۆجیادا دەرکـەوتووە کـە داواکـارین پـەروەردگار بەرەکەتی تێبخات.

هەر لـە ئایەتـە پیرۆزەکـەی (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ ...) وەڵامـی ئـەوەمان دەسـت دەکـەوێت کـە بۆچـی راسـتیە زانسـتیەکان لەسەردەسـتی زانـا ناموسوڵمانەکان دەدۆزرێنەوە، چونکە ئەم ئایەتە رووی کردۆتە بێباوەڕان و خوای گەورە دەریخستووە کە ئەوان راستیەکان دەدۆزنەوە کە دەفـەرموێت: (سَنُرِيهِمْ..) واتە پیشانی ئـەوانی دەدەین و نەیفـەرمووە (سنریکم ...) واتـە پیشـانی ئێـوەی

دەدەین، کەواتە ئەم ئایەتە ئیعجازێکی غەیبیشی تێدایە کە هەواڵیداوە بێباوەڕان و ناموسوڵمانان سەرمەشقی دۆزینەوەی زانستی دەبن و ئایەتەکانی خودا دەبینن لە ئاسۆکانی گەردوون و لەشی مرۆڤدا، و بەهۆیەوە بۆیان دەردەکەوێ کە قورئان هەق و راستیە.

لەلایەکی ترەوە ئەو زانا ناموسوڵمانانەی کە بە ئیشارەتە کەونیەکانی قورئان ئاشنابوون و لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کرد، کاتێک لەژێر تیشکی زانیاریەکانی خۆیاندا لێیان کۆڵیەوە دانیاننا بەوەدا کە ئەم زانیاریانەی لە قورئاندا هاتووە مەحاڵە زانیاریی مرۆڤ بووبێت لەکاتی دابەزینی قورئاندا، و لەدەرەوەی توانا عەقلیەکانی مرۆڤەکانی ئەو کاتەدایە، هەندێکیان لێرەدا وەستان و ئیعجازی زانستیان بە نیگای خوداییەوە نەبەستەوە، کە ئەم باوەڕهێنانە بابەتێکی ئاڵۆزە و پێویستی بە ئامادەکاریی دەروونی تایبەتی هەیە، لەگەڵ بوونی تەوفیق و رێنموونیی خودایی: (إنك لا تهدي من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء) [سورة القصص]، (وجحدوا بها واستيقنتها أنفسهم ظلماً وعلواً...) [سورة النمل].

ئەمەش ئەو رەتناکاتەوە کە زۆر زانای تریش هەبوون قەناعەتیان بەوە کردووە کە ئەم ئاماژانە لە سەروو توانای مرۆڤەکانەوەیە و باوەڕیان بە قورئان هێنا کە نیگا و وەحی خوداییە و موسوڵمانبوونی خۆیان ئاشکراکرد، جا چ لە کۆنگرەکانی ئیعجازی زانستی قورئان یان غەیری ئەم شوێن وکاتانە.

**رەخنەی نۆیەم:**

دەڵێن ئەگەر قورئان ئەم هەموو ئامارە زانستیانەی تێدایە ئەی بۆچی موسوڵمانان بەدرێژایی سەدەکان سوودیان لێوەرنەگرتووە لەرووی پێشکەوتنی زانستیەوە؟ بۆ وەڵام دەڵێین:

١- موسوڵمانانی پێشوو کە باوەڕیان بە ئیعجازی رەهای قورئان هەبووە سەرقاڵی لایەنی زمانەوانی بوون کە ئەمە وای لێکردن گرنگی بە ئیعجازی

بابەتیانـەی قورئـان نـەدەن، هـەروەها تێگەیشـتنیان لـە قورئـان زیـاتر لـەڕووی زمانەوانیەوە بوو کە بەلایانەوە بەسبوو بۆ تێگەیشتنی مەبەستەکانی قورئـان بـۆ دەرخستنی گەورەیی دەسەلاتی پەروەردگار.

٢- ئاماژە زانستیەکان لە ئایەتە گەردوونیەکانی قورئانـدا ئەوەنـدە ئاشـکرانین کە کەسانی ناپسپۆڕ لە زانستە گەردوونیەکاندا بتوانن بەئاسانی لێی تێبگـەن، زۆر ئەسـتەمیش بـووە بـۆ موسـوڵمانە پێشـینەکان بـە بـەکارهێنانی زانیاریـەکانی سەردەمی خۆیان وەك چەند ئاماژەیەك بۆ زانستەکان لێیان بکۆڵنەوە.

٣- ئـەو ڕێـڕەوە زانسـتیەی بـۆ تێگەیشـن لـە ئامـاژە زانسـتیەکانی قورئـان بەکاردەهێنرێت لە دەقەکانی قورئانەوە دەست پێناکات و لـەوێوە لـە تاقیگەکانـدا بکرێتە بواری توێژینەوە، بەڵکو لە دۆزینـەوەی راسـتیە گەردوونیەکانـەوە دەسـت پێدەکات لەسەر دەستی زانایان -جا چ موسوڵمان بن یان ناموسوڵمان- و پاشـان بەرەو ئایەتەکان دەڕوات کە ڕاڤەیان دەکات و یەکدەگرێتەوە لەگەڵیان، کـە ئەمـە راستگۆیی بـەڵێنی خـودایی (وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَحِينٍ) دەردەخـات، هـەروەها ئەمـە یـەکانگیرە لەگـەڵ سـوننەتی خـودایی لـە سـەرەتا پیشـاندانی راسـتیەکانی گەردوونبۆخەڵکی کە بەهۆیانەوە راستیی قورئانیشـیان بـۆ دەردەکـەوێت (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِيأَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ)، کەواتە توێژینەوەی زانسـتی لـە گەردوونی بینراوەوە دەست پێدەکات و پاشان بەرەو ئایەتـە نوسـراوەکانی خـودا کـە قورئانـە دەڕوات و ماناکـانی ڕاڤـە دەکـات، کـە ئەمـە بـە تەفسـیری زانسـتی ناسراوە.

٤- زۆرباشە ئەگەر بتوانرێت بەپێچـەوانەی ئـەم ڕێـڕەوەوە بـڕۆین، بـەوەی لـە ئامـاژە زانسـتیەکانی قورئانـەوە دەسـت پێبکـەین و پاشـان بـە توێژینـەوە بیانسەلمێنین و راستیە زانستیەکانیان لێـوە وەرگرین، کـە بێگومـان ئـەم ڕێـڕەوە توانایەکی ماددی زۆر گەورەی دەوێت، بەڵام ڕێڕەوەکەی تر زۆر لەمە ئاسانترە کە

لــە دۆزینــەوە گەردوونیەکانــەوە دەســت پێبکــەین و پاشــان بــەرەو ئامــاژە زانستیەکانی قورئان بڕۆین بۆ ڕۆشنکردنی ڕاستیەکانیان.

ئیتر بە هەریـەکێك لـەم دوو ڕێڕەوەدا بـڕۆین ئـەوا خزمـەتی ئیعجـازی زانسـتی قورئان دەکەین، کە ئەمیش دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ئیمان بە موعجیزەی قورئان و ڕاستگۆییەکەی بەوەی کە لە پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) دابەزیوە.

### ڕەخنەی دەیەم:

ئەوەیە کە دەڵێن ئیعجازی زانستی شـەرتی بەرامبـەرکێ (تەحـەددا)ی لەگەڵدا نیە و لە هاوشێوەی ئەو شتانە نیە کە ئەو کەسانەی سەرەتا بۆ تەحەددای ئـەوان نێردراوە تێیدا شارەزابوون.

بابزانرێت کە ئیعجازی زانستی شەرتی تەحەددای هێنانی هاوشێوەکەی تێدایە، هەروەها موعجیزە تەنها لەسـەر بنـەمای تەحـەددا و پەکخسـتن نـەهاتووە، بـەڵکو بەوەش جێبەجێ دەبێت کە تاقانە بێت و لە شتی ئاسایی بچێتە دەرەوە کە ئەمە دەیسەلمێنێت لەلایەن خـوداوە بـۆ پشـتیوانی پێغەمبەرەکـەی هـاتووە، ئیعجـازی زانستیش ئەم مەبەستەی هێناوەتەدی بەتایبـەتی لـە سـەردەمانی دوای دابـەزینی قورئـان، لەبەرئـەوەی قورئـان وەك موعجیزەیـەك بـۆ هـەموو خـەڵکی لـە هـەموو زەمانێکـدا هـاتووە، لـەکاتی دابەزینیـدا تەحـەددای عەرەبـەکانی بـە زمانـەوانی و ڕەوانبێژی کرد کە ڕووەیەکی ئیعجازەکەیەتی، لە سەردەمی پێشکەوتن لە زانسـتە گەردوونیەکاندا ئیعجـاز لـە قورئانـدا لـەو ڕاسـتیە زانسـتیە پێشـتر باسـنەکراوانەدا دەرکـەوت کـە قورئـان ئامـاژەی بـۆداون، کەواتـە ئیعجـازی زانسـتی تـەنها بـۆ تەحـەددای ئەوانـە نـەبوو کـە بۆیـان دابـەزی بـەڵکو بـۆ ئـەوەبوو کـە خـەڵکانی سـەدەکانی دوای ئـەوان بەهۆیـەوە شـایەتی بـدەن کـە قورئـان نیگایەکـە لەلایـەن خوداوە نێردراوە، ئەمەش مەبەستی ئیعجازە.

## ڕەخنەی پانزەیەم:

ئەوەیە کە دەڵێن ئەو زانیارییە گەردوونیانەی لە قورئاندا هاتووە لەشێوەی ئەو زانیاریانەیە کە خەڵکی بەگشتی دەیزانن، وەك: بەدوای یەکدا هاتنی شەووڕۆژ و جووڵەی خۆر کە ئەمە ئیعجازی زانستی تێدانیە.

بابزانین کە ئەو زانیاریانەی دەربارەی دیاردە گەردوونیەکان لە قورئاندا هاتووە زۆر جیاوازە لەوەی کە خەڵکی دەیزانن و ئاشکرایە، بۆ نموونە: دیاردەی بەدوای یەکداهاتنی شەووڕۆژ خەڵکی دەیزانن بەڵام کاتێك قورئان باسی دەکات بەشێوەیەکی زانستی وورد دەیهێنێت بە بەکارهێنانی هەندێك ووشە کە ئیعجازە زانستیەکە لەخۆدەگرێت کە نەزانراوبوو بۆ پسپۆڕانیش پێش دۆزینەوەی، پەروەردگار دەفەرموێت: (يكوّر الليل على النهار ويكوّر النهار على الليل) [الزمر:٥]، هەروەها دەفەرموێت: (وآية لهم الليل نسلخ منه النهار فإذا هم مظلمون...) [يس:٣٧]، هەروەها دەفەرموێت: (تولج الليل في النهار وتولج النهار في الليل...) [آل عمران: ٢٧].

لێرەدا (تكوير) بریتیە لە چەمانەوەی شەووڕۆژ بەسەریەکدا لەکاتی بەدوای یەکداهاتنیاندا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ خڕێتی زەوی، (نسلخ) واتە داماڵینی ڕۆژ لە شەو لەکاتی بەدوای یەکداهاتنیان، کە ئەم دیمەنە تەنها کەشتیەوانانی بۆشایی ئاسمان لەکاتی گەشتیان بۆ دەرەوەی بەرگەهەوای زەوی بینیان.

نموونەیەکی تر بریتیە لەجوڵەی ئاشکرای خۆر کە خەڵك دەیبینن لە خۆرهەڵاتن و خۆرئاوادا، بەڵام قورئان کە باسی دەکات باسی جووڵەیەکی ڕاستەقینە دەکات بۆ خۆر کە دەفەرموێت: (والشمس تجري لمستقر لها ذلك تقدير العزيز العليم) [يس:٣٦]، کرداری (الجري) مانای ئەو جووڵە رووکەشیە نیە کە خەڵك دەیبینن بەڵکو چەند جووڵەیەکی گەورەی ترە کە زانایان لەم سەردەمەماندا دۆزیویانەتەوە.

هەروەها موفەسیرەکان دەربارەی: {وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ} (الطور:٦)، کە پێشتر باسمانکرد بە دوو مانا لێکیانداوەتەوە وەك ئیمامی (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا بۆمان باسدەکات: "أغلبُ معاني السَّجْرِ وأولاها معنيان (الإيقادُ والامتلاءُ)، ثم رجّح أن المسْجُوْرَ: معناه المملوء، وقال: لأنَّ البحرَ غيرُ موقدٍ اليوم!"[٤٧]، واتە: ئەم ئایەتە بە دوو مانا هاتووە: دەریای لێوانلێو و پڕ، لەگەڵ دەریای سوتێنراو، پاشان ئەوە دەڵێت کە مانای (دەریای لێوانلێو و پڕ) راستترە چونکە دەریا لەمڕۆدا (واتە لە رۆژگاری ئەواندا) دانەگیرساوە و نەسوتێنراوە، کەواتە موفەسیرانی پێشین زیاتر بە دەریای لێوانلێو و پڕ لێکیانداوەتەوە چونکە لە رۆژگاری ئەواندا هەرئەوەیان بینیوە کە دەریا پڕ و لێوانلێوە.

بەڵام ئێمە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ووردیی ئەم فەرموودەیەی پەروەردگارمان بینیوە و بۆمان روونبۆتەوە کە دەریاکان سووتێنراویشن، چونکە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا بنکی دەریا و زەریاکان ژمارەیەکی زۆر گڕکانیان تێدایە کە لە ژمارەی گڕکانەکانی سەر رووی زەوی زۆر زیاترن، ئەمە کارێکی وا دەکات لە زۆر شوێندا بنکی دەریا و زەریاکان داگیرساو و سوتێنراوبن، هەروەها لە زۆر شوێنی بنی دەریا و زەریاکاندا سەرچاوەی گەورەی ئاوی گەرمی لەکوڵ هەیە کە بەهەمان شێوە دەبنە هۆی داگیرسان و کوڵانی بنی دەریا و زەریاکان[٤٨]. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە (٤٨٧-٤٨٨) لە هاوپێچی وێنە ڕەنگاوڕەنگەکان**).

کەواتە سەرنجی رەخنەگرانی ئیعجازی زانستی رادەکێشین بۆ ئەو جیاوازیە گەورەیەی لە نێوان زانیارییە گشتیەکانی خەڵك و ئاماژە گەردوونیەکانی قورئاندا هەیە، بۆ ئەوەی لە مەفهومی ئیعجازی زانستی تێبگەین.

ئەم نموونەش کە باسمان کردن لەوانەن کە خەڵك رووکەشەکەی دەزانن بەڵام لە قورئاندا چەندین ئاماژەی زانستی زۆری تر هەیە کە پسپۆڕانیش لێیان شارراوە بووە، دەبا رەخنەگران ئاگاداربن ....!!!

---

[٤٧] تفسير الطبري (٢٢/٤٥٩).

[٤٨] بڕوانە: کتێبی(حديث إن تحت البحر نارا ومطابقة ذلك للحقائق العلمية) – ص ٦.

تەفسیر لە زمانی عەرەبیدا[49] بەمانای (الإیضاح والتبیین) هاتووە، واتە: روونکردنەوە و دەرخستن، لە (فَسَّرَ)ەوە هاوتووە بە مانای (الإبانة والکشف) واتە دەرخستنی شتێکی شاراوە، لە زاراوەی زانایاندا تەفسیر بریتیە لە روونکردنەوەی ووتەی پەروەردگار کە قورئانە و دەرخستنی شاراوەکانی.

(التأویل) لە قورئاندا بە دوو مانا هاتووە: بە مانای (تەفسیر کردن) واتە: تێگەیشتن لە زاراوە و ووشە قورئانیەکان، وەك چۆن پێغەمبەر دوعای بۆ (ئیبن عەبباس) کردووە: (اللهم فقّهه في الدين وعلّمه التأويل)٥٠، واتە: خودایە تێی بگەیەنە و شارەزای بکە لە دین و تەفسیری قورئاندا، هەربۆیە پێشینان بەزۆری ووشەی (تەئویل) بۆ تەفسیر بەکاردەهێنن، ئەوەتا (ابن جریرالطبري) لە زۆر شوێنی تەفسیرەکەیدا لەهێنانی قسەی راڤەکاراندا دەڵێت: (یقول أهل التأویل...)، واتە: خەڵکی تەفسیر دەڵێن ....

تەفسیر کردنی قورئان دوو رێڕەوی سەرەکی هەیە وەك زانایان لێی دواون: (التفسیر بالمأثور) بریتیە لە راڤە کردنی قورئان سەرەتا بە دەقەکانی تری قورئان پاشان بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و ووتەی هاوەڵەکان و تابیعەکان.

هەروەها (التفسیر بالرأي) تەفسیر کردن بەراوبۆچوونی زانایان یان تەفسیری عەقڵی کە بریتیە لە هەوڵ و ئیجتیهاد کردنێکی راست بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئان لەلایەن موفەسیرەوە دوای بەدیهاتنی چەند مەرجێك تێیدا، و شارەزابوونی بە چەند زانستێك، کە گرنگترینیان زمانەوانی زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی ووشەکانی زمانی عەرەبیە، هەروەها زانایان بوونی (الموهبة) واتە توانایەکی خۆیی بە مەرجێك دەزانن[51].

---

٤٩بڕوانە: القاموس المحيط ج٢ ص١١٠، لسان العرب ج٦ ص٣٦١، البحر المحيط ج١ ص١٣.

٥٠ رواه أحمد والبخاري.

٥١بڕوانە: التفسير والمفسرون (د. محمد حسين الذهبي)، ج١ ص١٠٢.

ئـەوەی ووتـەی وەرگـیراوە لای زانایـان ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) هـەموو قورئانی پیرۆزی تەفسیر نەکردووە کە ئیتر ئێمە پێویستمان بە ووتەی خـەڵکی تـر نـەبێت، بـەڵکو بەشـێکی روونکردووەتـەوە بەتایبـەتی لـەو شـوێنانەی کـە مایـەی جیاوازی و ناکۆکیە[٥٢] .

ووتەی هـاوەڵانیش کـەمێکی بەراسـتیی گەشـتوەتە دەسـتمان و ئـەوانیش زۆر ووتـەیان بەدەمـەوە هەڵبەسـتراوە لـە تەفسـیرکردنی قورئانـدا، هەربۆیـە جـۆری دووەمی تەفسیر پێویستی تەواوی خۆی هەیە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان.

لەلایەکی ترەوە لەگەڵ ئەوەی لە قورئانـدا لـە زیـاتر لـە هـەزار ئایەتـدا ئامـاژە دراوە بە یاسا گەردوونیـەکان و پێکهاتـەکانی و ژینگـەی زەوی و بنـەماکانی ژیـان لەسەری و زیندەوەرەکانی کراوە، لەگەڵ هـاتنی هـەموو ئـەم ئایەتـە گەردوونیانـە لەرۆژگاری زانستە گەردوونیەکاندا هەندێك کەس ئینکاری لە مانـا راسـتەکانی ئـەم ئایەتانە دەکەن، و هەوڵدەدەن پشتیان لێهـەڵبکرێت وەك ئـەوەی کـە نـەهاتبن لـە قورئاندا ..

تەفسـیری زانسـتی قورئـان دەچـێتە جـۆری دووەمـەوە کـە تەفسـیرکردنە بـە بۆچوون (الرأي)، جا ئەگەر ئەو کەسەی کە تەفسیر دەکات لە زانایان و شارەزایان بێت ئەوا تەفسیرێکی وەرگـیراوە، و ئەگـەر کەسـەکە ئـەهلی زانسـت نـەبێت ئـەوە تەفسـیرەکەی زەمکـراوە، تەفسـیری زانسـتی بریتیـە لـەو تەفسـیرەی کـە زاراوە زانسـتیەکان بـەکاردەهێنێت بـۆ لێکدانـەوەی دەسـتەواژە قورئانیـەکان و کۆشـش دەکات بۆ دەرهێنانی ئاماژە زانستییە جۆراوجۆرەکان لێیەوە[٥٣] .

---

٥٢(البزار) لە (عائشـة)ی خێزانـی پێغەمبـەرەوە (رەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویـەتی: (پێغەمبـەر ﷺ تـەنها چـەند ئایـەتێکی دیـاریکراوی بـۆ هاوەڵـەکان تەفسـیر کـردووە کـە جبریـل فێریکردووە)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (تفسیر المحرر والوجیز) لاپەڕە ١٠.

٥٣بڕوانە: التفسیر والمفسرون ج٢ ص٣٢١.

## ئاماژە و ووتەی هەندێك لە پێشینان دەربارەی تەفسیری زانستی:

- (ئـیبن عـەبباس) رەزای خـوای لێبێـت وەك (الطـبري) لێـی دەگێڕێتـەوە فەرموویەتی: (التفسير على أربعة أوجه: وجه تعرفه العرب من كلامها، وتفسير لايعذر أحد بجهالته، وتفسير تعرفه العلماء، وتفسير لايعلمه إلا الله)[٥٤] واتە: (تەفسیر بە چوار شێوە دەکرێت، رووبەکیان عەرەب دەیزانن لەبەرئەوەی لە زمانی ئەوانە، روویەکی تریان هەموو کەس لێی تێدەگات و کەس خاوەنی عوزر نیە بۆ نەزانینی، تەفسیرێکیش کە تەنها زانایان دەیزانن و لێی تێدەگەن، و تەفسیریکێش کە تـەنها خودا خۆی دەیزانێت)، کەواتە زانایانیش هەموو کاتێك بەپێی تواناکانی خۆیان و تواناکانی سەردەمیان دەتوانن تەفسیرێکی راستی قورئانی پیرۆز بکەن.

- (ئـیبن مەسـعود) رەزای خـوای لێبێـت دەفـەرموێت: (مـن أراد علم الأولين والآخـرين فليتـدبر القـرآن)[٥٥] واتـە: هـەر کەسـێك زانسـتەکانی پێشـینەکان و دواییـنەکانی دەوێـت بـا تێبڕوانێتـە قورئـان، کـە ئەمـە بـە تەفسـیر کردنـی رووکەشیانەی ئایەتەکان نایەتەدی.

- ئیمـامی (الغزالـي) لـە کتـێبی (إحيـاء علـوم الـدين) لـە باسـی (آداب تـلاوة القرآن)دا باسێکی تەرخان کردووە بۆ (فهم القرآن وتفسيره بالرأي) واتە تێگەیشتن لە قورئان و تەفسیر کردنی بە راکان کە تێیدا دەڵێت:

(الأخبار والآثار تدل على أن في معاني القرآن متسعا لأرباب الفهم، قـال علـيّ: إلا أن يؤتي الله عبداً فهما في القرآن، فإن لم يكن سوى الترجمة المنقولة فما ذلك الفهم)[٥٦] واتە: " ئەو هەوالانەی لە پێشینانەوە پێمانگەیوە ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ماناکانی قورئان بواری تێدایە بۆ کەسانی تێگەیشتوو و زانا کە لێی تێبگەن،

---

٥٤بڕوانە: التفسير والمفسرون ج١ ص٣٩.

٥٥بڕوانە: إحياء علوم الدين ج١ ص٣٧٩.

٥٦هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(عەلی) ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی کە خودا تێگەیشتن لە قورئان بەهەندێك لە بەندەکانی دەبەخشێت، ئیتر چۆن دروستە بڵێین ئەم تێگەیشتنە هەر تەنها دووبارە کردنەوەی ئەو تەرجومە و وتانەیە کە پێمانگەیشتووە"، کەواتە دەڵێت قورئان بەردەوام شتی نوێی لێوە تێدەگەین، (ئەبو دەرداء) ڕەزای خوای لێبێت ووتوویەتی: (لا يفقه الرجل حتى يجعل للقرآن وجوهاً)[٥٧] واتە: مرۆڤ تێنەگەیوە لە قورئان تاوەکو بە چەند ڕوویەك لێکینەداتەوە.

هەروەها (الغزالي) دەڵێت: ئیمامی (عەلی) ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: (من فهم القرآن فسر به جمل العلم) کە تێیدا ئاماژەیداوە بۆ ئەوەی قورئان ئیشارەتی کردووە بۆ هەموو زانستەکان بەگشتی، ئیمامی (ئیبن عەباس) ڕەزای خوای لێبێت لە تەفسیری ئایەتی: (ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيراً كثيرا) (البقرة:٢٦٩) دەفەرموێت: حیکمەت واتە تێگەیشتن لە قورئاندا.

(الغزالي) بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (فهذه الأمور تدل على أن في فهم معاني القرآن مجالا رحبا ومتسعا بالغا، وأن المنقول من ظاهر التفسير ليس منتهى الإدراك فيه)[٥٨] واتە: ئەم شتانە شارەزامان دەکات کە لە تێگەیشتنی ماناکانی قورئاندا بوارێکی گەورە و فراوانیەکی زۆر هەیە، و ئەوەی پێمانگەیوە لە تەفسیری ڕووکەشی ئایەتەکان تەنها سنووری تێگەیشتن نییە لە ئایەتەکانی قورئان.

هەروەها (الغزالي) لە کتێبی (جواهر القرآن)دا کە دوای (إحياء) نوسیویەتی دەڵێت: زانستەکانی قورئان دەکرێن بە دوو بەشەوە: (علم الصدف والقشر) واتە زانستی توێکڵ کە بریتین لە زانستەکانی (اللغة والنحو وعلم القراءات وعلم مخارج الحروف وعلم التفسير الظاهر)، بەشی دووەم بریتیە لە (علم اللباب) واتە زانستی ناوکرۆك (یان لێکدانەوەی بابەتیانەی قورئان)، و باسی ئەوەی کردووە کە چۆن

---

٥٧هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥٨بڕوانە: إحياء علوم الدين ج١ ص٣٨٠.

هـەموو زانسـتەكان لـە قورئانـەوە سەرچـاوە دەگـرن وەك: زانسـتی پزیشـكی و ئەستێرەناسی و زیندەوەرناسی و توێكاری لاشەیان و غەیری ئەمان[٥٩] .

– (جلال الدين السيوطي) وەك ئیمامی غەزالی لەگەڵ تەفسیری زانسـتیدا بـووە و لە كتێبەكانی (الإتقان في علوم القرآن) و (الإكليل في استنباط التنزيل)دا بەدرێـژی باسی كردووە و بەڵگەی لە ئایەت و فـەرموودەوە بـۆ هێناوەتـەوە بـۆ سـەلماندنی ئەوەی وەك خۆی دەڵێت: (القـرآن مشـتمل علـى كـل العلـوم) واتـە قورئـان هـەموو زانستێكی تێدایە.

لـە فـەرموودەكان فەرموودەیـەك دەهێنێـت كـە ئیمـامی (الترمـذي) ریوایـەتی كردووە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ستكون فتن، قيل: ومـا المخـرج منهـا؟ قال: كتاب الله. فيه نبأ ما قبلكم، وخبر مابعدكم، وحكم ما بينكم)[٦٠] واتە: دوای من فیتنە وئاژاوە روودەدات، ووتیان چـی لـەوە رزگارمـان دەكـات، فـەرمووی: كتـێبی پەروەردگار چـونكە هـەواڵی ئەوانـەی پـێش ئێـوەی تێدایـە، و هـەواڵی ئەوانەشـی تێدایە كە دوای ئێوە لەداهاتوودا پەیدا دەبن، و دادوەرە لەنێوانیشتاندا.

هـەروەها (سـعيد بـن منصـور) لـە (ئـیبن مەسـعودەوە) رەزای خـوای لێبێـت دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (من أراد العلم فعليه بـالقرآن، فـإن فيـه خـبر الأولـين والآخرين) واتە: هەركەسێك بەدوای زانستدا دەگەڕێت بابە قورئانەوە سەرقاڵ بێـت چونكە هەواڵی پێشـینان و پاشـینانی تێدایـە، هـەروەها (ابـن أبـي حـاتم) لـە(ئیبن مەسعودەوە) رەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە: (أنزل في القـرآن كـل علـم وبـين لنـا فيه كل شيء، لكن علمنا يقصر عما بين لنا في القـرآن) واتـە: (لـە قورئانـدا هـەموو زانستێك دابەزیوە و هەموو شتێكمان بۆ روونكراوەتەوە بەڵام زانستمان كورتـە لـە

---

٥٩ بڕوانە: جواهر القرآن ص ٢١–٣٢.

٦٠ جزء مـن حـديث طويـل رواه الترمـذي والـدارمي والطبرانـي في المعجـم الكـبير وابـن حبـان والحـاكم في المستدرك، قال ابوعيسى: هذا حديث لاتعرفه إلا من هذا الوجه (سـنن الترمـذي: ٥/ ٩٨)، والصـحيح انـه موقوف على ابن مسعود.

روونکردنەوەی ئەوەی لە قورئاندا بۆمان باسکراوە)[61]، کەواتە دەڵێت زانستی ئەو رۆژگارە نەیتوانیوە هەموو شتێکی قورئان روونبکاتەوە و شیبکاتەوە بەڵکو لە داهاتوودا کە زانست گشتگیرتر دەبێت راستیەکانی قورئان زیاتر بۆ مرۆڤەکان روونده‌بێتەوە.

– زانای موسوڵمانی ناسراو (عبدالرحمان الكواكبي)[62] زۆر پشتگیری تەفسیری زانستی کردووە و وەسفی قورئان بەوە دەکات کە خۆری زانستەکان و گەنجینەی دانایيە، کتێبی (طبائعالإستبداد ومصارع الإستعباد)ی داناوە کە بریتیە لە چەند مەقالەیەك کە لە رۆژنامە میسریەکاندا بڵاوی کردووەتەوە کاتێك ساڵی ١٣١٨ك سەردانی ئەو وولاتەی کردووە، ئەم ووتانەی لەو کتێبەوە وەردەگرین:

---

٦١بڕوانە: الإتقان (ج٢ ص ١٢٦–١٣٦)، الإكليل ص٢.

٦٢(عبد الرحمن الكواكبي) (١٨٤٩– ١٩٠٢م) بیریار و زانای ناسراوی سوریا، لە رابەرانی فێرخوازی و بزوتنەوەی چاکسازی عەرەبیە، نووسەر و پارێزەر و شەرعزانێکی ناسراوە،لە شاری (حەلەب) لەدایکبووە و فێری زانستەکانی شەرعی و ئەدەب و سروشتزانی و بیرکاری بووە لە قوتابخانەی (الكواكبية)، کە باوکی و کۆمەڵێك لە گەورە زانایانی ئەو شارە سەرپەرشتیان دەکرد، لە زانستەکانی سیاسەت و مێژوو و کۆمەڵناسی و فەلسەفەشدا شارەزابووە، نووسەرێکی رەخنەگر بووە لە گەندەڵی کاربەدەستان، رۆژنامەیەکی سەربەخۆی لە شاری (حەلەب) دامەزراندووە بەناوی (الشهباء) ساڵی (١٨٧٧ز) و پاشان (الإعتدال)، پارێزەر و ئەندامی لیژنەی تاقیکردنەوەی پارێزەران بووە لە شارەکەیدا، ساڵی (١٨٩٢ز) بووە بە سەرۆکی شارەوانی (حەلەب)، پاشان هەستا بە گەشتکردن بۆ هیندستان و چین و کەنارەکانی رۆژهەلاتی ئاسیا و کەنارەکانی ئەفریقا و دوایی بۆ (میسر) کە لەوێ گیرسایەوە و ناوبانگی دەرکرد و بووە زانا و مامۆستایەکی ناسراو، هەموو ژیانی تەرخانکرد بۆ بانگەشە کردن بۆ چاکسازی و بەرەوپێش بردنی ئوممەت و دروستکردنی کۆمەڵە چاکسازی و خێرخوازیەکان، چەندین کتێبی نووسیوە لەوانە: (طبائع الاستبداد)، و (أم القرى)، و (العظمة لله)، و (صحائف قريش)، لە شاری (قاهیرە) ساڵی (١٩٠٢ز) وەفاتیکرد، و شاعیری ناسراوی (میسر) (حافظ إبراهيم) بەم دێرە شیعرانە یادی کردۆتەوە کە لەسەر گۆڕەکەی هەڵکەندراوە:

هنا رجل الدنيا هنا مهبط التقى    هنا خير مظلوم هنا خير كاتب

قفوا وأقرؤوا أم الكتاب وسلموا    عليه فهذا القبر قبر الكواكبي

(وهذه مسألة إعجاز القرآن، وهي أهم مسألة في الدين لم يقـدروا أن يوفوهـا حقهـا من البحث، واقتصروا على ما قاله فيها بعـض السـلف قـولا مجمـلاً مـن أنهـا قصـور الطاقة عن الإتيان بمثله في فصاحته وبلاغته، مع إنه لوفتح للعلمـاء ميـدان التـدقيق وحرية الرأي والتأليف، كما أطلق عنان التخريف لأهـل التأويـل والحكـم، لأظهـروا في ألوف من آيات القرآن ألوف آيات من الإعجاز ... ولرأوا فيه كـل يـوم آيـة تتجـدد مـع الزمان والحدثان، تبرهن إعجازه بصدق قولـه تعـالى (ولارطب ولا يابس إلا في كتاب مبين) (الأنعام:٥٩)، ولجعلوا الأمة تؤمن بإعجازه عن برهـان وعيـان لا مجـرد تسـليم وإذعان، ومثال ذلك: أن العلم كشف في هذه القـرون الأخـيرة حقـائق وطبـائع كـثيرة، تعزى لكاشفيها ومخترعيها من علماء أوروبا وأمريكا، والمدقق في القرآن يجد أكثرهـا ورد التصريح أو التلميح به في القرآن منذ ثلاثة عشـر قرنـاً، ومابقيـت مسـتورة تحـت غطاء من الخفاء إلا لتكون عند ظهورها معجزة للقرآن، شاهدة بأنـه كـلام رب لايعلـم الغيب سواه)[٦٣].

واته: ئەمەش مەسەلەی ئیعجازی قورئانە، کە بریتیە لە گرنگترین بابـەتی دیـن کە نەیانتوانی حەقی خۆی بدەنێ لە لێکۆڵینەوە، و تەنها بە ووتەی کورتی هەندێك پێشینان رازی بوون کە بریتیە لە بێتوانایی لە هێنانی هاوشێوەی لـە رەوانبێـژی و زمانەوانیدا، کە ئەگەر بهاتایە و ئازادی نووسین و ووردبینی و لێکدانەوە بۆ زانایان برەخسایە وەك چۆن بۆ خـەڵکی تـەئویل و حوکمـدان بـواری ئەفسـانە و خورافـات والأبوو، ئەوا دەیانتوانی لـە هـەزاران ئایـەتی قورئانـدا هـەزاران نموونـە و بەڵگـەی ئیعجاز دەربخـەن ... و هـەموو رۆژێکـیش ئایـەتێکیان تێدا دەبینـی کـە ماناکـەی لەگەڵ رووداو و پێشهاتەکاندا نوێدەبووەوە، و دەبووە بەڵگە لەسـەر ئیعجازەکـەی و راستی ووتـەی پـەروەردگار (هـەموو تـەڕ و ووشـکێك لـە کتـێبی ئاشـکرادان کـە قورئانە)، و وایان لە ئوممەت دەکرد کە باوەڕ بە ئیعجازەکـەی بهێـنن بـە بەڵگـەی

---

٦٣بڕوانە: طبائع الإستبداد ص ٦٠– ٦١.

سەلماو و بینراو نەك تەنها تەسلیم بوون و ملکەچ بوون، نموونەی ئەمەش ئەوەیە کە زانست لەم سەدانەی دواییدا زۆر راستی و سروشتی شتەکانی دۆزیوەتەوە، کە دەدرێنەپاڵ دۆزەرەوە و داهێنەرەکانیان لە زانایانی ئەوروپا و ئەمریکا، ئەوەی ووردبینی لە قورئاندا دەکات دەبینێت کە زوربەیان یان بە ئاشکرا یان بە ئاماژە ئیشارەتیان بۆ کراوە لە قورئاندا پێش ١٣ سەدە، کە مانەوەی ماناکانیان لەژێر پەردەی شارراوە و نهێنیدا تەنها بۆ ئەوە بووە کە لەکاتی دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ماناکانیاندا ببنە موعجیزەیەك بۆ قورئان و شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە ووتەی پەروەردگارێکە کە تەنها ئەو زانایە بە نهێنی و شارراوەکان.

## هەندێك لەو تەفسیرانەی کە تێیدا تەفسیری زانستی بۆ زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئان کراوە:

- تەفسیری (مفاتیح الغیب) دانراوی (فخرالدین الرازي) (٥٤٤–٦٠٦ك)، هەشت بەرگی گەورەیە، زور نموونە لە زانستە بیرکاریی و سروشتیەکانی هێناوە لەکاتی تەفسیری ئایەتەکاندا.
- (أنوار التنزیل وأسرار التأویل) دانراوی (القاضي البیضاوي) ساڵی (٦٩١ك) وەفاتی کردووە، کاتێك باسی ئایەتە کەونیەکان دەکات بەبێڵێکدانەوەیان بە زانستەکانی گەردوون و سروشت بەسەریاندا تێناپەڕێت.
- (غرائب القرآن ورغائب الفرقان) دانراوی (نظام الدین النیسابوري) لە زانایانی سەدەی هەشتەمی کۆچیە.
- (تفسیر الجلالین) دانراوی (جلال الدین السیوطي وجلال الدین المحلي).

- (السراج المنير في الإعانة على معرفة بعض معاني كلام ربنا الحكيم الخبير) دانراوى (الخطيب الشربيني)، (٩٧٧ك) وەفاتى كردووە.

- (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني) دانراوى (شهاب الدين الآلوسي) (١٢١٧-١٢٧٠ك).

- (الجواهر فى تفسير القرآن الكريم) دانراوى شێخى ئەزهەر (طنطاوي جوهري) (١٢٨٧-١٣٥٨ك).

## گرنگیی تەفسیری زانستی بۆ ئایەتە گەردوونیەكان:

١- تەفسیری زانستی دەریدەخات كە قورئان سەمەرەكانی كۆتایی نایەت و كۆن نابێت و زانایان تێرنابن لێی.

٢- دەرخستنی ئیعجازی زانستی قورئان و سەلماندنی ئەوەی دروستكەری بوونەوەر هەر ئەو قورئانی دابەزاندووە.

٣- تەفسیر كردنی ئایەتە كەونیەكان لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەیەكی زانستی راست ودروست و دوور لە تەفسیرە نازانستیەكانی بابەتەكانی وەك: (النطفة والعلقة) و دەرهێنانی زیندوو لە مردووەوە و پۆلێنكردنی زیندەوەرەكان و غەیری ئەمانەش لە هەزاران ئایەتی گەردوونی و ئاماژەی زانستی و ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا.

٤- بانگەواز كردن بۆلای خودا بە شێوازی سەردەمیانە كە مەبەستی دەرخستنی رووەكانی ئیعجازی زانستیە لە قورئان و سوننەتدا.

## چەند ڕێکخەر و سنوورێك بۆ تەفسیری زانستی قورئان:[٦٤]

١- پێویستە ڕاڤەكار پابەندبێت بەئیسلامەوە بە بیروباوەڕ وشەریعەتەكەیەوە، و شارەزابێت بە عەقیدەی شوێنكەوتوانی سوننەت و جەمات لە یەكتاپەرستی و پەروەردگاریێتی و ناو وسیفاتی خودا.

٢- پێویستە ڕاڤەكاری زانستی پابەندبێت بەنوێژ وڕۆژوو و هیچ بنەمایەكی ناسراوی ئیسلام ڕەتنەكاتەوە.

٣- پێویستە شارەزای تەواوی هەبێت لە تەفسیری زمانەوانی ئەو ئایەتانەی كە خەریكی ڕاڤەكردنیانە.

٤- پێویستە تەفسیركردن بە ڕاستیە زانستیە دامەزراوەكان بێت لەگەڵ دووركەوتنەوە لە بیردۆز و گریمانەكان.

٥- نابێت تەفسیرەكەی پێچەوانەی تەفسیری ئایەتێكی تربێت لەبەرئەوەی قورئان جیاوازی و دژبەیەكی تێدانیە، و قورئان هەندێكی تەفسیری ئەوەكەی تری دەكات.

٦- هەركەسە و لەبواری پسپۆڕیی ووردی خۆیدا تەفسیر وراڤە بكات.

---

٦٤بڕوانە: بابەتی: التفسير العلمي للآيات القرآنية الكونية بين المؤيدين والمعارضين- الدكتور: كارم السيد غنيم.

٧- ئیعجازی زانستیش پێویستی بە ڕێکخەر و سنووری زانستی و شەرعی ووردهەیە کە پێویستە ڕەچاو بکرێن.

## بەشی سێیەم

# چەند نموونەیەکی

# ئیعجازی زانستی

# لە قورئان و سوننەتدا

# تۆڕی چنراوی گەردوونی ....لەنێوان زانست و قورئاندا

نووسینی: عبدالدائم الکحیل




لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو دۆزینەوەیە نوێیەی لەم دواییانەدا دەربارەی تۆڕی چنراوی گەردوونی ئاشکراکرا دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، کە چۆن گەلەئەستێرەکان و کۆمەڵەکانیان پێکەوە چنراوێکی پێکەوە گرێدراو پێکدێنن هەروەك پۆشاکی چنراو، هەروەها باسی ئاماژەکەی قورئانی پیرۆز دەکەین بۆ ئەم چنراوە گەردوونیە لە ئایەتی: ﴿وَالسَّمَاء ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ (الذاريات:٧)، دوایی دەبینین کە چۆن قورئان یەکدەگرێتەوە لەگەڵ راستیە زانستییە سەلمێنراوەکاندا، کە ئەم یەکگرتنەوەیە شایەتی لەسەر ئەوە دەدات کە قورئانی پیرۆز کتێبی پەروەردگاری باڵادەستە، و موعجیزەیە لەلایەنی گەردوونی و زانستییەوە، لە سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت دەبەستین بە گرنگترین زانایانی رۆژئاوا کە ئەم چنراوەیان دۆزییەوە و سەدان توێژینەوەیان دەربارەی ئەنجامدا، هەروەها پشت بە توێژینەوە نوێ بڵاوکراوەکان دەبەستین، کە لەلایەن گرنگترین سایتەکانی فەزا و گەردوونزانی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دۆکیومێنت کراون.

خـوای پـەروەردگار دەبـارەی ئاسمـان دەفـەرموێت: ﴿وَالسَّمَاء ذَاتِ الْحُبُكِ﴾، پـێش چـەندین سـاڵ ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەم خوێنـدەوە و چـەند جارێـك دووبـارەم كـردەوە وهـەوڵی تێگەیشـتنی مانـای (الْحُبُك)مـدا، كـە گەیشـتمە ئـەوەی مانـای تۆڕێكی چنراو دەگەیەنێت!

پاشان گەڕامەوە بۆ ووتەی موفەسیرانی قورئان (ڕەزای خوایان لێبێت) و بینیم كە زوربەیان ووشەی (الْحُبُك) بە تۆڕێكی چنراو (محبُوك) و بەهێز و تۆكمە لێكیـان داوەتـەوە، هەندێكیشـیان ووتوویانـە ووتـەی پـەروەردگار (وَالسَّمَاء ذَاتِ الْحُبُكِ) واتە: ئاسمانی خاوەن شكلێكی جوان و خاوەنی هێز و وتوندی و خاوەنی رازانـەوە و خاوەنی ڕێڕەوەكان[٦٥].

بەڵام من لە دەروونی خۆمدا دەمپرسـی: ئـەم چـنراوە گەردوونیـە تۆكمەیـە لـە كوێیـە لـە گەردوونـدا كـە ئێمـە تـەنها ئەسـتێرە و هەسـارەكانی تێـدا دەبینـین؟ ئەوەبوو لە هەندێك سەرچاوەی زانستی گـەردوون و پێكهاتـەی كەونـدا گـەڕام لـەو كاتەدا بەڵام هیچ ئاماژەیەكم بۆ چنراوێكی گەردوونی نەبینی.

ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە لـە زاكیرەمـدا بـۆ چـەندین سـاڵ مایـەوە و نـەمتوانی تەفسیرێكی ووردی بۆ بدۆزمەوە، تەنها لە سەرەتای سەدەی بیست ویەكدا نـەبێت كاتێك كە چەند سایتێكی جیهانی دەربـارەی پێكهاتـەی گـەردوونم لـە ئینتەرنێتـدا كردەوە كە باسی دوایین دۆزینەوە سەلمێنراو و جێگیرەكانیـان دەكـات دەربـارەی ئاسمـان، لێـرەدا سەرسـوڕمانی گـەورە دایگـرتم كاتێـك كـە هـەواڵێكی (بینگـەی ئەورووپی—المرصد الأوروبي)م خوێنـدەوە كـە لـە سـایتەكەیاندا بڵاویـان كردۆتـەوە بەناونیشـانی:كورتەیەك دەربـارەی چـنراوی گـەردوونی زۆر سـەرەتا (لمحـە عـن

---

٦٥ بڕوانە (تفسیر القرطبي) سوورەتی (الذاریات)، لە فەرموودەیەكیشدا هاتووە: ﴿أنَّ عائشة (رضي الله عنها) كانت تحتبك تحت الدرع في الصلاة﴾ واتە: جلەكانی خۆی توند و تۆكمە دەكرد لەكاتی نوێژدا.

النسيج الكونى المبكر جداً)[٦٦]، کاتێکیش کە دێرە یەکەمەکانی ئەم مەقالەیەم خوێندەوە، گەیشتمە ئەوەی کە قورئانی پیرۆز پێش ئەم زانایانە کەوتووە بە ١٤ سەدە لە باسکردنیدا دەربارەی ئەم چنراوە گەردوونیە کە ناوی ناوە (الحُبُك)، بەڵکو پەروەردگاری باڵادەست سوێندیشی پێخواردووە.

## لەنێوان زمان و تەفسیردا:



هەندێک لە گەلەستێرەکانی ئاسمان

سەرەتا پێویستە کە پەنا ببەینەبەر زمانی عەرەبی کە قورئانی پێهاتۆتە خوارەوە، و بەدوای ماناکانی ئەو ووشەیەدا بگەڕێین، کە دوای گەشتێك بەناو فەرهەنگەکانی زمانەوانیدا[٦٧] دەبینین کە ئەم ووشەیە لە فرمانی (حَبَكَ)ەوە هاتووە، و عەرەب دەڵێن (حَبَكَ النساج الثوب) واتە: چنەرەکە جلەکەی چنی، (حَبَكَ الحائكُ الثوب) واتە: بەرگدرووەکە جلەکەی بەباشی و تۆکمەیی چنی و دروستکرد، لەم مانا زمانەوانیانەی ووشەکانەوە دەگەینە ئەو راستیەی کە ووشەی (الحُبُك) چەند مانایەك لەخۆ دەگرێت دەربارەی چنراوەکان و پەتی چنراو بە بەهێزی و تۆکمەیی، بەڵام موفەسیرە پێشینەکانی قورئان (خوا لێیان رازی

٦٦ بڕوانە ئەو بابەتەی ساڵی (٢٠٠١) بڵاوکراوەتەوە دەربارەی دۆزینەوەکەی زانی فەلەکی (پۆل میلەر) و هاوڕێکانی (چنراوی گەردوونی) لە سایتی بینگەی ئەورووپی باشوور بەم ناونیشانە:
http://www.eso.org/outreach/press-rel/pr-2001/pr-11-01.html

٦٧ بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب) و فەرهەنگە بەناوبانگەکانی تری زمانی عەرەبی.

بێـت) دووریيـەكانی ئـەم مانايـەيان پێنەگەيشـتبوو، ئـەويش لەبەرئـەوەی ئـەو سەردەمەی ئەوان تێيدا ژيـاون زانسـتە نوێكـانی فەلـەكيان لەبەردەسـتدا نـەبووە، تەنانەت بۆچوونی چنراوی گـەردوونی زۆر نوێيـە كـە مێژووەكـەی تـەنها بـۆ چـەند ساڵێك لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

## خورپەيەكی نوێ:

لە ئەنجامی ئەم مانا زمانەوانيەوە دڵنيابووم لـەوەی كـە شـێوەی ئـەم چـنراوە گەردوونيـە پێويسـتە وەك قوماشـێكی چـنراو لـە پـەت ودەزووبێـت كـە پێكـەوە گرێدراون، بۆ جارێكی تريش سەرسوڕمان گرتمـی كاتێـك كـە وێنـەی ئـەم چـنراوە گەردوونيەم بينی كە مەزنترين ئامێرەكانی كۆمپيوتەر كێشايان[٦٨]، كە بە تـەواوەتی بريتـــی بـــوو لـــە چـــەند هێڵێكـــی پێكەوەگرێـــدراو لـــە چـــنراوێكی تۆكمـــە و سەرسوڕهێنەردا.

بەڵام تەنها ئەم مەقالە زانستيە دەربارەی ئاماژە بـۆ چـنراوی گـەردوونی بـەس نيیە، چونكە لەوانەيـە تيـۆری بێـت و راسـت دەرنەچێت، منـيش وەك ئيمانـدارێك پێويستە لەسەرم كە دڵنيابم لـە راسـتی هـەر زانياريـەكی نـوێ و لـە راسـتييەكەی بێگومانبم پێش ئەوەی كـە بـاوەڕی پێبهێـنم، چـونكە دەبێـت بيروبـاوەڕم لەسـەر بنەمای زانستی راست و تەواو دابمەزرێنم.

هەربۆيە دەستمكرد بـە خوێندنـەوەی سـەدان لێكۆڵينـەوە دەربـارەی چـنراوی گـــەردوونی و دەزووە گەردوونيـــەكان كـــە هـــەموويان چـــەند ســـاڵێك دەبێـــت بڵاوكراونەتەوە، بينيم كە هەموو زانايان دووپاتی ئەم راسـتييە دەكەنـەوە، بـەڵكو يەكێكە لە گرنگترين راستييە ئاشكرا و سەلمێنراوەكان لە سەدەی بيسـت ويەكـدا،

---

٦٨ كردارێكی كۆمپيوتەری هەرە مەزن لـە جـۆری خـۆی لـە سـەدەی بيسـتدا ئەنجامـدرا بـە مەبەسـتی وەڵامدانەوەی پرسياری: ئايا شكڵی گەردوون لە رابوردوودا چۆن بووە، كە ئەم تاقيكردنەوەيە تيمێكی زانايانی گەردوونی بينگەی (ماكس پلانك) ئەنجاميانداو، بڕوانە ئەم لينكە بۆ بەدواداچوونی ئەم بابەتە:
**http://www.mpa-garching.mpg.de/~jgc/hubble_public.html.**

کاتێکیش کە ئەم چنراوە گەردوونیەم بینی بە هاوکێشە بیرکارییەکان و ئەو وێنانەی کە کۆمپیوتەرەکان کێشایان، ئەو راستییەم بۆ دەرکەوت کە قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا باسی ئەو چنراوە گەردوونیە (**Cosmic Web**)ی کردووە کە زانایانی رۆژئاوا ئەمرۆ شانازی بەوەوە دەکەن کە ئەوان یەکەم کەسێکن دەربارەی دواون[٦٩] !.



چنراوەکە هەروەک چۆن ئامێری سوپەر کۆمپیوتەرەکان کێشایان بۆ یەکەم جار لە سەدەی ۲۱دا کە سەدان ملیار لە گەلەئەستێرە لەخۆدەگرێت، کە هەر گەلەئەستێرەیەکیش سەدان ملیار لە ئەستێرە لەخۆدەگرێت، خاڵە درەوشاوەکان بریتین لە کۆبوونەوە گەلەئەستێرەییە زەبەلاحەکان، کە هەموویان پەروەردگار ڕێکی خستوون لە گەردوونی فراواندا لە پێکهاتەیەکی چنراوی سەرسوڕهێنەردا هەروەک قوماشی چنراو، کە تەنانەت سوێندیشی پێخواردوون کە دەفەرموێت: [وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ]، لێرەدا بڕوانە و تێبفکرە لە گەورەیی گەردوون و گەورەیی دەسەڵاتی بەدیهێنەری گەردوون (سبحانە وتعالی) کە بەدیهێنەری ئەم چنراوە ناوازەییە!!

---

٦٩ بڕوانە ئەو مەقالەیەی بە ناونیشانی: دۆزینەوەی دەزووە گەردوونیەکان بە بەکارهێنانی مۆدێلی کاندی (**Detectionof cosmic filaments using the Candy model**) کە لە بەرواری (ئازاری ٢٠٠٥)دا بڵاوکراوەتەوە بەم ناونیشانە:

**http://www.edpsciences.org/articles/aa/abs/2005/17/aa2409/aa2409.html.**

## مانا و ئامارژەی زیاتر:

بابزانین که مانا و ئامـاژه و مـوعجیزەی زیـاتر هەیـه لـەم بابەتـەدا، کـه پـێش ئەوەی دەستبکەین بـه ووردبوونـەوەی مانا بـەخورەکان کـه ئـەم ئایەتـه لـەخۆی گرتووه، با سەرەتا بڕوانینه ئەو دۆزینەوانەی کـه توێژینـەوەکانی سـەدەی بیسـت ویەك لەبواری زانسته گەردوونیەکاندا دۆزیویانەتەوه، زانایان لەم سـاڵانەی دوایـیدا تێبینی ئەوەیان کردووه که هەموو ئەوانەی له گەردوونـدا دەیـانبینین تـەنها ٥٪ی گەردوون پێکدەهێنێت، و زیاتر له ٩٥٪ی گەردوون بریتیه له ماددەیەکی نـەبینراو کـه پێیـدەووترێت تاریکـه مـاددە (Dark matter)[٧٠]، لێـرەدا لەگەڵمـدا فەرموودەی پەروەردگار (تبـارك وتعـالی) بێنـەرەوه یـادی خـۆت کـه دەفـەرموێت: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾ (الحاقة: ٣٨-٣٩)، واته: سـوێندبێت بـەو شتانەی که دەیبینن و بەوانەش که نایبینن، لێرەدا قورئانی پیرۆز هەواڵی پێـداوین دەربارەی ئەو شتانەی که نایانبینین، بەڵکو بەو شتانەش سوێندی خـواردووه کـه قورئـان حـەق و راسـتییه، ئایـا ئـەم ئایەتـه پـیرۆزه ئامارژەیـەکی ناڕاسـتەوخۆی لەخۆنەگرتووه دەربارەی ئەو ماددە تاریکەی زانایانی ئەمڕۆ دەیدۆزنەوه؟!

## زانایانی فەلەك دەربڕینەکانی قورئان بەکاردێنن!

لێرەدا دەپرسین: چۆن زانایانی رۆژئـاوا توانییـان تاریکـه مـاددە بدۆزنـەوه کـه ئێمه نایبینین؟! و چۆن چنراوی گەردوونیان دۆزییەوه؟ باشه دەبێت ئەم ناوەیـان لەکوێوه هێنابێت کـه ئـەوان قورئانیـان نەخوێندۆتـەوه؟ و ئایـا پێویسـت بـوو کـه گەشتێکی لێکۆڵینـەوەی نـوێ بکـەین بـەناو تـازەترین دۆزینـەوەکانی زانایـان لـەم

---

٧٠ بڕوانـه مەقالەیـەك بەناونیشـانی: (تاریکـه مـاددە لـه ناوجەرگـەی گەلەسـتێرەکاندا) لـه پێگـەی (گەردوون لەمڕۆدا):

**http://www.universetoday.com/am/publish/dark_matter_concentrated.html**

بوارەدا؟ جارێکی تر سەرسوڕمانێك و خورپەیەکی گەورە دایگرتم کاتێك کە لەسەر زمانی زانایانی دۆزەرەوە و بینەری ئەم چنراوە گەردوونیە بۆ یەکەم جار چەند وتەیەکی دووپاتکەرەوەم بیست کە تێیدا دەڵێن[٧١]:

**(We have little doubt that for the first time, we are here seeing a small cosmic filament in the early universe).**

واتە: ئێمە لێرەدا گومانمان لەوە نییە کە بۆ یەکەم جار لێرەدا دەزوویەکی گەردوونی بچووك دەبینین لە گەردوونی سەرەتادا.

پاشان دەقاودەق ئەم قسەیە دەکەن:

**(We see it at a time when the universe was only about 2 billion years old)**

واتە: ئێمە دەیبینین (واتە ئەم دەزووە) لە کاتێکدا کە گەردوون تەمەنی تەنها ٢ بلیۆن ساڵ بووە.

پاشان بەردەوام دەبن لە قسەکانیاندا و بینینی خۆیان و زانایانی فەلەك دووپات دەکەنەوە بۆ دابەشبوونی ئەم ماددەیە لە قۆناغێکی سەرەتای تەمەنی گەردووندا:

**(Astronomers can(See) the distribution of matter in the early universe).**

واتە: گەردوونزانان دەتوانن دابەشبوونی ماددە لە گەردوونی سەرەتاییدا (ببینن).

---

٧١ ئەمە بریتیە لە وتەی زانای فەلەك (پۆل میلەر) لە پەیمانگەی فیزیای فەلەکی لە ئەڵمانیا، دەتوانن راستەوخۆ دڵنیابن لەم هەواڵە لە توێژەرەوەکە خۆی بەهۆی پۆستە ئەلیکترۆنیەکەی (**pmoller@eso.org**)، و بۆ روونکردنەوەی زیاتر باشتر وایە بڕوانرێتە ئەو توێژینەوەیەی ئەم زانایە و هاوەڵەکەکانی: (جۆن فینبۆ لە هەمان بینگە: **jfynbo@eso.org**) و (بارن تۆمسۆن لە پەیمانگەی فیزیا و فەلەك لە دانیمارك: **bt@ifa.au.dk**) بڵاویان کردۆتەوە، هەروەها بڕوانە درێژەی ئەم مەقالەیە لە سایتی بینگەی ئەورووپی باشوور لە ئەڵمانیا بەم ناونیشانە:
**http://www.eso.org/outreach/press-rel/pr-2001/pr-11-01.html.**

ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کە ئەو زانایانە ووشەی (دەبینین) بەکاردێنن و تەنانەت ئەم ووشەیە دەخەنە نێوان دوو کەوانەوە () بۆ ئەوەی کە دەریخەن ووشەیەکی نوێیە لە بەکارهێنانیدا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو وێنانەی بۆ ئەو چنراوە دەیبینن دەگەڕێتەوە بۆ ١٣ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر! دوای بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ لە هۆکاری ئەوەی وای لەم زانایانە کردووە کە سووربن لەسەر بینینیان بۆ شێوەی ئەم چنراوە[٧٢]، لێرەدا ووتەی پەروەردگارم بیرکەوتەوە کە لە بەرامبەر ئەوانەی ئینکاری کتیبەکەی پەروەردگاریان کردووە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا...﴾[٧٣] (الأنبياء:٣٠).

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار! پەروەردگار (عزوجل) دەفەرموێت: (أَوَلَمْ يَرَ) واتە: بۆ نایبینن، ئەوانیش دەڵێن: (We see) واتە: ئێمە دەیبینین، هەروەك ئەوەی ووتەکانی پەروەردگار دووبارە بکەنەوە بەبێ ئەوەی پێی بزانن! خوای گەورەش دەفەرموێت: (الَّذِينَ كَفَرُوا) واتە بێباوەڕان، ئەوانیش دان دەنێن بە بێباوەڕیان و باوەڕنەبوونیان بە قورئانی پیرۆز.

خوای گەورەش کاتەکەی دیاری دەکات بە ووشەی (كَانَتَا) واتە لە ڕابوردوودا بەو شێوەیە بوون، ئەوانیش دەڵێن: (early universe) واتە: گەردوونی سەرەتا، خوای گەورەش دەفەرموێت (رَتْقًا)، ئەوانیش دان دەنێن بەوەدا کە دەستیان کردووە بە بینی یەکەم دەزوو لەم چنراوەدا بەوەی دەڵێن: (**small cosmic filament**).

---

٧٢بڕوانە پێگەی (**http://spaceflightnow.com/index.html**)، ئەو مەقالەیەی لە بەرواری (١ی ئابی ٢٠٠٢)دا بڵاوکراوەتەوە بەناونیشانی: ( **'Rivers of gravity' found that define cosmic "landscape**).

٧٣بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب) لە مانای ووشەکانی: (رَتَقَ) (فَتَقَ).

ئایا ئەمە موعجیزەیەکی قورئانی نییە کە پێویستە لەسەر هەموو بڕوادارێك تێیبفکرێت و لێیبکۆڵێتەوە؟ بەڵکو شانازی بەم کتێبە مەزنەوە بکات کە بە ڕاستی بریتیە لە کتێبی راستییەکان و سەرسوڕهێنەرەکانیش، نەك وەك ئەوەی ئەوان دەربارەی بە نارەوایی دەڵێن کتێبی ئەفسانە و خورافاتەکانە!!

لە بەرامبەر ئەم موعجیزە قورئانیەدا، موعجیزەی گوتاری قورئان بۆ بێباوەڕان کە ئەم (رَتق)ە گەردوونیە دەبینن لە سەرەتای گەردووندا، کە ئەوان بە فیعلی ئەم چنراوە گەردوونیەیان بینیوە بەهۆی ئامێرەکانیان و کۆمپیوتەرەکانیانەوە، ئیتر ئایا بۆ دڵنیانابن کە ئەم قورئانە لەلایەن ئەو خودایەوە نێردراوە کە دروستی کردوون و کارئاسانی بۆ کردوون کە ئەم دۆزینەوەیە ئەنجام بدەن، و لە کتێبەکەشیدا دەربارەی دواوە پێش ئەوەی کە ئەوان بیدۆزنەوە بە ١٤ سەدە!

ئەوان سەرەتای ئەم چنراوەیان دۆزیوەتەوە و دیاردەکانی ئەم دەزووە گەردوونیە چنراوانەیان بینیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامن لە گەڕان دەربارەی ئەم (رَتق)ە گەردوونییە، هەربۆیە دەبینین دەربڕینی ناوازەی قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەدا لێیان دەپرسێت: (أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) بۆ باوەڕناهێنن؟!

هەروەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیەوە دەزانین کە ووشەی (الرتق) بە مانای پڕکردنەوە دێت و (الفتق) بە مانای درزتێکردن دێت، کە ئەمانە ئاماژەیەکی ئاشکرایان تێدایە بۆ شتی چنراو، لێرەدا دەپرسین: ئایا ئەم زانایانە نین کە ووتەکانی ئەم ئایەتە دووبارە دەکەنەوە کە نەیانخوێندۆتەوە؟

کاتێکیش کە قورئان بە روونی ووتوویەتی کە گەردوون سەرەتا (رتق) بووە واتە: چنراوێکی تۆکمە بووە وەك بەربەستێکی بێبۆشایی، دەبینین زانایانی ئەم سەردەمە بە توندی دووپاتی دەکەنەوە کە ئەوان ئەم چنراوە دەبینن لە قۆناغە سەرەتاکانی تەمەنی گەردووندا!! بەڵکو ئەو زانایانە هەرگیز گومانیان نییە لە

بوونی ئەم چنراوە، تەنانەت ئێستا ئەو پرسیارە لەخۆیان دەکەن کە ئایا چۆن ئەم دەزوو و هێڵە زەبەلاحە گەردوونیانە رستراو و چنراون[٧٤]، ئێوەش لەگەڵ مندا بڕواننە وێنەی ئەو چنراوە کە کۆمپیوتەرەکان لەسەر تۆڕێکی سێ دووریی کێشایان بۆ بەشێکی گەورەی گەردوونی بینراو، کە بە ئاشکرا لێیەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەوەی دەیبینین لەم گەردوونەدا زۆر کەمترە لەوەی کە نایبینین!



## چەند راستیەکی زانستی چەسپاو:

لێرەدا پێویستە لەسەرمان هەوڵبدەین کە ئەو چۆنێتیە بناسینەوە کە وای لە زانایانی فەلەك کردووە کە دڵنیابن لەبوونی ئەم چنراوە، و بەڵکو هەموویان

---

٧٤بۆ ئەوەی ئەم ووتەیەمان متمانە پێکراوبێت توێژینەوەیەك دەکەین بە نموونە کە لەلایەن ٣ زاناوە ئەنجامدرا بەناونیشانی: ( **How Filaments are Woven into the Cosmic Web**)واتە: چۆن دەزووەکان چنراو و رستراون لە چنراوی گەردوونیدا، کە توێژەرەوەکان یەکەم رستەی توێژینەوەکەیان بەمە دەست پێکردووە: ( **Observations indicate galaxies are distributed in a filament-dominated web-like structure**) واتە: بینین و تێڕوانینەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە گەلەستێرەکان دابەش بوون بەسەر چەند دەزوویەکدا کە پێکهاتەی چنراوی بەسەریاندا زاڵە، ئەم مەقالەیە بەم ناونیشانە دەست دەکەوێت:

**http://arxiv.org/abs/astro-ph/9512141.**

یەکرابن لەسەر بوونی، چیرۆکەکە لەوێوە دەست پێدەکات کاتێك کە زانایانی گەردوون دەستیانکرد بە کێشانی نەخشەی ئەستێرە و گەلەستێرەکان، ئەوەبوو تێبینی ئەوەیان کرد کە چەند ناوچەیەك هەیە ئەم گەلەستێرانەی تێدا کۆدەبێتەوە ناودەبرێن بە هێشووە گەلەستێرە (**Galaxy Clusters**)، و دۆزییانەوە کە ئەم گەردوونە زیاتر لە ٢٠٠هەزار ملیۆن گەلەستێرە لەخۆدەگرێت.

کاتێکیش کە توانای حیساباتە هێجگار گەورە و ئالۆزەکان هاتنە بەردەست بەهۆی بەکارهێنانی سوپەر کۆمپیوتەرەوە (کۆمپیوتەری لەرادەدە بەدەر بەهێز وخێرا)، زانایان بیریان لەوە کردەوە کە هەموو زانیارییە پێویستەکان داخڵی ئەم کۆمپیوتەرە زەبەلاحانە بکەن، کە زانیاری دیجیتاڵی لەخۆدەگرن دەربارەی شوێنی گەلەستێرەکان و دوورییان لێمانەوە بە ساڵی رووناکی و رادەی پەخشکردنی رووناکییان، لەگەڵ زانیاریی دەربارەی کۆبوونە گەلەستێرەییە زەبەلاحەکان و زانیاریی تر کە زیاتر لە ١ ملیۆن گەلەستێرە لەخۆدەگرێت، کاتێکیش کە سوپەر کۆمپیوتەر کرداره بیرکارییەکانی ئەنجامدا، ئەو وێنەیەی کە لێیهاتەبەرهەم بەتەواوەتی لە تۆرێکی چنراو دەچوو، هەربۆیە ئەمە وای لە زانایان کرد کە راستەوخۆ ناوی لێبنێن چنراوی گەردوونی (**Cosmic web**). (**بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەڕە ٤٨٩-٤٩٢**)



چنراوەکە هەروەك چۆن ئامێری سوپەر کۆمپیوتەرەکان کێشایان بۆ یەکەم جار لە سەدەی ٢١دا کە سەدان ملیار لە گەلەستێرە لەخۆدەگرێت، کە هەر گەلەستێرەیەکیش سەدان ملیار لە ئەستێرە لەخۆدەگرێت، خاڵە درەوشاوەکان

بریتین لە کۆبوونەوە گەلەستێرەییە زەبەلاحەکان، کە هەموویان پەروەردگار ڕێکی خستوون لە گەردوونی فراواندا لە پێکهاتەیەکی چنراوی سەرسوڕهێنەردا هەروەك قوماشی چنراو، کە تەنانەت سوێندیشی پێخواردوون کە دەفەرموێت: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾، لێرەدا بڕوانە و تێبفکرە لە گەورەیی گەردوون و گەورەیی دەسەڵاتی بەدیهێنەری گەردوون (سبحانه وتعالى) کە بەدیهێنەری ئەم چنراوە ناوازەیەیە ! !

## ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە و ڕووەکانی ئیعجاز:

١- لەبەرئەوەی کە زۆربەی موفەسیرەکان و هەموو زانایانی زمانەوانی لە لێکدانەوەیاندا کۆکن لەسەر ئەوەی کە بنچینەی ووشەی (الْحُبُك) لە قوماشی چنراوەوە هاتووە، هەربۆیە قورئانی پیرۆز یەکەم کتێبێکە کە دەربارەی ئەم چنراوە گەردوونیە دواوە و بەستوویەتیەوە بە ئاسمانەوە لە ووتەی پەروەردگاردا (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ)، هەروەها ئەو میکانیزمە هەندەسیەشی ڕوونکردۆتەوە کە وای لەم کۆکراوە (رتق)ە چنراوە کردووە کە (فتق) ببێت و درزی تێببێت لەو ووتەیەی پەروەردگاردا کە ئاراستەی بێباوەڕانی کردووە کە بەچاوی خۆیان لەداهاتوودا دەیبینن: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾.

٢- لە ئاکامە گرنگەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوونی ئاماژەیەکی ئاشکرایە لەم ئایەتەدا کە ئەوەی ئێستا دەیانبینین لە گەردووندا لە گەلەستێرەکان لە شکڵی ئەمڕۆیاندا نین، بەڵکو ئەمە شکڵی پێشوویانە و هی ڕابوردووە[٧٥]، ئەویش لە ووتەی

٧٥ ڕووناکی لە هەر چرکەیەکدا بە نزیکەیی (٣٠٠) هەزار کیلۆمەتر دەبڕێت، واتە لە ساڵێکی تەواودا نزیکەی (٩.٥) تریلیۆن کیلۆمەتر دەبڕێت، ئەو گەلەستێرەیەی کە ملیارێك ساڵی ڕووناکی لێمانەوە دوورە ڕووناکیەکەی پێویستی بە ١ ملیار ساڵ هەیە تاوەکو بگات پێمان! کە لەم ماوەیەدا ڕووناکی ئەم گەلەستێرەیە ماوەی (٩.٥) هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر دەبڕێت! !

پەروەردگاردا (كَانَتَا): واتە لە رابوردوودا، کە ئەمەش پێشینە و پێشدەستیەکی زانستی قورئانە لە باسکردنیدا دەربارەی ئەوەی زانایان لەمڕۆمادا ناوی دەنێن (early universe) واتە: گەردوون لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا.

٣- ئەو ووشانەی قورئانی پیرۆز بەکاریان دێنێت زۆر وورده لە رووی زانستیەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە زانایانی فەلەك لە سەدەی بیست ویەکدا دەستیان کردووە بە بەکارهێنانی هەمان ووشەکانی قورئان لە توێژینەوەکانیاندا، بۆ نموونە ووشەکانی (الحُبُك) و (رتقاً) و (ففتقناهما) هەموویان ئاماژەیەکی راستەوخۆیان تێدایە بۆ شتێکی چنراو و رستراو، زانایانیش هەمان ئەم ناوە بەکاردێنن بۆ دەربڕینەکانیان دەربارەی گەردوون، واتە چنراوی گەردوونی.

٤- ئایەتە پیرۆزەکە ئەوەی دووپات کردووە کە ئەوانەی ئەم (رتق)ە گەردوونیە دەبینن بریتین لە بێباوەڕان لەوانەی کە باوەڕیان بە قورئان نییە، هەربۆیە گفتوگۆکەی ئاراستەی ئەوان کردووە ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾، لێرەدا دووبارە دەپرسینەوە و پرسیارێك ئاراستەی هەموو ئەوانە دەکەین کە دەڵێن قورئان لە دانانی موحەممەدە (ﷺ):

چۆن ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە (دروودی خوای لەسەربێت) توانی هەواڵ بدات بەوەی کە کەسانێك پاش ئەو دێن بە زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ کە بڕواداریش نین و دەتوانن پێکهاتەی چنراوی گەردوون بدۆزنەوە؟ و بەچاوی خۆیان دەزووەکانی ئەم چنراوە گەردوونیە دەبینن؟

باشە ئەگەر موحەممەد (ﷺ) خۆی نووسەری ئەم ئایەتانە بێت ئەی بۆچی ئەم دۆزینەوە مەزنەی نەداوەتە پاڵ خۆی یان نەتەوەکەی؟ بەڵکو دەیداتە پاڵ ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئیسلام نییە؟!!

## کۆتـایی:

ئەگەر ئەمڕۆ پرسیارێك ئاراستەی ئەو زانایانە بکەین کە ئەم چنراوە گەردوونیە ئالۆزەیان دۆزیەوە، و ملیارەها دۆلاریان سەرف کرد لە پێناوی کێشانی ئـەم وێنـە گەردوونیەدا، و پێیان بڵێین: راتان چۆنە کە ئەو شتەی ئێوە لە سـەدەی بیست و یەکدا دەیدۆزنەوە، کتێبێك کە لە سەدەی حەوتەمی زاینییەوە بوونی هەیە باسـی لێوەکردووە؟

ئەوان یەکسەر دەڵێن: ئەمە شتێکی مەحاڵە، هۆکەشی ئەوەیە کە قسـەکردن و هەواڵدان دەربارەی بوونی پێکهاتەیەکی چنراو بۆ گەردوون و قسەکردن دەربـارەی (الرتق) و (الفتق) پێویستی بە دووربینی گەورەکەر و بینگەی جۆراوجۆر هەیـە کـە لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا دابنرێن، و پێویستی بـە هـەزاران توێـژەرەوە هەیـە بـۆ کێشـانی نەخشـەکانی ملیۆنـەها گەلەسـتێرە، و دیـاریکردنی شـوێنەکانیان و لێکدانـەوەی شـەبەنگەکانیان، هـەروەها ئەمـە پێویسـتی بـە بـوونی ئامێرەکـانی سوپەر کۆمپیوتەری مەزن هەیە، و پێویستی بە خەرجیەکی یەکجار زۆر هەیە، کـە ئەم ئیمکانیەتانە تەنها لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا بەدەست هاتوون، ئـیتر چـۆن مرۆڤێك لەخۆیەوە دەتوانێت هەواڵ بە بوونی ئەم چنراوە بدات؟!!

ئێمە پێیان دەڵێین: بەڵێ! ووتەکەی ئێوە راستە ئەگەر ئەم قورئانە لە دانـانی مرۆڤ بووایە، بەڵام ئەم قورئانە ووتەی پـەروەردگاری مرۆڤەکانـە (تبـارك وتعـالی)! ئیتر ئایا دڵ و دەروونتان ملکەچ نابێت بەرامبـەر ئـەم موعجیزەیـە کـە بەڵگەیـەکی مادییە لەسەر راستی کتێبی پەروەردگار و راستی پەیامی ئیسلام؟

دەکەواتە لەگەڵماندا گوێبگرن بۆ ئەم بەیانە ئیلاهیە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللهِ وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لاَ رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (یونس:٣٧).

**سەرچاوە:**

بابەتی: (النسيج الكوني ... بين العلم والقرآن) لە نووسینی (عبدالدائم الكحيل)/ کە لە گۆڤاری (الإعجاز العلمي) ژمارە (٢٤)ی (١٤٢٧ك)دا بڵاوکراوەتەوە/ لە بڵاوکراوەکانی (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

هەروەها بۆ روونکردنەوەی زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوانەی لە پێگەی ئینتەرنێتەوە وەرگیراون و نووسەر سوودی لێوەرگرتوون:

١- مەقالەیەك بەناونیشانی: ( How Filaments are Woven into the Cosmic Web) بەم ناونیشانە:

http://arxiv.org/abs/astro-ph/9512141

٢- مەقالەیەك بەناونیشانی: چنراوی گەردوونی (The Cosmic Web) لە سایتی گۆڤاری (زانایانی ئەمریکی):

http://www.americanscientist.org/template/IssueTOC/issue/521;jsessionid=aaagRvpcl2pjAe

٣- مەقالەیەك بەناونیشانی: ( Morphological Statistics of the Cosmic Web) بەم ناونیشانە:

http://arxiv.org/pdf/astro-ph/0405303

٤- مەقالەیەك بەناونیشانی: (چۆن گەلەستێرە سەرەتاییەکان لەدایکبوون؟) بەم ناونیشانە:

http://www.space.com/scienceastronomy/astronomy/spongy_universe_010522

٥- هەروەها بڕوانە ئەم مەقالانەش کە دەربارەی: چنراوی گەردوونی و تاریکە ماددە و دروست بوونی گەردوون و تەقینەوەی مەزن دەدوێن، کە بەم ناونیشانانە دەست دەکەون:

(1) http://www.nap.edu/books/0309073421/html/55.html.

(2) http://astron.berkeley.edu/mwhite/myresearc h.html#sims.
(3) http://www.scienceblog.com/community/older /1998/B/199801619.html.
(4) http://www.kva.se/KVA_Root/files/newspics/ DOC_2005217592_1296017045_popcrafoord05eng.a sp.
(5) http://www.eso.org/outreach/press-rel/pr- 2001/pr-11-01.html.
(6) http://www.iop.org/EJ/article/14757516/2005/ 01/009/jcap5_01_009.pdf.
(7) http://www.eso.org/outreach/press-rel/p n r- 2001/pr-11-01.html.
(8) http://www.eso.org/outreach/press-rel/pr- 2003/pr-18-03.html.
(9) http://www.americanscientist.org/template/A ssetDetail/assetid/29667?fulltext=true.
(10) http://www.sciam.com/article.cfm?articleID= 00006572-E34C 1C5E-B882809EC588ED9F.
(11) http://astron.berkeley.edu/mwhite/whatarec mb.html.
(12) http://snap.lbl.gov/teachins/white_5_21.pdf.

## ئیعجازی زانستی له فه‌رمووده‌ی په‌روه‌ردگار

(فلا أُقسمُ بما تُبْصرُون. وما لا تُبْصرُون)




په‌روه‌ردگار له قورئانه پیرۆزه‌که‌یدا سوێندی به‌زۆر شتی گه‌وره وگرنگ خواردووه، وه‌ك له ئایه‌ته‌كانی:(لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ القِيَامَةِ. ولا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ)، (فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُوم)، (فِلا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ)، (فَلا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ، الجَوَارِ الكُنَّسِ)، (وَالسَّمَاءِ والطَّارِق)، (وَالشَّمْسِ وضُحَاهَا، والْقَمَرِ إذَا تَلاهَا، والنَّهَارِ إذَاجَلاَّهَا)، (وَالضُّحَى، واللَّيْلِ إذَا سَجَى، مَا ودَّعَكَ رَبُّكَ ومَاقَلَى).

په‌روه‌ردگار سوێند به شتانێك ناخوات گه‌ر گه‌وره و پیرۆز نه‌بن، ئه‌مه وا له مرۆڤی موسوڵمان ده‌كات كه بیر بكاته‌وه و تێبروانێت له‌و شتانه و هه‌وڵبدات نهێنی و لایه‌نی گه‌وره‌بیان بدۆزێته‌وه، ئێمه‌ش له‌م بنه‌مایه‌وه ده‌مانه‌وێت تێروانینێك بۆ ئایه‌ته پیرۆزه‌كانی (فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، ومَا لا تُبْصِرُونَ) (الحاقة:٣٨-٣٩) بكه‌ین و ئیعجازی زانستیان ده‌ربخه‌ین و بیسه‌لمێنین كه ئه‌م راستییه زانستیانه‌ی قورئانی پیرۆز پێش چوارده سه‌ده هه‌واڵی پێداون له‌رۆژگاری ئه‌مرۆی دۆزینه‌وه زانستیه‌كاندا راستیه‌كانیان سه‌لمێنراوه.

(البصر) له زمانی عه‌ره‌بیدا بریتیه له (چاو) كه مرۆڤ به‌هۆیه‌وه ده‌بینێت، راڤه‌كارانی قورئان ده‌رباره‌ی ئایه‌ته‌كان به‌گشتی ده‌ڵێن: خوای په‌روه‌ردگار سوێند

بـه هـەموو دروسـتکراوەکان دەخـوات ئەوانـەی مـرۆڤ دەیانبینێـت و ئەوانەشـی نایانبینێت، کەواتە زۆر شت هەیە کە لە مرۆڤ شـارراوەیە و نایبینێـت، و زۆر شـتی تریش هەیـە کـە ئێسـتا نـایبینین بـەڵام لەوانەیـە لـە داهـاتوودا بیبیـنین، هەربۆیـە ووردەکاری زاراوەی قورئانمان بۆ دەردەکـەوێت کـە دەفـەرموێت (وَمَا لا تُبْصِرُونَ) واتە ئێستا نایبینن و نەیفەرمووە(بما لن تبصـروا) واتـە هـەرگیز نـایبینن، ئەمـەش بەخشندەیی پەروەردگارە بۆ مرۆڤ کە ئەو توانا عەقلیانەی پێداوە بۆ ئەوەی شـتە نهێنی و نەبینراوەکانی پێ ئاشکرا بکات.

چاو کە بەخششێکی پەروەردگارە بۆ مرۆڤ کێشی تەنها ٨ گرامە، تەنها لە یەك چین لە چینەکانی تۆڕی بینـین لـە چـاودا ٥٠٠ ملیـۆن خانـەی هەسـتەوەری بیـنین (Rods and Cons Photoreceptors) هەیە، ٨ ملیۆن خانەی (قوچەکی) تایبەت بە رووناکی بەهێز و ١٥٠ ملیۆن خانەی (چیلکەیی) تایبەت بە روونـاکی کـز هەن، لـە چـەقی چـاوەوە دەمـاری بیـنین (Optic Nerve) دەردەچێت بـەرەو سەنتەری بینین لە مێشکدا کە لە نیو ملیۆن ریشاڵی دەماری پێکهاتووە و رووناکی دەگەیەنێتە مێشك کە دەیکاتە وێنەیـەکی بینـراو، خێرایـی گەیانـدنی وێنـەکان لـە دەماری بینیندا دەگاتە ١٠٠٠ جار لە چرکەیەکدا! (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٤٩٣**)

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلاَ تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات:٢١).



حیکمەتی پەروەردگار لەوەدایە کە لە کاتی رۆژ و شەودا ئەم خانانە بەسەرە کاردەکەن کە دەبێتە هۆی پاراستنیان لە فەوتان، ئەگەر تاریکایی بەردەوام بێت ئەوا چاوەکان رەشاییان بەسەردا دێت، وەك ئەوەی بەسەر کەشتیوانە ئاسمانییە یەکەمەکاندا هات (وەك: یۆری گاگارین) کاتێك چوون بۆ بۆشایی ئاسمان تەنها ئاسمانێکی رەش و تاریکیان بینی کە بە ئەستێرە دەدرەوشێتەوە، بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە کە پەروەردگار ئەم نهێنییەی لە ئایەتێکی تردا دەرخستووە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَاباً مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ، لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ (الحجر: ١٤-١٥).

## شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان و جیهانی بینراو و نەبینراو:

کاتێك ئیسحاق نیوتن (١٦٤٢-١٧٢٧) ئاوێزەیەکی شوشەی لەرێڕەوەی گورزەیەکی روناکیدا دانا بینی ئەم تیشکە کە رەنگی سپیە شیبووەوە بۆ ٧ رەنگ کە لە رەنگی وەنەوشەییەوە دەستپێدەکات بۆ سووری تۆخ و سەلماندی کە رەنگی سپی تیشکی خۆر لەمانە پێکهاتووە، رووناکی بریتیە لە شێوەیەك لە شێوەکانی ووزە و بەشێکە لە شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان (Electromagnetic waves) کە لە شەپۆلە گەردوونیە زۆر کورتەکانەوە دەست پێدەکات و درێژی شەپۆلەکەی وردە وردە زیاد دەکات تا دەگاتە شەپۆلە لاسیلکیە درێژەکان کە لە رادیۆ و تەلەفیزیۆندا بەکاردێن، چاوی مرۆڤ تەنها دەتوانێت ئەو شەپۆلانە ببینێت کە درێژییەکانیان لە ٤٠٠ نانۆمەترەوە[٧٦] دەستپێدەکات لە رەنگی وەنەوشەییەوە بۆ ٧٠٠ نانۆمەتر لە رەنگی سووردا، چاوی مرۆڤ ناتوانێت باقی شەپۆلەکانی تر ببینێت کە لە سەروو و خوارووی ئەم لەرەوەیە، وەك: تیشکی گەردونی، تیشکی گاما و ئێکس و سەروو وەنەوشەیی و ژێر سوور و شەپۆلەکانی رادار و شەپۆلە رادیۆییەکان، کە ئەم تیشکانە

---

[٧٦] بریتیە لە ١ لە ملیۆن بەشی میللیمەترێك.

بەکارهێنانەکانیان لەژیاندا زۆر زۆرە و دەتوانین شوێنەوارەکانیان لەسەر فیلمە هەستیارەکاندا ببینین، بەتایبەتی تیشکی ژێر سوور (Infrared rays) و گاما (Gamma rays) و تیشکی ئێکس (X-rays) کە شەپۆلی کارۆموگناتیسی نەبینراون بەڵام چەندین بەکارهێنانی بەسوودی رۆژانەیان هەیە و بەهۆی کاریگەریی و شوێنەوارەکانیان لەرۆژگاری ئەمڕۆدا دڵنیابووین لە بوونیان، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەم تیشکە نەبینراوانە بەهۆی ئامێرە زانستیەکانەوە بەکاردێن بۆ وێنەگرتن و پیشاندانی ئەندامە نەبینراوەکانی ناو لەشی مرۆڤ.

(بڕوانە وێنەی رەنگاورەنگی لاپەڕە ٤٩٤)




تەکنەلۆجیای نوێ کە پشت بە شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان دەبەستێت یارمەتیدەر بوون بۆ فراوان کردنی بازنەی بینینمان بۆ ئەو شتانەی پێشتر نەماندەبینی، زۆرێك لە زیندەوەرە وردەکان تا دۆزینەوەی وردبینی روناکی لێمان شارراوە بوون، پاش داهێنانی وردبین (میکرۆسکۆب) لە سەدەی حەڤدەیەمی زاینیدا مرۆڤ زۆر شتی بینی کە پێشتر نەیدەبینین لە خانەکانی بەکتریا و قەوزە و کەڕوەکان و توانی ببینێت چۆن خۆراك پەیدادەکەن و چۆن دابەش دەبن و چۆن

میکرۆبەکان هێرش دەکەنە سەر خانەکانی لەشمان و چۆن خرۆکە سپیەکانمان کە پێکهێنەری سەرەکی کۆئەندامی بەرگری لەشمانن بەرەنگاریان دەبنەوە، بەهۆی میکرۆسکۆبەوە مرۆڤ سەلماندی کە هەردوو تۆو و هێلکۆکە پێویستن بۆ دروستبوونی کۆرپەلە و سکپڕی ئەمەش پاش چەندین سەدە لە ئاماژەدانی قورئان بەم بابەتە، مرۆڤ بەچاوی خۆی بینی چۆن ئەندامەکانی لە شانەکان دروست دەبن و چۆن شانەکانی لە خانە پێکهاتوون.

پاشان وردبینی ئەلیکترۆنی (Electronic Microscope) داهێنرا کە بینینی مرۆڤی بردە ئاسۆیەکی نوێوە و مرۆڤ توانی پێکهێنەرەکانی خانە و ترشی بۆماوەیی (DNA) و جینەکانی بۆماوە ببینێت ﴿وَفِي الأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ، وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی وردترین شتێك کە نایبینین کە ئەلیکترۆنە بەکاردەهێنێت بۆ پیشاندانی وردترین پێکهاتەکانی خانەکان و کارەکانیان. (بڕوانە وێنەی لاپەڕە ٤٩٤)

لێرەشدا با ئەو پێشکەوتنە گەورەیە لەبیرنەکەین کە لە بواری دووربینە (تەلیسکۆبە) گەردوونیەکاندا بەدەستهاتووە کە وای لەمرۆڤ کردووە بتوانێت تەنە ئاسمانیە هەرە دوورەکان و وردەکاری ئەستێرەکان و هەسارەکان ببینێت.



مرۆڤ توانی بگاتە سەر رووی مانگ و بەچاوی خۆی خاکەکەی بینی و توانی کەشتیە ئاسمانیەکان بنێرێت کە سەرسوڕهێنەکانی گەردوونی پیشاندایین، شتانێك کەسانی پێش ئێمە هەرگیز نەیانبینی.

هەناوبینـە پزیشکیەکانیش (Endoscopes) مرۆڤ توانی بەهۆیانەوە ووردترین پێکهاتەکانی ناو لەش ببینێت و شۆڕشێکی بەرپاکرد لە زوو دۆزینەوەی نەخۆشیەکاندا و ئەنجامدانی نەشتەرگەریە میکرۆسکۆبیەکان بەبێ رووداني زیانی لاوەکی، توانرا هەناوبینە ووردەکان بخرێتە ناو منداڵدانەوە بۆ وێنەگرتنی قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا، ئەمە یارمەتیداین کە کۆمەڵێك راستی تێبگەین دەربارەی کۆرپەلەزانی کە هەرگیز پێشتر نەتوانراوە ببینرێت بەڵام قورئان پێش ١٤ سەدە زۆر بە ووردیی وەسفی کردووە.

پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر زانا لینارت نیلسۆن (Lennart Nilson) توانی وێنەی قۆناغە جیاوازەکانی دروستبوونی کۆرپەلە بگرێت هەر لە سەرەتای سکپڕیەوە تا لەدایکبوون کە بەهۆی ئەم کارەوە خەڵاتی نۆبلی وەرگرت.

لەو شتانەش کە پێشتر نەماندەبینی ئەو کارلێکانە بوون کە لە ماوەی هەرە کورتدا روویاندەدا، وەك یەکگرتنی گەردیلەی ماددەکان، ئێمە دەتوانین گەردیلەی ماددەکان بەهۆی بەکارهێنانی میکرۆسکۆبەوە ببینین بەڵام نەماندەتوانی کارلێکی ئەم گەردیلانە بۆ دروستکردنی گەردی نوێ ببینین تاوەکو پەروەردگار ئەم کارەشی ئاسانکرد لەسەر دەستی زانای موسوڵمان (د.أحمد زویل) کە بەهۆیەوە خەڵاتی نۆبڵی لە کیمیادا لەساڵی ١٩٩٩دا پێبەخشرا، ئەویش بە بەکارهێنانی کامیرای لەیزەری کە لەماوەیەکی هەرە کورتدا ($10^{-15}$)ی چرکەیەك کە پێیدەووترێت (فیمتۆچرکە) وێنەدەگرێت، لەمانەی سەرەوە ئەوە تێبینی دەکەین کە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ هەیە لەنێوان ئەو رووناکیەی کە دەیبینین و

بەکارهێنانی بۆ بینینی ئەو شتانەی کە نایانبینین، بەشێوەیەك کە دوو ئایەتە پیرۆزەکەش هەمان پەیوەندی نێوان ئەم دووانەشی دەرخستووە !

شەپۆلە سەروو دەنگییەکانیش[77] بەکاردێن بۆ وێنەگرتنی ناولەش و بەدواداچوونی سکپڕی، لەرینەوەی موگناتیسیش (الرنين المغناطيسي) بەکاردێت بۆ وێنەگرتنی پزیشکی کە وێنەی دەستنیشانکەری سەرسوڕهێنەری شانەکانی لەش پیشاندەدات، ئەوەی تا ماوەیەکی نزیکیش نەماندەبینی و لێمان شاراوە بوو بریتییە لە قووڵایی دەریا و زەریاکان و ئەو سەرسوڕهێنەرانەی کە تێیاندایە کە بەهۆی ژێردەریایی و روناککەرەوەکان و کامێرا ووردەکان توانیمان ئەو دونیا سەمەرەیە ببینین کەمایەی سەرسوڕمان و رێزمانە ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّنفَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْيَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾(النور:٤٠).

ئەوەی کەمایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە لەدایك دەبن و بێبەشن لە نیعمەتی بینین پەروەردگار هەستێکیان دەداتێ کە بەهۆیەوە بتوانن دەنگەکان بەشێوەیەك لەیەکتری جیابکەنەوە کە مرۆڤی بینەر ناتوانێت بیکات و دوورییەکانیش دیاری دەکەن، کە ئەمە لەزانستی پزیشکیدا پێیدەوترێت هەستی شەشەمی مرۆڤی نابینا، کەواتە دەتوانین بڵێین ئەوانەی بینین لەدەست دەدەن بەهۆکاری تر دەتوانن ببینن بەڵام ئەوانەی کە ئیمان لەدەست دەدەن لەسەر زەوی چەندین بەڵگە دەبینن لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار بەڵام نایبینن بەدڵەکانیان، کەواتە ئەوەی بینایی لەدەست دەدات هیچ زەرەری نەکردووە بەڵام ئەوەی بەرچاورۆشنی نەماوە هەموو شتێکی لەدەستداوە ﴿فإنها لا تعمى الأبصار و لكن تعمى القلوب التي في الصدور﴾.

---

[77](شەپۆلەکانی سۆنەر Ultrasound Waves).

لەکۆتاییدا ئەمەی باسکراوە مشتێکە لە خەرواری ئەو بەڵگانەی کە بینیومانن و بۆی دەرخستووین بۆچی پەروەردگار سوێندی خواردووە بەوانەی دەیانبینین و ئەوانەشی نایانبینین.

تاوەکو مرۆڤیش لەرووی زانستیەوە بەرەوپێش بچێت کەمی زانیارییەکانی خۆی بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر زانیاری و دەسەڵاتی پەروەردگار، پەروەردگار زۆر جوانی فەرمووە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْأَنَّهُ الحَقُّ أَوَ لَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيد﴾.

## رووی ئیعجازی ئایەتەکان:

١- پێشتر وادەزانرا بینین بەهۆی دەرچوونی تیشکی رووناکیەوە دەبێت کە لەچاوی مرۆڤەوە دەردەچێت، کە هەڵەی ئەم بۆچوونە بەتەواوەتی دەرکەوت کاتێك زانایان دۆزیانەوە کە بینین بەهۆی تیشکدانەوەی رووناکی لەسەر رووی تەنەکانەوە و گەیشتنی بەچاوی مرۆڤ دروستدەبێت، کەواتە بینین لەبوونی رووناکیدا دەبێت و بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ لەتاریکیدا نابینێت، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بە گرنگی رووناکیداوە لەبینیندا پێش ١٤٠٠ ساڵ کە دەفەرموێت: ﴿فَلاأُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، ومَا لا تُبْصِرُونَ﴾ واتە چاو هۆکاری روناکی بینین نیە چونکە چاو دەبینێت و ناشبینێت.

٢- بەدواداهاتنی شەو و رۆژ زۆر گرنگە بۆ بەردەوامبوونی بینین و بەکارهێنانی خانەکانی بینین، زانستی نوێش گرنگی خانە قوچەکی و چیلکەییەکانی بۆ دەرخستوین کە لەرۆژ و لەشەودا کاردەکەن و ئەگەر ئەم بەدوادا هاتنە نەبوایە ئەوا لەناو دەچوون.

٣- قورئانی پیرۆز سەرنجی راکێشاوین بۆ ئەو دۆزینەوە گەورانەی کە زانایان پێیگەیشتوون لە تەکنەلۆجیا نوێیەکان و هۆیەکانی بینین، هەروەها سەرنجی

راکێشاوین بۆ زۆر شت کە پێشتر نەماندەبینین لەبەر ووردییان، وەك: خانەی بەکتریا و قەوزە و کەڕوەکان وچۆنێتی زۆربوونیان و لەناولەشدا چۆن خڕۆکە سپیەکانی خوێن بەرەنگاریان دەبنەوە و چۆن هەردوو تۆو و هێلکۆکە گرنگن بۆ دروست بوونی کۆرپەلە.

٤- ئایەتە پیرۆزەکە هانمان دەدات بۆ فێربوونی زانست و بەردەوام بوون لە لێکۆڵینەوە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەوەی دەیسەلمێنێت کە فیکری ئیسلامی فیکرێکی زانستییە داواکاری قورئانە لە مرۆڤەکان بۆ بەکارهێنانی ژیرییان تا کۆتایین رادده: ﴿قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ والأَرْضِ﴾ ، ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَبَنَيْنَاهَا وزَيَّنَّاهَا﴾.

٥- قورئانی پیرۆز هەواڵی پێداوین کە مرۆڤ پێکهاتەی سەرەتایی شتەکان دەدۆزێتەوە: ﴿ولَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الأُولَى فَلَوْلا تَذَكَّرُونَ﴾، لە سەدەی هەژدەیەمەوە مرۆڤ کەوتە دۆزینەوەی پێکهاتەی شتەکان، قورئانی پیرۆزیش هەواڵی پێداوین کە گەردیلە کێشیهەیە و هەروەها لە گەردیلە بچووکتریش هەیە کە کێشیان هەیە: ﴿عالم الغيب لا يعزب عنه مثقال ذرة في السماوات ولا في الأرض ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتاب مبين﴾ (سبأ:٣)، ئەوەبوو مرۆڤ تەنها لەسەدەی نۆزدەیەمەوە تا ئەمڕۆ گەردیلە و پێکهاتەکانی دۆزییەوە و بۆی دەرکەوت کە هەندێکیان کێشیان هەیە.

قورئانی پیرۆز هەواڵی پێداوین کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر یاسایەك دامەزراون کەناوی ناوە (حەق): ﴿خلق السماوات والأرض بالحق تعالى عما يشركون﴾ (النحل:٣)، لەسەدەی حەڤدەیەمەوە تا ئەمڕۆ زانست زۆرێك لەو یاسایانەی دۆزیوەتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر دامەزراوە، و ئەمڕۆ زانست بەم چوار هێزە سەرەکیەی گەردوون کورتی کردۆتەوە: هێزی کێشکردن، هێزی کارۆموگناتیسی، ناوکەهێزی بەهێز، و ناوکەهێزی لاواز، پەروەردگار سوێندی

خواردووه كه له گەردووندا شتی بینراو و نەبینراو هەیە: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ. وَمَا لا تُبْصِرُونَ﴾، لەسەدەی حەڤدەیەمەوەتا ئەمڕۆ زانست هێزی بینراو و نەبینراو دەدۆزێتەوە و راستیی ووتەكەی پەروەردگار له قورئاندا دەسەلمێنێت: ﴿فسبحان الله حين تمسون و حين تصبحون. و له الحمد في السموات و الأرض و عشيا و حين تظهرون﴾.

**سەرچاوەكان:**


١- قورئانی پیرۆز و تەفسیرەكانی.

٢- المنجد: لويس معلوف.

٣- خلق الإنسان بين الطب و القرآن: د.محمد علي البار.

٤- رحلة الإيمان في جسم الإنسان: د.حامد أحمد حامد.

٥- گۆڤاری (الإعجاز العلمي) بڵاوكراوەی: (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن و السنة)، ژمارە (٢١) ساڵی (١٤٢٦ك).

# سەرەتایەك دەربارەی زانستی خۆپاریزی پزیشكی (الطب الوقائي) لە ئیسلامدا

نموونەیەكی تر لەو شتانەی مرۆڤ بە چاو نایبینێت، و ئەمرۆ بەهۆی مایكرۆسكۆب (Microscope) و ئامێرە زانستیەكانەوە دۆزراونەتەوە، زیندەوەرە زۆر وورده‌كانن، وەك: ڤایرۆس، و بەكتریا، و خانە سەرەتاییەكان، و زیندەوەرە مشەخۆرەكان، كە بە تەواوی دەوروبەری ئێمەیان گرتووە و لە هەموو شوێنێكدا هەن: لە هەوادا، لە ئاودا، لە خاكدا، و تەنانەت لە خۆراكیشدا هەن، كە هۆكارێكی كاریگەرن لە ژیانی رۆژانەماندا، و دەبنە هۆی تووش بوونی مرۆڤ بە نەخۆشی جۆراوجۆر.

ئیسلام بەرنامەیەكە بۆ دابین كردنی هەموو لایەنەكانی دین و دنیای مرۆڤ، وەك چۆن بنەماكانی دەسەلات و پەیوەندیە كۆمەلایەتی و یاسا ئابووریەكان دیاریدەكات، بەرنامەیەكی گشتگیری بێوێنەشی بۆ تەندروستی مرۆڤ هەیە، كە تەندروستی جەستەیی و ژیریی و رەووشت و دەروونیش دەگرێتەوە، لێرەدا بەیارمەتی پەروەردگار چەند لایەنێكی ئەم بەرنامەیە ڕووندەكەینەوە سەبارەت بە پارێزگاریكردنی تەندروستی، كە لە رۆژگاری ئەمرۆدا زانستێكی تایبەت بۆ ئەو بووارە دانراوە پێیدەوترێت (الطب الوقائي Preventive or Community Medicine) یان (زانستی خۆپارێزی).

بەپێی زانستی خۆپارێزی هۆكارە سەرەكیەكانی تووشبوون بە نەخۆشی بریتین لە:

١-زیندەوەرە ووردەكان. ٢-مادده ئەندامی و نائەندامیەكان. ٣-ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی تێكچوونی باری دەروونی ونەفسیەوە تووشی مرۆڤ دەبن.

زیندەوەرە ووردەکان هۆکاری سەرەکی تووشبوونی مرۆڤن بە نەخۆشی، وەك باسمان کرد لە هەموو شوێنێکدا هەن: لە هەوادا، لە ئاودا، لە خاکدا، لەسەر لەشمان و لەناو دەمماندا، تەنانەت لەو خۆراکانەشدا کە دەیخۆین، چەندین جۆری جیاوازیان هەیە، قەبارەیان جیاوازە، ڤایرۆسەکان بچووکترینیانن کە قەبارەیان لە (١٠ – ٣٠ نانۆمیتەر)دایە، پاشان میکرۆبەکان (بەکتریا) کەدەگەنە (١٠٠٠ نانۆمیتەر)، پاشان کەڕووە سەرەتاییەکان، پاشان کرمە مشەخۆرەکان و مێرووەکان.



وێنەی ڕاستەقینەی هەندێك بەکتریای نەخۆشی لە جۆری خڕ و چیلکەیی

لەشی مرۆڤ زەویەکی بەپیتە بۆ زۆرێك لەم زیندەوەرانە، بە تایبەتی لەناو لووت و قوڕگ و کۆئەندامی هەناسە و لەسەر رووی پێست و کۆئەندامی

هـــەرس (واتـــە ریخۆلەکان)، لـــەگەڵ ئـــەمەشدا لـەشی مرۆڤ لـــە جەنگێکی بەردەوامدایە لە دژی ئـــــەم زیندەوەرانە لـــــەرێگەی کۆئەندامی بەرگریـەوە[٧٨]، کە چەندین رێگەی بەرگری جۆراوجۆر بەکاردەهێنێت کە پێکهێنـەری ســـەرەکی ئەم بەرگرییە خـــرۆکە سپیەکـــانی خوێنـن، بـــەڵام هـــەندێ جـــار لـــەشی مـرۆڤ تـــووشی شکست دەبێـت بەرامبـەر بـــــەم زیندەوەرانـە و مـرۆڤ تووشـی نـــەخۆشی دەکەن، هەربۆیە لـە ئیسلامدا زۆر گرنگیـدراوە بـە خۆپاراستن لـــە نەخۆشی.

---

[٧٨] لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی تێدایـە بـۆ ئـەم راستیە، لـــە ســـوورەتی (الطـارق)دا خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ {٤}﴾، واتـــە: سوێند بێت کە هیچ کەسێك نییە چـاودێر و پارێزەری نـەبێت کـە فریشـتەکانن وەك موفەسیرەکـــان باسیـــان کـردووە، بـەڵام لـــە رۆژگـــاری ئەمڕۆمـــــاندا مانـــایەکی تـــری ئایەتەکەمـــان بـــۆ روونبووەتـــەوە کـە لـەناو لەشـی هـەموو مرۆڤێکیشدا پارێزەرێکی کـــاریگەر هەیە کە بریتییە لە کۆئەندامی بەرگری.

زانایـان بۆمـان بـاس دەکـەن کـە کۆئەنـدامی بەرگـــری (Immunity System)ی مـرۆڤ لـەم بەشـانە پێـك دێـت: ١- بـــەرگری سروشـتی (المناعـة الطبیعیـة Natural Immunity) کـــە خۆڕسـکانە لـــە لەشـدا و بـە بـەردەوامی هەیـە، وەك: رژێنـەکانی ســـەر لەشـی مـرۆڤ لـە پێسـت و رووپۆشی ئەندامەکـــان (فرمێسك، ئارەق، لیك، بەڵغەم)، کـــە مـــاددە زیـــانبەخشەکان رادەماڵن و ماددەی دژە بەکتریا و میکرۆبیـــان تێـــدایە، هـــەروەها خـــرۆکە سپیەکانی خـوێن کـە گـرنگترین هێڵی بەرگری لەشی مرۆڤ پێکدێنن.

٢-بەرگریی وەرگیراو (المنـــاعة المکتسبة Acquired Immunity)، کـــە بـــە هـۆی چـوونە ناوەوەی مـاددە زیـانبەخشەکانەوە لەشـی مـرۆڤ فێـری دروسـتکردنی دژەتـەن دەبێـت بەرامبـەریان و بـــەردەوام لـــەناویان دەبـات، ئـەم کۆئەنـدامی بەرگریـە ئایـەتێکی گەورەیـە بـۆ مـرۆڤ، بڕوانـە لـەم گەردوونـەدا مـرۆڤ لەنـــاو ئـەم هـەموو مـــاددە ترسنـــاك و خەتەرناکـــانەدا دەژی، هـــەر لـــە دووکەڵی کارگەکـــان و سەیارەکـان، ئـەو بەکتریـــا و میکرۆبانـەی کە لە هـەوا و هـەموو شـوێنێکدا هەن، هەروەهـــا ئـــەو مێروانـــەی چەندین نەخۆشی هەڵدەگـــرن، ئەگـــەر کـــۆئەندامی بـــەرگری نەبووایـە مـرۆڤ بـــەرگەی چـــەند کـــاتژمێرێك زیـــاتری نـــەدەگرت لـــە ژیانـدا، بـــەڕاستی دروستکراوێکی گەورە و گرنگە و ئامـــاژەی قورئـانیش بـەم بابەتـە نموونەیـەکی بـەرزی تـری ئیعجازە زانستیەکەیەتی.

لـــه فەرموودەكــــانی پێغەمبـــەردا (ﷺ) چـەندین ئامۆژگـــاری بەسـوود دەبیـنین كــــە بنەمـــا ســەرەكیەكانی زانسـتی خۆپـــارێزی پێكـدەهێنێت، پێغەمبەری مەزن و پەیامەكەی سووربوون لەسەر ئەوەی مرۆڤی موسوڵمان بەدوور بگـرن لـــە تووشـی زیـانبوون بـــەم زیندەوەرانــــە، و كـــاركراوە بـۆ ئـەوەی كۆگاكـــان هەڵگرتنیان لەنـــاو ببرێـــت، ئێستـــا بـــا بچینـــە خزمــــــەت گەنجینەیەك لـە فەرموودەكـــانی پێغەمبـەر (ﷺ) بـــۆ ئـەوەی بزانین چــــۆن ئامۆژگـــاریمان دەكات.

## نمـــــوونەی یەكەمـــان لـــەسەر دەستنوێژ گرتنە:

لـــە فەرموودەیەكـدا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـــەرموێت: ﴿الطَّهُورُ شَطْرُ الإِيمانِ﴾ (رواه مسـلم)، الطهـور: واتـــە پـــاك وخـاوێنی بـە گشـتی، یـــان دەستنوێـــژ گـــرتن، بەشێكی گـــەورەی ئیمانە.

لە فەرموودەیـــەكی تردا هـانی چـــاك دەستنـوێـــژ گرتنمـــــان دەدات و دەفەرموێت: ﴿مَن تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوضوء خَرَجَت خَطاياهُ مِن جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِن أَظْفارِهِ﴾ (رواه مسلم)، واتـە: هـەر كەسێك بـــە بـــاشی دەستنوێژ بـــگرێت، ئـــەوا تــــاوانەكانی لــــەگەڵ چـــۆڕینی ئـــاوی دەســتنوێژەكەی لـــــە نینۆكەكــــانیەوە تاوانەكانیشـــی ئـــاوا لێدەبێتـــەوە و پـــاك دەبێتـــەوە، وەك هەمـــوومـــان دەزانیـــن مرۆڤـی موســـوڵمـــان ڕۆژانــــە (٥) جـــار دەستنوێژ دەگرێـت، كـــە تیایـدا دەم وچـاو و دەسـت و قـۆڵ و قـــاچەكانی دەشـوات، هەروەهـــا پێغەمبـەر (درووود و ســـەلامی خـــوای لــــە ســــەر بێـــت) ئامۆژگاریمـــان دەكـــات كـــە هـــــەر ئەندامەی ٣ جار بشۆردرێت.

ئـاو هۆكـارێكی سـەرەكی خـۆ پاكردنەوەیـە، لەبـەر ئـەوەی لـە بـاری پـاكیی ئاساییدا ئـــاو ژینگەیــــەكی نەگونجـــاوە بـــۆ گەشـــەكردنی میكرۆبـەكان، سەرچاوە پزیشكیەكـــان دەریدەخــــەن كــــە پێست كۆگایەكە بۆ ژمارەیـەكی

زۆری بە کتریا و کەڕووەکان، لەسەر پێستی ئاساییدا ژمارەیان دەگاتە نزیکەی (١٠هەزار- ١٠٠هەزار) لە هەر سانتیمەتر چوارگۆشـــەدا، و لـــەو شوێنانەی کە بەدەرەوەن (١-٥ملیۆن)، و لـــە شوێنە شێدارەکانیشدا دەگاتە (١٠ملیۆن) لـە هـــەر سانتیمەتر چوارگۆشـەیەکدا، کردنـی ئـاو بەسـەر رووی پێسـتدا لـەکاتی دەستنوێژدا دەبێتە هۆی لابردنی لە ٩٠٪ی ئـــەو میکرۆبـــانە، ئەگەر تێبینی ئەو ئەندامـــانە بکـەین کـــە لـــەکـــاتی دەستنـــوێژ گرتنـــدا دەیـــانشۆین، بەراستی ئیعجازی قورئـان و سوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) هەست پێدەکـــەین، چونکە دەم و لووت کە سەرچـــاوەی سەرەکی چوونە ژوورەوەی میکرۆبن بۆ نـاو لەش، پاشان قۆڵ و قاچەکـــان کـــە زۆربـــەی کـــات بـــە دەرەوەن ڕێـــژەی میکـرۆب تیایانـدا زۆر زیـاترە (وەك باسمـــان کـرد ١-٥ ملیـۆن/ سـانتیمەتر چوارگۆشـەدا)، هـەروەها لەبـەر گرنگـی دەسـتەکان لـە گواسـتنەوەی میکرۆبـدا، لەبەرئـــەوەی بـــەرخـــواردن دەکـەوێت، جگـــە لـــەکـــاتی دەســتنوێژیش ئـــەمرمـــان پێکـــراوە کـــە بیشۆیـــن، پێـــش خـــواردن و دوای خـواردن، و پاش لە خەوهەستان. (**بڕوانە وێنە ڕەنگاورەنگەکانی لاپەڕە ٤٩٥**)

لێرەدا پێمباشە ئەم نموونەیەتان بۆ باسبکەم کە (د. عبدالصبـــور شـــاهین) هێناویـەتی سـەبارەت بـە سـەربازە موسـوڵمانەکانی نـــاو سوپـــای فەرەنســـا لـــە جـەنگی جیهـــانی دووەمدا، کاتێك کە ئەفسەرەکانی سوپای فـــــەرەنسا تێبینی ئـــەوەیان کرد کـــە زۆرێك لـــە سەربازەکـــانیان تـــووشی هـەوکردن و ڕەشبـــوونەوەی پەنجەکـــانی پێیـــان دەبوون، بـــەڵام بینییـان ئـــەو سـەربازە جەزائیری ومەغریبیە موسوڵمانانەی کـــە لـــە سوپـــاکەیاندا بـــوون بـــەهیچ جۆرێـــك دووچـــاری ئـــەو حـــاڵەتە نـەدەبوون، کـــە لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر کـرد بـــۆیان دەرکـەوت کـە هۆکـاری ئـەم پاراستنـــە بریتـی بـــووە لـــەوەی کـــە سـەربازە موسـوڵمانەکان هـەموو ڕۆژێـك ٥ جـــار پۆستاڵەکـــانیان و

گـۆرەویەکانیان دادەنا، و قاچیـــان دەشـــۆرد لـەکاتی دەسـتنوێژ گرتنـدا، کـــە ئەمە پاککردنەوەی قاچەکانیان بوو لە میکرۆبـەکان و بـووە هـۆی پاراسـتنیان لـە توشبوون بەو حاڵەتە ترسناکە.

لە لایەکی ترەوە (د. أحمد شەوقی ئیبراهیـم) کـــە ئـــەندامی (کۆمــــەڵەی پزیشـکیی شاهـــــانەی بەریتــــانیا)یە، باسـی ئـەوەمان بـۆ دەکـات کـە زانایـان گەیشتوونەتە ئـــەو راستیەی کـــە: کاتێك تیشکی روونـــاکی دەکـــەوێتە سـەر رووی ئـەو ئاوەی بـە رووخسـاری مرۆڤـی دەسـتنوێژ گرەوەیـــــە، دەبێتـــە هـۆی پەیدابوونی ئایۆناتی سالب و کەمکردنەوەی ئایۆناتی موجەب، کە ئەمـە هۆکارێکـە بۆ هێمن بوونەوە و خـــــاوبوونـــــەوەی دەمارەکـــان و ماسـولکەکانی لـەش و مـرۆڤ رزگـاری دەبێـت لـە ئـازارە ماسـولکەییەکان و حاڵـــــەتی دڵـــــەراوکێ و خـــــەوزڕان، کەواتــە ئـاو هێزێکـی ئەفسـوناوی هەیـە، وەك یـەکێك لـە زانـا ئەمریکیـەکان دەڵێـــت: (پـرژە ئـــاوەکانی ســـــەر دەم و چاو و دەستەکـــان (کـــــە مەبـــــەستی دەسـتنوێژ گـرتن)ە باشـترین هۆکـارە بـۆ هـێمن بوونـەوە و لابردنی دڵەڕاوکێ).

سـەرەڕای دەسـت نوێـژگرتن مرۆڤـی موسـوڵمان فەرمـــانی پێکـراوە هـەموو ئەندامەکـانی لـــەشی بشوات (ســـەر و لەشـی)، تەنـــانەت لـە ۱۷شـوێن و کاتـدا خۆشـتن سوننـــەتە، و پێغـــەمبەر (ﷺ) ئامۆژگـــاری ئیمـــاندارانی پێکـردووە، تەنانـەت وەك حـەقێکی خـودایی بەسـەر بەندەکانـەوە باسـی کـردووە، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿حَقُّ الله عَلى كُلِّ مُسْلم أَن يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيّام يَغْسِل رَأْسَهُ وَ جَسَدَهُ﴾ (رواه البخاري ومسلم).

واتـە: مرۆڤـی مـــوسوڵمان لـــەسەری واجبـە هـــەر حـەوت ڕۆژ جارێـك خـۆی بشـــوات (ســـــەر و لــــەشی)، لــــە کـاتی خۆشتنیشـــــدا زیـــاتر لـــــــە ۹۰٪ی میکرۆبەکان لـــە سەر رووی پێست لا دەبرێن.

**ئێستا بـا بچینەسەر نموونەیەکی تر لە سوننـەتەکـانی پێغەمبەر (ﷺ) کە بریتین لە: سوننەتەکانی "فیترەت":**

لـە فەرموودەکـانی پێغـەمبەردا (ﷺ) هـاتووە کـە (١٠)شت هـەیە سوننەتی هـەموو پێغەمبـەران بـووە، ئـەو سوننەتانەش لـەم فەرموودەیـەدا هاتووە: پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ﴿عَشْرٌ مِنَ الفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَ إِعْفاءُ اللِّحْيَةِ، وَ السِّواكُ، وَ اسْتِنْشـاقُ الماءِ، وَ قَـصُّ الأَظـافِرِ، وَ غَسْـلُ البَراجِمِ، وَ نَتْـفُ الإِبْطِ، وَ حَلْقُ العانَةِ، وَ انْتِقاصُ الماءِ (الإِسْتِنْجاء)، قال الراوي: وَنَسيتُ العاشرة إلاّ أَن تَكون (المَضْمَضَة)﴾ (رواه مسلم)، ئەم سوننەتـانە بریتین لـە بنەمـایەکی گـەورە و گرنگـی پـاك وخـاوێنی لەشـی مـرۆڤ، چـونکە هـیچ شـوێنێکی لەشیان نەهێڵاوەتەوە کـە گرنگ بێت بـۆ گەشەکردنی میکرۆبـەکانی نەخۆشی، کـە فەرمـان نەکرابێـت بـە پـاککردنەوەی بە بەردەوامی.

بۆنموونە: (مضمضة) کە بریتییە لە ئاوڕادان لەنـاودەم کـە ژمارەیـەکی زۆر میکرۆبی جـۆراو جـۆری تێـدایە کە ٣٠٠ جۆرن بـە ڕێـژەی ١٠٠ ملیـۆن لـە هـەر میللیمەترێکدا، بـە ئـاوتێڕادانی لـە کـاتی دەستنوێـژدا ٣ جـار، وەك پێغـەمبـەر (ﷺ) ئامۆژگاریمـان دەکـات ژمارەیـەکی زۆریـان لەنـاو دەچـن، سـەرەڕای ئـەو کـەڕوانەی کـە لەسـەر پاشماوەی خـۆراك دەژیـن لـە نـاودەمدا، و ددانەکان ناشرین دەکـەن و بۆنی دەم ناخۆش دەکـەن، کـە ئەمانـەش بـە ئـاو تێڕادان پاکدەبنـەوە، بۆیـە فرمانمان پێکراوە کە زیادڕەوەی بکەین لە ئاو لەدەمڕاداندا.

پاشان (إستنشاق) کـە بریتیـە لـە هەڵمـژینی ئـاو بـۆ نـاو بۆشـایی لـووت و کردنـە دەرەوەی، کـە چـەندین سـوودی پزیشـکی هـەیە، لـەوانە: لینجی و تەپ و تۆزی ناوپۆشی لـووت کـە لـە هـەوادا هەیـە لایدەبـات، و ڕووپۆشەکە تەڕدەکات، تا باشتر ڕێگە لـە چـوونە ژوورەوەی میکـرۆب و تـەپ و

تــــۆز بگرێـــت بـۆ نـــاو کۆئەندامی هەنـــاســـە، هـــەروەهــــا لــــەناوبردنی زیندەوەرە ووردەکان، لە توێژینەوەیەکدا کــە بـــۆ کاریگەریی دەستنوێژ کـــراوە لەسـەر پـاکیی لـووت دەرکـەوتووە کـە: ئـــەو کەسانەی نوێـژ ناکـەن ناوپۆشـی لووتیـــان چــــەندین کـــۆگای میکرۆبــــە جیاواز و ترسناکەکـــانی تێدایـە، وەك بـەکتـریاکـانـی: (Diphtheria, Proteus, Klepsiella)، بـەڵام ئەوانەی دەستنوێژ دەگرن هیچ کۆگایـەکی میکرۆبی تێـدا نییـــە، و توێژەرەکان بۆیـان دەرکـەوتووە کـە ڕێـژەی لەناوچوونی میکرۆبـەکان زیاددەکـات بـەپێی جارەکـانی ئاوڕادان و سێیـــەم جـــار بــــە تــــەواوەتی پـــاکدەبێتەوە.

نینــــۆك هێشـتنەوە دەبێتـە هــــۆی کۆبوونـەوەی میکـرۆب و گواسـتنەوەی نەخۆشـی، بۆیـە ئـەمرمان پێکـراوە کـە نابێـــت نینـۆك درێـــژ بکـــــەین، شـتنی گرێکـانی پەنجـەکان دەبێتـە هـۆی لـەناو بردنـی ئـەو میکرۆبانـەی ئــــەم شـوێنە دەکەنــــە کۆگــــا بۆخــــۆیان، هــەروەها لــەبـــەرئەوەی میکرۆبەکـــــان و کــــەرووەکان گرێکـــانی پـــەنجەکـــان دەکــــەنــــە کۆگایــەك بــۆخــــۆیان ئــــەمرمــان پێکراوە بــە شتنی گرێکانی.

## سیواك کردن:

پــــاککـــــردنەوەی نـــاودەم بـەهــۆی داری سـیواکەوە یان(سـیواککردن) یــەکێـکی تـــرە لــــــە فەرمــــانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کـــــە دەفـەرموێت: ﴿لَو لا أَنْ أَشُقَّ عَلى أُمَّتي لأَمَرْتُهُم بِالسِّواكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاة﴾ (ئیمــــامی موسـلیم ریوایەتی کردووە)، واتە: ئـەگـەر بـــە گـرانم نەزانیایـە لــەســـەر ئوممەتەکـــەم ئــەوا فەرمانم پێدەکردن بـــە سیـــواککــــردن لــــەگــــەڵ هــــەموو نوێژێکدا.

یاخود دەفەرموێت: ﴿تَسَوَّكوا فَإِنَّ السِّواكُ مُطَهِّرَة لِلفَم مَرضات لِلرَّب﴾ (رواه ابن ماجة)، واتــە: بـــە سـیواککردن پاکبوونـــــەوەی نـــاودەم، و ڕەزامــــەنـدی خـوای گــــەورە بەدەسـت دێـنین، لــــە ڕووی زانسـتیەوە سەلمـــاوە کـــــە

چینێکی میکرۆب لـــە ســـەر ڕووی ددانەکـــان دروســـت دەبێـــت، کـــە لێپرسـراوە لـــە داخـورانی ددانـەکان و نەخۆشیەکـــان و هـــەوکردنی پـــووک، ژمـارەی میکرۆبـەکان تیایـدا دەگاتـە (١٠٠ ملیـۆن) لەهـەر سـانتیمەترێکدا، و لەبەرئـەوەی لـە کـاتی خەوتنـدا لیـك کـەمترە گەشـەی میکرۆبـەکان زۆرتـــرە، و ئـــەم چینـــە زیاتر دروست دەبێت، بۆیە دەبینین لە فەرمـوودەیەکدا هـاتووە: کە پێغەمبەر (ﷺ) هەر کاتێك لـە خەو هەڵبستایە سیواکی دەکرد، هـــەروەها ئـــەم چینە میکرۆبـــە پەیوەنـدی بـــە خـــواردنەوە نییـە، بـــۆیە لـــەکاتی ڕۆژووشدا هەر گـــەشـــەدەکـــات و سیواککـردن سوننەتە.

سیواککردن چـەندین سوودی پزیشکی هەیە، لەوانە:

١- مـــاددەیەکی دژ بـــە بـــەکتریای تێدایـــە کـــە لـــە (پـــەنسیلیـــن Penicillin) دەچێت.

٢- مـــاددەی (سـنجرین)ی تێـــدایە کـــە دژە بەکتریـــایە و پێـنج جـۆر بەکتریای نـــاودەم لـــەناو دەبـــات لـەوانـــە: (Streptococcus)، کـــە زانایـــان (جاکوب و براون) لـــە ساڵی ١٩٧٩دا سەلماندیان.

٣- مـــاددەی (سیلیس)ی تێـدایە کـــە ددانەکان دەدرەوشێنێتەوە.

٤- ماددەی (Tannic acid)کـە دژە بەکتـریـایـــە، و هـــەوکردنی پـووك چاك دەکاتەوە.

٥- ماددەی (Trimethyl amine) کە گەشەی میکرۆب کەم دەکاتەوە، لە لێکۆڵینەوەیـــەکدا لـــەسەر ئـــەوانەی سیواك بەکـــار دەهێنن، بینـــراوە ئـــەو توێژاڵە بەکتریایە لادەبات، و تەنانەت هەوکردنی پووکیش چاك دەکاتەوە.

## خۆ پاککردنەوە:

یەکێـــکی تـــر لـــە سوننەتەکـــانی فیترەت خۆ پاککردنەوەیە بە ئاو لە پاشـــەڕۆکان، تەنانـــەت لـــە فەرموودەیەکـدا هـــــاتووە: پێغـەمبـــــەر (ﷺ)

بـــــەلای قەبرێکـــدا رۆیشـــت و فـــەرمووی ئـــەم کەســـــە سزایـــەکی تونـــد دەدرێـــت، لەبەرئەوەی خۆی لـــە پیسی بـــە باشـی پـاك نـەدەکردەوە، ئـەمیش لەبـەر ئـەو ژمـارە زۆرەی میکـرۆب کـە تیایاندایـە، وولآتـانی ئـەوروپا لـە نیـوەی دووەمی ســـەدەی بیستەمدا هەستیـــان بـــەم راستیە کرد، لـە توێژینەوەیەکدا کـە لـە زانکـۆی (مانشیستـەر) کـرا بینییـان کـە بـەکتریا ٨چـین دەسـڕی تـەوالێت دەبڕێت، بـــەڵام موسوڵمانـــان پـێش ١٤سەدە فـەرمانیان پێکراوە کـە بـە ئـاو خۆیان پاکبکەنەوە باشترە.

## پاك وخاوێنی جل وبەرگ:

لـــە ئیسلامدا پـــاك وخاوێنی جـل وبەرگیش وەك لەش گرنگە، خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَ ثِيَابَكَ فَطَهِّرْ {٤}﴾ (المـدثر)، واتـــە: ئـەی محمـد (ﷺ) جـل وبەرگەکانتت بە پاك وخاوێنی رابگرە، جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) کـە هـاوەڵێکی پێغەمبەرە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا کابرایەکی بینی جلەکانی پـیس بـوو، فـــەرمووی ئـــایا ئـــەم پیـــاوە هیچـی دەسـت نەدەکـەوت جلـەکانی پێپـاك بکاتەوە، هـەروەها لـە فـــەرموودەیەکی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿أَحْسِنوا لِباسَكُم وَ أَصْلِحوا رِحالَكُم، حَتَّى تَكونوا كَأَنَّكُم شامَة فِي النَّاس﴾، واتـــە: جـلـەکـــانتـــان پـــاك بـێـــت، و بارەکانتان رێك و پێك بێت، با وەکو چـــۆن خاڵ بـە لەشـەوە دیارە، ئاوا ئێوەش لەناو خەڵکدا دیاربن.

بـــەم ئـــامۆژگاریە چـــڕوپـــڕانە سەبـارەت بە: پاك وخاوێنی لەش و جـل وبـــەرگ، و شوێنی دانیشتـــن، و نوستـــن، و نوێژ کـــردن، دەتـــوانین خۆمـان بپارێزین لە زیندەوەرە ووردە زیانبەخشـەکان ســـەرەڕای ســـوودە دەروونیـەکانی پاك وخاوێنی لەسەر مرۆڤ، سەرەڕای لەناو بردنـی کۆگـای زینـدەوەرە ووردەکـان، بنەمایـەکی تـری زانسـتی خۆپـارێزی ئەوەیـە کـە نـەهێڵین ئـــەم زیندەوەرانـە بگـــەن بـــە مـرۆڤ و ڕێگـەیان لێبگیرێت، شـەریعەتی ئیسـلام لەمەشـدا پێشـڕەو

بووە، ئەمەش بەم شتانە دەبێت: وەك پـــاك و خــاوێنی ژینگە كە ئەمەش گرنگی پێدراوە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إنَّ الله طَيِّبٌ يحب الطيب، نَظيفٌ يُحِبُّ النَّظافَة، فَنَظِّفوا أَفْنِيَتَكُم وَ لا تَشَبَّهوا بِاليَهود﴾ (رواه الترمذي)، كـە تيايدا پێغەمبـەر داوامـــان لێـدەكات كـە وەكـو جولەكـەكان نـەبین و ناوماڵەكانمـــان پـــــاك رابگریـــن، لـــە فەرموودەیەكی تردا سەبارەت بــە پاك راگــرتنی رێگــاوبــان و شەقـــامەكـــان پێغەمبـــەر (ﷺ) دەفــەرموێت: ﴿عُرِضَت عَلَيَّ أَعْمالُ أُمَّتي حَسَنها وَ سَيِّئها، فَوَجَدتُ في مَحاسِنِ أَعْمالِها الأَذى يُماطُ عَن الطَّريق، وَ وَجَدْت في مَساويءِ أعمالِها النُخامَة تَكـون في المَسْـجِد لا تُـدْفَن﴾ (رواه مســـلم)، واتـــە: كردارەكـانی ئوممەتەكـەمم پیشـــاندرا، بینیـــم لــــە كـــــردەوە باشــەكانیاندا ئەوەیـە كـە پیسـی و ناڕەحـەتی لـەڕێی خـەڵكی لادەبرێـت، و بینـیم لـە كـردەوە خراپەكانیشیاندا كە بەڵغەم فڕێ دەدرێت لە مزگەوتدا و كەس نییە بیشارێتــــەوە و پـــاكیبكاتەوە، هەروەهـــا لە فەرموودەیەكی تریشــدا دەفەرموێـــت: ﴿إتَّقوا اللَّعانَيْن، قالوا: وَ ما اللَّعّانين يا رسول الله، قال: الَّذي يَتَخَلَّى في طَريقِ النَّاس وَ في ظِلِّهِم﴾ (رواه مسلم)، واتـە: خۆتـان بپـارێزن لـەو دوو شتـــەی لـــــە ڕەحمـەتی خـودا دوورتـان دەخــــاتەوە، پرسیـــان: ئـەو دوو شتـــە چییــە؟ پێغەمبـــــەر (ﷺ) فـەرمووی: ئـــەو كەسـەیە كـــە لــــەسەرە ڕێـی یـان لـە شـوێنی سـێبەری خەڵكیدا پیسی دەكات، كە باسی ئەو دووشتە دەكات كە مرۆڤ لـە ڕەحمـی خـودا دووردەخەنەوە ئـەوانیش ڕێگـای خـەڵكی و شــــوێنی سێبـــەر پـیس بكـــرێت، لـەڕووی زانسـتییەوە شـوێنی شێدار(سـێبەر) ژینگەیـــــەكی گونجـــــاوە بــــۆ گەشــــە كردنی زۆربــــەی جۆرەكــــانی بەكتریـــا و هێلكـــــەی كرمەكــــان، لەبـــــەر ئـــــەوەی تیشـكی ســــــەروو وەنەوشـەیی كــــە میكرۆبكـوژە لـەو شوێنـــانــــە نـــــادرێت، هــەروەهـــــا لەبەرئــــەوەی میز و پاشـەڕۆی مرۆڤ سەرچــــاوەیـــــەكی گــــــەورەی ئـــــــەو میكرۆبـانەن، كــــە ١ گـرام لــــە

پاشـــەڕۆ زیـــــاد لـــــە ١٠٠,٠٠٠ ملیـــۆن میکرۆبـــی تێـدایـــــــە، بـــۆیــــە پـێـغـــەمـبـــەر (ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات کە لەو شوێنانە دووربکەوینـــەوە، وەك باسمان کرد بنەمایەکی زانستی خـۆپارێزیی ئەوەیە نـەهێڵین میکرۆبـــەکان بگـــەنــە مـــرۆڤ و ڕێگەیـــان لێبگیـرێـت، میکـرۆبـەکــــان بــەشێوەیـــــەکی ســـــەرەکی لـــــە ڕێگــــەی خــــــــۆراك و هــــــــەوا و ئـــــــــــاوەوە دەگوێزرێنـــەوە، بـــۆیە شــــەریعەتی ئیسلام ئەمرمـــان پێدەکـــات بـــە پـاك ڕاگرتنیان، با بزانین چۆن:

## سەبارەت بە پاراستنی خۆراك:

خـــــۆراك ســــەرچــــاوەی سـەرەکی گواستنــــەوەی نەخۆشـیەکانی وەك: گرانــــــەتا، و زەحیــــــری، و ئیـفـلیــــجی مــنـــــدالّ، و هــــــــەوکردنی جگــــــەری ڤــــایرۆسییە، لـــــەڕێگــــەی بەرکـەوتنی پاشـەڕۆی مرۆڤـی تووشـبوو یاخوود هەڵگری نەخۆشییەکەوە، کە لە ڕێگەی دەست یـان بەکـارهێنانی قــــاپ دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی لـەبیر نەچــــووە لـــــەو ســــەردەمــــــەدا، و (عائیشە)ی هـــــاوســــەری پێغەمبەر (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: کـە پێغەمبــــەر (ﷺ) دەستی ڕاستی بـــۆ دەستنوێـــژ گرتـــن بەکـــار دەهێنـا، و دەستی چەپی بـــۆ خۆپــــاك کردنـەوە لەپیسـی، واتـە بـەکار هێنــانی دەستی چەپ بۆ خۆ پاککردنەوە تا دوور بێت لە بەرکەوتنی خۆراك.

## پاراستنی ئاو لە پیسبوون:

سەبارەت بە پاراسـتنی ئـاو لـەپیس بـوون پیغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ﴿لا يَبُولَنَّ أَحَدُكُم فِي الماءِ الدائِمِ الَّذي لا يَجْري ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ﴾ (متفق علیـه)، واتـە: هـیچ یـەکێك لـــە ئێـوە میز نەکاتـە نـــاو ئاوی وەستـــاوەوە، لەبـــەر ئـــــەوەی ئــــاوی وەستــــاو ژینگەیــــەکی باشـــــە بــــۆ گەشـە کردنـی بەکتریـــای وەك: کۆلێرا، و سـەلمۆنێللا، و شیگێللا، و هـەندێك کرمی وەك کرمــە پانەکــان، و

کرمی بەلهارزیا لە ئاودا سووڕی ژیانیان تەواو دەکەن، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿غَطُّوا الإِناء، وَ أَوكوا السِّقاء﴾ (رواه مسلم)، واتە: ئێوە کووپ و قاپ و مەنجەڵەکانتان داپۆشن و بە سەر بەرەڵڵایی جێیان مەهێڵن، هەروەها: ﴿نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) أن يُشْرَبَ مِن فِي السِّقاء﴾ (رواه البخاري)، واتە پێغەمبەر بەرگری لەوە کردووە لە دەمی گۆزەوە ئاو بخورێتەوە، چونکە هەر یەك میللیلیتر لە لیك بلیۆنەها میکرۆبی تێدایە، کە گەشەدەکەن و کەسی تر کە لێی دەخواتەوە زیانی پێدەگات.

## پاك ڕاگرتنی هەوا:

ئەو پرژانەی لە کاتی هەناسەداندا دەچنە دەرەوە دەبنە هۆی گواستنەوەی نەخۆشی، وەك: ئینفلوەنزا، و ئیفلیجی منداڵ، و ملەخرە (نکاف)، و سووریژەی ئەڵمانی، و هەڵامەت، و هەوکردنی قورگ، و سیل، و هەروەها چەندین نەخۆشی تر، بە تایبەتی نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان.




ئەو پرژانەی لە دەمی تووشبوویەك بە نەخۆشی ئینفلوەنزاوە دەردەچێت، لە وێنەیەکدا کە ملیۆنەها بەکتریای دەرچوو دەردەخات

بـــــۆیە دەبینیــــن پێغەمبــەر (ﷺ) ئەمرمــــان پێدەکــات بـــــەوەی فـــــوو نەکـــــــەین و هەنـــــاسە نەدەینــــــەوە بەســــەر خـــواردن و خواردنـــــەوەدا، هەروەهـــا پێغەمبـــەر خـــۆی (ﷺ): ﴿کانَ إذا عَطَسَ غَطَّى وَجْهَهُ بِيَدِهِ أَو بِثَوْبِهِ﴾ (رواه الترمذي)، واتــە: کـــــاتێك دەپـژمیی دەم و چـــاوی بـــــە دەسـتی یـــان بـــە جـل وبـــــەرگەکانی دا دەپۆشـی، هـــــەروەها پێغەمبـــــەر (ﷺ) بـەرگریکـــردووە لـــەوەی مـــرۆڤ خـــواردنی گـەرم بـــــە فـووکردن سـارد بکاتـەوە، واتـە فـوو بکـات بـەناو دەفـری خواردنـــدا، تـــــــا ببێتـەهـۆی بڵاوبوونەوەی میکرۆبی نەخۆشی.

لـــــە نموونەیەکی تری ئەم جـۆرە خۆپاراستنـــــەدا، لــــە پێغەمبــەرەوە دەگێڕنـــــەوە: ﴿إتَّقُوا الـذَّر (و هـو الغبار) فـإنَّ فِيـهِ النَّسْمَةَ (أي الميكـروبات)﴾، واتـــە: خۆتـــان لە تەپ و تۆز و پرژ بپـــارێزن لەبـــــەر ئـــــەوەی (نیسمـــــەی تێـدایە)، لـە (القـاموس المحـيط)ی زانـا (الفيروزآبـادي) هـــــاتووە: (النسمـــة: تطلــق على أصغر حيـــوان)، واتـــە: (نیسمـــە) بـــــە بچووکتریـــن ئـــاژەڵ دەووترێـت، ئـەم ئاماژەیـە ئیعجـازێکی گـەورەی تێدایـە لەبـەر ئـەوەی ئـەمڕۆ بـە میکرۆسکۆب و ووردبینــــە گەورەکان سەلمـــاوە کــــە ووردتـــرین زینـــدەوەر بریتیـــن لــــە میکرۆبەکـــان (ڤایرۆس و بەکتریـــا) و ئـــــەم نـــاوە (نیسمە) زۆر گونجــاوە بۆیـــــان لەبـــــەر ئـــــەوەی میکرۆبەکـــــان سیفـــەتی ژیـان و جـووڵاویـان تێدایە، واتە بە نـاڕاستەوخۆ پێغەمبـەر (ﷺ) ئـامۆژگـاری کـردووین بــــە دوور کــــەوتنەوە لــــەو پرژانـەی کـە میکـرۆب هەڵدەگرن (وەك ئـــــەو پرژەی لە کاتی کۆکیـــن و پژمینـــــدا لــــە نەخۆشـەوە بڵاو دەبێتەوە).

زانســـــتی خـــۆپـــــارێــزی کـــــاتێك پەیـــدابوو کـە زیندەوەرە ووردەکـان بە جۆرە جیاجیاکانیانـەوە دۆزرانـەوە، و تەکنۆلۆژیـــای پێشـکەوتوو هۆکـــــانی تووشبوون بە نەخۆشی دۆزیەوە، و ئەمەش لــــە سـەدەی بیستـەمدا بـوو، بـەڵام

پێش ئـەوە مرۆڤەکان ٢ جۆر بـوون: موسوڵمانـــەکان کـــە بنـەمـا ووردەکانی زانسـتی خۆپارێزییـان دەزانـی، ئـەویش بـەهۆی دینەکەیانـەوە و زۆر بـە ئاسـانی پەیڕەویان دەکرد، و وەك پەرستشێك بۆ پـەروەردگاریان دەزانـی، بـەڵام ئەوانـەی موسوڵمان نەبوون، با بزانین مێژوونووسان چی دەڵێن دەربارەیان:

رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (زیجرید هۆنکە) لـە کتێبـی (شمس العـــرب تشـــرق علی الغرب)دا بـــاسی سەرسـوڕمانی زانـای موسوڵمـــان (طرطوسي) دەکـــات لـــە پیس و پـۆخڵی رۆژئاواییـەکان، کـــە سـەردانی رۆژئـاوای کردووە لـــــە سەدەی هەژدەیەمدا، کــــە چـۆن ئـەم پێنج فـەرزە دەستنوێژی گـــرتووە، و ئەوان تەنانەت لەساڵدا ١ یـــان ٢ بە ئاوی سارد خۆیان دەشت، و جلەکانیشـیان نەدەشت، نـــەوەکو بدڕێت، پاشان روونیدەکاتەوە کـــە چـۆن وولاّتـانی رۆژئـاوا کاریـــان تێکـــرا بـــە رەووشـــتی موســـوڵمانەکان، و ووردە ووردە رەووشـــتە ئیسلامیەکانیان وەرگرت لە پاك وخـاوێنیدا، ئەمە شایەتی زانایەکی رۆژئـاوایە.

بەریتانیەکـــان وایان دەزانـی خۆشـتن زەرەری بـــۆ تەنـــدروستی هەیـــە، لـــە کۆشـکی (ڤێرســـای) کـــــە خـــانووی پاشاکـــانی فەرەنسا بـووە یـەك حـەمام نەبـــووە، زۆر عـەیب بـووە لـە کۆشـکی سـپی ئـــەمریکیشدا حەمـــام هـــەبێت، تەنانـەت یەکـەم حـەمام لـەوێ لـــە سـاڵی ١٨٥١دا دروسـت کـــــرا، هـــەروەهـــا (بـــەرنـــارد شـــۆ) کـــــــە دکتۆرێـــکی بەریتانیـە، لـــە کتێبی سەرسوڕمانی پزیشکێکدا (حیرة طبیب) باسی ئەوە دەکات کە چۆن کاتێك بەریتانیەکان دوورگەکـــانی (ساندویش)یـــان لـــە زەریـــــای هێمنــــدا داگیـــر کـــــرد، خەڵکەکەیـــان ناچـــار کرد کـــە واز لـــە دینـی ئیســـلام بهێنـــن، و ببـــن بـــە مەسیحی، ئـــەم دکتـۆرە بـاس دەکـات کـە چـۆن دوایـی توشبوون بە چەندین نەخـۆشی، پاش وازهێنانیان لـــە ئامۆژگاریەکـانی ئیســلام سەبارەت بە پاك وخاوێنی.

لــــــه سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) جیهـانی زینـدەوەرە ووردەکـان غـەیبی و شـــاراوە بـــوو، کـەس نەیـدەزانی، بـــەڵام ڕێنوماییەکـــانی ئیســـــلام دەربـــارەی پاك وخاوێنی ئاماژە بەوە دەکـــەن، و زانست دەیسەلمێنێت کـــە قورئـــانی پـیرۆز و سـوننەتی پێغەمبەر پێشـڕەو بـــوون لـــە باس کردنیـدا، و باشـترین ڕێنماییـان هـەبووە بـۆ لەنـاوبردنیان، و پاراسـتنی مـرۆڤ لێیـان، و ئـەو ئایەتـەی قورئانەکەی خـوای گـــەورەش هاتـەدی کـــە دەفـــەرموێـت: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَ يَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ:٦).

# نەخۆشی دەردەباریکە (سیل - التدرن) (Tuberculosis) و خۆپاراستن لێی

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ): ﴿كانَ إذا عَطَسَ غطَّى وَجْهَهُ بِيَدِهِ أو بِثَوْبِهِ﴾ (رواه الترمذي)، واتە: کاتێك دەپژمیی دەم و چاوی بە دەستی یان بە جل وبەرگەکانی دا دەپۆشی، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بەرگریکردووە لەوەی مرۆڤ فوو بکات بەناو دەفری خواردندا، تا نەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی میکرۆبی نەخۆشی.

هەروەها لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە: ﴿إتَّقُوا الذَّر (و هو الغبار) فإنَّ فِيهِ النِّسْمَةَ (أي الميكروبات)﴾، واتە: خۆتان لە تەپ و تۆز و پرژ بپارێزن لەبەر ئەوەی (نیسمەی تێدایە)، کە (نیسمە) بە بچووکترین ئاژەڵ دەووترێت، واتە زیندەوەرە ووردەکانی وەك (ڤایرۆس و بەکتریا)، واتە بە ناڕاستەوخۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری کردووین بە دوورکەوتنەوە لەو پرژانەی کە میکرۆب هەڵدەگرن (وەك ئەو پرژەی لە کاتی کۆکین و پژمیندا لە نەخۆشەوە بڵاو دەبێتەوە).

وەك نموونەیەك لەو نەخۆشییە مەترسیدارانەی لەرێی هەواوە بڵاودەبنەوە کەمێك باسی نەخۆشی (سیل) دەکەین، نەخۆشی سیل یەکێکە لە نەخۆشییە درمەکان (Endemic disease)، هۆکارە تووشکەرەکەی بریتییە لە بەکتریایەك بەناوی بەکتریای سیل (Mycobacterium tuberculosis)، ئەم نەخۆشییە لەوانەیە تووشی هەموو ئەندامەکانی لەش ببێت، بەڵام سیلی سییەکان بریتیە لە جۆرە مەترسیدار و باوەکەی، مەترسی زیادبوونی رێژەی نەخۆشیەکە لە جیهاندا لە زیادبووندایە بەهۆی پەیدابوونی هەرەشەیەکی گەورە

که خۆی لەو میکرۆبانەدا دەبینێتەوە کە بەرگرن بۆ ئەو دەرمانانەی کە ئێستە هەن و کاریان تێناکات.

دەردەباریکە (Consumption) نەخۆشیەکە لەگەڵ سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتیدا بوونی هەبووە، یەکەم ناسینەوەی فەرمی بوونی ئەم نەخۆشیە و میکرۆبەکەی بریتی بوو لە شوێنەوارەکەی کە لە بڕبڕەی پشتی مۆمیای میسری وهیندی صینیەکاندا دۆزرایەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا هیپۆکرات (أبوقراط) (٤٦٠ پ. ز.) ناوی (Phthisis)ی لێنا لەم نەخۆشیە (واتە دەردەباریکە)، پزیشکی موسوڵمان (إبن سینا) یەکەم کەسێکە کە ڕوونیکردەوە نەخۆشی سیلی سیەکان لەوانەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوێزرێتەوە، لە ساڵی (١٨٨٢ز)دا زانای ئەڵمانی (ڕۆبەرت کوخ) (Robert Koch) بۆ یەکەم جار میکرۆبی نەخۆشیەکەی دۆزیەوە، و دەرکەوت کە هۆکارە تووشکەرەکەی بریتییە لە بەکتریایەک.



Robert Koch:
An illustration depicts German scientist Robert Koch at work in his laboratory. Considered the founder of modern medical bacteriology, Koch isolated the bacillus that causes tuberculosis in 1882. He won the Nobel Prize for physiology or medicine in 1905.

**زانای ئەڵمانی (ڕۆبەرت کوخ) دۆزەرەوەی میکرۆبی سیل و هەڵگری خەڵاتی نۆبڵ لە پزیشکیدا لەکاتی کارکردنی لە تاقیگەکەیدا**

له (١٨٩٥ن)دا زانا (رۆنتیگن) (Roentgen) تیشکی سینی (X)ی دۆزیەوە، کە بووە هۆی ئەوەی دۆزینەوە و بەدواداچوونی سیلی سییەکان ئاسانتر و بەشێوەیەکی زانستیانە بێت، لە ساڵی (١٩٠٠ن)دا کوتانی دژی سیل کەناوی (BCG)یە لەلایەن (Calmette و Guerin)ەوە دۆزرایەوە، دەرمانەکانی دژی سیل بەم شێوەیە دۆزرانەوە:

- ستریپتۆمایسین (Streptomycin) لە ساڵی (١٩٤٣ن)دا دۆزرایەوە، (PAS) ١٩٤٩، ئایزۆنەیازید ١٩٥٢، پایرازینەماید ١٩٥٤، سایکلۆسیرین ١٩٥٥، ئیسامبیوتۆڵ ١٩٦٢، ریفامپیسین ١٩٦٣، لە ساڵەکانی نێوان (١٩٥٠-١٩٨٠ن)دا رێژەی تووشبوون بەم نەخۆشیە بەشێوەیەکی بەرچاو لە دابەزینێکی بەردەوامدا بوو لەهەموو جیهاندا، لە ساڵەکانی (١٩٨٠) و (١٩٩٠)ەکاندا بەهۆی بڵاوبوونەوەی درمی (ئەیدز AIDS)ەوە بووە هۆی سەرلەنوێ زیادبوونی رێژەی تووشبووان بەم نەخۆشیە، لە ساڵی (١٩٩٣ن)دا رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) نەخۆشی (سیل)ی وەك حاڵەتێکی کتوپڕی جیهانی (Global Emergency) راگەیاند.






*Dr. Selman A. Waksman*

(د. سێلمان واکسمان)

دۆزەرەوەی دەرمانی (Streptomycin)

## شێوازی بڵاوبوونەوە ونیشانەکانی:

سیل هەروەك زۆرێك لە نەخۆشیە درمەکانی تری کۆئەندامی هەناسەدان لەرێی هەواوە بڵاودەبێتەوە، بەتەنها (سیلی سییەکان) لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێتەوە، کاتێك ئەم نەخۆشانە دەکۆکن یان دەپژمن یان پێدەکەنن یان گۆرانی دەڵێن یان قسە دەکەن ئەویش لەرێی ئەو پرژانەی لە دەمیانەوە دێتە دەرەوە میکرۆبەکە بڵاودەکەنەوە، کاتێکیش کەسێکی لەشساغ ئەم پرژانە لەرێی دەم ولوتیەوە دەچێتە کۆئەندامی هەناسەوە لەوانەیە تووشی نەخۆشیەکە ببێت، ئەو کەسەی سیلی سییەکانی هەیە لەوانەیە لەگەڵ ئەو پرژانەدا (١ – ١٠٠ ملیۆن) میکرۆب بکاتە دەرەوە، ئەم پرژانە تیرەیان لە نێوان (١ – ٥) مایکرۆندایە لەوانەیە لە هەوادا بۆ ماوەی چەند سەعاتێك بمێننەوە، هەروەها رێگایەکی تر بۆ گرتنی نەخۆشی سیل بریتیە لە خواردنەوەی شیری ئەو مانگایانەی کە تووشی نەخۆشی سیل بوون، ئەگەر شیری مانگا بە باشی نەکوڵێنرێت لەوانەیە میکرۆبەکەی تێدا بمێنێتەوە.

## ئەو پرژانەی لەدەمی نەخۆش لەکاتی پژمین یان کۆکین یان قسەکردن دێنەدەرێ هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی سیلە



Speaking
0-200 bacilli

Coughing
0-3.500 bacilli

Sneezing
4.500- 1.000,000 bacilli

بەڵام با ئەوەش بزانین کە چوونە ناوەوەی میکرۆبەکە بۆ ناو لەش زوربەی جار نابێتە هۆی تووش بوون بە نەخۆشیەکە، و کۆئەندامی بەرگری لەش زاڵ دەبێت بەسەریدا، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێت بزانین ئەوانەی کە نەخۆشیەکەیان هەیە لە

حاڵەتێکی ناڕەحەتدان و مەترسی مردنیان هەیە، کەسێکی تووشبوو بە سیل ئەگەر چارەسەر نەکرێت ئەوا بە بەردەوامی میکرۆبەکە بڵاودەکاتەوە، و خۆیشی لە ماوەی چەند مانگێکدا یان لە چەند ساڵدا دەمرێت.

ئەو کەسەی کە سیلی سییەکانی هەیە لەوانەیە هەندێك لەم نیشانانەی هەبێت: کۆکەیەکی بەردەوام کە ٢ هەفتە زیاتر بخایەنێت، لەوانەیە کۆکەکەی بەڵغەمی لەگەڵدا بێت و هەندێکجاریش بەڵغەمەکەی خوێنی پێوەدەبێت، هەناسە توندی، سنگ ئێشە، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش و ئارەق کردنەوە بەتایبەتی لەشەودا، نەمانی ئارەزوو بۆ خواردن و لەدەستدانی کێشی لەش، ئەوانەی سیلی دەرەوەی سییەکانیان هەیە لەوانەیە ئەم نیشانانەی هەبێت: بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش و ئارەق کردنەوە بەتایبەتی لەشەودا، نەمانی ئارەزوو بۆ خواردن و لەدەستدانی کێشی لەش لەگەڵ نیشانەی تایبەتمەند بەو ئۆرگانەی کەتووشی سیل بووە (وەك هەڵاوسانی لیمفەگرێکان).

## خۆپاراستن:

گرنگترین خۆپاراستن بریتیە لە دۆزینەوەی نەخۆشەکان و چارەسەرکردنیان بۆ ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی میکرۆبەکە لە نەخۆشەکانەوە بۆ خەڵکانی تر، هەروەها بەرزکردنەوەی هۆشیاری تەندروستی هاوولاتیان بە تایبەتی نەخۆشەکان کە ڕاستەوخۆ بەسەرکەسدا نەکۆکن و لەکاتی کۆکە و پژمیندا دەستەسڕ بکەن بەدەم ولووتیانەوە، و بەتایبەتیش ئەو نەخۆشانەی کە نیشانەکانی نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسەیان هەیە و سەردانی نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکان دەکەن دەبێت دەمامك ببەستن، هەروەها هەواگۆڕکێی زۆر و لێدانی تیشکی خۆر لە ماڵەکان و دام ودەزگاکان دەبێتە هۆی فەوتاندنی ئەم میکرۆبە چونکە زۆر هەستیارە بەتیشکی خۆر و زوو لەناودەچێت بەڵام لە شوێنە سارد و نسرمەکاندا بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە.

سیل چارەسەری تەواوی هەیە بۆ کەسی تووشبوو، کە ئەگەر کۆرسی دەرمانەکانی بە رێکوپێکی تەواوکات بەتەواوەتی چاکدەبێتەوە، ئەگەری تووشبوونەوە زۆرکەمە بەم میکرۆبە کەلەوانەیە ١٪ نەبێت.

نەخۆشی سیل زیاتر لە هەموو نەخۆشیەکی تر مرۆڤی لەناوبردووە بەدرێژایی مێژوو، تا ئەمرۆش یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی مردن لە هەموو جیهاندا بەپێی سەرژمێری رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) دەبێتە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٢ ملیۆن کەس ساڵانە (٨٢٥٠ حاڵەتی مردن لە رۆژێکدا و ٤٣ حاڵەت لە هەموو سەعاتێکدا)، و دووەم هۆکاری سەرەکی مردنە لە جیهاندا بەهۆی نەخۆشیە درمەکانەوە، نزیکەی ٨٥٪ی تووشبووان بەم نەخۆشیە تەمەنیان دەکەوێتە نێوان (١٥–٥٤ ساڵ)، ئەگەر کەسێك کە سیلی هەیە چارەسەر نەکرێت ئەوا ساڵانە نزیکەی ١٠ – ١٥ کەسی تر تووشدەکات، رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) بەرواری (٢٤ی ئازار)ی هەموو ساڵێکی داناوە وەك رۆژی جیهانی (سیل) لە هەموو جیهاندا، کە هەموو ساڵێك لەم رۆژەدا چەندین چالاکی جۆراوجۆر و کۆڕ و سیمینار لە هەموو لایەکی جیهاندا سازدەکرێت بە مەبەستی بەدواداچوونی نەخۆشیەکە لە هەموو جیهاندا و دانانی پرۆگرامی نوێ بۆ کۆنترۆڵ کردن و قەلاچۆکردنی نەخۆشیەکە. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٤٩٦**)



بوونی زانیاریی دەربارەی نەخۆشیەکە و شێوازی بڵاوبوونەوەی گرنگە بۆ هەموو لایەك، ئەو کەسانەی نیشانەکانی نەخۆشیەکانی هەناسەیان هەیە نابێت پشتگوێی بخەن و سەردانی سەنتەرەکان و پزیشکی پسپۆڕ بکەن، دەبێت هاووڵاتیان هۆشیاربن لەبڵاوکردنەوەی نەخۆشیەکانی هەناسە لەرێی داپۆشینی دەم و لووت لەکاتی کۆکە و پژمیندا و بەکارهێنانی دەستەسڕ یان دەمامك بۆ نەخۆشەکان، هەروەها کارمەندانی تەندروستی لە نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکاندا دەبێت بە بەردەوامی دەرگا و پەنجەرەکان بکەنەوە و رێگای هەواگۆڕکێ و هاتنەناوەوەی تیشکی خۆر بدەن کە باشترین لەناوبەری میکرۆبەکانە.

سەرچاوەکان:


1- http://www.who.int/news-room/fact-sheets/detail/tuberculosis.
2- http://www.who.int/tb/en/
3- http://www.emro.who.int/health-topics.html
4- Tuberculosis 2017 – From Basic Sciences to patient care – Palomino, Leao, Ritacco.




# تیشکدانی ئیعجازی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە رۆژگاری دۆزینەوە زانستییەکاندا



پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین ئایەتدا فەرمانی پێکردووین کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین و سوننەتەکەی جێبەجێ بکەین: **(وأطيعوا الله وأطيعوا الرسول واحذروا ، فإن توليتم فاعلموا أنما على رسولنا البلاغ المبين) (المائدة:٩٢)**، **(يأيها الذين آمنوا استجيبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما يحييكم) (الأنفال:٢٤)**، **(وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا ، واتقوا الله إن الله شديد العقاب) (الحشر:٧)**، ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر دەکەن، واتە شوێن سوننەتەکەی ناکەون شوێنیان دۆزەخە بەدەقی ئەم ئایەتە و چەندین ئایەتی تریش: **(ومن يطع الله ورسوله يدخله جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها وذلك الفوز العظيم.ومن يعص الله ورسوله ويتعد حدوده يدخله ناراً خالداً فيها وله عذاب مهين) (النساء:١٣-١٤)**.

ئاشکرایە کە گوێڕایەڵی پەروەردگار بە گوێڕایەڵی قورئان و جێبەجێ کردنی دەبێت، لێرەدا دەپرسین: ئەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەچی دەبێت؟

بێگومان بەشوێنکەوتنی سوننەتەکەی دەبێت، و نابێت بڵێین گوێڕایەڵی پێغەمبەریش بەگوێڕایەڵی قورئان جێبەجێ دەبێت کە پەیامەکەیەتی، چونکە پەروەردگار لەو ئایەتانەدا گوێڕایەڵی بۆ خودای جیاکردۆتەوە لە گوێڕایەڵی بۆ

پێغەمبەرەکەی، کەواتە دەبێت گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنمان بۆ ٢ فەرمانی جیاوازبێت کە فەرمانی خودا بریتییە لە قورئانە پیرۆزەکەی و فەرمانی پێغەمبەریش لە فەرموودەکانی و سوننەتەکەیدا خۆی دەبینێتەوە.

سوننەتی[٧٩] پێغەمبەر (ﷺ) تەواوکەر و روونکەرەوەی قورئانە، و ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان وایە کە بەهەمان شێوەی قورئان نیگا و ڕێنمویی پەروەردگارە بۆ مرۆڤەکان.

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەناو موسوڵمانانندا تاقمێك پەیدابوون کە رەتی سەرجەم فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەدەنەوە بەبیانوی ئەوەی گوایە فەرموودەکان شتی ناڕاستی زۆری تێکەوتووە و ناتوانرێت بەتەواوەتی لەیەکتر جودابکرێنەوە، و تەنها باوەڕیان بەقورئان هەیە و تەنها ئەویش بەشایستەی جێبەجێکردن دەزانن.

ئەم ووتەیە لەراستیدا بەهیچ نەزانینی هەوڵی هەموو موسوڵمانانە لەسەردەمی هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان لە گەیاندنی ووتەکانی پەیامبەر و پێشەواکەیان و پاراستنی و پاڵفتەکردنی لە دەستێوەردان و شێواندنی، ئەم ووتەیە لەهەمان کاتدا تانەدانە لەراستیی قورئان و سەرەتایەکە بۆ گومان دروستکردن بۆ خودی قورئانیش، چونکە هەمان ئەو هاوەڵانە و شوێنکەوتووانیان کە فەرموودەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) گەیاندووە هەرئەوانیش بوون قورئانیان گەیاندووە و پەروەردگار بەهۆی ئەوانەوە پاراستوویەتی لە دەستێوەردان.

زانایان بۆ وەڵامدانەوەی ئم گومانە چەندین هەوڵیانداوە و چەندین دانراویان خستووەتە بەردەست، لێرەدا من بۆ وەڵامدانەوەی ئەم گومانە باسی ئەو پرۆگرامە ناوازەیە ناکەم کە زانایانی پێشین دایانهێناوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە و

---

[٧٩] سوونەت لە پێناسەی زانایانی فەرموودەدا بریتییە لە هەموو ئەوانەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراونەتەوە لە فەرموودەکانی و کردارەکانی و دانپێدانانەکان و سیفەتە جەستەیی و رەووشتییەکانی.

پشتڕاستکردنەوەیان و سەلماندنی ووتنی لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە لەراستیدا پرۆگرامێکی زۆر ناوازە و بێوێنەیە و لەهیچ ئاین و شارستانیەتێکی تردا بوونی نییە، و بەشێوەیەك راستیی فەرموودەکان دەسەلمێنن کە گومانت نامێنێت کاتێك فەرموودەیەکی صحیح دەبیستیت هەروەك ئەوەیە گوێت لە پێغەمبەرەکەت بێت گفتوگۆت لەگەڵ دەکات.

پەروەردگار پەیامبەرەکەی پاراستووە لە کەوتنە هەڵەوە لە ووتار و کردارەکانیدا.

لەم بابەتەماندا بەڵگەیەکی سەردەمیانە دەهێنینەوە بۆ دەرخستنی راستییەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە خۆی لە بەراوورد کردنی هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینێتەوە لەگەڵ راستییە زانستییەکان لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، واتە دەرخستنی ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کەخۆی لەو ئاماژە زانستییانەدا دەبینێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش فەرموویەتی و تەنها چەند ساڵێك دەبێت زانایان ئەو راستییانەیان بۆ دەرکەوتووە.

ئەمە دەیسەلمێنێت ئەم ووتانە لە زانیاریی مرۆڤەکانی ئەو کاتەدا نەبووە و دەبێت تەنها لە سەرچاوەیەکی سەروو مرۆڤەکانەوە هاتبێت کە پەروەردگاری دروستکەری گەردوون و نێرەرەی پەیامبەرەکەیەتی.

هەروەها بوونی ئەم ئاماژە ناوازانە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا لە کتێبەکانی فەرموودەدا هەن لەلایەکی ترەوە ئەو راستییە دەسەلمێنن کە ئەم ووتانە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) ووتراون و موسوڵمانانی پێشین دەستپاك و دەمپاك و متمانەپێکراو بوون لە گەیاندنی فەرموودەکانی پەیامبەرەکەیان.

## نموونەی یەکەم: ڕەنگەکانی ئاگر:

لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أوقد على النار ألف سنة حتى احمرّت، ثم أوقد عليها ألف سنة حتى ابيضت، ثم أوقد عليها ألف سنة حتى اسودّت، فهي سوداء مظلمة) **(رواه الترمذي وابن ماجة والبزار والبيهقي ورجاله ثقات)**، واتە: ئاگری دۆزەخ ١٠٠٠ ساڵ داگیرسێنرا تا ڕەنگی سوور بوو پاشان ١٠٠٠ ساڵی تر داگیرسێنرا تا ڕەنگی سپی بوو پاشان ١٠٠٠ ساڵی تر داگیرسێنرا تا ڕەنگی ڕەش بوو، کە ئێستا ڕەنگی ڕەشێکی تاریکە.

ئەوەی تێدەگەین لەم فەرموودەیەوە ئەوەیە کە ئاگر تا گەرمتربێت (واتە پلەی گەرمییەکەی بەرزبێتەوە) ڕەنگەکەی دەگۆڕێت لە سوورەوە بۆ سپی و لە کۆتاییدا ڕەش دەبێت، بەڕاستی ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەرە چونکە ئێمە لەژیانی ئاسایی ڕۆژانەدا و لەسەر زەوی شتی وانابینین تابڵێین ئەمە ئەنجامی تێڕوانینە لەئاگر، بەڵکو ئەم بابەتە تەنها لەدوای سەدەی بیستەمەوە بۆ زانایان ڕوونبووەوە کاتێك تێڕوانین و لێکۆڵینەوەیان لە ئاسمان و تەنەکانی و ئەستێرەکانی کرد.

زانایانی گەردوونزانی گەیشتنە ئەو ڕاستییەی کە ڕەنگی تەنە گڕگرتووەکان لە گەردووندا پەیوەندی بە پلەی گەرمی ئەو تەنەوە هەیە، پێوانە نوێکان ئەوەیان سەلماند کە ئەو تەنها فاکتەرەی کاریگەریی لەسەر ڕەنگی تەنەکان هەیە لە ئاسماندا بریتییە لە پلەی گەرمییان.

لەگەڵ گەرمکردنی تەنەکان ڕەنگیان لە سوورەوە دەگۆڕێت بۆ ڕەنگە کراوەکان، واتە بۆ زەرد و پاشان بۆ سپی، لەگەڵ بەردەوامبوونی بەرزبوونەی پلەی گەرمیان ڕەنگیان لە سپییەوە بۆ ڕەنگە تاریکەکان دەڕوات واتە شین و لە کۆتاییدا ڕەش دەبێت کە کۆتایین ڕەنگە و تەنەکان لە پلە گەرمییە هەرە بەرزەکان ڕەنگیان نامێنێت و ڕەش دەبن.




لـه گەردوونـدا ئـەو ئەسـتێرانەی پلـەی گـەرمیان نزیکـەی ٤٠٠٠ پلـەی کالڤنـە ڕەنگیان سوورە (وەك زەبەلاحە سوورەکان).

ئەو ئەستێرانەی گەرمیان نزیکە لە ١٠٠٠٠ پلە سپی دەردەکـەون کـە ڕەنگێکـی مەرکەزییە (وەك گرگنە سپییەکان).

ئەو ئەستێرانەش کە گەرمییان لە ١٠٠٠٠ پل زیاترە تـا ملیارەهـا پلـەی سـەدی ڕەنگیان شین دەبێت (وەك زەبەلاحە شینەکان و ئەستێرە نیوترۆنیەکان).

کۆتایین ڕەنگ زانایان وای بۆ دەچن لە تونێلە (کونە) ڕەشەکاندا ڕوودەدات کە پلەی گەرمیان زۆر بەرزە و لە ناکۆتا نزیك دەبێتەوە.

یەککگرتنەوەی تەواوی ڕاستییەکانی ئەم فەرموودەیە لەگەڵ نـوێترین دۆزینـەوە زانستییەکانی سەردەمدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە ئەم ووتانە بەهیچ شێوەیەك لە زانیاریی مرۆڤەکانی پێشترەوە وەرنەگیراوە و بۆمـان دەسـەلمێنێت کـە دەبێـت ئەم ووتانە فەرموودەی پێغەمبەرمان محمـد (ﷺ) بێـت کـە بـە وەحـی و زانیـاریی خودایی پشتگیریی کراوە.

**(بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٤٩٧ لە هاوپێچی وێنە ڕەنگاورەنگەکان)**

**نموونەی دووەم: دیاردەی هەورە بروسکە شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەدات:**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (**أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ**) (**رواه مسلم**)، واتە: ئایا هەورە بروسکەتان نەبینیوە کە چۆن دەڕوات و دەگەڕێتەوە لە چاوتروکانێکدا. لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) دیاردەی هەورە بروسکە بۆ هاوەڵانی ڕووندەکاتەوە بەووردەکارییەکی زۆر و باسکردنی هەندێك نهێنی هەورە بروسکە کە مرۆڤ تاوەکو دوای سەدەی هەژدەیەم نەبێت پەی بەو نهێنیانە نەبردووە، پێش هەموو شتێك دیاریکردنی خێرایی بۆ هەورە بروسکە دەستپێشخەرییەکی بێوێنەیە کە بە چاوتروکاندنێك دیاریکردووە (زانایان لەمڕۆدا ماوەی ڕوودانی هەورە بروسکە بە ٢٥ میللی چرکە[٨٠] دەخەمڵێنن کە بە نزیکەیی هەمان ماوەی ڕوودانی چاوتروکاندنێکە لەمڕۆڤدا). (**وێنەکانی لاپەڕە ٤٩٨-٤٩٩**)

پاشان دیاریکردنی ٢ قۆناغی ڕۆشتن و گەڕانەوە بۆ تەزووی کارەبایی هەورە بروسکەکە کە زانایان تەنها دوای سەدەی بیستەم و داهێنانی ئامێرە پێشکەوتووەکانی پێوانە و وێنەگرتن گەیشتنە ئەم ڕاستییە و زانیمان کە هەورە بروسکە ٢ قۆناغی ڕۆشتن و گەڕانەوەی هەیە.



---

٨٠ (میللی چرکە واتە یەك بەش لە ١٠٠٠ بەشی چرکەیەك).

چونکە مرۆڤ بەچاوی ئاسایی وادەزانێت کە تەزووەکە لە هەورەکەوە بە یەك قۆناغ دەڕوات بۆ زەوی بەڵام لەرووی زانستییەوە ئەوەی ئێمە بەچاو دەیبینین بریتییە لە گەڕانەوەی تەزووەکە لە زەوییەوە بۆ هەورەکە، ئەمانە هەمووی دەیسەلمێنن کە ئەم راستییانە لە زانیارییەکانی مرۆڤی سەدەی حەوتەمی زایینییەوە وەرنەگیراوە بەڵکو زانیاریی پەروەردگاری بەدیهێنەر و ئاگاداری نهێنیەکانە، و بێگومان ئەم فەرموودەیە ووتەی مرۆڤێکی ئاسایی نییە بەڵکو ووتەی ئەو پێغەمبەرەیە کە بە زانیاریی خودایی پشتگیریی کراوە[٨١].

(بڕوانە وێنە روونکەرەوەکانی لاپەڕە ٥٠٠- ٥٠٢)

**نموونەی سێیەم: ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی خۆپارێزیی و تەنینەوەی نەخۆشی:**




[٨١] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە بابەتی (دیاردەی هەورە بروسکە شایەتی دەدات لەسەر راستگۆیی پێغەمبەرمان(ﷺ) لە ژمارە (١٧)ی گۆڤاری هەیڤ.

له سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) چەندین نموونەی سەرنجراکێش هەیە دەربارەی خۆپاراستن لەنەخۆشی و ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی درمەکان کە هەموویان لەڕووی زانستیەوە ڕاستییان و گرنگیان بۆ پاراستنی ژیانی مرۆڤەکان سەلماوە، لێرەدا ناتوانین هەموویان بهێنین بەڵام یەك فەرموودە دەکەینە نموونەی ئەم بابەتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿الطاعون رِجْزٌ أُرسِلَ على طائفة من بني إسرائيل و على مَنْ كان قَبلَكُم، فإذا سَمِعْتُم بِهِ بِأَرضٍ فلا تدخلوا عليه، و إذا وَقَعَ بِأَرضٍ وَأَنتُم بها فلا تخرجوا منها فِراراً مِنْهُ﴾ (رواه البخاري و مسلم)، واتە: نەخۆشی تاعوون سزایەك بووە خودا بۆ میللەتانی پێشووتری ناردبوو، ئەگەر گوێتان لێبوو لە شوێنێکدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ئەو شوێنە، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا بڵاوبۆوە کە خۆتانی لێبوون ئەوا لەو شوێنە دەرمەچن و لەترسی ڕامەکەن[٨٢].

ڕێگرتن لە موسوڵمان لە چوونە ناوەوەی شوێنی تووشبوو بە نەخۆشی ئاشکرایە، بەبێ هیچ زانیارییەکیش لەبواری پزیشکیدا دەزانرێت کە بۆ پارێزگاری ژیانیان و تووش نەبوونیانە بە نەخۆشییەکە، بەڵام ڕێگرتن لەو کەسانەی لە شوێنێکدا دەژین کە تووشبووە بە نەخۆشیەیەکی درمی وەك تاعوون کە نەچنە دەرەوە و هەر لەشوێنی خۆیاندا بمێننەوە، بە تایبەتی کەسانێکی تەندروست کە هیچ جۆرە نیشانەیەکی نەخۆشییان تێدا نییە، شتێکی سەیر و قورسە بۆ تێگەیشتن بۆ کەسانێکی ئاسایی کە شارەزاییان لە بواری پزیشکیدا نییە ! !

هەروەها عەقڵ و مەنتیق بەسەرماندا دەسەپێنێت کە ئەو کەسەی لە شارێکی درماویدا بێت، دەبێت ڕابکات بۆ شوێنێکی سەلامەت لەو نەخۆشییە، بۆ ئەوەی تووش نەبێت، چونکە ڕاکردن لە نەخۆشی و تیاچوون غەریزەتێکی ئاساییە لە هەموو مرۆڤێکدا.

---

[٨٢] لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: عن جابر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): الفارُّ من الطاعونِ كالفارِّ مِنَ الزَّحْفِ و الصّابِرُ فيهِ كالصّابرِ في الزَّحْفِ﴾ (رواه أحمد).

زانستی پزیشکیی نویٚ لە بواری خۆپارێزیی و گواستنەوەی نەخۆشیدا راستیی و گەورەیی فەرموودەکەی بۆ روون کردووینەتەوە، زانایان و پزیشکان دەڵێن کاتێك پەتایەك یان درمێك لە شوێنێکدا بڵاودەبێتەوە و کاتێك نیشانەکانی نەخۆشییەکە لەسەر هەندێك لە خەڵکەکەی دەردەکەوێت، لەو قۆناغەدا زوربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە بوونەتە هەڵگری میکرۆبی نەخۆشییەکە و چۆتە لەشیانەوە، با نیشانەکانی نەخۆشییەکەش تێیاندا دەرنەکەوتبێت، کەواتە مەرج نییە ئەو کەسەی میکرۆبی نەخۆشی دەچێتە لەشییەوە تووشی نەخۆشییەکە ببێت.

لێرەدا مەترسییەکە لەم کەسە هەڵگرە لەشساغ و شکڵ ئاساییانەدایە کە میکرۆبی نەخۆشیەکە لە لەشیاندایە و بڵاوی دەکەنەوە بۆ خەڵکانی تر، زۆرێك لە نەخۆشییە درمەکانی وەك: گرانەتا (تایفۆئید)، سکچوونی ئەمیبی، کۆلێرا و تاعوونیش، هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەیان بریتییە لەو کەسانەی کە هەڵگری میکرۆبەکەن بەڵام خۆیان نەخۆش دەرناکەون.

لەژێر رۆشنایی ئەم راستییە نوێیانەدا پزیشکان ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەن لەو ناوچانەدا کە نەخۆشییەکی درمی تێدا بڵاوبووەتەوە و هەروەها بەرپرسانی ئەو ناوچەیەش ئاگادار دەکەن کە نەهێڵن هیچ کەسێك لەوێ بچێتە دەرەوە، چونکە چوونە دەرەوە هیچ سوودێکی نییە و مەترسیدارە، لەبەرئەوەی هەر کەسێك کە هەڵگر بێت و لەو شوێنە دەرچێت دەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی میکرۆبەکە بۆ شوێنی تر و ئەوسا کۆنترۆڵ کردنی تەنینەوەی نەخۆشییەکە زۆر زەحمەتتر دەبێت.



## نموونەی چوارەم: سەرەنجامی خراپەکاریی:

پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا ئاگادارمان دەکات لە سەرەنجامی کردەوە خراپەکان و سەرپێچی فەرمانەکانی پەروەردگار کە چۆن ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ .... خمس إذا ابتليتم بهن، وأعوذ بالله أن تدركوهن: لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها، إلاّ فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا ....﴾ (رواه ابن ماجة والحاكم وصححه)[٨٣].

واتە: پێنج شت هەیە ئەگەر توشتان ببێت، پەنا ئەگرم بەخودا کە پێیان بگەن: یەکێکیان ئەوەیە کە هەر کاتێك لادان وبێڕەوشتی لە میللەتێکدا بڵاوببێتەوە و ئاشکرای بکەن و شانازی پێوە بکەن، بێگومان سەرەنجام تاعون و ئازار و نەخۆشی وایان تێدا بڵاودەبێتەوە کە لە میللەتانی پێشترا نەبووە و نەبیستراوە.

لەرۆژگاری ئەمڕۆدا ئەو نەخۆشییانەی بەهۆی بەدڕەوشتییەوە بڵاودەبنەوە زۆرن و لە زانستی پزیشکیدا پسپۆڕییەکی تایبەت پێکدەهێنێت و پێیاندەوترێت نەخۆشییە زایندەییەکان (Sexually Transmitted Diseases) کە هەرگیز بەم شێوەیە لەپێشتردا نەناسراون و نە بەم شێوەیە بڵاوبوون، یەکێك لەو نەخۆشییە باوانە کە مەترسیدارترینیانە بریتییە لە نەخۆشی (ئایدز).

رۆژی (١/١٢)ی هەموو ساڵێك بە رۆژی جیهانی بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی (ئایدز) ناسراوە لە هەموو جیهاندا، کە تێیدا چەندین چالاکی جۆراوجۆر لە هەموو لایەکی دونیادا ئەنجام دەدرێت بە مەبەستی ناساندنی زیاتر و هۆشیار کردنەوەی

---

٨٣ لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (خمس بخمس..... ولاظهرت فيهم الفاحشة إلا فشا فيهم الموت .......) (رواه الطبراني في الكبير وهو حديث حسن).

مرۆڤەكان سەبارەت بەم نەخۆشییە و هۆكارەكەی و شێوازەكانی گواستنەوە و چۆنێتی بەرەنگاربوونەوەی.

كاتێك سەرەتا ئەم نەخۆشییە پەیدابوو، ڤایرۆسە تووشكەرەكەی هەموو كۆت و بەندێكی شكاند و بە هەموو لایەكی جیهاندا بڵاوبوویەوە، لەو رۆژەوە بەردەوام تەحەددای زانستی پزیشكی نوێ و پزیشكان دەكات كە نەیانتوانیوە بەری پێبگرن و چارەسەر و كوتانی كاریگەری بۆ بدۆزنەوە، ڤایرۆسەكە بۆ یەكەمجار لە ساڵی ١٩٨١دا دۆزرایەوە. ( **بڕوانە وێنەكانی لاپەڕە ٥٠٢-٥٠٣** )

تا ئێستا بە ووردی نەزانراوە كە ئەم ڤایرۆسە سەرەتا چۆن پەیدابووە! تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان بە دەیان ملیۆن كەس لە هەموو شوێنێكی دونیادا گیرۆدەی بوون و چاوەڕێی مردنێكی هێواش دەكەن.




با گوێ بگرین بۆ یەكێك لە تووشبوانی ئەم نەخۆشیە كاتێك دەڵێت: (من چاوەڕوانی قەدەر دەكەم، گوێم لێیە لە دەرگام دەدات، گوێم لە دەنگێتی كە ناخمی هەژاندووە، من نەم دەویست بەم شێوەیە ئازار بچێژم، بەهۆی ئەم

نەخۆشیەوە، ئایدز شێرپەنجەی سەردەمە، لەگەڵ زەردەخنەی هاوڕێیان و ئاوات خوازیان بۆ چاکبوونەوەم بەلام من مەوعیدم لەگەڵ قەدەر هەیە کە ئێستا لە دەرگام دەدات).

ئەمە وتەکانی (رۆك هەدسۆن)ی ئەکتەری بەناوبانگی ئەمریکی بوو لەسەر جێگای مردن دوای ئەوەی ئازارەکانی ئەیدز پەکیخستبوو.

ئەم نەخۆشیە پەیوەندیەکی تەواوی بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانەوە هەیە، کە هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەی لە رێگەی سێکس کردنە لە دەرەوەی خێزان (زینا کردن)، لە وڵاتانی رۆژئاوا سێکس لەگەڵ هاورەگەز (نێربازیی) و سێکس لەگەڵ رەگەزی بەرامبەر (زینا) و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لەرێی دەرزیەوە سێکوچکەی هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئایدزە، لە هەموو جیهانیشدا سێکسی دەرەوەی خێزان (٨٠٪)ی زیاتری هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکەیە، کەواتە ئەم نەخۆشیە پەیوەندی تەواوی لەگەڵ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە نادروست و نەشازەکان هەیە و سەرەنجامی ئەو لادان و پشێویە سێکسیەیە کە جیهانی گرتووەتەوە. ( **بۆ سەرەنجامی نەخۆشییەکە بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٠٣-٥٠٤** )

ئەیدز لەرێگەی جەنگێکی گەردوونی سێیەمەوە نەهاتووە، یان لەرێی بۆمبە ناووکی و هایدرۆجینی و نیوترۆنی و بایۆلۆجیەکان، بەڵکو سەرەنجامی هەڵسوکەوتی نەشاز و لادەری مرۆڤایەتیە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، ئەمە دەرەنجامی هەڵگەڕانەوەیە لەو سروشتە پاکەی پەروەردگار مرۆڤی لەسەر دروست کردووە و نوقوم بوون لە زۆنگاوی بێڕەوشتی و نەشازی و مادده هۆشبەرەکان.

بێگومان پەروەردگار وەك بەدیهێنەری ژیان و مرۆڤ باشتر ئاگادارە بە پێویستیەکانی مرۆڤ، هەربۆیە لە سەرەتاوە پەیامی خۆی بە پەیامبەرە بەڕێزەکانیدا بۆ مرۆڤایەتی ناردووە بە مەبەستی رێنمایی کردنیان بۆ باشترین رێباز و هەڵسوکەوت لە ژیانیاندا، هەڵسوکەوت و رەووشتێك کە لەگەڵ ئەو سروشتە

پاکـەدا یەکبگرێتـەوە کـە پـەروەردگار مرۆڤـەکانی لەسـەر دروسـت کـردووە، هـەر کاتێکیش مرۆڤەکان لەم سروشتە پـاك و پەيامـە پيرۆزانـە دووركەوتبنـەوە و نـوقم بووبن لە زۆنگاوی نـەفامی و لادان و بەدڕەووشـتيدا، سـەرەنجام بـە لەناوچـوون و مـاڵوێرانی خۆيـان تـەواو بـووە، ئەمـەش سـوننەتێکی خوداييـە بـۆ پاکردنـەوەی سەرزەوی لە ستەمکاران و تاوانباران و لادەران، و ڕێخۆشکردن بۆ نەوەيەکی نـوێ کـە لەسـەر سروشـتە پاکەکـەی خـۆی سـەر زەوی ئـاوەدان بکاتـەوە و لەسـەر بنەمايەکی دروست پەيوەنديە کۆمەڵايەتيەکانی دامەزرێنێت.

لێرەدا با گوێ بگرين بۆ پەيامی پـەروەردگار کـە چـۆن ئامۆژگاريمـان دەکـات: ﴿فأصابهم سيئات ماكسبوا والذين ظلموا من هؤلاء سيصيبهم سيئات ماكسبوا وماهم بمعجزين﴾ (الزمر:٥١)، واتە: ئەو کەسـانەی پـێش ئێـوە تووشـی ئـەنجامی خراپـی کارە لادەرەکانيان بوون، ئـەو سـتەمکارانەش (بێبـاوەڕانی سـەردەمی پێغەمبـەر) بەهەمان شێوە تووشی سـەرەنجامی کـارە خراپـەکانيان دەبـن و نـاتوانن ڕێ لـەم چارەنووسەيان بگرن، کەواتە ئەمە سوننەتێکی خوداييە کە هەموو کـارێکی خـراپ و لادەر سـەرەنجامی خـراپ بـەدوای خۆيـدا دێنێـت، پێغەمبـەريش (ﷺ) لـە فەرموودەکەيدا ئاگادارمان دەکـات لـە سـەرەنجامی کـردەوە خراپـەکان کـە چـۆن ئـەنجامی خراپـی لێدەکەوێتـەوە کـە دەفـەرموێت: ﴿ .... خمس إذا ابتليتم بهن، وأعوذ بالله أن تدركوهن: لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها، إلاّ فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافم الذين مضوا ....﴾.

مەترسيدارترين جۆری ئەم نەخۆشييانە وەك ووتمان بريتييە لە نەخۆشی ئەيدز (AIDS) کـە زۆر تازەيـە و تـەنها لـە سـاڵی ١٩٨١دا ڤايرۆسـە تووشـکەرەکەی دۆزرايەوە، نەخۆشی ئەيدز لەمرۆماندا بريتييە لە تاعونی سەردەم کە سەرەکيترين ڕێگـەی بڵاوبوونـەوەی (زيـاتر لـە ٪٩٠ی حاڵەتـەکان) لـە ئـەنجامی بێڕەوشـتی و لادانەوەيە.

کۆمەڵگای ماددیی بێباوەڕی ڕۆژئاوایی ئەمڕۆ کە (فرۆید)ی کردۆتە سەرمەشقی (کە لە ووتەیەکیدا دەڵێت: مرۆڤ ناتوانێت خودی خۆی بسەلمێنێت تەنها بەتێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکانی نەبێت، و هەموو کۆت و بەندێك لە ئاین و ڕەووشت و خووە باوەکانی کۆمەڵگا بریتین لە کۆت وبەندێکی بەتاڵ و لەناوبەری ووزەکانی مرۆڤ و بریتیە لە کپکردنەوەیەکی نادروست !!؟).

دەبینین چۆن سەرەنجامی ئەم سنوور بەزاندن و لادان و بەرەڵلاییە بووەتە هۆی پەیدابوون و بڵاوبوونەوە و سنووربەزاندنی ئەم نەخۆشیە کوشندانە کە لە سەرووی هەموویانەوە نەخۆشی ئەیدزە.

زیانە مرۆییەکانی ئەیدز هیچی کەمتر نیە لە زیانەکانی دوو جەنگە گەورە جیهانیەکەی سەدەی بیستەم و بەردەوامیش مرۆڤەکان لەناو دەبات، ساڵانە (٢) ملیۆن کەس بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە لەناودەچن، و (٢.٥) ملیۆن کەسی تر تووشدەبن!

تا ساڵی (٢٠١٣) زیاد لە (٣٩) ملیۆن کەس لە جیهاندا بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە گیانیان لەدەستداوە لە سەرەتای دۆزینەوەی لە (١٩٨١)دا، تا کۆتایی (٢٠١٣) (٣٥ ملیۆن) کەس هەڵگری ڤایرۆسی نەخۆشیەکەبوون لە جیهاندا و چاوەڕێی مردنێکی هێواش دەکەن، ئەمانە بەپێی دوایین ئامارەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەیدز (UNAIDS). (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٠٥**)

زیانە ئابوورییەکانی ئەیدز هیچی لەو زیانە مرۆییانە کەمتر نییە کە باسمان کردن، هەر لەسەرەتاوە کێشەیەکی ئابووری گەورەی لە جیهاندا نایەوە، بۆ نموونە تێچوونی پشکنین و چارەسەرکردنی یەکەم (٣٠٠) حاڵەت بەتەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا گەیشتە (١٨ ملیۆن) دۆلار کە سەرەنجام هەمووشیان مردن!!

لەمڕۆدا تێچوونی چارەسەری (١) نەخۆشی ئەیدز دەگاتە (١٠٠) هەزار دۆلار، کە هۆکاری سەرەکی بریتیە لە گرانی نرخی دەرمانەکانی کۆنترۆڵ کردنی ڤایرۆسەکە و ئەو ماوە زۆرەی بۆ چارەسەر پێویستە، جا بڕوانە ئەو تێچوونە زەبەلاحەی پێویستە بۆ چارەسەری دەیان ملیۆن نەخۆش لە جیهاندا، بە تایبەتی لە وولاتە هەژارەکاندا کە چ قورساییەکی گەورە دەخاتە سەر بودجەی ولاتان بۆ نەخۆشییەك کە ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی بەو شێوە بەربڵاوە زۆر ئاسانە و خۆی دەبینێتەوە لە دوورکەوتنەوە لە داوێن پیسیی و بێڕەووشتی و لادان، ئەم هەموو پارە بەهەدەر چووە دەتوانرا بەهۆیەوە هەرهیچ نەبێت خەڵکانی برسی لە جیهاندا پێتێربکرێن و هەژاریی پێقەلاچۆ بکرێت و ئاستی ژیانی هەژارانی پێبەرز بکرایەتەوە[٨٤].

## نموونەی پێنجەم: دیاردەی سکالاّ و گەلەکۆمەکی لەلەشی مرۆڤدا:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى لـه سائر الجسد بالسهر والحمى﴾ رواه مسلم . ولفظ البخاري: ﴿ترى المؤمنين في تراحمهم وتوادهم وتعاطفهم كمثل الجسد الواحد إذا اشتكى عضوا تداعى له سائر جسده بالسهر والحمى﴾.

واتە: نموونەی ئیمانداران لەخۆشەویستی و بەزەیی و هاوسۆزییان بۆیەکتری وەکو نموونەی لاشەیەك وایە کاتێك ئەندامێکی ئەو لاشەیە تووشی زەرەرێك دەبێت و سکالاّ دەکات هەموو ئەندامەکانی لاشە گەلەکۆمەکی بۆدەکەن و یارمەتی دەدەن و بەهۆیەوە هەموو لاشە تووشی شەونخوونی و خەوزڕان و تا دەبێت.

لەفەرموودەکەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر ئەندامێکی لەشی مرۆڤ تووشی زەرەر ببێت ئەو ئەندامە خۆی سکالاّ دەکات کەدەفەرموێت (إشتکی).

---

٨٤ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە کتێبی: نەخۆشی ئایدز، نووسینی: مەسرور سلیمان، لە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی.

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە راستگۆکەی، زانستی نوێی ئـەمڕۆ ئەو راستییەی بۆسـەلماندووین کـە هـەر ئەنـدامێکی لەشـی مرۆڤـ کاتێك تووشـی زەرەرێك یان نەخۆشیەك دەبێت سەرەتا ئـەو ئەندامـە چـەند وەڵامێکی دەبێـت و چەندین ئاماژە دەنێرێت کەخۆی لەخۆیدا بریتییە لە سکاڵاکردن.




هەر شوێنێکی مرۆڤ کەتووشی زیان دەبێت لـەو شـوێنەدا چـەند چـالاکییەك و وەڵامێـــــك روودەدات کـــــەپێیدەوترێت وەڵامـــــــی دەمـــــــاری و کـــیمیایـــی(Neuro-Endocrinal Response) پاشـان ئـەم وەڵامـە دەبێتــە هــۆی ئاگــادار کردنــەوەی چــەند ســەنتەرێکی تایبــەت لەمێشــکدا بــۆ یارمەتیدانی ئەندامی بریندار، ئەم چالاکیانە بریتییە لە نـاردنی سـکاڵا بـۆ مێشـکی

مرۆڤ کە گەورەترین دەسەڵاتە لەلەشدا، مێشکیش هەموو ئەندامەکانی لەش ئاگادار دەکاتەوە بۆ هەستان بەچالاکیەکی بەکۆمەڵ و گەلەکۆمەکی بۆ یارمەتیدانی ئەندامی بریندار. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٠٦-٥٠٧**)




هەروەها لەفەرموودەکەدا هاتووە کە سەرەنجامێکی تری گەلەکۆمەکی لەش بریتییە لە خەوزڕان و دروستبوونی تا، هۆکاری سەرەکی دروست بوونی تا بریتییە لەچەند ماددەیەك کە خرۆکە سپییەکانی خوێن و شانە بریندارەکان دەریدەدەن کەئەو ماددانە پایرۆجینەکانن (Pyrogens) بەتایبەتی ماددەی (Interleukin 1) کەکاتێك دەچنە سووڕی خوێنەوە و پاشان دەگەنە مێشك سەرەنجام کاریگەرییەکی وا لەسەنتەری راگرتنی پلەی گەرمی لەش لەمێشکدا دروست دەکەن کە دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش.

هەروەها هۆكارێكی تری دروست بوونی تـــا بریتیە لەهۆرمۆنی سایرۆكسین كە لەلایەن ڕژێنی دەرەقیەوە بەڕێژەیەكی زیاتر دەڕێژرێت لەكاتی هەر زەرەرێك كەتووشی لەش دەبێت، كەواتە وەكو لەفەرموودەكەدا هاتووە زانستی نوێی ئەمڕۆ زۆر تازە گەیشتووەتە ئەم راستیانە، و راستیەكانی فەرموودەكەی بۆ سەلماندووین كە ماددەكانی لەش خۆی دەبێتە هۆی دروست بوونی تـــا.

هەروەها زانستی فیسیۆلۆجی بۆمان ڕووندەكاتەوە كە لەكاتی تووشبوونی ئەندامێكی لەش بەزیانێك و گەیشتنی سكاڵاكەی بۆ مێشك، یەكێك لە ئەنجامەكانی ئەم كردارە بریتیە لە چالاكبوونی سەنتەری خەوزڕان و ئاگاداریی لەمێشكدا و سستبوونی سەنتەری خەوتن لە ناوچەكانی (Reticular Formation) و (Limbic System) لەمێشكدا، كە لەئەنجامی ئەمەدا خەودەزڕێت و كەسی تووش بوو زۆر بەزەحمەت خەوی لێدەكەوێت.

## نموونەی شەشەم: ئاماژەكان لە سوونەتدا بۆ زانستی بۆماوەیی:

بەگەڕانـــەوە بـــۆ راســـتیە زانستیەكانی كۆرپەلـــەزانی و بۆمـــاوەزانی (**Genetics**)، دەبینین ئەم زانستانە بۆیان سەلماندووین لە زیندەوەرەكاندا دوو جۆر سیفەتی بۆماوەیی هەیە:

١- سیفەتی زاڵ (**Dominant**): ئەوەیە كەئەگەر تەنها لەیەكێك لە باوانەوە (دایك یان باوكی زیندەوەرەكەوە) بۆی بمێنێتەوە ئەوا بەمسۆگەری لەداهاتوودا لەكۆرپەلەكەدا دەردەكەوێت.

٢- سیفەتی بەزیوو (**Recessive**): ئەوەیە كەئەگەر لەدایك یان لەباوكیەوە بەتەنها بۆی بمێنێتەوە، ئەوا لەكۆرپەلەكەدا ئەو سیفەتە دەرناكەوێت، بەڵكو پێویستە ئەو سیفەتە بەزیوە لە هەردوو دایك و باوكەكەدا هەبێت و بۆ منداڵەكە بگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی لەداهاتوودا لە كۆرپەلەكەدا بە مسۆگەری دەركەوێت.

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە بەڕێزەکەی، دەبینین ئەم راستیە لەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا(ﷺ)ئاماژەیپێدراوە، ئەوەتا دەبینین کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەپەروەردگار دەپاڕایەوە، لە یەکێك لە نزاکانیدا دەیفەرموو:

- [مَتِّعْنا اللّهُم بِأَسْماعِنا وَأَبْصارنا وَقُوَّتِنا أَبَداً ماأَحْيَيْتَنا،وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا] (**حديث حسن رواه الترمذي و النسائي**)، واتە:ئەی پەروەردگار خۆشیمان پێ ببەخشە بەگوێکانمان وبە چاوەکانمان، وبەهێزو قووەتمان هەتا لەژیاندا ماوین، وکە مردین ئەمە بکە بەسیفەتێکی زاڵ بۆ نەوەکانی پاش خۆمان، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە کەدەفەرموێت: (وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا) کە بە (إسم فاعل) هێناویەتی، واتە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە: ئەو سیفەتانە خۆیان بکەر(فاعل) بن و سیفاتەکان لە نەوەکانی داهاتوودا بەدڵنیاییەوە دروست بکەن، کە وەك ووتمان ئەم بۆچوونە بەووشەی زانستی بۆماوەزانی ئەمڕۆ پێی دەڵێن سیفەتی زاڵ.

– لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:[عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَماً أَسْوَدَ وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: «فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): « فَأَنَّى هُوَ »، قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ»] (**رواه مسلم**)،واتە:پیاوێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمبەر و پێیوت:خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە کەمن ڕەش نیم و لە من ناچێت! پێغەمبەر(ﷺ)(بۆ ئەوەی تێگەیشتنی ئەم بابەتەی لا ئاسان بکات) لێی پرسی: تۆ ووشترت هەیە؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، پاشان پێی ووت: ڕەنگیان چۆنە؟ ئەویش ووتی: سوورن، ووتی: باشە سپی ڕەنگیان تێدانییە؟ ووتی: بەڵێ سپی تێدایە، پێغەمبەر (ﷺ) پێیوت: ئەوە تۆ چۆن دەیبینیت (ئاوا ووشترێکی سپی لە نێوان ئەو ووشترە سوورانەدا لەدایك بووە)؟ کابرا ووتی: لەوانەیە ئەی پێغەمبەری خوا

ئەوە ڕەگێکی پێشتر بێت و بۆ ئەم مابێتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دەبزانە لەوانەیە ڕەنگی منداڵەکەشت هەربریتی بێت لەڕەگێکی بۆماوەیی پێشترتان و بۆ ئەم ماوەتەوە.

ئەم فەرمودە پیرۆزە دوو ئاماژەی بۆماوەیی گرنگی تێدایە کە زۆر تازە دۆزراونەتەوە لەم ڕۆژگارەدا، ئەوانیش ئەوەیەکە: ١- سیفەت هەیەبەزیوە. ٢- سیفەتی تریش هەیە کەلە وەچەیەکدا دەردەکەوێت پاشان چەند وەچەیەکی تر دەپەڕێنێت ولەوەچەکانی داهاتوودا دەردەکەوێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تریشدا هەمان ئەو بۆچوونە هاتووە کە زۆر سیفەت هەیە لە باوك و دایکەوە بۆ نەوەکانیان دەگوێزرێنەوە کە دەفەرموێت: ﴿تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُم فَإِنَّ العِرْقَ دَسَّاس ...﴾، واتە: بزانن کێ هەڵدەبژێرن ببێت بە هاوسەرتان لەبەر ئەوەی کە ڕەگی خراپ هەروەك ڕەگی چاك بۆ نەوەکان دەگوێزرێتەوە، کەواتە ئەو سیفەتانەی کە مرۆڤ هەیەتی بەهۆی بۆماوەوە لە باو و باپیرانیەوە بۆی دەگوێزرێتەوە بەهۆی جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمەکان.





**کرۆمۆسۆمەکان ماددەی بۆماوەیین لە مرۆڤدا و هەڵگری هەموو سیفاتەکانین**

**(هەروەها بڕوانە وێنە ڕەنگاورەنگەکانی لاپەڕە ٥٠٨)**

## نموونەی حەوتەم: ئیعجازی پزیشکی لەو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە کلێنچکە( عجب الذنب )ی کردووە بە بنچینەی دروست بوونی مرۆڤ:

لە چەند فەرموودەیەکیدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی کلێنچکەی کردووە کە بەشێکی گرنگی لەشی مرۆڤە، و بە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤی داناوە، بەڕوونی باسی ئەوەی کردووە کە مرۆڤ لەمەوە دروست دەبێت، وەك لەم فەرموودانەدا:

- (كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّراب إلاّ عَجْبَ الذَّنَب، مِنْهُ خُلِقَ وَمِنْهُ يُرَكب) (رواه مسلم)، واتە: هەموو بەشێکی مرۆڤ زەوی دەیخوات و دەیڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکێك نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت بیفەوتێنێت، **لەم ئێسکەوە ئادەمیزاد دروست بووە** و هەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە.

- (كُلّ ابْن آدَم تَأْكُلُ الأرضُ إلاّ عَجْب الذَّنَب مِنْه خُلِقَ وفيه يُرَكَّب) (رواه أبوداود).

زانایانی زمانەوانی سەبارەت بە (عَجْب الذَّنَب) دەڵێن: (**هو العظم الذي في أسفل الصلب عند العجز**)[٨٥] واتە: بریتییە لەو ئێسکەی کە لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا هەیە (واتە ئێسکی کلێنچکە)، ئەم ئێسکە لە ئاژەڵانیشدا هەیە و کلك دروست دەکات، فەرموودەکە ووشەی (الذَّنَب)ی بەکارهێناوە بە مانای (کلك)، کە ئەوە دەگەیەنێت کۆرپەلەی مرۆڤ پێشتر کلکی هەبووە و لە دواییدا دەپووکێتەوە.

ئەم فەرموودانە چەند ئاماژەیەکی زانستیی زۆر نوێی تێدایە:

یەکەمیان: مرۆڤ کلکی هەیە.

دووەمیان: کۆرپەلەی مرۆڤ لەم کلێنچکەوە دروست دەبێت.

سێیەمیان: شوێنی دروستبوونی کۆرپەلە لە کۆتایی ئەم کلکەدایە.

---

[٨٥] بڕوانە: فەرهەنگی لسان العرب/ ماددەی (عجب).

چوارەم: ئەم شوێنە بریتیە لە ئێسك.

پێنجەم: کۆتایی ئـەم کلکـە زۆر بچووکە (بڕوانـە ووشـەی (حَبَّةِ خَرْدَلٍ) کـە لـە فەرموودەکاندا بەکارهاتووە).

شەشەم: یەکەم شتێك کە لە کۆرپەلەکەدا دروسـتبوونی تـەواو دەبێـت بریتیـە لەم کلکە کە پاشان مرۆڤ و هەموو ئەندام و شانەکانی لێوە دروست دەبێت.

## کلێنچکە لە زانستی کۆرپەلەزانیدا( شریتی سەرەتایی ):

تازەترین توێژینەوەی زانسـتی کۆرپەلـەزانی روونـی کردۆتـەوە کـە کلێنچـکەی مرۆڤ لە سەرەتادا بریتییە لە ئەندامێکی بچووك پێیـدەوترێت: شـریتی سـەرەتایی (Primitive Streak)، لەگەڵ دەرکەوتنی ئـەم شریتەسـەرەتاییەی کۆرپەلـە، چینەکانی لەش و ئەندامەکانی کۆرپەلەوکۆئەندامی دەماری کۆرپەلەکە پێکدێنێت، دوایـی ئـەم شریتەسـەرەتاییە هـیچ شـوێنەوارێکی نامێنێـت جگـە لـە جێماوەیـەك نەبێت، کە لە مرۆڤی پێگەیشتوودا پێی دەڵێن ئێسکی کلێنچکە (Coccyx).

## پێکهاتنی شریتی سەرەتایی:

لــە چـواردەهەمین رۆژی گەشــەکردنی کۆرپەلــەدا دوو خەپلەکـەی کۆرپەلــە درێژدەبنــەوە هــەتا شـێوەیەکی هــەرمێیی وەردەگـرن، ســەرەپانەکەی بەشــی پێشــەوەیەتی بــەڵام بەشــە کۆتاییەکـەی باریـك دەبێــتەوە، خانــەکانی چـینی ئیکتـۆدێرمی دەرەوە لــە ناوچــەی کۆتاییــدا چـالاك دەبـن و ســەرەنجام دەبنــە پێکهێنــەری شــریتی ســەرەتایی (Primitive Streak)، بـۆ یەکـەمجار لــە پانزەهەمین رۆژی دوای پیتاندنی هێلکەکەدا دەردەکەوێت، و پێکهاتووە لە خانەی شێوەداسی لە کۆتایی چینی دەرەوەی دیسکی کۆرپەلەکەدا.

لــە ســەرەتای هەفتــەی ســێیەمدا و دوای پێکهــاتنی شــریتی ســەرەتایی دابەشبوونێکی خێرا و گەشەکردنێکی بەپەلە لە خانەکانی ئەم شریتەدا روودەدات،

و دەبێتە هۆی درێژ بوونەوەی و دوایی هێڵێکی راست پێکدێنێت، هەردوو لای راست و چەپی کەمێك بەرز دەبنەوە و کۆتاییەکەشی بەرزتر دەبێت وگرێی سەرەتایی (Primitive node) دروستدەکات، لە کاتی درێژ بوونەوەی ئەم شریتەدا لە ناوەڕاستیدا ڕێڕەوێك دروست دەبێت کە پێیدەووترێت چاڵایی سەرەتایی (Primitive groove)، لەم ڕێڕەوەوە خانەکانی شریتی سەرەتایی دەچنە ناو دیسکی کۆرپەلەکەوە لەرێی کونێکەوە کە پێیدەوترێت کونی سەرەتایی (Primitive pit)، لێرەوە شریتی سەرەتایی دروستبوونی تەواو دەبێت کە دەکەوێتە بەشی کۆتایی دیسکی کۆرپەلەکەوە، کاتێك شریتی سەرەتایی دروست دەبێت ئیتر دەتوانرێت تەوەرەی پێشەوە بۆ دواوەی کۆرپەلەکە بزانرێت و پێشەوە و دواوەی دیاری دەبێت، هەروەها بەشی پشتی و سکی و راست و چەپی جیادەکرێتەوە، کەواتە لێرەوە خاڵی شەشەممان لە ئامارژە زانستییەکانی فەرموودەکان بۆ روون دەبێتەوە کە دروستبوونی ئەم کلکە پێش دروستبوونی کۆرپەلەکە دەکەوێت.




پاش دروستبوونی شریتی سەرەتایی بە ماوەیەکی کەم کۆچی خانەکان لە دەرەوە بۆ ناوەوە بەناو ڕێڕەوەکەدا روو دەدات، و دیسکی کۆرپەلەکە جیادەبێتەوە بۆ سێ چین، خانە دروستبووەکان لە شریتی سەرەتاییەوە لە کونی

سەرەتاييەوە دەچنە ناو كۆرپەلەكەوە و بەلاى ڕاست و چەپدا بلاودەبنەوە، دوايى ئەم خانە كۆچكردووانە دەبنە پێكهێنەرى چينێكى نوێ لە كۆرپەلەكەدا، كە پێيدەووترێت چينى ناوەراست يان (ميزۆدێرم Mesoderm).

ئەم چينە نوێيە (ميزۆدێرم) پاش ماوەيەكى كەم كاردەكاتە سەر چينى هايپۆبلاست (Hypoblast) و دەبێتە هۆى گۆڕانى ئەم چينە و دروستبوونى چينێكى نوێ كە جێيدەگرێتەوە و پێيدەووترێت ئينـدۆدێرم (Endoderm)، زۆر بە كورتى دەتوانين بلێين لە ئەنجامى پێكهاتنى شريتى سەرەتايى و زيادبوونى دابەشبوونە چالاكيەكەيدا، ديسكى كۆرپەلەكە درێژ دەبێتەوە و هەر ٣ چينەكەى لەشى دروست دەبن و لە يەكترى جيادەبنەوە. (**بڕوانە وێنەكانى لاپەڕە ٥٠٩-٥١٠**)



الخلايا المهاجرة إلى الشريط الأولي تتكاثر بداخله ثم تدخل الى تجويف القرص الجنيني لتكوين طبقة الميزودرم وطبقة الإندودرم

لە ناسراوترين ئەو زانايانەى باسى شريتى سەرەتاييان كردووە هەردوو زاناى ئەڵمانى (هانس سپيمان) و (هيلدا مانگۆلد)ن، كە هەستان بە توێژينەوە لەسەر شريتى سەرەتايى و بۆيان دەركەوت كە كردارى دروستبوونى كۆرپەلەكە ڕێكدەخات، و ناويانـنان ڕێكخەرى سەرەتايى (Primary organizer)، ئەم دوو زانايە هەستان بە بڕينى ئەم بەشەى كۆرپەلەيەك و چاندنى لە كۆرپەلەيەكى ترى ئاژەڵدا كە لە هەمان تەمەندا بوو لە هەفتەى سێيەم و چوارەمدا، ئەوەبوو ئەم پارچە چێنراوە بووە هۆى دروست بوونى كۆرپەلەيەكى ترى لاوەكى لە

کۆرپەلە سەرەکیەکەدا، ساڵی ۱۹۳۵ز زانای ئەڵمانی سپیمان خەڵاتی (نۆبڵ)ی وەرگرت لەسەر ئەو دەستپێشخەریەی بۆ دۆزینەوەی شریتی سەرەتایی و چاندنی، بەڵام دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) پێش ۱٤۰۰ساڵ باسی کاری ئەم شریتەی کردووە، بەڵام بە زاراوەی جیاواز و ناوی (عجب الذنب)ی لێناوە کە فەرموویەتی (منه خلق) واتە مرۆڤ لەمەوە دروستبووە[٨٦].

لەبەر ئەم گرنگیەی شریتی سەرەتایی لیژنەی (وارنك Warnock) لە پەرلەمانی بەریتانیادا (کە تایبەتە بە پیتاندنی دەستکرد لە دەرەوەی منداڵدان و قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە) کردوویەتی بە نیشانە و قۆناغی جیاکەرەوە بۆ ئەنجامدانی تاقیکاریی لەسەر کۆرپەلە دوای پیتاندنی دەستکرد، پێش پەیدابوونی ئەم شریتە لیژنەکە ڕێگا بە تاقیکردنەوە دەدات لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ، بەڵام پاشپەیدابوونی ئەم شریتە (کە لیژنەکە بە سەرەتای پەیدابوونی ڕاستەقینەی مرۆڤی داناوە) لیژنەکە هەموو جۆرە تاقیکاریەکی لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ قەدەغە کردووە لە ڕۆژی چواردەیەمی دروستبوونی کۆرپەلەکەوە کە لەم ڕۆژەوە شریتی سەرەتایی پەیدادەبێت.

---

[٨٦] لێرەدا سەبارەت بەو زاراوەیەی کە لە فەرموودەکاندا هاتووە (عجب الذنب) دەڵێین: لە رووی کۆرپەلەزانیەوە گونجاوترین زاراوەیە بۆ وەسفکردنی ئەو بەشەی کە کۆرپەلەکەی لێوە دروستدەبێت، زۆر گونجاوترە لە زاراوەکانی (شریتی سەرەتایی) و (ڕێکخەری سەرەتایی) کە زانایانی کۆرپەلەزانی بەکاری دێنن، چونکە زاراوەی (عجب الذنب) ئاماژە دەدات بە بوونی کلك لە کۆرپەلەدا (ذنب)، و هەروەها ئاماژە دەدات بەو شوێنەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش بەهۆی ووشەی عجب: کە بە مانای کۆتایی کلك دێت)، هەروەها ئاماژە دەدات بۆ قەبارەی ئەو شتەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش لەڕێی ووشەی عجب: کە مانایەکی تری بریتیە لە بەشێکی بچووکی کۆتایی ئێسکی کلك یان بەشێکی کلێنچکە، هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەو قۆناغەی کەتێیدا ڕوودەدات کە قۆناغێکی سەرەتاییە (عجب الذنب: واتە سەرەتای کلك)، ئەم لەپێشیەی کە زاراوەکەی فەرموودەکان هەیەتی بەسەر زاراوە زانستیەکاندا خۆی لەخۆیدا ئیعجازێکی دەربڕین و بەیان کردنە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ).

(د. کیس مور) لەم بارەوە دەڵێت: بەشی هەرە زۆری گەشە کردن و درێژبوونەوەی تۆپەڵە خانەکەی کۆرپەلە دەگەڕێتەوە بۆ کۆچ کردنی خانەکان لە شریتی سەرەتاییەوە، و لەبەر ئەوەی ئەم شریتە دەکەوێتە بەشی دواوەوەی (بەشی کلکی) تۆپەڵە خانەی کۆرپەلەکەوە، کەواتە ئەم کلکەی کۆرپەلەکەیە کە بناغە و سەرەتای راستەقینەی دروست بوونی ئەندامەکانی کۆرپەلەی مرۆڤە[٨٧].

کەواتە دروستبوونی شریتی سەرەتایی بریتییە لە سەرەتایەکی جیابوونەوەی شانەکانی کۆرپەلە بۆ دروست کردنی چینە جیاجیاکان و ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، لەڕاستیدا ئەوەی دەناسرێت بە قۆناغی دروستبوونی ئەندامەکان (Organization) تەنها دوای پەیدابوونی شریتی سەرەتایی دەست پێدەکات، کە لە سەرەتای هەفتەی ٤ تا کۆتایی هەفتەی ٨ دەخایەنێت، بە شێوەیەك کە کۆرپەلەکە لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا هەموو کۆئەندامە سەرەکییەکان و ئەندامەکانی تێدا دروستبووە، و تەنها وردەکارییەکانیان و گەورەبوون و گەشەکردنی ئەم ئەندامانە ماوە، کە لە قۆناغەکانی داهاتوودا روودەدەن.



وێنەی ٤

## سەرەنجامی شریتی سەرەتایی:

لێرەدا کاتی پرسیارێك هاتووە کە دەڵێت: ئایا ئەم بەشەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت بەڕاستی کلکە؟ و سەرەنجام چی لێدێت؟

ئەگەر سەیری (وێنەی ٤) بکەین کە گەشەکردنی کۆرپەلە رووندەکاتەوە، دەبینین بە جوانی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەدرێتەوە، کە بۆمان

---

٨٧ بڕوانە کتێبی: (The Developing Human)/ دانراوی (د. کیث مور)/ لاپەڕە ٧٥.

دەردەخات چۆن ئەم بەشەی دواوەی کۆرپەلەکە لوولدەخوات بۆ ئەوەی کلکێك دروست بکات.

ئەگەر سەیری (وێنەی ٥)یش بکەین وێنەیەکی راستەقینەی ئەم کلکە دەبینین لە کۆرپەلەیەکی چوار هەفتەدا، و نەمانی ئەم کلکە لە هەفتەی حەوتەمدا.




١- وێنەیەکی راستەقینەی کلکێك کە بۆ کۆرپەلەکە دروستدەبێت لە هەفتەی چوارەمدا.
٢- لەم وێنەیاندا دەبینین کە چۆن کلکەکە نامێنێت لە هەفتەی حەوتەمدا.

پاش دروستبوونی ئەندامانەکان لێیەوە و تەواو بوونی کاری ئەم شریتە، لە هەفتەی چوارەمدا، سەرەنجام ئەم شریتە دەست دەکات بە پووکانەوە، و تەنها لە کۆتایی بڕبڕەی پشتی کۆرپەلەکەدا دەمێنێتەوە، (د. کیس مور) دەڵێت: شریتی سەرەتایی دوای ئەم کردارانە زۆر بە زوویی دەچێتەوەیەك و لە قەبارەدا بچووك دەبێتەوە و دەبێت بە ئەندامێکی ناگرنگ لە ناوچەی کۆتایی بڕبڕەی پشتدا (لە ئێسکی کلێنچکەدا)[88]، کەواتە لەبەرئەوەی شریتی سەرەتایی بریتیە لە هۆکاری گەشەکردنی کۆرپەلە، و لە مرۆڤی گەورەدا شوێنەوارەکەی تەنها بریتییە لە ئێسکی کلێنچکە، سەرەنجامی گشتی دەتوانین بڵێین کە بەشێکی ئەم

---

٨٨ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کلێنچکەیەیە بنچینەی دروستبوونی مرۆڤە، بە تەواوەتی وەك فەرموودەکان ئاماژەیان پێداوە !.

هەروەها لەگەڵ پووکانەوەی ئەم شریتە سەرەتاییە لە ئێسکی کلکدا (کلێنچکە)، ئەم کلکە خۆیشی دەست دەکات بە پووکانەوە و بە تەواوەتی نامێنێت لە هەفتەی حەوتەم و هەشتەمدا، دەربارەی ئەمە (د. لارس هامبێرگەر) لە کتێبی (منداڵێك لەدایك دەبێت)دا دەڵێت: (ئێمە تەنها چەند بڕگەیەکی بچووکی کلکمان بۆ دەمێنێتەوە دوای لەدایکبوونمان، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە کاتی دروستبوونماندا کلکمان هەبووە)، هەروەها ناوچەی کلێنچکە ناوچەیەکی ئێسکیە، و لەبەرئەوەی کە شریتی سەرەتایی دەبێت بە بەشێك لەم ناوچەیە ئەوا دەتوانین بڵێین: لە گەورەدا شریتی سەرەتایی یان (عجب الذنب) بریتیە لە ئێسکێك! هەروەها شریتی سەرەتایی لە ئێسکی کلێنچکەدا شوێنەوارێك دروست دەکات کە زانایان دەڵێن ئەوەندە بچووکە کە حیسابی بۆ ناکرێت و بەچاو نابینرێت، کە دەقاودەق ئەمەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ داوە کە هەموو لەشی مرۆڤ پاش مردن دەڕزێت و نامێنێت تەنها بەشێکی کەمی ئەم کلێنچکەیە نەبێت کە بەچاو نابینرێت (واتە: عجب الذنب)، فەرموویەتی: ئادەمیزاد لەمەوە دروست بووە، و هەر کاتێك پەروەردگار وویستی لێبێت لە رۆژی دواییدا لەشی مرۆڤەکان لەو بەشە کەمەی ئێسکی کلێنچکەوە دروستدەکاتەوە، ئەمەش بە تەواوەتی ئەو ڕاستیانەیە کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەیان پێداوە.

لەکۆتاییدا دەڵێین ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لە دەیان نموونەی ئیعجازی زانستی سوننەت کە سەلمێنەری راستیی سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرن (ﷺ) لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا و گومان لەوەدا ناهێڵن کە کاتێك گوێت لە فەرموودەیەکی صحیح دەبێت هەروەك ئەوەیە پێغەمبەرەکەت (دروودی خوای لەسەربێت) گفتوگۆت لەگەڵ بکات.

**سەرچاوەکان:**

١- گۆڤاری: (هەیڤ) ژمارەکانی (٢-٣، ١٧، ١٨).

٢- بەڵگە ئاشکراکان، نووسینی (د.کاوە فەرەج سەعدون).

٣- نەخۆشی ئایدز، نووسینی: مەسرور سلیمان، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی، ساڵی (٢٠١٢).

٤- السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي- د.مصطفى السباعي.

٥- بابەتی: ألوان النار: معجزة نبوية مذهلة: المهندس عبدالدائم الكحيل:
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2012-12-04-18-32-28/499-2012-09-27-18-00-22

٦- ئامارژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا- د.کاوە فەرەج سەعدون- چاپی یەکەم-٢٠٠٨.

٧- گۆڤاری (الإعجاز):ژمارە (١)ی‌صەفەری ١٤١٦ك-تەمموزی ١٩٩٥ز-(هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)/ بابەتی: (الإعجاز الطبي في أحاديث الرسول عن عجب الذنب: د. محمد علي البار).

٨- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغرّ/ دار المعرفة- بيروت/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٥.

**- The Developing Human–ninth edition \ Keit.L.Moor &T. V. N. Persaud.**

**- Langman's Medical Embryology\ T.W.Sadler\ 10th edition.**

# تەحەددایەکی قورئانیی بەردەوام




یەکێك لە هەرە لایەنە ناوازەکانی قورئان و موعجیزە درەوشاوەکانی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بریتییە لە هەواڵدانی بە چەند شتێکی شاراوە و غەیبی کە لە ڕۆژگاری دابەزینی قورئاندا مرۆڤ زانیاریی دەربارەیان نەبووە بەڵکو لە داهاتوودا ئاشکرا بوون و بە بەردەوامیش زیاتریان لێئاشکرا دەبێت بۆ مرۆڤەکان، ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾(فصلت: ٥٢-٥٣)، واتە: ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەر ولە خودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون ببێتەوە و دڵنیا ببن کە دەسەڵاتی پەروەردگار و قورئانە نێردراوەکەی حەق و ڕاستی ڕەهایە.

قورئان بەم لایەنە ناوازەیەی تەحەددا و بەرامبەرکێی لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا کردووە کە پێکەوە بتوانن تەنها یەك سوورەت لە هاوشێوەی بهێنن، مێژوو شایەتە هەموویان دۆڕاو بوون لەم پێشبڕکێیەدا، یەکێك لە تەحەددا دیارەکانی قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەبینینەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ} (**الأحزاب:٤**).

واتە: خودا دوو دڵی دروست نەکردووە لە هەناوی هیچ پیاوێکدا، ئەو هاوسەرانەشتان کە پێیان دەڵێن: ئێوە لەجێی دایکمانن، خوانەیکردوون بەدایکتان، ئەوانەش کە بە قسەی خۆتان دەیکەن بە کوڕی خۆتان، خوا نەیکردوون بە کوڕتان، ئەمانە قسەیەکن کە بە زارتان دەیڵێن، خواش هەق بێژە و هەر ئەو ڕێبازی راست و دروست نیشانی بەندەکانی دەدات.

لێرەدا قورئانی پیرۆز تەحەددای ئینسانەکان دەکات، مەبەست لە ئیعجاز بەگشتی و ئیعجازی زانستی بە تایبەتی بریتیە لە تەحەددای مرۆڤەکان کە ناتوانن هاوشێوەی ئەمە بهێنن بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە قورئان لەلایەن خوداوە هاتووە، لێرەدا نموونەیەك لەم تەحەددایەمان بۆ دەهێنێتەوە کە خوای گەورە هەرگیز پیاوێکی دروست نەکردووە کە دوو دڵ لە هەناویدا بێت.

لە کتێبەکانی راڤەی قورئانی پیرۆزدا لە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا هاتووە: کە لە وەڵامی پیاوێك لە قورەیشدا هاتووەتە خوارەوە کە ناوی (جمیل بن معمر الفهري) بووە، کە پڕوپاگەندنەی ئەوەی دەکرد کە دوو دڵی هەیە لە سنگیدا، و پێیدەوترا (خاوەنی دوو دڵەکە) لەبەر زۆرزانیی و تەڵەکەبازیەکەی، هەروەها وەڵامێکی دەمکوتکەر بوو بۆ هەندێك لە دووڕووەکان کە دەیانوت پێغەمبەر (ﷺ) دوو دڵ لە سنگیدایە (بۆیە خوای گەورە بەدرۆی خستنەوە).

مەبەست لە هێنانەوەی ئەم نموونە مەحاڵە ئەوەیە کە بەشی دووەمی ئایەتەکە بسەلمێنێت، کە بەهەمان شێوەش مەحاڵە خێزانەکانتان (کە حەڵاڵترین کەسە بۆتان)، کە کەسی سوێندخۆر (کە دەڵێت وەك دایکم وای بۆ من) واتە (ظهار) دەکات، وەك ئەو دایکەتان وابن کە ئێوەی بووە و گەورەترین و بەڕێزترین کەسە و حەرامترین کەسە بۆتان، تەنانەت ئێوە نابێت بەووتەش ئەمە دەربڕن، و مەحاڵە ئەم دوو پێچەوانەیە بەیەك بشوبهێنرێن، پاشان دەقە قورئانیەکە دەچێتە سەر بابەتی هەڵوەشاندنەوەی مەسەلەی منداڵ تەبەننا کردن، واتە ئەوانەی کە کوڕتان نین (لەئێوە نەبوون)، تەنها بە ووتە و پڕوپاگەندەی ئێوە نابن بە کوڕتان، لەبەر ئەوەی منداڵەکانی ئێوە تەنها ئەوانەن کە بووتانن و لە پشتی ئێوەن، بەڵام ئەو تەبەننا کراوانە لە پشتی ئێوە نین و نابنە منداڵی راستەقینەی ئێوە، ئیتر چۆن ئەم دوو دژ بەیەکە وەك یەك دەبن؟

وەك ووتمان لە سەرەتای ئایەتەکەدا ئاماژەیەکی ئیعجازیی هەیە کە خوای گەورە بەهۆیەوە تەحەددای هەموو مرۆڤەکان دەکات تا رۆژی دوایی، و پێمان رادەگەیەنێت کە مەحاڵە لە سنگی هەر پیاوێکدا دوو دڵ هەبێت، بەکارهێنانی ووشەی (لِرَجُلٍ) ئیعجازەکەی گەورەتر و دامەزراو کردووە، چونکە ئەگەر ووشەی (ئادەمیزاد – بَشَر) یان (نەوەکانی ئادەم –بني آدم)ی بەکاربهێنایە ئەوا هەندێك کەس دەیانووت ئەوەتا دایك کە ئەگەر کۆرپەلەیەك لەسکیدا بێت ئەوا دوو دڵ لە هەناویدایە (دڵی خۆی و دڵی کۆرپەلە دروست بووەکە لەناو سکیدا).

لە رووی زانستیەوە و بەپێی ووتەی زانایان و توێژەرەوانی کۆرپەلەزانی و پزیشکان و نەشتەرکارانی دڵ مەحاڵە مرۆڤێك پەیدابێت کە دوو دڵی هەبێت، و لە هیچ کام لە کتێبە پزیشکیەکان و سەرچاوە زانستیەکان لەم بوارەدا و لە بواری تریشدا بەدرێژایی مێژوو شتی وا تۆمار نەکراوە و ناشبێت مرۆڤێك دوو دڵی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە زوربەی نووسەران و توێژەرەوان لەم بوارەدا لە غەیری موسوڵمانان بوون.

لەوانەیە هەندێك كەس بپرسن: ئەی ئەوە نییە زۆر منداڵ لەدایك دەبن بە شێواوی و نوقسانی و تەنانەت ئەم شێواویانە دڵیشیان دەگرێتەوە؟

ئێمەش دەڵێین: بەڵێ، تۆمار كراوە كە كەسانێك هەبوون پەنجەی زیادەیان هەبووە كە هەموومان بینیومانە، یان زیادە ریخۆڵە، یان بۆری میزی زیادە، یان یەكگرتنی تەواو یان جوزئی گورچیلەكانیان هەبووە، یان پلێكی زیادەی گورچیلە یان گورچیلەیەكی سێیەمیان هەبووە، یان دروستبوونی هەندێك زیادە لە كۆتایی بڕبڕەی پشتدا وەك كلكێكیان هەبووە، ئەمانە و چەندین شتی دیكەش تۆمار كراون. (**بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەكانی لاپەڕە ٥١١**)

هەروەها هەندێك حاڵەتی شێواوی لە دروستبوونی دڵ خۆیدا روودەدات، وەك: بوونی كون لە دیواری جیاكەرەوەی دوولاكەی دڵدا، یان یەك سكۆڵەی هەبێت وەك لە دڵی باڵندەدا، یان دڵ لەلای راست بێت، یان چەند شێواویەك پێكەوە هەبن كە پێیان دەووترێت (چوارینەی فالووت Tetralogy of Fallot) كە بەناوی دۆزەرەكەیەوە ناونراوە، هەروەها زۆرێكی دیكەش لە تێكچوون و شێواویە زگماكیەكانی دڵ كە لەوانەیە شێنبوونەوەی لەگەڵ بێت یان لەگەڵی نەبێت.

**دڵ لە سەرەتای هەفتەی سێیەمەوە دروست دەبێت، كە لە دوودڵەبۆری لای راست و لای چەپ پێكدێت، كە دوایی لە ناوەڕاستدا پێكدەگەن و لە بەشی سەرەوەیاندا یەكدەگرن**



بەڵام هەرگیز ئەوە روونادات کە دوو دڵ لە یەك کۆرپەلەدا دروست ببێت، ئەویش بەهۆی مەحاڵی دروستبوونیان لەیەك سینەدا، چونکە ئەگەر هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنی دڵی کۆرپەلە بوەستێت، ئەمە بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی لەبار بردنی یان مردنی لەناو مناڵداندا، کە ئەمەش دروستبوونی دوو دڵ نییە بەڵکو لە قۆناغێکدا دروستبوونەکە وەستاوە، تەنانەت لەو دووانانەشدا کە پێکەوە نووساون، کە لەوانەیە هەریەکەیان دڵی خۆی هەبێت، یان بە هەردووکیان یەك دڵیان هەبێت، بەڵام مەحاڵە کە ٣ دڵیان هەبێت.

ئەمەش دەرخەری ئیعجازی قورئانی پەروەردگاری تاك و تەنهایە: [وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ] (**العنكبوت:٤٣**).

## ئەگەر کەمێك دەربارەی دڵ بدوێین:

دڵ لە سەرەتای هەفتەی سێیەمەوە لەناو لەشی کۆرپەلەدا دروستدەبێت، کە لە دوو دڵەبۆری لای راست و لای چەپ پێکدێت، کە بە بەردەوامی گەشە دەکەن و دوایی لە ناوەڕاستدا پێکدەگەن و لە بەشی سەرەوەیاندا یەکدەگرن، و پاشان هەردوو سکۆڵە و هەردوو گوێچکەلە دروستدەکەن، لە کاتی ئەم پرۆسەیەدا بۆرییە خوێنە سەرەکیەکانیش دروستدەبن.

لە پێش کۆتایی هەفتەی شەشەمی گەشە کردنی کۆرپەلەدا دڵ دەستدەکات بە گرژ بوون و خاوبوونەوە و لێدانەکانی دەست پێدەکات، تەنانەت پێش ئەوەی کە کۆتاییە دەمارییەکان گەشە بکەن بۆی، ئێستا بیردۆزێکی زۆر نوێ هەیە کە لەلایەن زانایانەوە کاری لەسەر دەکرێت ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: (دڵ خاوەنی مێشکێکی بچکۆلەی خۆیەتی).

دڵ یەکێکە لە هەرە سەرسوڕهێنەرترین دروستکراوەکانی خودا و لە دوو بەش پێکدێت کە هەر لایەکی لە دوو ژوور پێکهاتووە، بەشی سەرەوەی دڵ پێیان دەووترێت گوێچکەلەکان (Atria) و بەشی خوارەوەش پێیان دەووترێت

سـكۆڵەكان (Ventricles)، دڵ بریتیـە لـە پـەمپێكی جـووت، كـە خـۆراك و ئۆكسجین و پێویستیەكان بۆ هەموو خانەكانی لـەش دەگوێزێتـەوە ئـەویش لـەرێی تورێكی فراوانی خوێنبەرەوە (كە زانایان دەڵێن ئەگەر لوولەكانی ئەم تـۆرە بـدرێن لەیەك بەدرێژی ئەوا درێژییان دەگاتە ١٥٠ كیلۆمەتر).

بارستایی دڵ (٢٥٠–٣٠٠گم) دەبێت، بە نزیكەیی بە قەبارەی دەستێكی قونجاو (مشتەكۆڵەیەك)، لەهەر خولەكێكدا (٧٠) جار لێدەدات، واتە زیاتر لە (١٠٠٠٠٠) جار لە رۆژێكدا، و نزیكـەی (٤٠)ملیـۆن جـار لـە سـاڵێكدا، كـە هـیچ كاتێـك لـە لێـدان و كـاركردن ناكـەوێت تـا تـەواو بـوونی تەمـەنی ئـەو كەسـە، لـە مـاوەی هـەموو (٨) چركەیەكدا خوێن دەگەیەنێتـە مێشـك، و بـۆ دوورتـرین شـوێنیش لـە لەشدا تـەنها (١٨) چـركەی پێدەچـێت، لـە مرۆڤێكـی باڵغـدا رۆژانـە دڵ ٧٠هـەزار لـیتر خـوێن دەنێرێت بۆ هـەموو لایـەكی لـەش، كاتێـك كـە تەمـەنمان دەگاتـە ٧٠ سـاڵ دڵمـان هەستاوە بە ناردنی ئەندازەی ١ملیۆن بەرمیل خوێن بۆ ئەندامەكانی لەش.

گرنگیی تەواوی دڵ بۆ لەش لە كـاتی وەسـتانیدا دەردەكـەوێت، كـە ئەگـەر بـۆ ماوەی (٢–٣) خولەك بوەسـتێت و خـوێن نەچـێت بـۆ مێشـك لەوانەیەببێتـە هـۆی تێكچوونی خەتەرناك لە مێشكدا، وەك: لـەهۆش خۆچـوون كـە لەوانەیـە بـەردەوام بێت و خەبەری نەبێتەوە، یان تووش بوون بە ئیفلیجی تەواو یان جوزئی، و ئەگەر لە (٤) خولەك زیاتر لەكار بكەوێت دەبێتە هۆی مردنی مێشك و سـەرەنجام مردنـی كەسەكە.

كەواتە دڵ گرنگترین ئەندامی لەشە كە بۆ بەردەوامبوونی ژیان پێویستە، پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە راستگۆكەی، ئەم راستیە لە فەرموودەیەكی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەی بۆ هاتووە كە دەفەرموێت: [... أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ] (**رواه البخاري ومسلم**)، واتە: لەناو لەشی مرۆڤـدا پارچـە گۆشـتێك هەیـە كـە ئەگـەر ئـەم بـاش و

گونجاوبێت و بەباشی کاربکات ئەوا هەموو لەش باش دەبێت، و ئەگەر ئەمیش تێکبچێت و بشێوێت ئەوا هەموو لەش دەشێوێت، کە ئەو پارچە گۆشتە بریتیە لە دڵ.

## سەرچاوەکان:


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان - م. بورهان محمد أمین.

٣- ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د.کاوە فەرەج سەعدون/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.

٤- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغر/ دار المعرفة - ٢٠٠٤.

٥- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (١٦)ی رەجەبی (١٤٢٤ك - ٢٠٠٣ز)/ کە لەلایەن (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)وە دەردەچێت.

# ئیعجازی زانستی پێشەسەر (الناصیة)
# لەنێوان قورئان و زانستی نوێدا




لەچەند ئایەتێکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی پێشەسەر (ناصیة) هاتووە و کۆمەڵێك سیفەتی دراوەتەپاڵ کە مایەی تێرامان و لێووردبوونەوەیە، هەروەك لە ئایەتانەدا هاتووە:

- {إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ} (هود ٥٦)، واتە: بەڕاستی من پشتم بەخودا بەستووە کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێك نییە کە خودا بگری پێشەسەری نەبێت (لەژێر ڕکێفی خوای گەورەدا نەبێت)، بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە.

- {يُعْـرَفُ الْمُجْرِمُـونَ بِسِـيمَاهُمْ فَيُؤْخَـذُ بِالنَّوَاصِـي وَالْأَقْـدَامِ} (الـرحمن ٤١)، واتـه: خراپەکاران بە رووخسارياندا دەناسرێنەوە ئەمجا رائەکێشرێن بـە پێشەسـەريان و بەقاچيان بۆ ناو دۆزەخ.

- {كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ * نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ} (العلق ١٥-١٦)، واته: بەڕاستى ئەگەر وازنەهێنێ (ئەبو جەهل) رايدەکێشين بەتوندى بەپێشەسەرى، کە پێشەسەرێکى درۆزنى بەهەڵەدا چووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **{ما أصاب أحداً قط هم ولا حزن فقال: اللهم انى عبدك وابن عبدك وابن أمتك، ناصيتي بيدك، ماضٍ فى حكمك عدل فى قضاؤك أسألك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو علمته أحداً من خلقك أو انزلته فى كتابك أو استأثرت به فى علم الغيب عندك أن تجعل القرآن ربيع قلبى، ونور صدرى، وجلاء حزنى، وذهاب همى، إلا أذهب الله همه وحزنه و أبدله مكانه فرجاً} (حديث صحيح رواه الإمام أحمد).**

## (الناصية) لەزمانى عەرەبيدا:

لە زوربەى فەرهەنگەکانى زمانى عەرەبيدا هاتووە: (النَّاصِيَةُ) بريتيـە لـە(مُقَدَّمُ الرَّأْس) واتە: پێشەسەر، هەروەها ووتراويشە (النَّاصِيَةُ شَعْرُ مقدَّم الرأس) واتـە: بريتيە لە قژى پێشەسـەر، بڕوانـە فەرهەنگـەکانى (المعجم الوسيط ، معجم اللغة العربية المعاصر ، المعجم الرائد ، المعجم الغني) ...

لە فەرهەنگى (لسان العرب)دا هاتووە: (قال الأزهري الناصية عند العرب منبت الشعر في مقدم الرأس لا الشعر الذي تسميه العامة الناصية وسمي الشعر ناصية لنباته من ذلك الموضع وقيل في قوله تعالى لنسفعن بالناصية أي لنسودن وجهه)، واتە: پێشەسەر لاى عەرەب بريتييە لـەو شـوێنەى کـە قـژى سـەرى لێدەڕوێت لـە پێشـەوەى سـەردا، نـەك قژەکـەى پێشەسـەر کـە خـەڵکى عـەوام واى پێدەڵێن، تەنانـەت قژەکـەش کـە پێيدەوترێت پێشەسـەر لەبـەر ئەوەيـە کـە لـەو شـوێنەوە

دەڕوێت، لە تەفسیری ووتەی پەروەردگاریش (لنسفعن بالناصیة) ووتراوە: واتە پێشەسەر و ناوچەوانی ڕەشدەکەین.

## ووتەی موفەسیران دەربارەی (الناصیة):

هەندێك لە موفەسیران لە تەفسیری (نَاصيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ) وەك خۆی تەفسیریان کردووە وەك: ئیمامی (إبن کثیر): کە لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: {کاذبة في مقالها خاطئة في أفعالها} واتە: پێشەسەری لە ووتەکانیدا درۆدەکات و لە کردارەکانیدا هەڵە و تاوان دەکات.

هەروەها ئیمامی (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا، و (إبن الجوزي) لە (زاد المسیر فی علم التفسیر)دا و (عبدالرحمن السعدي) لە (تیسیر الکریم الرحمن فی تفسیر کلام المنان)دا هەمان تەفسیریان کردووە.

زوربەی موفەسیرەکانیش مانای ئایەتەکەیان تەئویل کردووە و ووتوویانە کە ئەم درۆکردن و خراپەکارییەی دراوەتەپاڵ (الناصیة) مەبەست پێی خاوەنەکەیەتی کە (ئەبو جەهل)ە، کە کەسێکی درۆزن و تاوانکارە.

# ڕاستییە زانستییەکان

دەماغ (Brain) گرنگترین بەشی کۆئەندامی دەمارە لە مرۆڤدا، کە پێکهاتووە لە: مێشك و مێشکۆکە و قەدی مێشك، مێشك (Cerebrum) لە مرۆڤدا ناسراوە بە بەشی پێشەوەی دەماغ (Forebrain)، کە لەڕووی پێکهاتەی شانەییەوە دەبێت بە دوو بەشەوە: ماددەی خۆڵەمێشی (Grey Matter) کە دەمارەخانەکانن و ماددەی سپی (White Matter) کە ریشاڵەکانی دەمارە خانەکانن.

بەم دوو بەشەش پێکەوە دەووترێت توێکڵی مێشك (Cerebral Cortex).

لە رووی بەشەکانی و ناوچەکانی مێشکی مرۆڤ دابەش دەبێت بۆ ٦ پل: ١پلی پێشەوە، ٢پلی لاتەنیشت، ٢پلی دیواریی، ١پلی دواوە.

## راستییە زانستییەکان

### مێشك (Cerebrum)

- ناسراوە بە بەشی پێشەوەی دەماغ (Forebrain).
- لەرووی پێکهاتەوە دوو بەشە:

ماددەی خۆڵەمێشی (Grey Matter) و

ماددەی سپی (White Matter).

- بەم دوو بەشەش دەووترێت توێکڵی مێشك (Cerebral Cortex)







پلی پێشەوەیان ناوچەوانەپل (Frontal Lobe): کە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی مێشك و گەورەترین پلی مێشکە، و پێنج سەنتەری دەماری تێدایە کە جیاوازن لەرووی شوێن و فرمانەکانیان:

١- توێکڵی پێشەوە (Prefrontal cortex): کە راستەوخۆ دەکەوێتە پشت ناوچەوان و بەشی هەرە گەورەی پلی پێشەوەیە، کردارەکانی وابەستەیە بەدروستکردنی کەسایەتی تاکەکان و تواناکانی وەك: وویست و ئیرادە، دەستپێشخەری کردن، توانای پلان دانان، وەرگرتنی بڕیارەکان، هەست و سۆز، بڕیاردان لەشتەکان و جیاکاریی نێوانیان، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و رووبەرووبوونەوەی کێشەکان، کارلێکردن لەگەڵ کەسانی تردا و ووردبینی لە شتەکاندا و دامەزراویی سۆزداریی، هەروەها سەنتەری ئەندێشە و خەیاڵ (Imagination) لەخۆدەگرێت.

٢- سەنتەری جووڵەی سەرەتایی (Primary Motor Area): هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای چەپی لەش.

٣- سەنتەری جووڵەی ناسەرەکی پێشەوە (Secondary Motor Area): هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای راستی لەش.

٤ - کێڵگەی بینینی پێشەوە (Frontal eye Field): هەڵدەستێت بەکرداری هاوئاهەنگی جووڵاندنی چاوەکان بۆ لایەکی دیاریکراو.

٥- سەنتەری بروکا بۆ جووڵەکانی قسەکردن (Motor speech Area of Broca ): هەڵدەستێت بە هاوئاهەنگی کردن لەنێوان ئەو ئەندامانەی بەشدارن لە کرداری قسەکردندا: کە بریتین لە: (قورقوراگە، زمان، و روخسار).

کەواتە توێکڵی پێشەوەی مێشك (Frontal Cortex) راستەوخۆ دەکەوێتە پشت ناوچەوان و بریتییە لە کۆنترۆڵکەر و ئاراستەکەری ئەوهەڵسوکەوتانەی مرۆڤەکەوابەستەیە بەکەسایەتیەوە لە: راستگۆیی و درۆکردن، و چاکە و تاوان.

**( بۆ روونبوونەوەی زیاتری بابەتەکە تکایە سەیری وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەرەکانی ٥١٢ تا ٥١٥ بکە )**

## لێکۆڵینەوەی ئەلیکترۆنی مێشك:

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئامێرێکی نوێی لێکۆڵینەوەی کاری ئەندامەکانی لەش هەیە کە پێیدەووترێت: (functional Magnetic Resonance Imaging) یان (fMRI)، کە بەهۆی بەکارهێنانی شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان دەتوانێت پێوانەی کار وچالاکی ئەندامەکان دەکات، لەکاتی لێکۆڵینەوەی کارەبایی کاری مێشك لەو کەسانەی تووشی زیانگەیشتن بە پلی پێشەسەری مێشکیان بوون، بابزانین چی روودەدات لەو کەسانەدا؟

١- دەناڵێنن بەدەست دابەزینی توانا عەقڵییەکانیان و کەم وکورتی لە هەڵس وکەوتی ئاساییان.

٢- دابەزینی بەها رەووشتیەکانیان، وەبیرهاتنەوە، و توانای چارەسەری مەسەلە و کێشە عەقڵییەکان.

هەروەها دەرکەوتووە کە چەند بەشێکی پلی پێشەوەی مێشك سەنتەری دەستپێشخەرین بۆ درۆکردن، هەر لێرەدا ئەو کردارانەی پەیوەستن بە

درۆکردنەوە چالاك دەکرێن، هەروەها کردەوە خراپەکان و تاوانەکان هەر لە سەنتەرەکانی پلی پێشەوەدا پلانی بۆ دادەنرێت پێش ئەوەی ئەم فرمانانە بگوێزرێنەوە بۆ ئەندامەکان بۆ جێبەجێ کردنی، کەواتە ئەو توێکڵی مێشکەی لە قووڵایی پێشەسەردا شاردراوەتەوە بەرپرسیارە لە تاوانەکان، چونکە ئێرە سەنتەری ئاراستەکردن و کۆنترۆڵ کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤە.

**(بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥١٦)**

## ئامێرێکی نوێی دەرخستنی درۆ:

له رۆژگاری ئەمڕۆدا بێسوودیی ئامێرە کۆنەکانی درۆدەرخستن دەرکەوتووە، چونکە زۆر لە تاوانبارە زیرەکەکان دەتوانن لەم پشکنینانەدا دەربچن و بەراستگۆ لەقەڵەم دەدرێن، بەڵام بەهۆی ئەم ئامێرە نوێیەی پشکنینی کاری ئەندامەکانی لەشەوە توانراوە رێگەیەکی نوێ بۆ درۆ دەرخستن دابهێنرێت کە هیچ تاوانبارێك ناتوانێت لێی دەربچێت، لێرەدا چالاکی سەنتەرەکانی درۆکردن لەمێشکدا دەپێورێت، بە بەکارهێنانی ئەم رێگا نوێیە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵەکانی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٦ لە چەند زانکۆیەکی بەناوبانگی وەك (زانکۆی مێشیگان) چەندین توێژینەوە ئەنجامدرا بۆ پێوانی چالاکی کارۆموگناتیسی ناوچەکانی مێشك لە کاتی کرداره جۆراوجۆرەکاندا، بەتایبەتی لەکاتی درۆکردندا بینرا کە سەنتەرەکانی پلی پێشەوەی مێشك تەواو چالاك دەبن، کە سەلماندیان فەرمانکردن بەدرۆ لەم سەنتەرانەی پێشەسەرەوە دەردەچن.

هەروەها بینییان کە لەکاتی درۆکردندا چالاکییەکی زۆر لەمێشکدا روودەدات کە ووزەیەکی زۆر بەفیڕۆدەدات، بەڵام لەکاتی راستگۆییدا چالاکی سەنتەرەکان زۆر کەمترە و نزیکە لەحاڵەتی ئاسایی مێشك، کە ئەمە وایلێکردن بڵێن حاڵەتی ئاسایی مێشك بریتییە لە راستگۆیی (Truth is Brain's Default mode) بەڵام درۆکردن حاڵەتێکی زۆر نائاساییە و ووزەیەکی زۆر بەفیڕۆ دەدات.

هەروەها بۆیان دەرکەوت کە لەکاتی ئەنجامدانی کردەوەی خراپ و تاواندا چالاکی پلی پێشەسەری مرۆڤ زۆر زیاتر دەبێت، کە ئەمەش بۆی سەلماندن سەنتەری تاوان یان چاکەکردن لەپلی پێشەوەی مێشکدایە.

لە توێژینەوەیەکی تردا لە زانکۆی (پەنسلڤانیا) لە ئەمریکا زانایان تەنانەت گەیشتنە ئەو راستییەی کە پێشەسەری مرۆڤ بەرپرسە لە باوەڕهێنان و بێباوەڕی (ئیمان و کوفر)، هەروەها پێشەسەری ئەو کەسانەی کە داهێنان دەکەن زۆر چالاکترە لە خەڵکانی تر، کەبۆیان دەرکەوت پلی پێشەسەری مێشك بەرپرسە لە ئیبداع و داهێنان.

## لێکدانەوەی زانستی ئایەتەکانی: (١٥ - ١٦)ی سورەتی (العلق):

قورئانی پیرۆز وەسفی پێشەسەری (أبو جهل) دەکات بەوەی درۆزن و تاوانکارە هەربۆیە شایەنی راکێشانی توند و سزادانە.

لێرەدا چەند پرسیارێکمان دەبێت:

١- بۆچی هیچ بەشێکی تری لەش سیفەتی درۆکردن و تاوانکردنی نەدراوەتەپاڵ؟ بۆچی تەنها پێشەسەر بەمە تایبەتمەند کراوە؟

٢- بۆچی پەروەردگار نەیفەرمووە (ناصیة کاذب خاطئ) واتە راستەوخۆ کردارەکان بداتەپاڵ ئەبو جەهلکە ئەم ئایەتانە باسی (أبو جهل) دەکەن؟

٣- بۆچی تەنها وەسفی پێشەسەر بە درۆکردن و تاوان کراوە؟

تەفسیری ئایەتی ٥٦ی سوورەتی هود: ئیمامی (ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (أي تحت قوته وقدرته) واتە پێشەسەری هەموو گیانلەبەران لەژێر هێز وتوانی پەروەردگاردایە.

ئیمامی (الطبري) دەڵێت: (لا یوجد شیء یتحرك فوق هذه الأرض ما لم یكن مملوكا ویتحرك بمشیئة الله وحده). کەواتە پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە

هەموو دروستکراوەکان بە وویستی ئەو دەجوولێنەوە، کە ئەمەش لەرێی کۆنترۆڵ کردنی پێشەسەریانەوە دەبێت.

ئەوەی لە ئایەتەکەوە تێدەگەین و موفەسیرەکان ئاماژەیان پێداوە ئەوەیە کە پێشەسەر ئەو شوێنەیە کە فەرماندەیی و کۆنترۆڵی هەڵس وکەوتی هەموو دروستکراوەکانی سەر زەوی دەکات (لە مرۆڤ و گیانەوەرەکان).

کەواتە قورئان و سوننەت بڕیار دەدەن کە:

١- سزادانی پێشەسەر ئاماژەیە بۆ کۆنترۆڵ کردنی تەواوی هەموو گیانەوەرێکی سەر زەوی.

٢- پێشەسەر بریتییە لە سەنتەری دروستکردنی تاوانەکان، و ئەنجامدانی درۆکردن.

## لایەنی ئیعجازیی

١- ئایەتە پیرۆزەکان و فەرموودەکان بە ووردەکارییەکی زانستی تەواوەوە ئاماژەیان داوە بۆ ئەوەی توێکڵی پلی پێشەوەی مێشك کە شارراوەتەوە لە قووڵایی پێشەسەردا بریتییە لە سەنتەری بڕیاردان لە مرۆڤدا بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەڵس و کەوتەکانی لە: راستگۆیی و درۆکردن، خێرکاریی و تاوانکردن، و سەنگینیی و لادان، کە راستییە زانستییەکان لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە ئەمەیان سەلماند.

٢- پلی پێشەوە سەنتەرەکانی جووڵە لەخۆدەگرێت کە کۆنترۆڵی هەموو جووڵە خۆویستەکانی لەش دەکات.

٣- سەنتەری هاوئاهەنگی جووڵەی چاوەکانیش لەخۆدەگرێت، کە وادەکات چاوەکان پێکەوە ئاماژەکانی توێکڵی پلی پێشەوەی مێشك جێبەجێ بکەن.

٤- هەروەها سەنتەری هاوئاهەنگی ئەندامەکانی قسەکردن دەکەوێتە پلی پێشەوە کە ئەوەی روودەدات لەپلی پێشەوەدا دەکات بە ووشە.

کەواتە ئایەتە پیرۆزەکان چەند راستییەك بڕیاردەدەن کە پێشتر و دوای هاتنی قورئان و پاشتریش تا سەدەکانی نۆزدە و بیست کەس نەیزانیوە، هەربۆیە زۆرێك لــە موفەســیرەکان (رەحمــەتی خوایــان لێبێــت) لەبەرئــەوەی ئــەم راســتییە زانستییانەیان نەزانیوە دەربارەی پێشەسەر، هاتوون تەئویلی مانای ئایەتــەکانیان کردووە، دیارە ئەمەشیان بەو مەبەستە کردووە کە قورئان بەشتێك تەفسیر نەکرێت کە لە سەردەمی ئەواندا نەزانراوە بۆ ئەوەی بیپارێزن لە بەدرۆخستنەوەی نەزانەکان و بێباوەڕەکان، موفەسیرەکان (رەزای خوایان لێبێت) چاریان نەبووە تەنها ئەم تەئویلە نەبێت کە بۆ ئایەتەکانی سوورەتی (العلق)ی بکەن، چونکە وەك ئێمە نەیانزانیوە پێشەسەر شوێنی درۆکردن و تاوانکارییە، بێگومان ئەگەر لە سەردەمی ئەواندا ئەم راستییانە دەربکەوتنایە ئەوا ئەوان ئەم تەئویل و کینایەیان بەکارنەدەهێنا و ئایەتەکەیان وەك خۆی تەفسیر دەکرد، کە وەك باسمان کرد هەندێك موفەسیری تر وەك خۆی تەفسیریان کردووە.

بەڵام ئاماژەی ئایەتە پیرۆزەکان زۆر ئاشکرایە کە (كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ)ی کردووە بە سیفەتی (نَاصِيَةٍ) خۆی، و نەیکردووە بە سیفەتی ئەو جەهل خۆی کە بڵێت (ناصية كاذب خاطئ)، لێرەوە ئیعجازی زانستی ئایەتە پیرۆزەکان بە تەواوەتی دەردەکەوێت و بۆمان دەسەلمێنێت کە قورئان دانراوی مرۆڤ نییە چونکە هیچ مرۆڤێك پێش ١٤٠٠ ساڵ ئەم راستییانەی نەزانیوە دەربارەی پێشەسەر تەنانەت دوای ١٢٠٠ ساڵی تریش نەیانزانیوە، کەواتە دەبێت شایەتی بدەین کە قورئان تەنها لەلایەن پەروەردگاری مرۆڤەکانەوە نێردراوە کە ئاگاداری هەموو نهێنییەکانە: { قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً} ...

## سەرچاوەکان:

- تەفسیرەکانی زانایان (ابن کثیر، الطبري، القرطبي).

- تەفسیری (تیسیر الکریم الرحمن في تفسیر کلام المنان) دانراوی (عبدالرحمن السعدي).

- تەفسیری (موفرەداتی قورئان) دانراوی: م. محمد مەلا صالح بامۆکی.

- فەرهەنگی (لسان العرب) دانراوی (ابن منظور).

- ئینتەرنێت بابەتی: (لمحات إعجازیة إیمانیة عن الناصیة فی القرآن والسنة)- للأستاذ الدکتور مجاهد أبوالمجد.

- ناوچەوان و کاری ناوچەوانەپل لە مێشکدا {لێکۆڵینەوەیەکی ئیعجازیی سوورەتی (العلق)}- لە کتێبی (بەڵگە ئاشکراکان)- نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون.

- ئینتەرنێت بابەتی: (موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات: الزعم أن وصف القرآن للناصیة بالکذب لا إعجاز فیه)- الهیئة العالمیة للإعجاز العلمي في القرآن والسنة.

- ئینتەرنێت بابەتی: (نَاصِیَةٍ کَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ)- الشیخ عبدالمجید الزندانی - رئیس جامعة الإیمان- صنعاء/ الیمن.

- ئینتەرنێت: بابەتی: الناصیة بین العلم والإیمان- للمهندس عبدالدائم الکحیل.

-Guyton`s Textbook of Medical Physiology \ W. B. Saunders - 12th Edition.

# سیستەمی هۆرمۆنی سەرەتای سوورەتی (مریم)

لەم باسەماندا دەچینە خزمەتی گەنجینەیەك لە دەربڕینە قورئانیەکان، کە لەگەڵ جوانیی شێوازی دەربڕین و ڕەوانبێژی بێهاوتادا، باسی بابەتێکی ووردی زانستیی دەکات کە ئەویش پەیوەندی هەیە بە بابەتێکی پزیشکیی زۆر هەستیار و تازە دۆزراوەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، ئەویش سیستەمی دەماری هۆرمۆنیە (NeuroEndocrinalSystem) لە لەشی مرۆڤدا، ئەم بابەتە بەشێوازێکی ڕێکوپێکی سەرسوڕهێنەر لە ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (مریم)دا هاتووە، کە دەفەرموێت:

[كهيعص{١} ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا{٢} إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاء خَفِيًّا{٣} قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَ اشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَ لَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا{٤} وَ إِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَ كَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا{٥} يَرِثُنِي وَ يَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَ اجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا{٦} يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيًّا{٧} قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَ كَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَ قَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا{٨}]، واتە: باسی ڕەحمەتی خواتان بۆ دەکەین لەگەڵ زەکەریای بەندەیدا، کاتێك بە بێدەنگی و بە نهێنی لەخودا پاڕایەوە، ووتی: خودایە من ئێسکم لاواز بووە و سەرم بە سپیەتی گڕیگرتووە و هیچ کاتێك من لە داواکردن و نومێد بوون بە ڕەحمەتی تۆ کافر نەبووم و تۆش وەڵامت داومەتەوە، من دەترسم لە دوای من خەڵکی بێڕێز ببنە پێشەوای خەڵك و خێزانەکەشم نەزۆکە بۆیە خودایە منداڵێکی صاڵحم لەلایەن خۆتەوە پێبدە، بۆ ئەوەی ببێتە میراتگری پێغەمبەرایەتی و زانیاری من و نەوەی یەعقوب، و خودایە بیکەرە کەسێك کە خۆت پاشان بەندەکانیشت لێی ڕازیبن لە دین و ڕەوشتیدا، ئەی زەکەریا ئێمە مژدەت پێدەدەین کە منداڵێکت دەدەینێ ناوی (یەحیا)یە کە هیچ کەسێك پێش

ئەم ئەو ناوەی نەبووە و لەمیش نەچووە، زەکەریا (لە گەرمەی خۆشیدا و بە سەرسوڕمانەوە!!) ووتی: خودایە من چۆن منداڵم دەبێت کە خێزانەکەم نەزۆکە و خۆشم گەیشتوومەتە <u>ئەوپەڕی پیریی</u>!! پاشان پەروەردگار وەڵامیدایەوە: خوای گەورە فەرموویەتی ئەم کرداری دروست کردنی نەوەیە لە تۆوە لەلای ئەو زۆر ئاسانە، وەك چۆن سەرەتا تۆشی دروست کرد لە سکی دایکتدا کە هیچ نەبوویت.








ئەم هەشت ئایەتە بەیەکەوە باسی پێنج نیشانە دەکەن کە لە پیاودا روودەدەن:

**١- لاوازبوونی ئێسکەکان. ٢- سەر سپیبوون. ٣- ترسان. ٤- لاوازی وەچە خستنەوە. ٥- پیری زۆر.**

+ لێرەدا دەپرسین ئایا ئەم نیشانانە بە تایبەتی پەیوەندیەکی زانستی لەنێوانیاندا هەیە کە لە سستمێکی پزیشکیدا کۆیانکاتەوە؟

− ئەم نیشانانە کە بەیەکەوە باسکراون حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، مرۆڤیش لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بە یارمەتی زانستی کارئەندامزانی یان فیسیۆلۆجی (**Physiology**) گەیشتووەتە راستیە زانستیەکان لەم بارەیەوە.

## لێکۆڵینەوەی نیشانە پزیشکیەکانی سەرەتای سوورەتی ( مریم ):

منداڵبوون لەگەڵ پیری زۆردا ناگونجێت، چونکە وەچەخستنەوە لەگەڵ ئەو نیشانانە (ئێسك لاوازی، سەرسپیبوون، ترسان و پیری زۆر) مەحاڵە، ئەم نیشانانە تایبەت نین بە پێغەمبەرانەوە و تووشی خەڵکانی تریش دەبن بۆیە ئێمە بە گشتی وەك چەند نیشانەیەکی پزیشکی باسیان دەکەین کە بە یاسایەکی رێك وپێك و ووردی لەشی مرۆڤ بەرێوە دەچن.

## ١- پیریی زۆر :

قۆناغی پیریی کۆتایین قۆناغەکانی ژیانە و بریتیە لە قۆناغی چوونە دواوەی هەموو چالاکیەکانی لەش و دەرکەوتنی عەیب و نوقسانی لە توانای کۆئەندامە جیاوازەکانی لەشدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە تا ئێستا لە رووی زانستیەوە بە تەواوەتی هۆکارە راستەوخۆکانی پیربوون نەزانراوە، کەڵەکە بوونی عەیب و نوقسانی لەسەر ئاستی ماددەی بۆماوەیی کە ترشەلۆکە ناوکیەکانە (DNA) لە ناوکی خانەدا دەبێتە هۆی بێتوانایی خانەکان لە دروست کردنی پرۆتینی ئاسایی، بەم هۆیەوە ئەم پرۆتینانە ناتوانن کارەکانیان بەرێك وپێکی لەناو لەشدا ئەنجام بدەن و ئەمە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی پیریی.

لە لایەکی ترەوە تەنە بنچینەییە سەربەستەکان (Free Radicals) کە چەند ماددەیەکی ژەهراوین بۆ لەش و لە ئەنجامی زیندە چالاکیەکانەوە پەیدا دەبن، بەرپرسن لەو زیانانەی لە خانەکاندا روودەدەن و دەبنە هۆی پیریی، لەگەڵ ئەمانەشدا رەقبوونی دیواری خوێنبەرەکان (ئەستوور بوونی دیواری لوولەکانی خوێن بەهۆی نیشتنی چەوری لەژێر ناوپۆشی دیوارەکانیاندا) دەبنە هۆی کەمیی گەیشتنی خۆراك و ئۆکسجین بۆ شانە و خانە جیاوازەکانی لەش، بە تایبەتیش مێشك کە دەبێتە هۆی پووکانەوەی بە هێواشی، و پاشان دەرکەوتنی نیشانەکانی

پیریی، لە: لاوازی لە بینین و بیستن و بیرهاتنەوە و ماسولکەکانی لەشدا، هەروەها کەم نوستن، لەرزین، چرچ بوونی پێست و لاوازی ئێسکەکان و سەرسپیبوون.

## ٢- لاوازی ئێسکەکان:

بریتیە لە نوقسانیەکی بەرچاو لە بڕی ماددەی ئێسکیی لە لەشی مرۆڤدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕی ماددەی ئێسکی دەگاتە زۆرترین ڕێژەی لە سەرەتای کامڵیدا، بەڵام دابەزینی ئەم ڕێژەیە لە دوای تەمەنی ٤٠ساڵیەوە دەست پێدەکات، بەوەی کرداری رووخان و نەمانی ئێسك زیاتر دەبێت لە کرداری دروست کردنی ئێسك.

### پەیوەندیی نێوان پیریی و لاوازبوونی ئێسکەکان:

لاواز بوونی ئێسك لە پیریدا دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونەوەی چالاکی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسك (**Osteoblasts**).

هەروەها کەمیی ڤیتامین (**D**) لە پیریدا دەبێتە هۆکاری زیادبوونی هۆرمۆنی پاراسایرۆید (**Parathyroid Hormone**)، ئەم هۆرمۆنە کاردەکاتە سەر ئێسکەکان و دەبێتە هۆی زیادبوونی کرداری تێکشکان و کەمبوونەوەی ڕێژەی ماددەی ئێسکیی، لە پیاودا هۆکارێکی تر هەیە بۆ کەمبوونەوەی ماددەی ئێسکیی، ئەویش هۆرمۆنی نێرینە یان تێستۆستیرۆنە (**Testosterone**)، ئەم هۆرمۆنە کاریگەریەکی پۆزەتیڤانەی هەیە و چالاکی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسك زیاد دەکات، هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن لە پیریدا کەم دەبێتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی خانە خۆرەکانی ئێسك (**Osteoclasts**) بە بەردەوامی ئێسك داخورێنن بەبێ ئەوەی جێی پڕبکرێتەوە بە ئێسکی نوێ لە ڕێی خانە بنیاتنەرەکانەوە.

### پەیوەندیی نێوان ترس و لاوازی ئێسك:

ترسانی بەردەوام دەبێتە هۆی روودانی چەندین گۆڕانکاری لە لەشدا، لەوانە زیاتر رژاندنی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن لە کوێرەڕژێنی سەر گورچیلەوە، راددەی ئەم

رژاندنە لە حاڵەتی ترس و دڵەراوکێدا زۆر دەبێت، بەهۆی کاریگەریی کۆرتیزۆنەوە بنیاتنانی ئێسك دەوەستێت لەگەڵ بەردەوامبوونی تێکشکانیدا، سەرەنجامی گشتی ئەم پرۆسانە لاواز بوونی ئێسکەکانە.

## ٣- سەرسپیبوون:

بریتیە لە سپیبوونی رەنگی مووەکان بەهۆی لەدەستدانی ماددە رەنگکەرەکەیەوە، سەرچاوەی ئەم ماددە رەنگکەرە لە خانە رەنگیەکانەوەیە (Melanocytes) کە دەکەونە بنکی سەلکی مووەوە، ئەم خانانە ماددەی رەنگیی یان میلانین (Melanin) دەگوێزنەوە بۆ خانە کیراتینیەکان لە پێست و موودا، لەسەر رووی پێست زیاتر لە ٢ملیار خانەی رەنگکەر هەیە، کێشی ئەم خانانە پێکەوە بریتیە لە (١گرام) و راددەی چڕیان ١٥٦٠ خانەیە بۆ هەموو میللیمەتر سێجایەك لە پێست، ئەم رێژە و چڕییە نەگۆڕە بۆ هەموو رەگەزو تیرەکانی مرۆڤ، جیاوازی رەنگی مرۆڤەکان تەنیا لە چڕی ئەم ماددە رەنگکەرەیە لەناو هەر خانەیەکی میلانۆسایتدا.

### پەیوەندیی نێوان پیریی و سەرسپیبوون:

تا مرۆڤ بە تەمەندا بچێت نیشانەی پیریی زیاتر لە سەریدا دەردەکەوێت و وردە وردە قژی سەری سپی دەبێت، هەندێ کەس کە دەگاتە تەمەنی ٥٠ساڵ ٥٠٪ی زیاتری سەری سپی دەبێت.

چالاکی خانە رەنگکەرەکان لەژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنێکی تایبەتیدایە کە کوێرە رژێنی ژێرمێشك دەری دەدات، و بە هۆرمۆنی چالاککەری خانە رەنگ کەرەکان (MSH) ناسراوە، لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەندا رژاندنی هۆرمۆنی (MSH) کەمدەکات و دەبێتە هۆی کەمبوونی ژمارەی خانە رەنگکەرەکانی پێست و خاوبوونی چالاکیان، پاشان دەرکەوتنی سپێتی لە مووی سەردا.

## پەیوەندی نێوان ترسان و سەرسپی بوون:

زانراوە کە ترس و دڵەڕاوکێی درێژخایەن سەری مرۆڤ سپی دەکات، تاقیکردنەوەکانیش پەیوەندی کۆئەندامی دەماری بەسۆز (SympatheticNervousSystem)یان سەلماندووە لەگەڵ دیاردەی سەرسپی بوون، چالاکی زیادبووی ئەم کۆئەندامە لەکاتی هەڵچوونەکاندا دەبێتە هۆی زوو سەرسپیبوون، گرفتە دەروونیە ئاڵۆزەکان دەبنە هۆی زۆر خێراتر دەرکەوتنی سپێتی لەسەردا، ئەمە ئەوەیە کە قورئان بە دەستەواژەی (وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا) واتە (سەر گڕی گرتووە بەسپێتی) دەریبڕیوە.

زانایان گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە زوو لەدەستدانی ڕەنگی قژ بەهۆی ژەهراویبوونی خانەکانی ڕەنگکەری پێستەوە دەبێت بە ماددەیەکی ژەهراوی بۆ ئەو خانانە، کە لە سیستمی دەماریی بەسۆزەوە دەردەدرێت کە ئەویش ئەدرینالینە، کە یەکێکە لە زۆرترین دەردراوەکان لە کاتی هەڵچوونە دەروونیەکاندا، بە تایبەتی ترس و دڵەڕاوکێی زۆر.

## ٤- لاوازیی وەچەخستنەوە:

بەهێزی وەچەخستنەوە لە پیاودا لە ڕووی بایۆلۆجیەوە خۆی لە توانای دروستکردنی تۆودا دەبینێتەوە لە گونەکاندا.

## پیری و لاوازی وەچەخستنەوە:

چوونە تەمەنەوە کاریگەریەکی گرنگی دەبێت لەسەر دروست کردنی تۆو لە پیاودا، لە تەمەنی ٥٠ساڵ بەرەو ژوور توانای وەچەخستنەوە لاواز دەبێت بەهۆی چەندین فاکتەرەوە، کەمبوونی هۆرمۆنی (تێستۆستیرۆن) و هۆرمۆنێکی تریش کە لە ژێرمێشکە ڕژێنەوە دێت کە هۆرمۆنی چالاك کەری خانە ڕەنگکەرەکانە (MSH) ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەم کردارەدا.

## کاریگەریی کەمبوونی تێستۆستیرۆن:

تیمێکی پزیشکی لە سەنتەری (ماساشوستس)ی ئەمریکی بۆ لێکۆڵینەوەی بەساڵاچوواندا گەیشتنە ئەوەی کە کەمبوونی رێژەی تێستۆستیرۆن ساڵانە بەرێژەی ١٪ دادەبەزێت لەنێوان تەمەنی ٤٠ بۆ ٧٠ساڵیدا، واتە لە سەروو ٧٠ساڵیدا رێژەی تێستۆستیرۆن بە رادەی سێیەك دادەبەزێت، لەگەڵ ئەم دابەزینەدا چەندین نیشانەی پزیشکیی پەیدا دەبێت، لەوانە: کەمبوونی رێژەی ماددەی ئێسکی و ماسولکەیی، کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی بە رادەی ٣/٢ لە تەمەنی ٧٥ساڵیدا.

## کاریگەریی کەمبوونی هۆرمۆنی ( MSH ):

هۆرمۆنی (MSH) دەبێتە هۆی رەنگکردنی پێست و قژ، کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە دەبێتە هۆی سپیبوونی سەر لە پیریدا، ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەو پەیوەندییە کە لەنێوان کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە و لاوازی وەچەخستنەوەدا هەیە، گرنگی هۆرمۆنی (MSH) دەرکەوتووە لە دروست کردنی سپێرمدا، هەر بۆیە کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە لە پیریدا دەبێتە هۆی سەرسپیبوون و هەروەها لاوازیش لە توانای وەچەخستنەوەدا.

## ترسان و رۆڵی لە لاواز بوونی وەچەخستنەوەدا:

ترس و هەڵچوونە دەروونییەکان کاریگەریی راستەوخۆیان هەیە بۆ سەر تویکڵی مێشك و کەمکردنەوەی چالاکیەکانی، لێرەوە ئەم کاریگەرییە دادەبەزێت بۆ کەم کردنەوەی چالاکی ژێرمێشکە رژێن، و لە کۆتاییدا بۆ کارگەی دروست کردنی سپێرمەکان لە گوندا و دەبێتە هۆی کەمبوونی دروستبوونی سپێرم، هەروەها بینراوە کە ترس و دڵەڕاوکێ دەبێتە هۆی کەڵەکە بوونی ماددەیەکی زیانبەخش بۆ دروستبوونی سپێرم، ئەویش ماددەی سیرۆتۆنینە (Serotonin) کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی رێژەی دروست کردنی تۆو لە پیاودا. لە توێژینەوەیەکی تردا

که لەسەر ئەو کەسانە کرا کە چاوەڕێی حوکمی لە سێدارەدان بوون بینرا بە رادەیەکی زۆر دروستبوونی سپێرم تیایاندا هاتووەتە دواوە تا رادەی وەستانی تەواو، ئەویش بە هۆی کاریگەریی ترسەوە. لەگەڵ زیادبوونی سیرۆتۆنین لە گونەکاندا، بەرزبوونەوەی رێژەی هۆرمۆنی کۆرتیزۆنیش لە کاتی ترسدا کاردەکاتە سەر کەمکردنەوەی بەرهەم هێنانی خانە سپێرمیەکان، ئەوەش زانراوە کە ترس و دڵەڕاوکێی درێژخایەن ئەوندە کۆرتیزۆن دروست دەکات بە رادەیەك لە ئاستی بەرهەمهێنانی کۆرتیزۆن لە وەرەمی رژێنی سەر گورچیلەش زیاتر دەبێت.

## ٥- پەیوەندی هاوبەشی نێوان ترس و پیریی:

### ترسان مرۆڤ پیردەکات:

ترسانی زۆر و درێژخایەن لە رژاندنی چەندین هۆرمۆن زیاد دەکات لە لەشدا لەوانە هۆرمۆنی ئەدرینالین، توێژینەوەکان سەلماندوویانە کە زیادبوونی ئەدرینالین دەبێتە هۆی بەرز بوونی ئاستی کۆلیسترۆڵ و پەیدابوونی نیشانەکانی رەقبوونی خوێنبەرەکان، بینراوە کە هۆکاری پەیدا بوونی لە تەمەنێکی گەنجتردا بریتیە لە ترس و دڵەڕاوکێ، کەواتە ترسان مرۆڤ زووتر پیردەکات لەرێی کرداری رەقبوونی خوێنبەرەکانەوە.

### پیربوون ترس زیاد دەکات:

توێژینەوەکان لەسەر مرۆڤە بەتەمەنەکان دەریانخستووە کە رێژەیەکی زیاتر لە ئەدرینالین لە لەشیاندا دەرێژرێت بە بەراورد لەگەڵ کەسانی گەنج، ئەم زیادەیە دەگاتە ٧٥٪ کە رێژەیەکی بەرچاوە، ئەم زیادبوونی ئەدرینالینە بەهۆی بارێکی ترس و دڵەڕاوکێوە نییە، بەڵام ئەمە وا دەکات مرۆڤی پیر زیاتر دووچاری هەڵچوونە دەروونیەکانی وەك ترس ببێت، چونکە دەبێتە هۆی هەستیارکردنی سیستمی دەماری بەسۆز تیایاندا بۆ هەڵچوون و تێکچوونی دەروونی، لێرەوە

پەیوەندی هاوبەشی دڵەڕاوکێ و ترسانمان لەگەڵ پیربووندا بۆ دەردەکەوێت، کە چۆن کاردەکەنە سەر یەکتری و هۆکاری دروست بوونی یەکترین، ئەگەر بێتو ترسان ببێتە هۆی زوو پیربوون، پیربوون خۆیشی چانسی تووشبوون بە ترس و دڵەڕاوکێ زیاتر دەکات. ( **هەروەها بڕوانە وێنە روونکەرەوەکانی لاپەڕە ٥١٧-٥١٩** )

## پوختەی سستمی هۆرمۆنی سەرەتای سوورەتی ( مریم ):

ئەو پێنج نیشانەیەی لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا هاتوون: لاوازی ئێسك، سەرسپی بوون، ترسان، پیری زۆر و لاوازی وەچەخستنەوە، بریتین لە پایەکانی پەیوەندیەکی هۆرمۆنی یەکتری تەواوکەر، ئەمە روونکەرەوەی ئەوەیە کە بۆ ئەم نیشانانە بە تایبەتی باس کراون لەناو هەموو نیشانەکانی چوون بەتەمەندا، ئەویش بەهۆی ئەو پەیوەندیەی بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە لە یەکەیەکی لۆژیکی و پڕ لە حیکمەتدا:

لە سەرەتای دوعاکەی زەکەریا پێغەمبەردا باسی لاوازی ئێسك و پاشان سەرسپی بوون و دوایی ترسان کراوە، لەرووی زانستیەوە لاوازی ئێسك لەکاتی ترساندا روودەدات بەهۆی زیادبوونی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن، کە هەروەها دەبێتەهۆی لاوازی لە وەچەخستنەوەدا، سەبارەت بە سەرسپیبوونی خێرا کە روودەدات و ئەوەی کە قورئان باسی لێوە کردووە بە گرتێبەر بوون (وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا)، ئەم سەرسپیبوونە بەهۆی ترس و دڵەڕاوکێوە روودەدات، و دەبێتە هۆی رژاندنی ماددەیەکی زیانبەخش بە خانە رەنگکەرەکانی پێست و قژ، کە ماددەی ئەدرینالینە، هەر لە حاڵەتی ترسدا ماددەیەکی زیانبەخشی تر بەڵام زیاتر بۆ سپێرمی پیاو دەرێژرێت کە ئەویش ماددەی سیرۆتۆنینە.

کەواتە سەرەنجامی کۆتایی ترس و دڵەڕاوکێ بریتیە لە زیاتر رژاندنی هەر سێ هۆرمۆنی: کۆرتیزۆن، ئەدرینالین و سیرۆتۆنین، لەلایەکی ترەوە و بەهۆی چوونە تەمەنەوە کەمکردنێکی زۆر لە رژاندنی هەردوو هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن و هۆرمۆنی

(MSH)دا روودەدات، کە لەگەڵ زیاتر رژاندنی ماددە زیانبەخشەکاندا هەموویان بەیەکەوە کاردەکەنە سەر سپێرمەکان و زیان دەدەن الە پێگەیشتنیان، ئەگەر پەیدابوونی یەك هۆکار لەوانەی سەرەوە بەس بێت بۆ وەستاندنی بەرهەمهێنانی سپێرم، ئایا کۆبوونەوەی ئەو هەموو هۆکارە بەیەکەوە چی دروست دەکەن؟!

دوای روونکردنەوەی ئەم سستەمە هۆرمۆنیە سەرسوڕهێنەرە یەکتری تەواوکەرە، ئایا هیچ گومانێك لەوەدا دەمێنێت کە زەکەریا پێغەمبەر لە حاڵەتێکدا بووە کە زۆر مەحاڵە توانای منداڵ خستنەوەی هەبووبێت؟!

لێرەوە دەبینین کە سەرەتای سوورەتی (مریم) چەند موعجیزەیەکی گەورەی لەخۆ گرتووە: هەر لەجوانی و کورتی و پڕ مانایی دەستەواژەکەی و ووردیی وەسفەکەی بە شێوازێکی رەوانبێژ، پاشان لە سەرووی هەموویەوە بوونی پەیوەندیەکی زانستی وورد لە نێوانیاندا.

باشە کێ دەتوانێت ئەم وەسفە پڕ لە رەوانبێژی و زانستیە بکات تەنها خودای پەروەردگار نەبێت!!

[سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ] (**فصلت: ٥٣**).

**سەرچاوەکان:**

١- تفسير القرآن العظيم/ الإمام إبن كثير.

٢- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە ٣ی (رەبیعی دووەمی ١٤١٨ك)/ دەرکراوی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

**3- Review of Medical Physiology - William F. Ganong -eighthteenth Edition - 1997.**

# ئیعجازی زانستی لە فەرموودەی (وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ...)

## شەق بوونی گوێ و چاو




لە ئەنجامی تێڕوانینی زانایان و پزیشکان لە قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤ یەکێك لەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشانەی کە مرۆڤ سەرسام دەکات بریتییە لە ڕووداوی دروستبوونی چاوەکان و گوێکانە لە کۆرپەلەدا، ئەمانە بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی لە کۆرپەلەی مرۆڤدا دروستدەبن، و هیچ کەسێك ناتوانێت تەصەوری دروستبوونیان بکات ئەگەر بە چاوی خۆی نەیبینێت.

لەلایەکی ترەوە زۆر سەرسوڕهێنەرە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) لە هەندێك پاڕانەوە و لەکاتی کڕنووش بردنیدا دەیفەرموو: [عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)....... وَإِذَا سَجَدَ قَالَ « اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِى خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ».......] (**رواه مسلم**).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی کڕنووش بردندا ئەم نزایەی دەخوێند: خوای گەورە بۆ تۆ کڕنووشم برد و باوەڕم بە تۆ هێناوە و خۆم تەسلیمی تۆ کردووە،

روخسارم کڕنووشی برد بۆ ئەو کەسەی کە دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە و بیستن و بینینی لێوە شەق کردووە و دروستکردووە (واتە چاوەکان و گوێکان)، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە باشترینی دروستکەرانە.

دەربڕینێکی سەرنج ڕاکێشە کە دەبینین ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە بیستن و بینین لە روخسارەوە بە شێوەی شەقبوون دروستدەبن.

ئەوەی روونیدەکەینەوە ئەوەیە ئەم فەرموودەیە بەهێنانی دەستەواژەی (شەقبوون) ئیعجازێکی زانستی و ئیعجازێکی هەواڵدان لەخۆی دەگرێت.

کۆرپەلەزانی نوێ بۆمان باسدەکات کە ٣ کرداری سەرەکی هەیە لەکاتی دروست بوونی چاوەکان و گوێکاندا:

١- کردارێکی دروستبوون لەڕێی جیابوونەوەی ئەندامێك لە ئەندامێکی تر و دەرهێنانی لێیەوە.

٢- کردارێکی دروستبوونی چاڵاییەك.

٣- کردارێکی لەتبوون و دڕانی پەردەکان.

لە زمانی عەرەبیدا ئەو ووشەیەی کە تەعبیر لەم هەموو کردارانە دەکات و هەموو ئەو مانایانە کۆدەکاتەوە بریتییە لە ووشەی شەق کردن (شقّ):

- لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (واشتقاق الحرف: أخذه منه) واتە: شەق کردن و دەرهێنانی پیتێك لە پیتێکی تر مانای: دەرهێنان دەگەیەنێت.

- لە (معجم مقاييس اللغة)دا هاتووە: (شقّ: يدلُّ على انصداع في الشَّيء) واتە: شەق کردن مانای دروستبوونی درز و چاڵایی لەشتێکدا دەگەیەنێت.

هەروەها لە (لسان العرب)دا هاتووە: (والشَّقُّ: الصَّدع البائن) واتە: شەق بریتیە لە چاڵاییەکی (قڵشێکی) ئاشکرا.

— دەربارەی مانای سێیەم: لە (لسان العرب)دا هاتووە: (شقّ الثياب: مَزَّقَه تَمزيقاً) واتە: شەق کردنی جل بریتییە لە لەت و پەت کرن و دڕاندنی، کەواتە هەر

سێ مانا زانستیەکەی زاراوەی شەقکردن لە زمانی عەرەبیدا دەدرێتە پاڵ ووشـەی (شقٌ).

با ئێستا بچینە سەر درێژەی بابەتەکە، تـا بـزانین لـە رووی کۆرپەلەزانییـەوە ئەوەی کە روودەدات لە بواری دروستبوونی گوێکان و چاوەکان چییە و ئایا ئـەو مانایانەی بەسەردا دەچەسپێت؟

## لە بواری دروستبوونی چاوەکاندا:

یەکـەم جـار لـە بـەرزایی سـەری کۆرپەلەکەدا دوو چـاڵایی بچـووک پەیـدادەبن کـە نـاودەبرێن بـە چـاڵایی بیـنین (Optic Sulcus) ئەمانـە لـە بەشـی پێشـەوەی




ئەم وێنانە گەشە کردنی چاو روون دەکاتەوە، دەبینین کە چۆن بڵقی هاوێنەی چاو لە چینی دەرەوەوە شەق دەبێت و جیادەبێتەوە و دەچێتە ناو چاڵایی کووپی بینینەوە

هەردوو لای بۆری دەماریی یان تویێی دەماری (Neural Folds) لە رۆژی ٢٢دا دروستدەبن، کە پاشان هەردوو بۆری دەماریی یەکدەگرن و مێشکی پێشەوە (Forebrain)ی کۆرپەلەکە دروستدەکەن، لە هەمان کاتدا ئەو دوو چالاّییەی کە لە هەردوولای بۆرییەکەدا بوون ئەستوور دەبن و هەر یەکەیان قەدێکی بینین (Optic Stalk) دروستدەکەن.

کە هەریەکەیان نزیك دەبێتەوە لە سەر رووی پێست لە هەردوو لای مێشکی کۆرپەلەکەوە، پاشان بە شێوەی توورەکەی بینین دەردەکەون لەسەر رووی پێست، کۆتایی ئەم قەدە بۆ ناوەوە دەچەمێتەوە، لێرەوە شێوە توورەکەییەکەی دەگۆرێت بۆ چالاّییەك کە لە کووپ دەچێت و پێی دەووترێت کووپی بینین (الكأس البصرية Optic Cup).

لەگەڵ چەمانەوەی کۆتایی ئەم قەدە بۆ ناوەوە کرداری لۆچ بوونی پێست (یان ئیکتۆدێرمی دەرەوە) بەسەریدا روودەدات بۆ دروست کردنی بلّقی هاوێنەی چاو (Lens Vesicle) کە لە سەرەتادا بەنووساویی بە پێستەوە دەمێنێتەوە، لە کردارێکی تردا ئەم بلّقە (هاوێنەیە) کە لە پێستەوە دروست بووە لێی جیادەبێتەوە و شەق دەبێت و لە پێست دەهێنرێتە دەرەوە و دەچێتە ناو چالاّیی کووپی بینینەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا چینێك لە میزۆدێرم کە ئەم هاوێنەیە دادەپۆشێت و پێی دەووترێت پەردەی پارێزەری هاوێنەیی (Iridopupillary Membrane)، ئەم پەردە پارێزەرە شەق دەبێت و کونێك دروست دەکات لە پێشەوەی هاوێنەدا (کە لەدواییدا (**Iris**) یان کونی رەشێنەی چاو دروست دەکات)[٨٩].

**(بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەڕە ٥٢١)**

---

[٨٩] بڕوانە: کتێبی کۆرپەلەزانی پزیشکی (Langman's Medical Embryology)/ لاپەڕە (٣٢٦).

لەکۆتاییدا هەردوو پێڵووەکان کە لە هەفتەی دەیەمدا پێکەوە دەنووسێن، لە هەفتەی (٢٦)دا لەت دەبن و شەق دەبن و دەکرێنەوە بۆ دروستکردنی هەردوو پێڵووی سەرەوە و خوارەوە لە هەر چاوێکدا.

## لە بواری دروستبوونی گوێکاندا:

گوێی مرۆڤی پێگەیشتوو لە سێ بەش پێکهاتووە:

١-گوێی ناوەوە (Inner Ear). ٢-گوێی ناوەڕاست (Middle Ear).
٣-گوێی دەرەوە (Outer Ear).

گوێی ناوەوە بەهەمان ڕێگەی دروستبوونی هاوێنەی چاو دروست دەبێت، بەڵام لە بەشی پشتەوەی مێشکەوە (Hindbrain)، کە چاڵاییەکی بچووك بەناوی چاڵایی گوێ (Otic Pit) لە چینی ئیکتۆدێرمی دەرەوە دروست دەبێت، ئەم چینە بەسەر خۆیدا لوول دەخوات و دەبێتە هۆی جیابوونەوە و شەق بوونی بڵقێکی پێست کە لێیەوە دەردەهێنرێت و بەرەو ناوەوە کۆچ دەکات و توورەکە یان بڵقی بیستن (Otic Vesicle) دروستدەکات، ئەم توورەکەیە پاشتر گەشە دەکات بۆ دروست کردنی پێکهاتەجۆراوجۆرەکانی گوێی ناوەوە، وەك: (Membranous Labyrinth) و (Bony Labyrinth).

ئێسکەکانی گوێی ناوەڕاستیش دروست دەبن و شەق دەبن لە: کرکڕاگەی یەکەم کەوانەوە (First Arch Cartilage) کە پاشان ئەم کەوانەیە ئێسکەکانی چەناگە دروست دەکات، هەروەها لە کرکڕاگەی کەوانی دووەمیشەوە (Second Arch Cartilage) بە چەند ڕێگەیەکی ئاڵۆز دروستدەبن.

گوێی دەرەوەش لە ئەنجامی زیادبوون و گەشە کردنی خانەکانی چینی ئیکتۆدێرم بۆ ناوەوە دروست دەبێت، ئەم بارستە خانەیە چینێکی بەهێز و پتەو دروست دەکەن کە پێیدەووترێت (داخەری گوێی دەرەوە)، پاشان ئەم چینە

داخەرە لەت وپەت دەبێت و ڕێڕەوێك دروستدەكات كە لە درز و شەقێكی ئاشكرا دەچێت و پێیدەڵێن كەناڵی گوێی دەرەوە (External Acoustic Meatus).

**(بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەكانی لاپەڕە ٥٢٠)**




**Figure 17-2.** Schematic transverse sections through the region of the rhombencephalon showing the formation of the otic vesicles. (A) 24 days, (B) 27 days, and (C) 4½ weeks. Note the appearance of the stato-acoustic ganglion.

**دروست بوونی پێكهاتەكانی گوێی ناوەوە**




**Figure 17-3.** (A and B) Development of the otocyst showing a dorsal utricular portion with the endolymphatic duct, and a ventral saccular portion. (C, D, and E) The cochlear duct at 6, 7, and 8 weeks, respectively. Note the formation of the ductus reuniens and the utriculosaccular duct.

**قۆناغە سەرەتاییەكانی دروست بوونی گوێ و شەق بوونی لە چینی دەرەوە (بلقی بیستن) هەروەها دروست بوونی پێكهاتەكانی گوێی ناوەوەش روون كراوەتەوە.**

لەمانەوە بە تەواوەتی بۆمان ڕووندەبێتەوە كە ماناكانی ووشەی (شَقً) زۆر بە جوانی یەكدەگرێتەوە لەگەڵ كرداری دروستبوونی چاو و گوێ لە كۆرپەلەی مرۆڤدا، جارێك بەوە یەكدەگرێتەوە كە لە ئەنجامی پەیدابوونی چالآییەكەوە

دەبن، و جارێکی تر لە ئەنجامی دروستبوونی ئەندامێك لە ئەندامێکی ترەوە، و جارێکی تریش لە ئەنجامی لەتبوون و دڕانی پەردەکانەوە دەبێت.

لەدوای ڕوونکردنەوەی ئەم کردارانە کە زانستی نوێ دوای سەدان ساڵ لێکۆڵینەوە و تەنها لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا گەیشتە ئەم ڕاستییانە، لە کۆتاییدا بەلاغەت و ڕەوانبێژیی و وردەکاریی فەرموودەکانی پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆدەردەکەوێت، و بۆمان دەسەلمێت کە دەبێت ئەم فەرموودە پیرۆزە کە ئیعجازێکی زانستی ئاشکرای تێدایە ووتەی پێغەمبەرمان بێت، چونکە هیچ کەسێك و هیچ شارستانیەتێك پێش پێغەمبەر و لە سەردەمی ئەودا و دوای ئەویش بەسەدان ساڵ ئاگاداری ئەم بابەتە نەبوون و شتی وایان باسنەکردووە، کەواتە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (...وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ...) بۆ دروستبوونی گوێ و چاو لە مرۆڤدا، ئەمە زانیاریی مرۆڤی ئاسایی ئەو سەردەمانە نییە بەڵکو دەبێت نیگایەك و ئیلهامی ئەو پەروەردگارە بێت کە دروستکەرە و ئاگاداری هەموو نهێنییەکانە لە ئاسمانەکان و زەوی و لەناو لەشی مرۆڤیشدا.

**سەرچاوە:**


- لە کتێبی (ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا)، نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون، چاپی یەکەم ٢٠٠٨ وەرگیراوە، بەسوود وەرگرتن لەم سەرچاوانە:
- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغرّ/ دار المعرفة- بيروت/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٥
- موسوعة الإعجاز العلمي في الحديث النبوي/ الجزء الثاني- خلق الإنسان/ أ.د. أحمد شوقي إبراهيم/ الطبعة الثانية- ٢٠٠٤.

**-The Developing Human–ninth edition \ Keit.L.Moor &T. V. N. Persaud.**

**- Langman's Medical Embryology\ T.W.Sadler\ 10th edition.**

# ئیعجازی زانستی
# له فەرموودەی جومگەکاندا

**ئامادەکردنی:**

پ.د/ شریف أحمد جلال: پرۆفیسۆر له کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (عبدالعزیز) له (مەدینەی منەوەرە).

پ.د/ أحمد عبد المنعم العیاط: پرۆفیسۆر له کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (عبدالعزیز) له (مەدینەی منەوەرە).

د/ مصطفی محمد عبد المنعم: پرۆفیسۆری یاریدەدەر له کۆلیجی پزیشکی زانکۆی (عبدالعزیز) له (مەدینەی منەوەرە).

**بەدواداچوون و سەرپەرشتیاری شەرعی و زمانەوانی:**

پ. د/ خلیل ابراهیم ملا خاطر.

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی وەرگێڕ:

ئەم بابەتە بریتییە لە دەرخستنی ئیعجازی زانستی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئاماژەی داوە بە بوونی (٣٦٠) جومگە لە لەشی مرۆڤدا، لەبەرئەوەی کە بابەتێکی نوێیە و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە کە چەند پزیشکێکی تایبەتمەند و مامۆستای زانکۆ پێی هەستاون بە گەڕانەوە بۆ راستییە زانستییەکان و سەرچاوە پزیشکییەکان و پاش ژماردنێکی ووردی جومگەکان لە لەشی مرۆڤدا راستی ئەم ژمارەیەیان سەلماندووە، هەربۆیە پێم باشبوو کە وەریگێڕم بۆ زمانی کوردی بە

مەبەستی دەرکەوتنی ئەو پرشنگە نووره لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا لە رۆژگاری ئەمڕۆی زانست و پێشکەوتندا، کە بۆمان دەسەلمێنێت بەشێوەیەك کە گومانی تێدانیە، پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆیەوە قسەی نەکردووە بەڵکو هەموو ووتەکانی نیگای خودایین و لە هەمان کاتیشدا پڕن لە موعجیزەی پرشنگدار و ئاشکرا ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ٣-٤).

**فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ):**

**- روى الإمام مسلم في صحيحه قال: حَدَّثَنَا حَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْحُلْوَانِيُّ حَدَّثَنَا أَبُو تَوْبَةَ الرَّبِيعُ بْنُ نَافِعٍ حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ - يَعْنِي ابْنَ سَلَّامٍ - عَنْ زَيْدٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَلَّامٍ يَقُولُ حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ فَرُّوخَ أَنَّهُ سَمِعَ عَائِشَةَ تَقُولُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ:** ﴿«إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلَاثِمَائَةِ مَفْصِلٍ فَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَهَلَّلَ اللَّهَ وَسَبَّحَ اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلَاثِمِائَةِ السُّلَامَى فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ». **قَالَ أَبُو تَوْبَةَ وَرُبَّمَا قَالَ:** «يُمْسِي»﴾. (صحيح مسلم - كتاب الزكاة).

+ واتە: ئیمامی (موسلیم) لە (صحیح)ەکەیدا لە (عائیشە)ی خێزانی پێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿هەموو مرۆڤێکی نەوەی ئادەم لەسەر (٣٦٠) جومگە دروستکراوە، هەر کەسێك (الله أكبر)، و (الحمد لله)، و (لا إله إلا الله)، و (سبحان الله)، و (أستغفر الله) بکات، و بەردێك لە رێگەی خەڵکی لا ببات، یان دڕکێك یان ئێسقانێك لەرێی خەڵکی لاببات، و فەرمان بە چاکەیەك بکات، یان رێگریی لە خراپەیەك بکات، بە ئەندازەی ژمارەی ئەو (٣٦٠) جومگەیە، ئەوا ئەو رۆژە بەڕێ دەکات بەشێوەیەك کە خۆی لە ئاگری دۆزەخ دوور خستۆتەوە﴾، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (ئەوا کە ئێوارەی کردەوە خۆی لە ئاگری دۆزەخ دوور خستۆتەوە).

- روى الإمام البخاري في صحيحه قال حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ حَدَّثَنَاسَعِيدُ بْنُ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنْ النَّبِي صلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ﴿عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ، فَقَالُوا: يَانَبِي اللَّهِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: يَعْمَلُ بِيَدِهِ فَيَنْفَعُ نَفْسَهُوَيَتَصَدَّقُ، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، قَالَ: يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِالْمَلْهُوفَ، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، قَالَ: فَلْيَعْمَلْ بِالْمَعْرُوفِوَلْيُمْسِكْ عَنْ الشَّرِّ فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ﴾ (صحيح البخاري - كتاب الزكاة).

+ واتە: ئیمامی (بوخاری) لە (صحیح)ەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لەسەر شانی هەموو موسوڵمانێك صەدەقە و چاکە پێویستکراوە کە بیکات، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی ئەو کەسەی کە سامانی نەبوو چی بکات؟ فەرمووی: با بە دەستی خۆی کاربکات، کە سوود بەخۆی دەگەیەنێت و چاکەش دەکات، ووتیات: ئەی ئەگەر ئەمەشی دەست نەکەوت چی بکات؟ فەرمووی: با یارمەتی ئەوانە بدات کە پێویستییان هەیە و تامەزرۆی یارمەتی خەڵکن، ووتیان: ئەی ئەگەر ئەمەشی دەست نەکەت چیبکات؟ فەرمووی: با کاری چاك بکات و خۆی بگرێتەوە لە خراپە، ئەمەش چاکەیە بۆی﴾.

+ لە کتێبی (فتح الباری شرح صحیح البخاری)دا ئیمامی (ئیبنو حەجەریعەسقەلانی) لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: ووتەی پێغەمبەر (عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ) مەبەست پێی هاندانە بە تەئکیدی، یان لەوانەیە لەوەش فراوانتر بێت، کە ئەم دەستەواژەیە بۆ پێویستکردن (إیجاب) و هاندان (إستحباب)یش دەبێت، وەك ئەو ووتەیەی تری پێغەمبەر (ﷺ) وایە کە دەفەرموێت: (لەسەر موسوڵمان ٦ سیفەت پێویستە)، کە تێیدا شتی وا هاتووە کە بە یەکڕایی زانایان خوازراو و هانبۆدراوە و واجب نییە، (ئەبو هورەیرە)ش لە ریوایەتەکەیدا بۆ فەرموودەکە ئەوەی هێناوە کە بەستوویەتیەوە بە هەموو رۆژێکەوە، هەروەها ئیمامی (موسلیم)یش لە (ئەبو زەر)ەوە ریوایەتی کردووە:

﴿يصبح على كلسلامى من أحدكم صدقه﴾ واته: لەسەر هەموو جومگەیەكی ئێوە كە هەموو رۆژێك بەیانی دەكەنەوە چاكەیەك هەیە كە دەبێت بیكەن، (سلامی) بریتییە لە جومگە.

**- روى الإمام احمد في مسنده قال: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ حَدَّثَنِي أَبِيحَدَّثَنَا زَيْدٌ حَدَّثَنِي حُسَيْنٌ حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَقَالَ سَمِعْتُ أَبِي بُرَيْدَةَ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ:** ﴿فِي الْإِنْسَانِ سِتُّونَ وَثَلَاثُمِائَةِ مَفْصِلٍ فَعَلَيْهِأَنْ يَتَصَدَّقَ عَنْ كُلِّ مَفْصِلٍ مِنْهَا صَدَقَةً. **قَالُوا: فَمَنْ الَّذِييُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ:**النُّخَاعَةُ فِي الْمَسْجِدِتَدْفِنُهَا أَوِ الشَّيْءُ تُنَحِّيهِ عَنِ الطَّرِيقِ فَإِنْ لَمْ تَقْدِرْفَرَكْعَتَا الضُّحَى تُجْزِئُ عَنْكَ﴾ **(مسند الإمام أحمد:٢٣٧٠٠).**

+ واتە: ئیمامی (ئەحمەد) لە (موسنەد)ەكەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لە لەشی مرۆڤدا (٣٦٠) جومگە هەیە، كە پێویستە لەسەری بۆ هەموو جومگەیەك چاكەیەك بكات، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كێ دەتوانێت كە بەمە هەستێت؟ فەرمووی: تەنانەت بەڵغەم كە لە مزگەوتدا فڕێ درابێت و تۆ بیشاریتەوە، یان هەر شتێك كە لەسەر ڕێگا لای ببەیت چاكەیە، ئەگەر هەر نەتتوانی ئەوا دوو ركات نوێژی (چێشتەنگاو) لەسەرت لادەبات.




**جۆرەكانی جومگە لە لەشی مرۆڤدا**

**ماناى زمانەوانى:**

(مفصل) جومگە: بریتییە لە شوێنی بەیەکگەشتنی ئێسکەکان لە لەشدا.

(السلامی): بریتییە لە جومگە، و کۆکەی بریتییە لە (سلامیات)، لە (القاموس)دا هاتووە: (السلامی) بریتین لەو ئێسکە ووردانەی کە بەدرێژایی پەنجەکانی دەست و پێدا هەن.

ئەم پێناسەیەش کە لەلایەن زانایانەوە کراوە (خوا پاداشتیان بداتەوە) پێویستی بە رێکخستن و روونکردنەوەی زیاتر هەیە لەژێر رۆشنایی زانستە نوێکاندا.




**ئێسکە ووردەکانی پێ لە مرۆڤدا**

## ڕێگرەکان لەبەردەم یەکگرتنەوەی ڕاستییە گەردوونییەکان لەگەڵ دەقە شەرعیەکەدا:

١- کورتکردنەوەی ئاماژەکان لە تێگەیشتنی فەرموودەکەدا لە جومگەکانی نێوان ئێسکەکاندا و پشتگوێ خستنی جومگەکانی نێوان کرکراگەکان.

٢- جیاوازی پێناسەی زانستی بۆ جومگەکان کە بریتییە لە بەیەك گەشتنی ئێسکەکان یان کرکراگەکان بەبێ بوونی بەربەست، لە تێگەیشتنی زمانەوانی کە ئاماژە دەدات بەبوونی بەربەست یان جیکەرەوە (فاصل) لەنێوان دوو شتدا.

٣- پێویستی دانانی یاسایەك بۆ حاڵەتە دووبارە بووەکان لەناو لەشدا، کە لەوانەیە دوو ئێسك لە زیاتر لەیەك شوێندا بەیەك بگەن و جومگە دروست بکەن، کە ئایا ئەمانە بە یەك جومگە یان زیاتر دادەنرێن.

## چارەسەر کردنی ئەم دژایەتییە رووکەشییە ئەویش: بە ووردیی دانانی پێناسەی زانستی بۆ جومگەکان و جێبەجێ کردنیشی لە ژماردنی جومگەکانی لەشی مرۆڤدا:

### یەکەم: دانانی پێناسەیەکی وورد و تەواوی جومگەکان:

هەستاین بە دانانی ژمارەیەك لە مەرجی زانستیی تەفصیلی پێش دەستکردن بە کرداری ژماردنەکە و پاشان هەستاین بە ژماردن بە ووردیی، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە هەر خەلەل و نوقسانییەك لە دانانی مەرج و یاساکاندا دەبێتە هۆی ڕوودانی خەلەل لە دەرخستنی ڕاستییە گەردوونییەکەدا کە خۆی لە ژمارەی ڕاستەقینەی جومگەکانی لەشدا دەبینێتەوە کە لە فەرموودە پیرۆزەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، پابەند نەبوون بە چەند مەرج و یاسایەکی وورد و ڕاستیش لەڕووی زانستییەوە دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگای ڕەخنەگرتن و تانەلێدان لە بواری ئیعجاز بە گشتی، ئەویش لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو کەسانەی بەم کارە

هەڵدەستن دێن دەقە شەرعییەکان و راستییە زانستییەکان بە ئارەزووی خۆیان دەستکاریی دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ هەوا و ئارەزووی خۆیاندا یەکبگرێتەوە.

ئەوەی کە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا پشتی پێدەبەستین ئەوەیە کە:

**<u>جومگە بریتییە لە شوێنی بەیەکگەشتنی هەموو دوو ئێسکێك یان ئێسك و کڕکڕاگەیەك یان دوو کڕکڕاگە لە هەر شوێنێکی لەشی مرۆڤدا کە جیاکەرەوە لەنێوانیاندا بێت.</u>**

ئەم پێناسەیەش پێچەوانە نییە لەگەڵ زانستەکانی زماندا و لەهەمان کاتیشدا مانای ووشەی (مفصل) وورد و جێگیردەکات بە بنەما زانستییەکان کە هەموو ئەو جومگانە دەگرێتەوە کە کڕکڕاگەکان تێیدا بەشدارن، و هەروەها لەگەڵ سەرچاوە زانستییەکانیشدا پێچەوانە نییە، بەڵکو مانای زمانەوانی ووشەی (مفصل)یش جێگیر دەکات کە مەبەست پێی بریتییە لە بوونی جیاکەرەوەیەك لەنێوان دوو شتدا، هەروەها بەیەکگەشتنی دوو ئێسکیش هەمیشە بەیەك جومگە دادەنرێت تەنانەت ئەگەر لە شوێنێکیش زیاتردا بەیەك بگەن، بەم شێوەیە بنەما و مەرجە هاوپێچەکانی پێناسەکەش ئەمانە دەبن:

لەم سەرژمێرییەدا جومگە کڕکڕاگەییە سەرەتاییەکان داخڵ نابن، کە لە ئێسکێك پێکهاتوون و بە کڕکڕاگە دەورە دراون لەبەرئەوەی ئەم کڕکڕاگانە لە تەمەنێکی زوودا دەبن بە ئێسك و ئەو ئێسکە بەتەواوەتی یەکدەگرێت و هیچ نێوانێکی نامێنێت.

## نموونەکان:

أ- بەیەکگەشتنی کۆتاییەکانی ئێسکە درێژەکانی پەلەکان لەگەڵ ناوەڕاستەکانیاندا.

ب- بەیەکگەشتنی ئێسکی (وەتەد) لە کەللەی سەردا لەگەڵ ئێسکی پشتە سەردا.






١- لــــــــەم ســــــــەرژمێرییەدا بەیەکگەشتنی گرکراگە و ئێسکەکان داخـڵ نـەکراوە کاتێك کـە نێوانیـان نـەبێت و تـەنها پێکەوەنووسـابن بـە یەکگرتنی پەردەی

کرکراگەکــە لەگــەڵ پــەردەی ئێســـــکەکەدا، بـــــۆ نموونـــــە: بەیەکگەشـــــتنی کرکراگـــــەکانی پەراسووەکان لەگەڵ پەراسوەکاندا.

٢- بەیەکگەشـتنی هـــەموو دوو ئێسکێك بە یەك جومگە دانراوە تەنانەت ئەگەر لە زیاتر لە یـەك شوێنیشدا بەیـەك گەشتبن، بۆ نموونە:

١- بەیەکگەشتنی ئێسکی پێشەوەی کەللەی سەر لەگەڵ ئێسکی (وەتەد)دا.

٢- بەیەکگەشتنی ئێسکی (وەتەد) لەگەڵ ئێسکی (میکعە) لە کەللەی سەردا.

## دووەم: کۆکردنەوە و ژماردنی جومگەکانی لەشی مرۆڤ بە جێبەجێ کردنی ئەو یاسایەی لەسەرەوە دانراوە:

أ) کۆکردنەوە و ژماردن بە درێژی:

**1-SKULL**(کەللەی سەر)

| ناوی جومگەکان | ژمارەیان |
|---|---|
| 1. FRONTO PARIETAL JOINT (CORONAL SUTURE) | 1 |
| 2. FRONTO –ETHMOID JOINT | 1 |
| 3. FRONTO MAXILLARY JOINTS | 2 |
| 4. FRONTOZYGOMATIC JOINTS | 2 |
| 5. FRONTONASAL JOINT | 1 |
| 6. FRONTOSPHENOID (LESSER WING) JOINT | 1 |
| 7. FRONTO-LACRIMAL JOINTS | 2 |
| 8. PARIETOOCCIPITAL JOINT | 1 |
| 9. INTERPARIETAL JOINT (SAGITTAL SUTURE) | 1 |
| 10. TEMPRO-PARIETAL JOINTS | 2 |
| 11. TEMPRO-SPENOID JOINTS (GREATER WING) | 2 |
| 12. OCCIPITO-TEMPORAL JOINTS | 2 |
| 13. TEMPRO-SPHENOID JOINTS (GREATER WING) | 2 |
| 14. TEMPRO-ZYGOMATIC JOINTS (ZYGOMATIC ARCH) | 2 |
| 15. TEMPRO-MANDIBULAR JOINTS | 2 |
| 16. INTER OSSICULAR JOINTS | 4 |

| | |
|---|---|
| 17. INTERMAXILLARY JOINT | 1 |
| 18. ZYGOMATICO-MAXILLARY JOINT | 2 |
| 19. MAXILLO-PALATINE JOINT | 1 |
| 20. NAZOMAXILLARY JOINTS | 2 |
| 21. MAXILLO-ETHMOID JOINTS | 2 |
| 22. MAXILLO- LACRIMAL JOINTS | 2 |
| 23. MAXILLO-SPHENOID JOINTS (PTERYGOID PROCESS) | 2 |
| 24. MAXILLO-CONCHAL JOINTS (INFERIOR CHONCHA) | 2 |
| 25. DENTAL GOMPHOSIS | 32 |
| 26. SPHENO-ETHMOIDAL JOINT | 1 |
| 27. VERMO-SPENOID JOINT (PTERYGOID PROCESS) | 1 |
| 28. PALATO-SPHENOID JOINTS (PTERYGOID PROCESS) | 2 |
| 29. ZYGOMATICO-SPHENOID JOINT (GREATER WING) | 2 |
| 30. VERMO-ETHMOIDAL JOINT (PERPINDICULAR PLATE) | 1 |
| 31. LACRIMO-ETHMOIDAL JOINT (LABYRINTH) | 2 |
| 32. JOINT BETWEEN VOMER AND HARD PALATE | 1 |
| 33. INTERNASAL JOINT | 1 |
| 34. JOINT BETWEEN HORIZONTAL PLATES OF PALATINE BONES | 1 |
| كۆ | 86 |

## 2- LARYNEX(قورقوڕاگە)

| | |
|---|---|
| 1- CRICOTHYROID JOINTS | 2 |
| 2-CRICOARYTENOID JOINTS | 2 |
| 3- ARYTENOI-CORNICULATE JOINTS | 2 |
| کۆ | 6 |

## 3- VERTEBRAL COLUMN AND PELVIS
## (بڕبڕەی پشت و حەوز)

| | |
|---|---|
| 1- ATLANTO-OCCIPITAL JOINTS | 2 |
| 2- INTERVERTEBRAL JOINTS | 69 |
| 3- LUBOSACRAL JOINTS | 3 |
| 4- SACRO-COCCYGEAL JOINT | 1 |
| 5- SYMPHYSIS PUBIS | 1 |
| کۆ | 76 |

## 4-UPPER LIMBS(پەلەکانی سەرەوە)

| | |
|---|---|
| 1- STERNOCLAVICULAR JOINT | 1X2= 2 |
| 2- ACROMIOCLAVICULAR JOINT | 1X2= 2 |
| 3- SHOLDER JOINT | 1X2=2 |
| 4- ELBO JOINT | 1X2=2 |
| 5- SUPERIOR RADIO-ULNAR JOINT | 1X2=2 |
| 6- INFERIOR RADIO-ULNAR JOINT | 1X2=2 |
| 7- WRIST JOINT | 1X2=2 |

| | |
|---|---|
| 8- INTERCARPAL JOINTS | 6X2=12 |
| 9- MID CARPAL JOINT | 1X2=2 |
| 10- CARPOMETACARPAL JOINTS | 4X2=8 |
| 11-METACARPOPHALANGEAL JOINTS | 5X2=10 |
| 12- INTERPHALANGEAL JOINTS | 9X2=18 |
| کۆ | 64 |

## 5- THORACIC CAGE(قەفەزی سنگ)

| | |
|---|---|
| 1- MANUBRIO STERNAL JOINT | 1 |
| 2- XIPHISTERNAL JOINT | 1 |
| 3- STERNOCOSTAL JOINTS | 14 |
| 4- INTERCHONDRAL JOINTS | 6 |
| 5- COSTO-VERTEBRAL JOINTS | 12X2= 24 |
| 6- COSTO-TRANSVERSE JOINTS | 10X2=20 |
| کۆ | 66 |

## 6-LOWER LIMBS(پەلەکانی خوارەوە)

| | |
|---|---|
| 1- SACROILIAC JOINT | 1X2=2 |
| 2-HIP JOINT | 1X2=2 |
| 3-KNEE JOINT | 1X2=2 |
| 4- SUPERIOR TIBIO- FIBULAR JOINT | 1X2=2 |
| 5- INFERIOR TIBUO FIBULAR JOINT | 1X2=2 |
| 6-ANKLE JOINT | 1X2=2 |
| 7- INTERTARSAL JOINTS | 7X2=14 |

| | |
|---|---|
| 8- TARSOMETATARSAL JOINTS | 4X2=8 |
| 9- METATARSOPHALANGEAL JOINTS | 5X2=10 |
| 10- INTERPHALANGEAL JOINTS | 9X2=18 |
| کۆ | 62 |

**ب) ژمارەی گشتی جومگەکان بەپێی یاسا دانراوەکان:**

| | |
|---|---|
| ١- جومگەکانی ئێسکی کەللەی سەر | ٨٦ |
| ٢- جومگەکانی قوڕگ | ٦ |
| ٣- جومگەکانی قەفەزی سنگ | ٦٦ |
| ٤- جومگەکانی بڕبڕەی پشت و حەوز | ٧٦ |
| ٥- جومگەکانی پەلەکانی سەرەوە ٣٢ × ٢ = | ٦٤ |
| ٦- جومگەکانی پەلەکانی خوارەوە ٣١ ×٢ = | ٦٢ |
| کۆی گشتی | ٣٦٠ |

ئالێرەوە نموونەیەك و بەڵگەیەکی تری بەڵگەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی خاوێندا ئاشکرا دەبێت، کە هیچ مرۆڤێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەیدەتوانی ئەم زانیارییەی دەستبکەوێت و بیزانێت مەگەر بە نیگای خودایی نەبێت، پەروەردگاریش زۆر جوانی فەرمووە:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (**فصلت:٥٣**).

**سەرچاوە:** سایتی (**www.eajaz.org**).

# له نێوان دوو بەشدا

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: [فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ] (الطارق ٥-٧)، واتە: کەواتە با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کە لە چی دروستکراوە؟! دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاو و دەرپەڕیو (کە مەنی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەتە، هەردووکیان هەڵدەقوڵێن بۆ پێکهێنانی ئادەمیزاد بە ویستی خوا)، لەنێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینەدا دەردەچێت، (التَّرَائِبِ) لە زمانی عەرەبیدا بە شتێکی تەخت دەووترێت وەك زەوی تەخت، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (ورَجلٌ تَرِبٌ: لازق بالتراب (ما تستوي حاله مع التراب))، کە مەبەست پێی لە ئایەتەکەدا ئێسکەکانی قەفەسی سنگە (پەراسووەکان)، هەر لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (الترائب عظام الصدر: ما بين الترقوة الى الثندوة).

دەربارەی (الصُّلْبِ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای بڕبڕەی پشت دێت، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (الصُّلب: عَظْم من لدن الكاهل الى العجب)، لەبارەی واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەوە (کە دەفەرموێت: لە نێوان بڕبڕەی پشت و قەفەسی سنگ دەردەچێت) زانایانی راڤە وتەفسیر چەندین رایان هەیە، هەندێکیان دەڵێن ئەو شتەی لەم نێوانەوە دەردەچێت مەبەست پێی مرۆڤە بەگشتی کە لە نێوان (الصلب والترائب)دا دروست دەبێت، هەندێکی تریان دەڵێن مەبەستی ئەو ئاوەیە کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت، بەم پێیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزەیەکی تر هەیە کە دەفەرموێت: مرۆڤ لە بەشێك ئاوی دەرپەڕیوەوە دروستدەبێت، وئەم ئاوە لە چەند ئەندامێکەوە دەردەچێت، کە ئەم ئەندامانە سەرەتا لە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکان (الصلب و الترائب)دا دروستدەبن.

وەك ئاماژەمان پێدا لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا (الصلب) بە مانای بڕبڕەی پشت (العمود الفقري) دێت، و (الترائب) واتە: ئێسکەکانی پێشەوەی سنگی مرۆڤ واتە پەراسووەکان.

کەواتە ئەوەی تێدەگەین لە ئایەتە پیرۆزەکەوە وەك ئیعجازێکی نوێ و تەحەددایەك ئەوەیە کە دەفەرموێت کۆئەندامی زاوزێی پیاو و ئافرەت سەرەتا لە کۆرپەلەدا لە نێوان بڕبڕەی پشت و ئێسکەکانی سنگدا دروست دەبن لە پشتدا، زانستی ئەمڕۆ دۆزیویەتەوە کە لە کۆرپەلەدا ئەو خانانەی هێلکەدانەکان لەئافرەتدا و گون لەپیاودا دروست دەکەن لەگەڵ ئەو خانانەی کە گورچیلەکان دروست دەکەن لە داهاتوودا، سەرەتا لە ناوچەی چینی ناوەڕاست (Mesoderm)وە لە کۆرپەلەدا جیا دەبنەوە و دروستدەبن، کە دەکەونە نێوان چینی سەرەوە یان دەرەوە (Ectoderm) کە ئەمەیان بڕبڕەی پشت و دەمارە پەتك دروست دەکات لە داهاتوودا، و چینی خوارەوە یان ناوەوە (Endoderm) کە لە داهاتوودا ئێسکەکانی قەفەزی سنگ (پەراسووەکان) دروستدەکات، ئەم چینە (چینی ناوەڕاست) تەنێکی لێوە دروستدەبێت کە پێکهێنەری گورچیلەکان و گونەکان یان هێلکەدانەکان دەبێت و دەکەوێتە ئەملاولای بڕبڕەی پشتی سەرەتاییەوە، لەگەڵ بەرەوپێش چوونی دروستبوونی کۆرپەلەدا ئەندامەکانی زاوزێی مرۆڤ (هێلکەدانەکان لە ئافرەتدا و گونەکان لەپیاودا) کە سەرەتا لەگەڵ گورچیلەکانن لە نزیکی پشتی مرۆڤدا، و پاشان دێنەخوارەوە بۆ شوێنی ئاسایی خۆیان.

ئەوەی ئەم ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێنێت ئەوەیە کە هێلکەدانەکان و گونەکان و گورچیلەکانیش ڕاستەوخۆ لە لایەن خوێنبەری گەورە یان شاخوێنبەرەوە (Aortic Artery) خوێنیان بۆ دەچێت لە شوێنێکی نێوان هەردوو گورچیلەکانەوە، هەروەها لەلایەن دەماری دەیەمی سنگ (کە لە دڕکە پەتکی

پشـتەوە لـە نێـوان بڕبـڕەی دەیـەم و پانزەیەمـەوە دەردەچـێت) لـە مێشـکەوە دەماریان بۆ دەچێت، کە هـەموو ئـەم دەمـار و خوێنبەرانـە لەناوچـەی ناوەڕاسـت لەنێوان بڕبڕەی پشت و قەفەزی سنگدا شوێنی خۆیان وەردەگرن.

## معجزة الماء الدافق والصلب والترائب

الخصيتان والمبايض تتكونان في الجنين في مكان الكليتين، زاوية التقاء الصلب مع الترائب ثم تنزلان مع عروقهما الى سفل البطن

## بالعلم تسطع الآيات

قال الطبري: (اختلف أهل التأويل في معنى الترائب. فقال بعضهم:

الترائب: موضع القلادة من صدر المرأة. وقال آخرون: الترائب: ما بين المنكبين والصدر. وقال آخرون: هو اليدان والرجلان والعينان. وقال آخرون: يخرج من بين صلب الرجل ونحره. وقال آخرون: هي الأضلاع التي أسفل الصلب. وقال آخرون: هي عصارة القلب).

وما أن اخترعت المجاهر حتى بدت معجزة كبرى في كتاب الله تعالى: إن الماء الدافق سواء في الرجل أو في المرأة إنما يخرج متخلصا بالاستعانة بالعروق المغذية للمبيض والخصية، النازلة معهما من (بين الصلب والترائب) مكان الكليتين) بالتدريج أثناء فترة الحمل حتى تستقر الخصيتان والمبايض في مكانهما الجديد أسفل البطن. إنه العلم البليغ الذي لم يكن أحد يدري عنه شيئا قبل مائة عام عددا. سلوهم: من الذي أعطاه محمدا صلى الله عليه وسلم في الزمن الأول.

صورة توضح مسار الدماء الممتدة من أعلى زاوية التقاء الصلب (العمود الفقري) والترائب (الضلوع) حتى تصل إلى مقر تكوين ماء الرجل (الخصيتين).

يقول الله تعالى:

«لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا (١٦٦)»

(سورة النساء: ١٦٦)

**وێنەیەکی تۆیکاری ئەو خوێنبەر و خوێنهێنەرانەن کە خوێن دەبەن بۆ گونەکان، دەبینین راستەوخۆ لە خوێنبەر و خوێنهێنەری گەورەوە وەرگیراون کە دەکەونە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکانەوە**

(بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتری بابەتەکە بڕوانە لاپەڕە ٥٢٢ لە هاوپێچی وێنە ڕەنگاوڕەنگکان)

لـە ئایـەتێکی تریشـدا ئاماژەیـەك بـۆ ئـەم راسـتییە هـاتووە کـە خـوای گـەورە دەفـەرمـوێت: [وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا

غَافِلِينَ](**الأعـراف:١٧٢**). واتـه: پـەروەردگار پێشـتر پـێش دروسـتكردنی مرۆڤـەكان لەپشتی باوكیان (واتە پێش دروست بوونی مرۆڤەكان بەگشتی كە پاشان لەپشـتی بـاوك و دایكـەوە دروسـت دەبـن) پـەیمانی لێـوەرگرتن دان بـەوەدا بنـێن كـە (الله) پەروەردگاریانە، ئەوانیش بەگشتی ووتیان بەڵێ پەیمان و شایەتی دەدەین....

خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا ئەمەی تەئكید كردووە كە دەفەرموێت: [وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ ...] (**النسـاء:٢٣**)، واتـە: لەسـەرتان حـەرام كـراوە خێزانەكانی ئەو كوڕانەی كە لە پشـتی خۆتـانن... كـە وابـزانم ئاماژەیـەكی روونـی تێدایە بۆ ئەوەی لەپشتەوە بنچینەی مرۆڤ و خانەكانی زاووزێیەتی.

هەروەها لە فەرموودەیەكی پێغەمبەریشدا (ﷺ) ئاماژە بـۆ ئەمـە كراوە: [عَنْ عَائِشَـةَ أُمِّ الْمُـؤْمِنِينَ (رضِـيَ الله عنهـا) قَالَـتْ: دُعِـيَ رَسُـولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى جَنَـازَةِ صَـبِيٍّ مِـنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ طُوبَى لِهَذَا عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ لَمْ يَعْمَلِ السُّوءَ وَلَمْ يُدْرِكْهُ، قَالَ: « أَوَغَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ! إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ »] (**رواه مسلم**)، واتە: عائیشەی دایكی ئیمانداران دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بانگكرا بـۆ ناشتنی منداڵێكی پشتیوانان، منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا خۆش بەختی بۆ ئەم منداڵە كە چۆلەكەیەكی بەهەشتە، نە خراپـەی كـردووە و نـە خراپـەی دیـوە، ئەویش فەرمووی: هـەر ئەوەیـە ئـەی عائیشـە، خـوای گـەورە بڕیاریـداوە كـە كـێ خەڵكی بەهەشتە بۆ هەموو كەسێك هەر لەو كاتەی كە لە پشتی باوكیاندا بوون.

لـە فەرموودەیـەكی تریشـدا: لـەو فـەرموودە بەناوبانگـەی كـە دەربـارەی بێباوەڕانی مەككە كە ئازاریان دەدا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: [بَل أَرْجُو أَن يُخْرِجَ اللهُ مِن أَصْلابِهِم مَن يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ لا يُشْرِك بِهِ شَيْئا] (**متفـق عليـه**)، واتـە: مـن ئومێـدم وەهایە كە لە پشتی ئەمانەوە خوای گەورە ئەوەیەك دروسـت بكـات و دەربهێنێـت كە پەروەردگار بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن.

كەواتە لە كۆتاییدا دەگەینە راڤەی دروستی ئایەتە پیرۆزەكە كە مەبەست پێـی ئەوەیە: بنچینەی مرۆڤ لە شوێنێكەوە دەردەچێت كـە دەكەوێتـە نێـوان بڕبـڕەی

پشت و پەراسووەکانەوە، و دوایی لەڕێی ئاوێکی دەرپەڕیوەوە کە لە گونەکان و هێلکەدانەکانەوە دەردەپەڕێت دروستدەبێت.

بەڕاستی ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەر و پڕ لە ئیعجازە، چونکە کێ لەو سەردەمەی پێغەمبەردا (ﷺ) بە خەیاڵیشیدا ئەم شتانە دەهاتن، بەم شێوەیە راستییە زانستییەکان و ئایەتەکانی قورئان یەك دەگرنەوە، کە هیچ سەیر نییە چونکە دروست کەری ئەم راستییانە هەرئەوە کە قورئانی پیرۆزیشی بۆ ناردووین بە پێغەمبەردا (ﷺ): [أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ] (الملك:١٤).

**سەرچاوە: کتێبی (ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا – نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون) – چاپی یەکەم – ٢٠٠٨.**

ڕێڕەوی هاتنە دەرەوە و لەدایك بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ
٤
پەراسووەکان
بڕبڕەی پشت

**کۆرپەلەی مرۆڤ لە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکاندا (الصلب والترائب)دوە دێتە دەرەوە و لەدایك دەبێت.**

# کەمترین ماوەی دووگیانی ئافرەت موعجیزەیەکی قورئانیە

کۆرپەلەی مرۆڤ لە دوای قۆناغی (النشأة) دەبێت بە دروستکراوێکی نوێ و تەواو کە دەتوانێت لەدەرەوەی منالدانی دایکی بژی، ئەمەش لەپاش تەواو بوونی مانگی شەشەمی دووگیانیەوەیە، ئەم مانایە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەم ئایەتانەی قورئاندا هاتووە:

- ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾ (الأحقاف:١٥)، واتە: سکپڕی تا بڕینەوەی منداڵ لە شیر هەمووی ٣٠مانگ دەخایەنێت.

- لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿... وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ...﴾ (لقمان:١٤)، واتە: شیردانی منداڵ دوو ساڵ دەخایەنێت، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ...﴾ (البقره:٢٣٣)، واتە: دایکان دەبێت شیر بدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو.

کەواتە لەم ئایەتانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کەمترین ماوەی سکپڕی بریتییە لە ٦مانگ چونکە ئەگەر ماوەی سکپڕی و شیردان ٣٠مانگ بێت، و ماوەی شیردان بە تەنها دوو ساڵ (واتە ٢٤مانگ) بێت، ئەوا کەمترین ماوەی دووگیانی ئافرەت ٦مانگ دەبێت، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئیمامی عەلی (رەزای خوای لێبێت) بەم شێوەیە فەتوایدا کاتێك کە موسوڵمانێك گومانی لە خێزانەکەی کرد کاتێك کە دوای ٦مانگ لە ژن هێنانی منداڵێکی زیندووی بوو، ئەویش بە پشت بەستن بەم ئایەتانە ووتی کە ئەوە منداڵی خۆتە چونکە کەمترین ماوەی سکپڕی ٦مانگە[٩٠]، هەموو هاوەڵەکانیش لەم رایەدا لەگەڵیدا بوون و موفەسیرەکانی قورئانیش هەمان قسەیان کردووە.

---

[٩٠] بڕوانە: (زاد المسير لإبن الجوزي)/ (٧:٣٧٧).

## ڕوونکردنەوەی زانستیی:

پزیشکی فەرەنسی (شارل ڕۆ)[91] ئەم ڕاستیەمان بۆ شیدەکاتەوە لە ڕووی زانستییەوە و دەڵێت: کۆرپەلە لە سکی دایکیدا لە ناوەندێکی ئاویدا دەژی و هەر لەویشەوە ئۆکسجین وەردەگرێت (کۆرپەلەکە ئۆکسجین لە دایکەکەوە وەردەگرێت لەرێی ناوکە پەتکەوە و خۆیشی لە ناوەندێکی ئاویدایە).

کۆرپەلە بۆ ئەوەی بتوانێت لە دەرەوەی منداڵدان بژی پێویستی بەوە هەیە کە ئۆکسجین لەرێی هەناسەدانەوە وەربگرێت لەبری ئەوەی لە دەوروبەرە ئاویەکەیەوە دەریبهێنێت، ئەمەش پشت دەبەستێت بە پێگەیشتن و کامڵ بوونی سییەکانیەوە، و هەروەها پێگەیشتنی ئەو سەنتەرە دەماریانەی کە لە دڕکەپەتك و مێشکدا هەن و کۆنترۆڵی هەناسەدان دەکەن.

پێگەیشتنی تەواوی سییەکان دوای هەشت مانگ لە سکپڕی دەبێت بەڵام توانای دەست کردن بە هەناسەدان زۆر پێش ئەمە دەست پێدەکات، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە پێگەیشتنی پشت بە دوو فاکتەری سەرەکی دەبەستێت کە بریتین لە:

١- پێگەیشتنی توورەکەکانی هەوا یان سیکڵدانۆچکەکان (Alveoli) کە بریتین لە کیسی زۆر بچووك لە هەردوو سییەکاندا، لێرەدایە کە ئاڵوگۆڕی گازیی لە سییەکاندا ڕوودەدات.

٢- موولوولەکانی خوێن (Vascular Capillaries): ئەو خوێنەیان تێدایە کە گازەکان لە لەشدا دەگوێزێتەوە.

دروست بوونی سیکڵدانۆچکەکان لە مانگی شەشەمی دووگیانیدا دەبێت و تا کۆتایی بەردەوام دەبێت، و لەوانەیە ئەم ماوەیە تا ساڵی یەکەمی دوای لەدایك بوونیش بخایەنێت، مولوولەکانی خوێنیش لە مانگی شەشەمدا بە توندوتۆڵی بە

---

[91] ئەم بابەتەی لە (کۆنگرەی پزیشکی ئیسلامی جیهانی یەکەم دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و'سوننەتدا) پێشکەش کرد.

سیکڵدانۆچکەکانەوە دەبەسترێنەوە، ئیتر بەهۆی ئەمانەوە بە شێوەیەکی تیۆری دەتوانین بڵێین کە کۆرپەلەکە توانای ژیانی هەیە لە دەرەوەی مناڵدان (ئەویش لەبەر ئەوەیە کە توانای هەناسەدانی هەیە بەهۆی دروست بوونی پێکهێنەرە سەرەکیەکانی هەناسەدان)، هەربۆیە دەبێت تەواو بوونی مانگی شەشەم بە کەمترین ماوەی سکپڕی دابنرێت کە کۆرپەلەکە واچاوەڕوان دەکرێت بتوانێت دوای ئەمە بژی. (**بڕوانە لاپەڕە ٥٢٤ ی هاوپێچی وێنە ڕەنگاورەنگەکان**)

فاکتەری سەرەکی بۆ بەردەوام بوونی هەناسەدان بریتیە لە ماددەی سێرفاکتەنت (Surfactant) کە لەلایەن سیکڵدانۆچکەکانەوە دەردەدرێت، ئەم ماددە پرۆتینی چەوریدارە (Lipoprotein) وا لە سیکڵدانۆچکەکان دەکات کە لە کاتی هەناسە وەرگرتندا بەشێوەیەکی جێگیر بکشێن و لەکاتی هەناسەدانەوەدا ڕێ لە قەپات بوون و تێکشکانیان دەگرێت، دەردانی ماددەی سێرفاکتەنت لە هەفتەی بیستەمەوە دەست پێدەکات، کە بڕەکەی زۆر کەمە لەو منداڵانەدا کە پێش کاتی خۆیان لەدایك دەبن و ناگاتە ڕاددەیەکی پەسەند کراو تەنیا لە کۆتایی سکپڕیدا نەبێت.

ئەو فاکتەرە سەرەکیەی وا لەو منداڵانە دەکات کە پێش کاتی خۆیان لەدایك دەبن بتوانن بژین، ئەوە نییە کە کۆمەڵێك توورەکەی تەنکی لاپەڕی هەبێت (Thin Terminal Sacs)، بەڵکو بریتییە لە گەشە کردنێکی پەسەندی لوولە خوێنەکانی سییەکان و بوونی ڕێژەیەکی پێویستە لە ماددەی (سێرفاکتەنت)، هەربۆیە ئەو کۆرپەلانەی کە لە نێوان ٢٤–٢٦ هەفتەی دووگیانیدا لەدایك دەبن دەتوانن بژین ئەگەر بێتو چاودێرییەکی زۆر تایبەتیان بۆ بکرێت، و لەناو شووشەکانی نەبەکامدا بهێڵرێنەوە.

بەڵام چانسی ئەوەش هەیە کە ئەو کۆرپەلانەی تەمەنیان لەنێوان ٢٢–٢٥ هەفتەدایە و لەدایك دەبن بمرن لەو کاتە زۆر زووەدا، لەبەر ئەوەی کە کۆئەندامی

هەناسەیان پێنەگەیشتووە، بەڵام ئەو کۆرپەلانەی کە دوای ئەم ماوەیە لەدایك دەبن بەزۆری چانسی ژیانیان هەیە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە کۆئەندامی هەناسەدانیان دەتوانێت کرداری هەناسەدان ئەنجام بدات، هەروەك دەشزانین کە مانگی کۆچی (مانگی هەیڤی) لە ٢٩.٦ رۆژ پێکدێت، و شەش مانگی هەیڤی دەکاتە:(٦ × ٢٩.٩ = ١٧٧,٦ رۆژ)، کە یەکسانە بە ٢٥ هەفتە و ٢ یان ٣ رۆژ.

کەواتە ئەو ماوەیەی قورئانی پیرۆز دیاری کردووە بە ووردیی بریتییە لە کەمترین کاتی پراکتیکی بۆ سکپڕی لە مرۆڤدا کە بریتییە لە ٢٥ هەفتە و بەرەو ژوور (+ 25 Weeks)، و ئەو منداڵانەی کە لەم کاتەدا و پێش کاتی ئاسایی خۆیان لەدایك دەبن دەتوانن بژین، ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێزدەکات کە ٢٥ هەفتە و بەرەو ژوور بریتییە لەو ماوە پراکتیکیەی کە کۆرپەلەکە دەتوانێت تێیدا هەناسە بدات و بێبوونی نەخۆشی ترسناك بژی، چەند شتێکە لەوانە:

١- هەندێك سەرچاوەی پزیشکی رێژەی ئەو منداڵانەی کە لە کاتی شەش مانگی هەیڤی یان ٢٧ هەفتە لە یەکەم رۆژی عادەی ئاسایی مانگانەی ئافرەتەکەوە (LNMP: Last Normal Menstrual Period) لەدایك دەبن و بە زیندوویی دەمێننەوە بە ٧٢٪ دیاری کردووە بۆ ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٨ بە پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر تەمەنی کۆرپەلەکە، هەروەها بە ٩٠٪ لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥-١٩٩٦ بە پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر کێشی منداڵەکان (کە کێشی ئەو منداڵەی بە تەمەنی ٢٧ هەفتەیی لەدایك دەبێت بریتییە لە ١٠٠٠ گرام بەپێی توێژینەوەیەکی سەرچاوەیی کە لە ساڵی ١٩٩٦دا ئەنجامدرا)، هەروەها بە ٩٠٪ دیاری کرا بەپێی توێژینەوەیەکی ساڵی ٢٠٠١ کە پشتی بەستبوو بە تەمەنی کۆرپەلەکە.

کەواتە ئەو ماوەیەی ئاماژەمان پێدا بەپێی ئەو ئامارانەی سەرەوە بریتییە لەو ماوەیەی کە بەزۆری کۆرپەلەکە تێیدا دەژی، بۆ زانیاریش ئەو ماوەی ٢٧

هەفتەیەی کە ووتمان لە یەکەم رۆژی عادەکەوە حیساب دەکرێت هەمان ئەو ماوەیەیە کە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیان پێداوە (شەش مانگی کۆچی یان ٢٥هەفتە)، کە ٢ هەفتەی سەرەتای ٢٧ هەفتەکە بریتییە لە ماوەی نێوان یەکەم رۆژی عادەی مانگانەکە تا کاتی دەرپەڕانی هێلکەکە لە هێلکەدانەوە، کە لەگەڵ ٢٥ هەفتەی تردا حیساب دەکرێت (کە ئەمیان لە کاتی دەرپەڕانی هێلکەکەوە دادەنرێت تا لەدایك بوونی کۆرپەلەکە)، قورئانی پیرۆزیش حیسابەکەی پشتی بەستووە بە یەکەم رۆژی دووگیانی و ئەمە بە سەرەتای تەمەنی کۆرپەلەکە دادەنێت، چونکە ئایەتە قورئانییەکە باسی سکپڕی کردووە ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾، و باسی ووشەکانی (دەورە–سووڕ) یان (حەیز) و لەو شێوانەی نەکردووە، ئەگەر بە شێوەیەکی لۆجیکیش بیری لێبکەینەوە دەبینین کە حیسابی تەمەنی کۆرپەلەکە لە رۆژی پیتاندنی هێلکەکەوە بکرێت باشتر و مەنتیقی ترە، چونکە کۆرپەلەکە لەو دوو هەفتەیەی پێشتردا هەر بوونی نییە.

٢– دەقەکانی قورئانی پیرۆز ئەو دەستێوەردانە پزیشکیانە ناگرێتەوە (بەپێدانی کۆرتیزۆن و سێرفاکتەنت) بەو کۆرپەلانەی کە پێش شەش مانگی کۆچی لەدایك دەبن، و ئەم ماددانە رۆڵیان هەیە لە مانەوەی کۆرپەلەکەدا کە بە نزیکەی (٢٠٪) دیاری کراوە بۆ ئەو منداڵانەی کە کێشیان لەخوار ١٠٠٠ گرامەوەیە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە دەقەکانی قورئان جیهانین و بۆ هەموو مرۆڤایەتین و بۆ هەموو کاتێکن، و هەموو گەل و نەتەوەکانی سەر زەوی توانای ئەم تەکنەلۆجیا پێشکەوتووانەیان نییە، ولە رابووردووشدا بابەتی لەو جۆرە بوونی نەبووە.

٣– لەبەرئەوەی ئەو منداڵانەی پێش ٢٥هەفتە لەدایك دەبن (واتە کێشیان لە خوار ١٠٠٠ گرامەوەیە) تووشی نەخۆشی جۆراوجۆر دەبن، وەك: نەخۆشییە درێژخایەنەکانی سییەکان (بە تایبەتی نەخۆشی پەکخەری RDS: Respiratory Distress Syndrome)، و هەوکردنی ریخۆڵەی کۆڵۆن

(Necrotizing Enterocolitis)، و خـــوێن بـــەربوونی نـــاو مێشـــك (Intraventricular Hemorrhage) لـــە پلـــەی ســـێیەم و چـــوارەم، هەندێکیان بەپێی توێژینەوە نوێکان تووشی ئەمانە دەبن: شەلەلی مێشك و بێهێزی جووڵە، یان گیروگرفتیان دەبێت لە ئەندامەکانی بیستن و بینین، دواکەوتنی گەشە کردن، و قسەکردن، و دابەزینی رادەی ژیریی، رێژەی تووش بوون بـەم نەخۆشـی و دواکەوتنانە بە تایبەتی بۆ منالانی ناو شووشە (خُدَّج) کە کێشیان ئێجگـار نزمـە لـە کـاتی لـەدایك بوونـدا (Extremely Low Birth Weight) دەگاتـە نزیکەی نیوە تا ٢\٣ی هەموو حاڵەتەکان.

٤- ئایەتەکـە پەیوەنـدی نییـە بـەو حاڵەتـە شـاز و ناوازانـەی کـە جـار جـار روودەدەن و تێیدا کۆرپەلەکە لەنێوان ٢٠-٢٥ هەفتەدا لەدایك دەبێت لەگەڵ نزیکە کامڵ بوونی کۆئەندامی هەناسەیدا، ئەمەش وەك زانایان باسـی دەکـەن پەیوەنـدی هەیە بە دووچار بوونی دایکی کۆرپەلەکـە یـان وێڵاشـی منالەکـە یـان کۆرپەلەکـە خۆی بۆ نارەحەتیەك یان بار گرانیەك.

٥- هیچ دەقێکی زانستیی نیە کە بڵێت لەرووی زانستیەوە سەلماوە کە ماوەی سکپڕی دەبێ ٩ مانگ بێت، بەڵکو سەرچاوە زانستیەکان دەڵێن مـاوەی دووگیـانی لەنێوان ٢٥٠-٢٨٥ رۆژدایـە هـەروەك لـە (ئینسـایکلۆپیدیای بـەریتانی)دا هـاتووە، هـەروەها دەڵێـت منـداڵێك کـە گەشـەی تـەواو بووبێـت لەوانەیـە دوای ٢٢١ رۆژ لـە دوایین رۆژی عادەی دایکەکە لەدایك ببێـت کـە نزیکـەی ٧ مانگـە، ئەمـەش دەقـی نووسینەکەیە:

Duration of pregnancy: There are, as a rule, 266 to 270 days between ovulation and childbirth, with extremes of 250 and 285 days. Physicians usually determine the date of the estimated time for delivery by adding seven days to the first day of the last menstrual period and counting forward nine calendar months; i.e., if the last period

began on January 10, the date of delivery is October 17. Courts of law, in determining the legitimacy of a child, may accept much shorter or much longer periods of gestation as being within the periods of possible duration of a pregnancy. One court in the state of New York has accepted a pregnancy of 355 days as legitimate. British courts have recognized 331 and 346 days as legitimate with the approval of medical consultants. Fully developed infants have been born as early as 221 days after the first day of the mother's last menstrual period.

٦- له یاساكانی ئەمڕۆشدا دان بەوەدا نراوە كە هەر منداڵێك دوای ٦ مانگ و بەرەوژوور لەدایكبوو ئەوا چانسێكی باشی بۆ ژیان هەیە، وەك لە یاسای ویلایەتی (لویزیانا)ی ئەمریكیدا هاتووە كە دەڵێت:

(Every child born alive more than six months after conception, is presumed to be capable of living).

بڕوانە ئەم لینكە: http://www.lectlaw.com/def2/p139.htm

٧- لەزۆر سەرچاوەی زانستیدا هاتووە كە ماوەی سكپڕی ٦ مانگ و بەرەوژوور ئاساییە بۆ ژیانی منداڵ، وەك لەم سایتەی سەر بە وەزارەتی تەندروستی ئەمریكا كە باسی ئەو تازەبووانە دەكات كە ماوەی دووگیانی دایكیان (٢٨ هەفتە) بووە:

Inclusion Criteria (when recruited as newborns):
Gestational age at birth ≤ 28 weeks
Birth weight ≤ 1250 grams

واتە: ٢٨ هەفتە × ٧ رۆژ = ١٩٦ رۆژ، كە دەكاتە ٦ مانگ. بڕوانە ئەم لینكە:
http://clinicaltrials.gov/ct2/show/NCT00310869

– لە رۆژنامەی (دەیلی مەیل)ی بەریتانیدا هاتووە:

Research has found the number of successful births between 22 and 25 weeks has more than doubled.

واتە: توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە رێژەی سەرکەوتنی دووگیانی بۆ ئەو کۆرپەلانەی کە لەنێوان ٢٢ بۆ ٢٥ هەفتە لەدایك دەبن دووجار زیادبووە، بڕوانە ئەم لینکە:

http://www.dailymail.co.uk/health/ar...on-limits.html

– دەزگایەکی تەندروستی ئەمریکی باسی توێژینەوەیەك دەکات کە ئەو منداڵانەی لەخۆگرتووە کە پێش کاتی خۆیان و لەنێوان ٢٥ بۆ ٣٢ هەفتە لەدایکبوون (gestational ages 25-32 wks)، بڕوانە ئەم لینکە:

http://psycnet.apa.org/index.cfm?fa=...1986-00077-001



لەلایەكی ترەوە خوای گەورە لەو ئایەتە پیرۆزەدا باسی هیلاكی دایك دەكات لەكاتی دووگیانیدا، باشە دەبێت ئەو ماوەیەی پەروەردگار باسی دەكات پێویستە چەندبێت؟

ئەگەر باسی درێژترین ماوەی سكپڕی بكردایە ئەوە مانای ئەوەبوو كە ئەو دایكەی پێش ئەمە منداڵی دەبێت هیلاك نەبووە؟! بۆیە دەبینین باسی كەمترین ماوەی دووگیانی و سكپڕیی كردووە، كە ئەمە روونكەرەوەی ئەو هیلاكی و ناڕەحەتیەیە كە هەموو ئافرەتێكی دووگیان دەیبینێت، هەربۆیە ئەو ئافرەتەی كە بەكەمترین ماوەی دووگیانی ناڕەحەت دەبێت ئەوا ئەگەر حەملەكەی دوابكەوێت بۆ ماوەی ئاسایی كە ٩ مانگە یان زیاتر بخایەنێت ئەوا ناڕەحەتی و هیلاكیەكەی زیاتر دەبێت، ئەگەر ئافرەتێك بۆ دووگیانی كەم كە ٦ مانگە ناڕەحەت بێت ئەوا بێگومان بۆ دووگیانیەك كە ٩ مانگ بخایەنێت ناڕەحەتتر دەبێت، بۆیە پەروەردگار زۆر جوانی فەرمووە: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَاناً حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْراً ....﴾ (الأحقاف:١٥).

خاڵێكی گرنگ هەیە كە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە كە دەقەكانی قورئان باسی شەش مانگیان كردووە وەك كەمترین ماوەی دووگیانی و سكپڕی لەبری باس كردنی نۆ مانگ كە ماوەی ئاساییە، بریتیە لە دەرخەر و سەلمێنەری ئیعجازی گەورەی قورئان، چونكە ٦ مانگ شارراوەترین ماوەی سكپڕیە لەلای عەرەبەكانی ئەو سەردەمە و شتی وایان نەزانیوە پێشتر، تەنانەت هاوەڵەكانیش سەریان سوڕما لە حاڵەتی ئەو ئافرەتەی كە تاوانبار كرابوو بە داوێنپیسی كە بە ٦مانگی منداڵی بووبوو، كە حاڵەتەكەیان بۆ روون نەبووەوە تەنها بە پشت بەستن نەبێت بە دەقەكانی قورئان كە بە ئاشكرا باسی ماوەی شارراوەی سكپڕیان كردووە، بەهۆی ئەم رووداوانەوە خوای پەروەردگار نەخوێندەواری و نەزانیی كۆمەڵگای عەرەبی ئەو سەردەمە دەردەخات و بەهۆی ئەمەوە گەورەیی و بەرزیی

یاساکانی قورئان دەردەکەوێت بەسەر بیروبۆچوونە باوەکانی ئەو سەردەمەدا، لەمرۆشماندا دەرخەرێکی ئیعجازی زانستی قورئانە بەپێی دەقی ئایەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

هەروەها سوودێکی تری باس کردنی شەش مانگ ئەوەیە: کە ئەو ئایەتە قورئانیە لە باسی منەت و گەورەیی دایك و روونکردنەوەی راددەی هیلاکی لە سکپڕی و شیرداندا هاتووە، کە ئێمە پێویست دەکات زۆر باش بین لەگەڵیدا و هەمیشە سوپاسگوزاری ببین، خوای گەورە وەسفی ئەو کەسانەی بە چاکە کردووە کە گەورەیی و فەزڵی دایك و باوکی دەزانێت و دوعای خێریان بۆ دەکات: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (الأحقاف: ١٥)، واتە: ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاك رەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئازارەوە هەڵیگرتووە و بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی، کە سکپڕبوون و لە شیر بڕینەوەی ٣٠ دانە مانگی خایاندووە، هەتا کاتێکیش ئینسان دەگاتە حاڵەتی توند و تۆڵی و توانایی و تەمەنی چلساڵی (ئەوسا حەق وایە کە ئەم دوعایە بکات) و بڵێت: پەروەردگارا! کۆمەکیم بکە و یارمەتیم بدە تا شوکرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو ناز و نیعمەتانە بم کە بە من و دایك و باوکمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدە لەو جۆرە کار و کردەوە چاکانە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی رازیت، دواکاریشم چاکە بڕوێنیت لەناو نەوەکانمدا لەبەر قازانجی خۆم (چونکە چاکەی هەر کەس بەشی دایك و باوکی تێدایە) بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لە گوناهەکانم خۆش ببیت و من لە موسوڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم.

هەربۆیە ئەگەر سوپاسگوزاری دایك لەسەر ماوەی شەش مانگی سكپڕی پێویست بێت كە كەمترین ماوەیە، ئەوا بۆ ماوەی تەواوی سكپڕی كە ٩مانگە زۆر پێویستترە و دەبێت گەورەتر و باشتر بێت، چونكە دایكەكە تووشی ئەشكەنجە و ناڕەحەتیەكی زۆر زیاتر دەبێت، و دەبێت دوور كەوینەوە لە بچووكترین بێگوێیی بۆ دایك و باوك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴾ (الإسراء:٢٣) واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە كە جگە لەو كەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە كە چاكەكاریش بن لەگەڵ دایك و باوكتاندا، هەركاتێكیش یەكێكیان یان هەردووكیان بە پیری كەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لەدەست مەكە و هەرگیز پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەكە، بەردەوامیش گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت.

ئەوەشمان بیرنەچێت كاتێك پەروەردگار باسی شەش مانگی كردووە مەبەست لێی گشتگیرییە بۆ هەموو ئافرەتێكی دووگیان، چونكە هەموو ئەوانەی كە منداڵیان دەبێت كۆرپەلەكەیان ٦ مانگی تەواو كردووە (چونكە ٦ مانگی كەمترین ماوەی دووگیانییە)، بەڵام ئەگەر باسی ٧ یان ٨ یان ٩ مانگی بكردایە ئەوا لەوانە بوو هەندێك ئافرەتی دووگیانی نەگرتایەتەوە، بەم شێوازە پڕ بەلاغەتە ئایەتەكە گشتگیرە و ئیعجازێكی زانستی بێوێنەی تێدایە، كە تێكەڵ دەبێت بە حیكمەتی سوپاسگوزاری بە ڕەوانبێژترینی دەربڕین.

دیاریكردنی ماوەی شیردانیش بە دوو ساڵی تەواو موعجیزەیەكی تری ئایەتەكانە، چونكە زانایانی خۆراكزانی لەمڕۆدا هەمان رایان هەیە، بۆ نموونە ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) ساڵی ٢٠٠١ كۆنگرەی (Complementary feeding)ی بەست و سەرەنجام ئەوەیان ڕاگەیاند كە ٢ ساڵی یەكەمی ژیانی منداڵ زۆر گرنگە بۆ گەشەكردنێكی تەندروست و خواردنی

ساوا لەم کاتەدا (کە شیری دایك باشترینە) زۆر بنەڕەتیە، ئەمەش دەقی بەشێکی ڕاپۆرتی کۆنگرەکەیە:

The first two years of a child's life are a critical window during which the foundations for healthy growth and development are built. Infant and young child Breast feeding is a core dimension of care in this period.

کە دەڵێت: یەکەم ٢ ساڵی ژیانی منداڵ دەلاقەیەکی گرنگ و مەترسیدارن کە لەم کاتەدا بناغەی گەشەکردن و گەورەبوونێکی تەندروستیانە دادەنرێت، شیردانی سروشتی کۆرپە و منداڵی بچووك لەم کاتەدا دووریەکە لە چەقی پرۆسەی پەروەردەکردندایە لەم کاتەدا.

سەرچاوە:

Complementary feeding, Report of the global consultation, Geneva, 10-13 December 2001.

توێژینەوە زانستیەکان دەریانخستووە کە شیردانی سروشتی بۆ ٢٤مانگ پارێزەرە بۆ دایك لە تووشبوون بە شێرپەنجەی هێلکەدان بەرێژەی سێیەك، ورۆڵی هەیە لەپاراستنی لەتووشبوون بەشێرپەنجەی مەمك، بڕوانە ئەم توێژینەوەیە:

Rates and risks of ovarian cancer in subgroups of white women in the United States." Obstet Gynecol 1994 Nov; 84(5): 760-764

## ماوەی بەخێوکردن و گۆشگرتن لە منداڵداندا:

لە ئایەتەکانی پێشووەوە بۆمان دەرکەوت کە کەمترین ماوەی سکپڕی بریتییە لە ٦مانگ، بەڵام لە باری ئاساییدا منداڵبوون بەگشتی دوای ٩مانگ دەبێت، کەواتە ئەو ٣ مانگەی کە منداڵ دوای پێگەیشتن لەناو منداڵداندا دەمێنێتەوە دەتوانین ناوی بنێین ماوەی بەخێوکردن وگۆش گرتن لە منداڵداندا (فترة الحضانة الرحمية) و ماوەی ئەو ٦مانگە بەسە کە کۆرپەلەکە دوای ئەمە بە زیندوێتی بمێنێتەوە.




زوربەی کاتی مانەوەی لەناو مناڵداندا کۆرپەلە تەنها لە قەبارەدا زیاد دەکات، وەك لەم وێنانەدا دەبینین کەواتە ماوەی ٦ مانگی کۆتایی تەنها ماوەیەکی گۆشگرتنە لەناو مناڵداندا.

لێرەوە دووبارە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوەی قورئانی پیرۆز بڕیاری داوە و موفەسیرەکان باسیان کردووە هەر ئەوەیە کە زانستی نوێی ئەمڕۆ بڕیاریداوە، کە کۆرپەلە پێش ٦مانگی ناتوانێت بە زیندوویی لەدایك ببێت و مەحاڵە بتوانێت پێش هەفتەی ٢٤ی ژیانی کۆرپەلەیی بۆخۆی هەناسە بدات، چونکە کۆئەندامی هەناسەدانی هێشتا بە تەواوەتی گەشەی نەکردووە وتوانای کرداری هەناسەدانی نییە، لەو خاڵانەی سەرەوە کە باسمان کرد ئەمانەمان بۆ دەردەکەوێت:

أ- ووردەکاریی قورئان لە دیاریکردنی کەمترین ماوەی پێویست بۆ مانەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا، کە دوای ئەمە ئەگەر لەدایك ببێت لەوانەیە بە زیندوویی بمێنێتەوە.

ب- دەتوانین سێ مانگی کۆتایی مانەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا بە ماوەیەکی گەورەبوون و بەخێوکردن دابنێین لە منالداندا (ماوەی گۆش گرتنی ناو منالدان).

## سەرچاوەکان:


- ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د.کاوە فەرەج سەعدون/ ناوەندی رۆشنبیر/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.

- چەند پێگەیەکی ئینتەرنێت.

- The Developing Human \ third edition (with Islamic additions)\ Keit.L.Moor, Abdul-Majeed A. Zindani.
- Langman's Medical Embryology\ T.W.Sadler\ fifth edition-1985.
- Human Embryology \ Patten \ 3rd Edition-1968.
- Obstetrics by Ten Teachers\ T.L.T. Lewis & G.V.P. Chamberlain\ 15th Edition - 1992.
- Encyclopaedia Britannica \ Ultimate Reference Suite DVD - 2006.

# فەرمانکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە گەڕان بەدوای چارەسەری نەخۆشیدا

بابەتی چارەسەری نەخۆشی و گەڕان بەشوێن دەرمانی نارەحەتیە جیاوازەکانی مرۆڤدا یەکێکە لە کارە لەپێشەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، و بەردەوام زانایان و پزیشکان هەوڵەکانیان لەم بوارەدا درێژە پێدەدەن و تەقەلاکان بەردەوامن و پێشکەوتنی زۆر باشیش لەم بوارەدا هاتۆتەدی، زوربەی نەخۆشییە ناسراوەکان یان چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوە یان لە میکانیزم و رێڕەوی تووشکردن و سووڕی ژیانیان تێگەیشتووین.

ئەم هەولانە لەخۆیاندا کارێکی پیرۆز و پێزانراوە، ئەگەر سەیری فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لەم بوارەدا بکەین دەبینین لە زۆرێك لە فەرموودەکانی قورئان و سوننەتدا ئاماژە بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی و گەڕان بەدوای دەرماندا هاتووە، و هانی موسولمانانیان داوە کە پێشەنگ بن لەم بوارەدا، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: ﴿تَداوَوا عِبادَ الله، فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَضَع داءً إلاّ وَضَعَ لَهُ دَواءً، غَيْرَ داءٍ واحِدٍ، الهَرَمْ﴾ (**رواه أحمد و أصحاب السنن**)، واتە: ئەی بەندەکانی خودا دەرمان بەکار بهێنن و خۆتان چارەسەر بکەن و بەدوایدا بگەڕێن، چونکە پەروەردگار هیچ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانیشی بۆ دانەنابێت تەنها یەك دەرد نەبێت کە ئەویش پیریە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إن الله لم ينزل داءً إلا أنزل له دواء، جهله من جهله وعلمه من علمه﴾ (**رواه الترمذي والنسائي وابن ماجة واحمد وصححه الألباني**) واتە: خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانیشی بۆ دانەنابێت، کەس هەیە نایزانێت و کەسی واش هەیە ئەم دەرمانە دەزانێت، کاتێکیش هاوەڵەکان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەپرسن: ئایا ئێمە بەدوای چارەسەردا بڕۆیین فەرمووی: بەڵێ،

چونکە خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانیشی بۆ دانەنابێت ( **رواه أبوداود والترمذي وابن ماجة وأحمد** ).

پێغەمبەر (ﷺ) خۆیشی دەرمانی بەکاردەهێنا بەتایبەتی لەنەخۆشی کۆتایی ژیانیدا، لە کتێبی (صفة الصفوة)ی (إبن الجوزي)دا هاتووە: عوروەی کوڕی زوبەیر لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری (ڕەزای خوای لێبێت) پرسی: من سەرم سوڕماوە لە زانیاری زۆری تۆ لە بواری پزیشکی و چارەسەردا؟! عائیشەش ووتی: ئەی عوروە پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتایی ژیانیدا نەخۆش بوو، وەفدی تیرە عەرەبیەکانیش دەهاتن بۆ لای لە هەموو لایەکەوە و شێوازی چارەسەر و دەرمانی دەردەکەیان بۆ باس دەکرد، منیش گوێم لێدەگرتن و چارەسەرەکانم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئامادە دەکرد، زانیارییەکانی من لەوێوەیە ( **رواه الطبراني والحاكم وصححه ووافقه الذهبي** ).

هەر پێغەمبەر (ﷺ) خۆیشی هانی هاوەڵەکانی دەدا بۆ ئەوەی بەدوای چارەسەردا بگەڕێن، و دەیناردن بۆلای پزیشکەکان یان پزیشکی دەنارد بۆلای بریندارەکان، وەك کاتێك (ئوبەی کوڕی کەعب) لە جەنگێکدا بریندار دەبێت پێغەمبەر (ﷺ) پزیشکێك دەنێرێت بۆلای و چارەسەری دەکات ( **رواه مسلم وأبوداود وأحمد** )، جارێکیش یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر لە ناوچەوانیدا برینداربوو کە بووە هۆی هەوکردنی و جەراعەتی لێوە دەهات، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بەشوێن دوو کەسدا کە پێشتر چارەسەری خەڵکیان دەکرد، و لێی پرسین: ئێوە ئەمەتان چارەسەر دەکرد پێش ئیسلام، ووتیان: بەڵێ، کە ئیسلام هات ئێمە وازمان لێهێنا و تەنها تەوەکول و پشتمان دەبەست بەخودا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دە چارەسەری بکەن، ووتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لە پزیشکیدا خێر و پاداشت هەیە: فەرمووی: بەڵێ، ئەو کەسەی کە دەرد و نەخۆشی ناردووە لەهەمان کاتدا چارەسەر و دەرمانیشی بۆ ناردووە ( **رواه ابن السني والبزار ورجاله ثقات** ).

تەنانەت هەندێك پزیشكی عەرەب هەبوون لەوكاتەدا كە بەناوبانگ بوون بە چارەسەری نەخۆشی، پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە هاوەڵەكانی دەكرد كە سەردانیان بكەن و چارەسەرەكانیان بەكاربهێنن، وەك (الحارث بن كلدة) كە شارەزا بووە لە پزیشكی لەو كاتەدا و لە قوتابخانەیەكی پزیشكی وولاتی فارسدا خوێندبووی و فێربوو بوو، ﴿عن سعد بن أبي وقاص قال: مرضت فأتاني النبي (ﷺ) فوضع يده على ثديي حتى وجدت بَردها على فؤادي، فقال: إنك رجل مفؤود فأت الحارث بن كلدة أخا ثقيف، فإنه رجل يتطبب﴾ (**رواه أبوداود وابن السني وسنده جيد**)، واتە: سەعد كاتێك نەخۆش بوو پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی كرد و دەستی خستە سەرسنگی و فەرمووی: تۆ كەسێكیت نەخۆشی دڵت هەیە بچۆ بۆلای حاریس كە لە تیرەی سەقیفە لە تائیف چونكە شارەزایە لە پزیشكیدا.

لەلایەكی ترەوە هەركەسێك بەبێشارەزایی و فێربوون بەپێی عادەت و زانستی سەردەم پزیشكیی بكات و پڕوپاگەندەی ئەوە بكات كە چارەسەری نەخۆش دەكات ئەوا تاوانبارە و هەر زەرەرێك لەو كەسانە بدات كە چارەسەریان دەكات ئەوا دەبێت تۆڵەی لێبسەنرێتەوە و زیانەكانیان بۆ قەرەبوو بكات، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿من تطبب ولم يُعْلَم منه طب قبل ذلك فهو ضامِن﴾ (**رواه أبوداود والنسائي وابن ماجة وحسنه الألباني**)، واتە: هەركەسێك خۆی بەپزیشك دەربخات و چارەسەر بكات بەبێئەوەی زانرابێت كە پێشتر فێری پزیشكی بووە و شارەزابووبێت، ئەوا دەبێت قەرەبووی ئەو زیانانە بكات كە دروستی دەكات.

كەواتە با ئاگاداری ئەو كەسە جادووگەرانە بین كە پڕوپاگەندەی ئەوە دەكەن كە دەتوانن چارەسەری هەموو نەخۆشییە جەستەییەكان بكەن، بەبێئەوەی پێشتر لەبواری پزیشكیدا خوێندبێتیان و شارەزاییان پەیداكردبێت لە نەخۆشی و شێوازی چارەسەردا، و بۆ ئەم مەبەستە تەنانەت هەندێك لە فەرموودە و

ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن بەداردەستیان کە بێگومان مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ووتانە ئەوە نیە کە ئەوان لێکیدەدەنەوە و کاری لەسەردەکەن، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکانیدا دەربارەی چارەسەری نەخۆشی تەنها چەند شتێکی گشتی باسکردووە و ئامۆژگارییەکانی بەپلەی یەکەم خۆپارێزین لە نەخۆشی بەڵام کە نەخۆشییەکی جەستەیی راستەقینەی دەبینی داوای دەکرد کە بەدوای چارەسەردا بگەڕێن و بچن بۆلای پزیشکانی شارەزا.

کەواتە گەڕان بەدوای چارەسەری نەخۆشیدا گوێڕایەڵیە بۆ خوا و پێغەمبەر و جۆرێکە لە پەرستن و عیبادەت، و کارکرد لەبواری پزیشکیدا و فێربوونی ئەو زانستە بەشێوە راست ودروستەکەی بەهەمان شێوە گوێڕایەڵیە بۆ خودا و پێغەمبەر (ﷺ) و پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت، هەروەها هاندانیشە بۆ موسوڵمانان بۆ کارکردن و پێشکەوتن لەو بوارەدا.

# ئاماژه زانستییه‌كان له ووته‌ی راڤه‌كارانی قورئان و فه‌رمووده ده‌رباره‌ی ده‌قه‌كانی رۆژوو

## ئاماژه زانستییه‌كان له ووته‌ی راڤه‌كارانی قورئاندا:

رۆژوو و هه‌موو ته‌شریعه خوداییه‌كان بۆ به‌ده‌ستهێنانی سوود و مه‌صله‌حه‌ت بۆ مرۆڤه‌كان دانراوه، جا ئه‌گه‌ر ئه‌م مه‌صله‌حه‌تانه رۆحی و ده‌روونی بن، یان له ره‌ووشت و هه‌ڵس وكه‌وتدا بن، یان جه‌سته‌یی و ماددی بن ئه‌ویش بۆ پاراستنی ته‌ندروستی له‌ش، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌مه‌یه كه خوای گه‌وره رۆژووی له‌سه‌ر ئێمه و نه‌ته‌وه‌كانی پێشووش پێویست كردووه، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ]، موفه‌سیر (فه‌خری رازی) ده‌رباره‌ی ده‌ڵێت: (ئه‌م عیباده‌ته له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ران و نه‌ته‌وه‌كانی پێش ئێوه له ئاده‌مه‌وه تا ئێوه واجب بووه، و خوای گه‌وره به ته‌نها له‌سه‌ر ئێوه‌ی دانه‌ناوه).

خاوه‌نی (تفسير المنار) ده‌ڵێت: (له‌سه‌ر میلله‌تانی پێشووش نووسراوه، و پایه‌یه‌كی هه‌موو دینێكی پێش ئێوه بووه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له به‌هێزترین عیباده‌ته‌كان و خاوێنكه‌ره‌وه‌ی ده‌روونه، كه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت له‌سه‌ر میلله‌تانی پێشووش پێویستكراوه ئه‌مه به‌ڵگه‌ی یه‌كگرتوویی به‌رنامه ئاسمانییه‌كانه له بنه‌ڕه‌ته‌كان و مه‌به‌سته‌كانیان).

رۆژووی نووسراو له‌سه‌ر هه‌موو میلله‌تێك هه‌مووی یه‌ك جۆر بووه كه بریتییه له وازهێنان له خواردن و خواردنه‌وه و جیماع له به‌ره‌به‌یانیه‌وه تا رۆژئاوا بوون، هه‌ندێك جار درێژتر بووه و شه‌و و رۆژێكی خایاندووه، وه‌ك رۆژووی جووله‌كه‌كان كه له ٢٤سه‌عاتدا ته‌نها یه‌ك ژه‌میان خواردووه، هه‌روه‌ك له فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه: [فَصْل ما بَينَ صِيامِنا وَصِيام أَهل الكِتاب أَكْلَةُ السَّحَر] (**رواه مسلم**)، واته: جیاوازی نێوان رۆژووی ئێمه و رۆژووی دیانه‌كان بریتییه له

خـواردنی پارشـێو، کەواتــە ئــەوان لــە ئێــوارەوە تــا ئێوارەکــەی تــر هیچـیان نەخواردووە.

ئیمامی (إبن الجوزي) لە تەفسیری (زاد المسـیر) لـە باسـی مانـای (كَمَا كُتِبَ)دا دوو ڕای هێناوە: یەکەمیان: ئەم لێکچوواندنە لە حوکمی فەرزکردنی ڕۆژووەکەدایـە (کە بە گشتی پێویست بوو لەسەریان بەڕۆژوو بین) نەك لـە شـێوازەکەیدا، (سـعید بن جبیر) دەڵێت: لەسـەریان نووسـرابوو کـە نـان بخـۆن تـا دەخـەون، دوای ئـەوە بۆیان نەبوو بخۆن تا شەوی داهـاتوو، و حـەرامیش بـوو بۆیـان لـە شـەوی ڕۆژوودا بچنە لای خێزانەکانیان، کە ئەمە ڕوخسەتێکە خوای گەورە بۆ ئێمەی داناوە [أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ] (**البقرة:١٨٧**)، واتە: حەڵاڵە بۆ ئێوەی (ئوممەتی محمد) کە شەوانی ڕۆژوو بچنە لای خێزانـەکانتان، دووەمیـان: لێکچـوواندنەکە بـۆ ژمارەی ڕۆژەکانی ڕۆژووە: یان ئەوەتا ئێمەش و ئەوانیش مانگی ٣ ڕۆژمان لەسـەر فەرزبووە کە بەڕۆژوو بین، بەڵام بۆ ئێمە ئەوە هەڵوەشاوەتەوە بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کاتێك فەرزکرا، یان ئەوەیە کە لەسەر ئێمە و میللەتانی پێشووش هـەمان مانگی ڕەمەزان فەرزکراوە کە بەڕۆژوو بین، بـەڵام ئەوانـەی پێشـتر دەسـتکاری و گۆڕانکارییـان لـە کـات و نـاوەڕۆکی ڕۆژوودا کـردووە، خـاوەنی تەفسـیری (المنـار) دەڵێت: لەو (تەورات)ەی جوولەکەکان کـە ئێسـتا لەبەردەسـتدایە هیچـی تێدانییـە لەســـەر پێویســـتبوونی ڕۆژوو، تـــەنها مـــژدەی چـــاك دەدات بـــە ڕۆژووەوانـــان، و چەســـپیوە کـــە (موســـی) پێغەمبـــەر (علیـــە الســـلام) ٤٠ ڕۆژ بـــەڕۆژوو بـــووە، جوولەکـەکانی ئـەم سـەردەمەش هەفتەیـەك بـەڕۆژوو دەبـن وەك یادگارییـەك بـۆ ڕووخانی (ئۆرشەلیم) و داگیرکردنی، ١ ڕۆژی مانگی (ئاب)یش بەڕۆژوو دەبن.

هەروەها گاورەکانیش لە (ئینجیل)ەکانیاندا ووتەی تێدا نییـە لەسـەر پێویسـت بـوونی ڕۆژوو، تـەنها وەسـفی ڕۆژوو دەکـات و بـە عیبـادەت دایـدەنێت، گـرنگترین ڕۆژووشـیان ئـەو ڕۆژووەیـە کـە پـێش جـەژنی (الفصـح)یان دەیگـرن کـە (موسـی)

پێغەمبەر (علیە السلام) بەڕۆژوو دەبوو تێیدا، بەهەمان شێوە (عیسی) پێغەمبەریش (علیە السلام) خۆی و هاوەڵەکانی (الحواریون) تێیدا بەڕۆژوو دەبوون، پاشان بەرپرسان و سەرانی کڵێساکان شێوازی تریان لە ڕۆژوو داهێنا وەك: نەخواردنی گۆشت، یان نەخواردنی ماسی، یان نەخواردنی هێلکە و شیر، کە ڕۆژووی ڕاست و دروست و پێویست لەسەر پێشینەکانیان وەك ڕۆژووی جوولەکەکان وابووە، کە لە شەو و ڕۆژێکدا یەك جار خواردنیان دەخوارد، بەڵام ئەمان گۆڕییان و ئێستا لە نیوەی شەوەوە بەڕۆژوو دەبن بۆ نیوەڕۆ، (قاسیمی) لە تەفسیری (محاسن التأویل)دا دەڵێت: (هەر کاتێك ووشەی ڕۆژوو بەکار بهێنرێت لە هەموو شەریعەتێکدا مەبەست پێی وازهێنانە لە خواردن و خواردنەوە بە تەواوەتی هەموو ڕۆژەکە تا ئێوارە، نەك تەنیا گۆڕینی جۆرێك خواردن بە جۆرێکی تر).

لە مانای ووتەی پەروەردگار [لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ]دا چەندین ڕاڤە ووتراوە، گرنگترینیان ئەمانەیە: یەکەم: وەرگرتنی سیفەتی (تەقوا) یان پارێزکاریی بەهۆی ڕۆژووەوە، کە مرۆڤ دەپارێزێت لە کردن و کەوتنە ناو ئەو تاوانانەی کە خودا پێی ناخۆشە و بەهۆیەوە تووڕە دەبێت لە بەندەکانی، دووەم: بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژوو بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا پارێزەرێکە بۆ مرۆڤ لە کەوتنە تاوانەوە کە تووشی تووڕەیی و قینی پەروەردگاری دەکات، کە ئەم دوو مانایە زۆر نزیکن لە یەکەوە، سێیەم: ئەوەیە کە ڕۆژوو پارێزەرە بۆ مرۆڤ و دەیپارێزێت لە هەموو تێکچوون و نەخۆشی و مەترسییەك کە لەوانەیە تووشی ببێت لە لەش یان دەروونیدا.

سەبارەت بە مانای یەکەم: (الرازي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ڕۆژوو مرۆڤ فێری تەقوا دەکات، لەبەرئەوەی شکاندنی هەوا و ئارەزووەکانی تێدایە، مرۆڤ دەگێڕێتەوە لە تاوان و خراپەکاریی، خۆشیەکانی دونیا و دەسەڵات بچووك و کەم

دەكاتەوە چونكە ئارەزووەكانی سك و عەورەت دەشكێنێت، هەر كەسێك زۆرتر بەرۆژوو ببێت ئەم دوو شتەی زیاتر لەلا سووك دەبێت، كە ئەمە دەبێتە هۆی بەربەستێك و دەیگێڕێتەوە لە تاوان و حەرام كراوەكان، ئەمانە هەمووی پێكەوە هۆكاری تەقوا و خۆپارێزین).هەریەك لە (الزمخشري) لە (الكشاف)، و (قاسیمی) لە (محاسن التأویل)دا، و (إبن الجوزي) بەشێوەیەكی نزیك لەم ووتانە راڤەیان كردووە، هەروها (الشوكاني) لە (فتح القدیر)دا هەمان تەفسیری كردووە.

(محمد رشید رضا) لە تەفسیری (المنار)دا دەڵێت: (ئەم ووتەیە (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) روونكردنەوەی مەبەستی فەرز ردنی رۆژوو و سوودە گەورەكەی و حیكمەتە بەرزەكەیەتی، بەوەی كە دەروونی مرۆڤی رۆژووەوان ئامادە دەكات بۆ تەقوای خودا بە وازهێنان لە ئارەزووە سروشتیە حەڵاڵەكانی بەردەست، تەنها بەمەبەستی جێبەجێ كردنی فەرمانی پەروەردگار و دەستكەوتنی پاداشت، لێرەوە توانای مرۆڤ بۆ دووركەوتنەوە لە ئارەزووە حەرامەكان و ئارام گرتن لەسەریان بەهێزتر دەبێت، هەروەها توانای مرۆڤیش بەهێزدەكات لە هەستان بە تاعەتەكان و خێرەكان و ئارام گرتن و بەردەوام بوون لەسەریان).

هەربۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: «الصِّیام نِصْفُ الصَّبْر» (حدیث صحیح رواه ابن ماجة)، واتە: رۆژوو نیوەی سەبر و ئارامگرتنە.

(لَعَلَّ) لێرەدا بۆ ئومێد خواستنە (الترجي)، كەواتە رۆژووی ئیسلامی بۆ ئەشكەنجەدانی مرۆڤ نییە بەڵكو بۆ پەروەردەكردن و پاككردنەوەی دەروونێتی، خوای گەورە هیچ پێویستیەكی بە رۆژووی ئێمە نییە و دەوڵەمەندە لەم كارەی ئێمە و تەنها بۆ سوود و قازانجی ئێمە لەسەری داناوین، (القرطبي)یش لە تەفسیرەكەیدا ووتەی زانایانی كورت كردووەتەوە لە مانای (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) و دەڵێت: (ووتراوە بە مانای لاوازكردن دێت، چونكە هەر كاتێك ئارەزووەكان لاوازبوو تاوانەكانیش كەم دەبێتەوە، هەروەها ووتراوە مانای: وازهێنان و

دووركەوتنـەوە لـە تـاوان دەگەيـەنێت، و ووتراويشـە كـە مانـاى فراوانـى (تـەقوا) دەگرێتەوە و هۆكارێكى خۆپارێزييە لەبەر ئەوەى ئارەزووەكان دەمرێنێت).

لە ماناى سێيەمدا: كـە بريتييـە لـە پاراسـتنى مـرۆڤ لـە نەخۆشـيە دەروونـى و جەسەييەكان، (محمد رشيد رضا) دەڵێت: (لـە سـوودە تەندروسـتيەكانى ڕۆژوو ئەوەيە كە ماددە كەڵەكەبووەكان لە لەشدا لـەناو دەبات، بـە تايبـەتى لـە لەشـى موسريفە زۆرخۆرە كەم ئيشكەرەكاندا، هەروەها تەڕيبە زيانبەخشـەكانيش ووشـك دەكاتــەوە، و ريخۆڵــەكان لــە ژەهرەكــانى قەڵــەوى پــاك دەكاتــەوە، چــەورى دەتوێنێتـەوە يـان نايـەڵێت لـە لەشـدا زۆر ببێـت —كـە زۆر مەترسـيدارن بـۆ دڵ—، پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرموێت: [صُوموا تَصِحُّوا]*، (واتـە: بـەڕۆژوو بـبن بـۆ ئـەوەى هەميشە تەندروست و لەشساغ بن)، هەندێك لە پزيشكەكانى ڕۆژئاوا دەڵێن: ڕۆژوو بوونى مانگێك لە هەموو ساڵێكدا پاشـەڕۆ و پاشمـاوە مـردووە كەڵەكـە بووەكـانى لەش بۆ ماوەى يەك ساڵ لەناو دەبات).

يەكێك لە نووسەرانى سەردەم بەناوى (عبدالرحمن حسـن حبنكـة الميـداني) لـە كتێبى (الصيام ورمضان في السنة والقرآن) لە ماناى (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)دا دەڵێـت: واتـە ڕۆژوو بۆ پاراستنى لەشتان و نەفسـتانە بـەهۆى ئـەم خۆپارێزييـەى كـە دەيكـەن، كەواتە مەبەست پاراستنى نەفسە لـە هـەموو شـتێك كـە زەرەرى پێبگەيـەنێت لـە دونيـادا و لـە سـزاى خـودا لـە دوارۆژدا، ئـەو كەسـەى فـەرزى ڕۆژوو بـە شـێوە ڕاستەكەى جێبەجێ بكـات ئومێد وايـە لـە دونيـادا لـە زەرەر و زيـان بيپارێزێـت و هۆكارى لەشساغى بێت بۆى، ئەويش بەهۆى سـوننەتى خـودايى لـە هۆكارەكانـدا، هەروەها ئومێد وايە لە دوارۆژيشدا لە سزاى سەرپێچى كردن بيپارێزێت.

سـەبارەت بـە ووتـەى خـودايى ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾ چـەند رايـەك هەيـە كـە ڕاسترينيان ئەوەيـە كـە مەبەسـت پێـى ڕۆژەكـانى مـانگى ڕەمەزانـە، كـە ووتـەى

---

* (إبن السني) و (أبو نعيم) و (الطبراني) گێڕاويانەتەوە كە فەرموودەيەكى (حسن)ە.

زوربەی موفەسیرەکانە، (الفخر الرازي) دەڵێت: لێرەدا خوای گەورە منەت بەسەر ئیماندارانەوە دەکات کە وەك بفەرموێت من رۆژووی هەموو رۆژەکان یان زوربەی رۆژەکانی ساڵم لەسەر پێویست نەکردوون کە لە توانامدا هەبوو لەسەرتانی دانێم، بەڵام من رەحمم پێکردن و کارەکەم سووک کردووە لەسەرتان -نەك تەنها ئێوە بەڵکو میللەتانی پێش ئێوەش- کە چەند رۆژێکم لەساڵدا بۆ دیاری کردن کە تێیدا بەرۆژوو بن.

خوای گەورە رۆژووی رەمەزانی لەسەر لەشساغ و نەخۆشیش فەرز کردووە، ئەو نەخۆشەی کە لە ئایەتەکەدا روخسەتی پێدراوە رۆژووەکەی بشکێنێت (وەك زوربەی تەفسیرزانان و زانایان و فوقەها دەڵێن) ئەوەیە کە ئەگەر نەخۆشەکە بەرۆژوو ببێت لەوانەیە ببێتە هۆی زەرەرێکی بەرچاو بۆ نەخۆشەکە یان نەخۆشیەکەی لەسەر قورس ببێت، چونکە زۆر نەخۆشی هەیە کە رۆژووبوون بۆی بەسوودە و تەنانەت دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی خاوەنەکەی، کەواتە مەرجی رۆژوو نەگرتن بۆ نەخۆش ئەوەیە لەسەرەوە باسمانکرد، لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە هەموو تەشریعەکانی ئیسلام بە گشتی و رۆژوو بە تایبەتی ئاسانن و لە توانای هەموو کەسێکدا هەیە و هیچ جۆرە زەرەرێك بە لەش ناگەیەنن، هەر کاتێکیش نارەحەتی هەبوو خوای گەورە روخسەتی داناوە بۆ ئەوەی ئەم کارئاسانیە بەردەوام بێت، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: [بُعِثْتُ بِالحَنِيفِيَّة السَّمْحة] (**رواه أحمد**)، واتە: من نێردراوم بەو ئاینەی کە هیچ جۆرە نارەحەتی و بارگرانیەکی تێدانییە، هەروەها خوای گەورەش لە دینەکەماندا قورسی و نەتوانایی لەسەر دانەناوین [وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ] (**الحج:٧٨**)، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: [إِنَّ خَيْرَ دِينِكُم أَيْسَرَه، إِنَّ خَيْرَ دِينِكُم أَيْسَرَه] (**رواه أحمد**)، واتە: باشترین دینی ئێوە ئاسانترینەکەیەتی، باشترین دینی ئێوە ئاسانترینەکەیەتی.

## ئاماژە زانستییەکان لە ووتەی راڤەکارانی فەرموودەدا:

### ١- ووتەی پێغەمبەر (ﷺ): [الصِّيام جُنَّة]:

ئیمامی (النسائي) لە کتێبی فەرموودەکەیدا زیادەیەکی بۆ ئەم فەرموودەیە هێناوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: [الصِّيام جُنَّة مِنَ النّار] (**صححه الألباني في صحيح الجامع**)، واتە: رۆژوو پارێزەرە لە دۆزەخ، ئیمامی (ئەحمەد)یش فەرموودەیەکی تری هێناوە لە (أبی هريرة)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: [الصِّيام جُنَّة وَحِصنٌ حَصينٌ مِنَ النّار] (**صححه الألباني في صحيح الجامع**)، واتە: رۆژوو پارێزەر و قەڵایەکی تۆکمەیە لە دۆزەخ، ئیمامی (إبن حجر) لە (فتح الباري)دا لە شەرحی (جُنَّة)ی فەرموودەکاندا دەڵێت: (الجُنَّة: الوِقايَة وَالسَّتر)، واتە: بە مانای پارێزەر و داپۆشەر دێت، لە دۆزەخ (وەك پێشتر ووتمان)، یان ووتوویانە پارێزەرە لە ئارەزووەکان، ئیمامی (نەوەوی)یش دەڵێت: (داپۆشەرە، واتە تاوانی مرۆڤ دادەپۆشێت و هەروەها مرۆڤیش لە دۆزەخ دادەپۆشێت).

٢- ووتەی پێغەمبەر: ﴿يا مَعْشَرِ الشَّباب! مَن استطاعَ مِنكم الباءَة فَلْيَتَزَوَّج، وَمَن لَم يَسْتَطِع فَعَلَيه بِالصَّوم فَإنَّه لَه وِجاء﴾: (إبن حجر) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ووتەکەی تایبەت کردووە بە گەنجانەوە، چونکە ئەمان چالاکترن لەرووی زاووزێوە، (الباءَة) بە مانای توانای ماددی جەستەیی بۆ ژنهێنان، واتە ماناکەی بریتییە لە: ئەوەتان توانای ماددی و جەستەیی و کەل وپەلی هەیە بۆ ژنهێنان با ژن بهێنێت، ئەوەشی ناتوانێت با بەرۆژوو بێت بۆ ئەوەی ئاگری ئارەزووەکانی دابمرکێنێتەوە، ووتەی (فَعَلَيه بِالصَّوم) بە مانای بەردەوام بوون و زۆر رۆژووگرتن دێت، کە ئەمە رای زانایانە کە هەر کەسێك توانای ژنهێنانی هەبێت واجبە لەسەری ژن بێنێت، ئەوەشی ناتوانێت دەبێت بە بەردەوامی بەرۆژوو بێت.

هەروەها (إبن حجر) ئاماژەیداوە بە پەیوەندی نێوان برسێتی و دامرکاندنەوەی ئارەزووەکاندا وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە، هەروەها دەڵێت: ئارەزووی حەزکردن لە ئافرەت بەستراوەتەوە بە خواردنەوە، کاتێك ئەم بەهێز بێت ئەویش بەهێز دەبێت و هەر کاتێکیش ئەم لاواز بێت ئەویش لاواز دەبێت، ووتەی پێغەمبەریش (فَإِنَّه لَه وِجاء): بەکارهێنانی ووشەی (وِجاء) لێکچوواندنێکە مەبەست پێی ئەوەیە بەردەوام بوون لەسەر رۆژوو دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی ئارەزووەکان و لاواز کردنی.

**سەرچاوە**: کتێبی: رۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە – نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون – چاپی یەکەم– ٢٠٠٨.

# هەندێك لە سوننەتەكانی ڕۆژووگرتن و لێكدانەوەیان لەڕووی زانستییەوە

## پارشێوكردن:

یەكێكە لە كردارە گرنگەكان كە ووزەیەكی زۆر باش دەدات بەكەسی ڕۆژووەوان بەتایبەتی لە سەرەتای ڕۆژی ڕۆژوودا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (تسحّروا فإن في السحور بركة) (**متفق عليه**)، واتە: پارشێوبكەن چونكە بەرەكەتی تێدایە، هەروەها زۆر جار هاوەڵەكانی بانگدەكرد بۆ خواردنی پارشێو و دەیفەرموو: (هلمّ إلى الغداء المبارك) (**رواه أبو داود والنسائي**)، واتە: وەرن بۆ خواردنە بەبەرەكەتەكە.

باشترە خواردنی پارشێو سووك بێت وەك میوە یان شیرینی لەگەڵ بڕێكی باش ئاو و شلەمەنی، ئەمەش بۆ ڕێگرتن لە تێكچوون و قورسبوونی گەدە لەڕۆژدا بەتایبەتی كە زوربەی خەڵكی دوای پارشێو دەخەونەوە، سوننەتی پێغەمبەریش بەم شێوەیە بووە كە دەفەرموێت: (نعم سحور المؤمن التمر) (**رواه أبو داود**)، واتە: باشترین پارشێوی ئیماندار خورمایە، یان دەفەرموێت: (السَّحور بركة فلا تدعوه ولو أن يجرع أحدكم ماء) (**رواه أحمد وابن حبان**)، واتە: پارشێوكردن بەرەكەتە بۆیە وازی لێمەهێنن، ئەگەر تەنها بەخواردنەوەی چەند قومێك ئاویش بێت.

## دواخستنی خواردنی پارشێو و زوو شكاندنی ڕۆژوو:

لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا (ﷺ) ئامۆژگاری موسوڵمانان بەوە كراوە كە نان خواردنی پارشێو دوابخرێت بۆ كۆتایی شەو، واتە پێش نوێژی بەیانی مرۆڤ نانی پارشێو بخوات، هەروەها ئامۆژگاری موسوڵمانانی بەوەش كردووە كە ڕۆژوو شكاندن لە ئێوارەدا بە زوویی بكەن، واتە یەكسەر دوای بانگی ئێوارە ڕۆژوو بشكێنرێت و دوا نەخرێت بۆ دوای نوێژ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ثلاث من

أخلاق النبوة: تعجيل الإفطار ، وتأخير السحور، ووضع اليمين على الشمال في الصلاة) (**رواه الطبراني**)، واته: ٣ شت له رەوشتی پێغەمبەرانە: پێشخستنی بەربانگ، دواخستنی پارشێو، و دەستی راست بخرێتەسەر دەستی چەپ لەنوێژدا، هاوەڵانی پێغەمبەریش هەمان رەووشتیان هەبووە، ئەوەتا ئیمامی (بەیهەقی) لە سونەنەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زووترین کەس بوون لە رۆژوو شکاندن و درەنگترین کەس لە پارشێو کردندا.

سەبارەت بە حیکمەتی ئەم کردارەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەم ئامۆژگارییە وادەکات کاتی رۆژوو کورت بکرێتەوە بۆ کەمترین ماوەی توانراو، خواردنی پارشێو ٤-٦سەعاتی دەوێت بۆ ئەوەی بە تەواوەتی هەرس بکرێت و بمژرێت و لەش سوودی لێوەرگرێت، دوای ئەمە لەش پشت دەبەستێت بە خۆراکە هەڵگیراوەکانی بۆ دەستخستنی ووزە وەك گلایکۆجین و چەوری هەڵگیراو کە زۆر بەسوودە بۆ لەش و رزگاری دەکات لێیان، ئەو ماوەیەی دەمێنێتەوە بۆ ئەم کردارە ئەوەندە زۆر نییە کە زەرەر بدات لە لەش و ماددە کیتۆنیەکان دەست بکەن بە کەڵەکە بوون لە ئەنجامی سەرفکردنی زۆری چەورییەکانی لەشدا.

## بۆچی مرۆڤ بە خورما رۆژوو بشکێنێت؟

لە کۆتایی رۆژی رۆژوودا رێژەی گلوکۆز لە خوێندا تەواو دادەبەزێت، ئەم بارە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی وەرگرتنی گلوکۆز لەلایەن شانە ماسولکەیی ودەمارییەکان، لێرەدا زوربەی گلایکۆجینی جگەر شیبووەتەوە، کە ئیتر لێرەوە شانەکان بۆ دەستخستنی ووزە پشت بە ئۆکساندنی ترشە چەورییەکان دەبەستن، یان لە ئۆکساندنی گلوکۆزی دروستکراو لە جگەردا لە ترشە ئەمینیەکان و گلیسرۆڵەوە، لەم حاڵەتەدا پێدانی گلوکۆز بە شێوەیکی خێرا بە لەش سوودی گەورەی هەیە، چونکە رێژەکەی لە خوێندا بە خێرایی بەرز دەبێتەوە پاش ئەوەی لە ریخۆڵەکانەوە دەمژرێت، سەرەتا دەچێتە ناو خانەکانی جگەرەوە پاشان بۆ

خانەکانی مێشك دەچێت و دوایی بۆ هەموو شانەکانی تر، لێرەوە ئۆکساندنی زیادی ترشە چەورییەکان دەوەستێت وریدەگیرێت لە دروستبوونی تەنە کیتۆنیە زەرەرمەندەکان، بەهۆیەوە نیشانەکانی هیلاکی و لاوازیی گشتی و سەرئێشە لادەچێت کە بەهۆی ئۆکساندنی ڕێژەیەکی زۆر لە چەوریەکانەوە دروستدەبێت.

خورما بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین خۆراکەکان دادەنرێت بە گلوکۆز، هەربۆیە باشترین خۆراکە کە لەکاتی بەربانگدا بخورێت، ڕێژەی شەکری تێیدا دەگاتە نێوان (٧٥-٨٧٪)، ڕێژەیەکیشی تێدایە لە: پرۆتینەکان، و چەورییەکان، و هەندێك ڤیتامین کە گرنگترینیان (A,B2,B12)ن، و کانزای وەك: (کالیسیۆم، فۆسفۆر، پۆتاسیۆم، گۆگرد، صۆدیۆم، مەگنیسیۆم، کۆباڵت، زینك، فلۆرین، مس، و مەنگەنین)، و ڕێژەیەك لە سلیلۆز، ئەو ڤیتامینانەی لە خورمادان ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە کردارەکانی نواندنی خۆراکدا، وکاریگەریی هێمنکەرەوەیان هەیە بۆ دەمارەکان.

ئەگەر مرۆڤ ڕۆژوو بە ماددەی پرۆتینی یان چەوری بشکێنێت، ئەمانە دوای ماوەیەکی زۆر لە هەرس کردن و شیکردنەوەیان دەمژرێن، و ئەو مەبەستە ناپێکن لە دابین کردنی پێویستی بە پەلەی لەش بۆ ووزە، لێرەوە حیکمەتی فەرمانی پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ دەردەکەوێت لە ئامۆژگاری کردنی موسوڵمانان بەوەی کە بە خورما ڕۆژوویان بشکێنن، وەك لەم فەرموودانەدا:

- [إذا أَفْطَرَ أَحَدُكُم فَلْيُفْطِر على تَمر، فَإن لَم يَجِد فَلْيُفْطِر على ماء فَإنَّهُ طَهُور] (**رواه أبوداود وابن ماجة والترمذي وقال: حديث حسن صحيح**)، واتە: هەریەکێکتان ئەگەر وویستی ڕۆژوو بشکێنێت با بە خورما بیشکێنێت، ئەگەر خورمای دەست نەکەوت با بە ئاو بیشکێنێت لەبەرئەوەی ئاو پاك و پاککەرەوەیە.

- [كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُفطِرُ قَبْلَ أَن يُصَلِّيَ عَلَى رُطَبات، فَإن لَم تَكُنْ رُطَبات فتُمَيرات، فَإن لَم تَكُن تُمَيرات حَسا حَسَوات مِنَ الماء] (**رواه أبوداود والترمذي وقال:**

**حدیث حسن**)، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی نوێژی ئێوارە بکات ڕۆژووی دەشکاند بە چەند دەنکێك خورمای شل، ئەگەر دەستی نەکەوتایە ئەوا بە خورمای ئاسایی یان ووشك دەیشکاند، ئەگەر ئەویشی دەست نەکەوتایە ئەوا تەنها بە چەند قومێك ئاو ڕۆژووەکەی دەشکاند.

## ئایا لە ڕۆژوودا جوولە باشترە یان حەوانە و ئیسراحەت؟

زۆرێك لە سەرچاوە پزیشکیەکان باسی ئەوە دەکەن کە جوولەی ماسولکەکان لە کاتی دوای هەلمژینی خۆراکدا (واتە لە کاتی ڕۆژووگرتندا) دەبێتە هۆی ئۆکساندنی کۆمەڵێکی تایبەت لە ترشە ئەمینیەکان کە خاوەنی زنجیرەی لقدارن وەك: (لیوسین و ئایزۆلیوسین و ڤالین)، ئەم ترشانە بە شێوەیەکی سەرەکی لە ماسولکەکاندا دەئۆکسێنرێن، ئەو ئەنزیمە تایبەتەی کە کۆمەڵە ئەمینیەکان دەگۆڕێت (یان ئەنزیمی Amino Transferase) بە ڕێژەیەکی زۆر لە مایتۆکۆندریا و سایتۆسۆڵ (Cytosol)ی خانە ماسولکەییەکاندا هەیە، دوای ئەوەی کە خانە ماسولکەییەکان ووزەی خۆیان دەست دەکەوێت لەم کرداری ئۆکساندنەوە، لەناو ئەم خانانەدا دوو ترشی ئەمینی زۆر گرنگ دروستدەبن کە هەردوو ترشی (ئەلانین و گلووتامین)ن، یەکەمیان سووتەمەنی سەرەکی دروستکردنی گلوکۆزی نوێیە لە جگەردا و دووەمیان بەشداری دەکات لە دروست کردنی ترشە ناوکیەکاندا و بەشێکی تریشی دەگۆڕێت بۆ ترشی (ئەلانین).

لەکاتی جوولە و چالاکیدا هەردوو ترشی (پایرۆڤەیت و لاکتەیت) دروست دەبن، ئەویش لە ئۆکساندنی گلوکۆز لە خانە ماسولکەییەکاندا، کە ئەم دووانەش بە سووتەمەنی سەرەکی دادەنرێت بۆ دروستکردنی گلوکۆزی نوێ لە جگەردا، ئەم کرداری ئۆکساندنە بە جوولە زیاد دەکات، هەربۆیە کرداری دروستکردنی گلوکۆزی نوێ لە جگەردا بەهۆی زیادبوونی جوولەی ماسولکەکانەوە زیاد دەکات، کە لەوانەیە بگاتە سێ ئەوەندەی حاڵەتی ئیسراحەت و حەوانەوە.

ترشی (ئەلانین) بە یەکێك لە گرنگترین ترشە ئەمینیە دروستبووەکان دادەنرێت لە ماسولکەکاندا لەکاتی رۆژوودا، کە رێژەکەی دەگاتە (٣٠٪)ی هەموو ترشە ئەمینیە دروستبووەکان، ئەم رێژەیە بەجوولە و چالاکی زیاد دەکات، کە لە ئۆکساندنی ترشە ئەمینیەکانی تر و پایرووڤەیتەوە دروست دەبێت، هەروەها خۆیشی (ترشی ئەلانین) دەگۆڕێتەوە بۆ (پایرووڤەیت)، ئەویش لە سووڕی دروست کردنی گلوکۆز لە جگەردا و هەروەها لە ئۆکساندنی لە ماسولکەکاندا.

کۆئەندامی ماسولکە ئەو گلوکۆزەی کە لە جگەرەوە دێت بەکاردەهێنێت بۆ دروست کردنی ووزە، ئەگەر بێتو جوولە زیاد بکات و ئەو گلوکۆزەی کە دێت بەشی پێویستی ماسولکەکان لە ووزە نەکات، ئەوا ماسولکەکان پێویستی خۆیان لە ووزە لە ئۆکساندنی ترشە چەوریەکانەوە دەست دەخەن کە لە شیبوونەوەی شانە چەوریەکانەوە دەچنە سووڕی خوێنەوە، هەر کاتێکیش کە ترشە چەوریەکان رێژەیان کەم بکات ئەوا ماسولکەکان ووزە لەو تەنە کیتۆنیانەوە وەردەگرن کە لە ئەنجامی ئۆکساندنی چەوریەکان لە جگەردا دروستدەبن.

ئەم کردارە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە جوولە و چالاکی لە کاتی رۆژوودا دەبێتە هۆی چالاك کردنی هەموو کردارەکانی ئۆکساندنی ئەو ماددانەی کە ووزە دەبەخشن بەلەش، و هەروەها کردری شیبوونەوەی چەوریەکان، و کرداری دروست کردنی گلوکۆزی نوێ لە جگەردا لەو گلیسرۆلەی لە شیبوونەوەی چەوریەکانەوە پەیدا دەبێت، و هەروەها لەو (لاکتەیت)ەی کە لە ئۆکساندنی گلوکۆز لە ماسولکەکانەوە پەیدا دەبێت، ئەم هەموو کردارانە چالاك دەکات.

کەواتە جوولە و چالاکی لە کاتی رۆژووی ئیسلامیدا کارێکی ئیجابی و زۆر سوودبەخشە چونکە دەبێتە هۆی زیادکردنی توانای کارکردنی جگەر و ماسولکەکان و لەش رزگار دەکات لە چەوریەکان و دەیپارێزێت لە مەترسی زیادبوونی تەنە کیتۆنیەکان لە خوێندا.

هەروەها جوولەی ماسولکەکان کرداری دروست کردنی پرۆتین لە جگەر و ماسولکەکاندا لاواز و خاو دەکاتەوە، کە پلەی ئەم لاوازکردنە راستەوانە دەگونجێت لەگەڵ رادەی جوولە و ماوەکەیدا، ئەمە دەبێتە هۆی هێشتنەوە و کۆکردنەوەی ووزەیەکی زۆر کە لە دروست کردنی پرۆتیندا بەکاردێت، چونکە هەر بۆندێکی ترشە ئەمینیەکان پێویستی بە ووزەی هەلگیراوی ناو پێنج گەردی ئەدینۆسین و گوانینی سێ فۆسفاتی (ATP & GTP) هەیە.

ئەگەر بزانین هەر گەردێکی هەریەکێك لەم دوو پێکهاتە گرنگانە (واتە ATP & GTP) بڕی ووزەی هەلگیراو تێیدا لە نێوان (٥–١٠) کیلۆ کالۆریدایە، هەروەها ئەگەر بزانین کە سادەترین جۆری پرۆتین لە (١٠٠) ترشی ئەمینی کەمتر پێکنایەت، ئەوا لێرەوە ئەو بڕە ووزە ئێجگار زۆرەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە دروستکردنی پرۆتینە جۆراوجۆرەکاندا بەکاردێت، کە ئەگەر بێتو ئەم کردارە لاواز بکرێت ئەوا بڕێکی ئێجگار زۆر لە ووزە دەپارێزێن لە فەوتان.

هەروەها لە کاتی جوولەدا گلوکۆز و ترشە چەوریەکان و ترشە ئەمینیەکان بەکاردێن بۆ دروست کردنی ووزە بۆ خانە ماسولکەییەکان، ئەم کردارە دەبێتە هۆی ئاگادارکردنەوەی سەنتەری خواردن لە ناوچەی (Hypothalamus) لە مێشکدا، ئەگەر بزانین پەیوەندیەکی پێچەوانە (Feed back Mechanism) هەیە لە نێوان رێژەی ئەم ماددانە لە خوێندا و رادەی تێریی و ئاگادارکردنەوەی سەنتەری خواردن لە مێشکدا، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە جوولە و چالاکی چەند گرنگە لە ئاگادار کردنەوەی سەنتەری خواردن لە مێشکدا و لە زیادکردن و کرنەوەی ئارەزووی خۆراك لەلای مرۆڤ.

جوولە و چالاکی ماسولکەیی زیادە دەبێتە هۆی شیبوونەوەی گلایکۆجین بۆ گلوکۆز لە کاتی نەبوونی ئۆکسجیندا، هەروەها لە ئەنجامی کرداری نواندنی خۆراکیی ئەو شەکرەی دروست بووە لە ترشی لاکتیکەوە کە پاشان دەنێردرێت بۆ

خوێن و دوایی لە جگەردا دەگۆڕێت بۆ گلوکۆز و گلایکۆجین، بەڵام بابزانین کە لە ماسولکەکاندا گلایکۆجین شینابێتەوە بۆ گلوکۆز لە باری ئیسراحەت و نەجووڵاندا (وەك ئەوەی لە جگەردا ڕوودەدات)، ئەویش لەبەر نەبوونی ئەنزیمی گلوکۆزی شەش فۆسفاتی **(Glucose-6-Phosphate)** یان **(G6PD)**، کەواتە جووڵەی ماسولکەکان فاکتەرێکی گرنگە بۆ چالاککردنی شیبوونەوەی گلایکۆجینی هەڵگیراو لە ماسولکەکاندا بۆ گلوکۆز و پاشان پێشکەشکردنی بۆ ئەو شانانەی کە پشتی پێدەبەستن بۆ دەستخستنی ووزە، وەك: (مێشك و کۆئەندامی دەمار، خڕۆکەکانی خوێن، مۆخی ئێسقان و ناواخنی گورچیلەکان).

هەروەها جووڵەی ماسولکەیی بینراوە کە پەیوەندی هەیە بە تازەبوونەی خانەکانی ناوپۆشی ریخۆڵەکان، لێرەوە هەرس کردن و هەڵمژینی ماددە خۆراکیەکان باشتردەبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم خانانە پێویستییان بە ترشی (گلووتامین) هەیە بۆکرداری دروستکردنی ترشە ناوکیەکان (Nucleotide Synthesis)، کە ئەم ترشە (گلووتامین) لە ماسولکەکانەوە بە ڕێژەیەکی زۆر دروستدەکرێت لە کاتی جووڵە وچالاکیدا، خانەکانی ناوپۆشی ریخۆڵەکان (Mucosal Cells) هەموو (٢-٦) ڕۆژ جارێك نوێ دەبنەوە، کە ڕۆژانە (١٧ملیار) خانە لەدەست دەدەن، کەواتە لێرەوە دەپرسین: ئایا جووڵەی ماسولکەیی وەك چارەسەرێکی باش بەکارنایەت بۆ تێکچوونەکانی کۆئەندامی هەرس و خراپ هەڵمژینی خۆراکەکان؟!

بناغەی ڕۆژووی ئیسلامی لەسەر وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە دامەزراوە، هاندانی میکانیزمەکانی تێکشکاندن کردارێکی سەرەکییە لە کرداری نواندنی خۆراکدا، لەکاتی ڕۆژیشدایە کە کردارەکانی نواندنی خۆراك (بە تایبەتی تێکشکاندن) زیاددەکات، ئەویش لەبەرئەوەیە کە کاتی جووڵە و بەکارهێنانی ووزە هەڵگیراوەکانە لە ئیش وکارەکانی ڕۆژانەدا.

خوای پەروەردگار کاتژمێرێکی بایۆلۆجی بۆ لەشی مرۆڤ داناوە کە کاری هۆرمۆنەکانی کوێرە رژێنەکان رێك دەخات، لەگەڵ زۆرێك لە میکانیزمەکانی نواندنی خۆراکیش بەشێوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ چالاکیەکانی ئەم کردارانە لەکاتی رۆژوودا، لێرەدا با هەردوو هۆرمۆنی (کۆرتیزۆڵ و ئەدرینالین) بە نموونە بهێنینەوە، یەکەمیان لە بەرزترین رێژەیدا دەبێت بە نزیکەیی لە کاتژمێر ٩ی سەرلەبەیانیدا (لەو کەسانەدا کە بە شەو دەخەون).

کە ئەم رێژەیە وردە وردە کەمدەکات تا دەگاتە پێنج یەکی رێژەکەی لە کاتی نیوە شەودا، ئەم هۆرمۆنە یەکێکە لە هۆرمۆنەکانی تێکشکاندن، کە هەڵدەستێت بە تێکشکاندنی پرۆتینەکان بۆ ترشە ئەمینیەکان.

هۆرمۆنی دووەم (ئەدرینالین) دەگاتە بەرزترین رێژەی لە هەردوو کاتی کۆتایی بەیانی و نیوەڕۆدا (واتە بە نزیکەیی لە کاتژمێر ٩ی بەیانی و ٢ی نیوەڕۆدا)، ئەم هۆرمۆنە هەڵدەستێت بە بەرزکردنەوەی رێژەی گلوکۆز و ترشە چەوریەکان، و رێژەی تێکشکاندنیان زیاد دەکات، هەروەها یارمەتی خاوکردنەوەی دروستبوونی پرۆتینەکان دەدات و ئۆکساندنی ترشە ئەمینیەکان لە ماسولکەکاندا زیاد دەکات، هەروەها ترشی (ئەلانین) دەجوڵێنێت بەرەو جگەر بۆ ئەوەی گلوکۆزی نوێی لێوە دروست بکرێت، ئەویش بە مەبەستی پێشکەش کردنی ووزەی زیاتر بۆ لەش، هەروەها کۆئەندامی دەماریش ئاگادار دەکاتەوە لەم حاڵەتە.

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە لەوانەیە ئەم حاڵەتە یەکێك بێت لە نهێنیەکان و حیکمەتەکانی دانانی رۆژووی ئیسلامی لە رۆژدا (کە کاتی جوولە و چالاکی و گەڕانە بەسەر زەویدا)، و دانەنانی لە کاتی شەودا کە کاتی ئیسراحەت و ئارامیە، لەبەرئەمە دەتوانین بڵێین کە جووڵە و چالاکی لە کاتی رۆژووی ئیسلامیدا دەبێتە هۆی پێدانی گلوکۆزی پێویست (کە هەڵگیراوە یان دروستدەکرێت لە جگەردا) بۆ بەکارهێنانی بۆ دەرپەڕاندنی ووزە، و سووتەمەنییەکی نموونەییە بۆ ئەوەی ووزە

بدات بە مێشك و خڕۆکە سوورەکانی خوێن و مۆخی ئێسقان و کۆئەندامی دەمار و زۆر ئەندامی تریش.

ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم شانانە گورج و گۆڵتر و چالاکتربن بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانیان، لە لایەکی ترەوە جووڵە سوودی تری هەیە بۆ زیندە چالاکیەکانی لەش چونکە دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی دروستکردنی پرۆتین لە ترشە ئەمینیەکانەوە و چالاکی میکانیزمەکانی تێکشکاندنیش لە کاتی رۆژوودا زیاد دەکات، کە دەبێتە هۆی سەرف کردنی ووزە هەڵگیراوەکان لە لەشدا و عەمبارەکانی لەش لە ژەهرەکان پاك دەکاتەوە کە لەوانەیە لەناو چەوریەکانی لەشدا هەڵگیرابن و توابنەوە تێیدا، کەواتە بابزانین کە تەممەڵی و خەوتن لە کاتی رۆژدا دەبێتە هۆی لەکارخستنی هەموو ئەم سوودانە و لەوانەیە ئەو کەسە تووشی چەندین نارەحەتی و تێکچوون بکات و کەسەکە خاوتر و تەممەڵتر دەکات.

هەروەها نووستن لە کاتی رۆژدا و نەخەوتن و هەستان بەدرێژایی شەو لە کاتی رەمەزاندا دەبێتە هۆی تێکچوونی کاری کاتژمێری بایۆلۆجی لە لەشی مرۆڤدا، کە کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر زیندە چالاکیەکان و کرداری نواندنی خۆراك لەناو خانەکانی لەشدا، لەم بوارەدا توێژینەوەیەك ئەنجامدرا کە ئەو تێکچوونەی دەرخست کە بەسەر هۆرمۆنی (کۆرتیزۆڵ)دا دێت، ئەم توێژینەوەیە (د.محمد الحضرامي) لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (شا عبدالعزیز) لە ووڵاتی (سعودیە) پێی هەستا، کە لەسەر (١٠) کەسی تەندروست ئەنجامدرا لە دەرەوەی نەخۆشخانە، ئەنجامەکەی دەریخست کە چوار لەم کەسانە تێکچوون تێیاندا روویدا لە سووڕی رۆژانەی (کۆرتیزۆڵ)دا، ئەمەش لە کاتی ٢ هەفتەی کۆتایی مانگی رەمەزاندا، لەگەڵ هەڵگەڕانەوەی رێژە ئاساییەکان لەکاتی بەیانی و نیوە شەودا، بینرا کە رێژەی بەیانی دابەزیوە و رێژەی ئێواران بەرز بووەتەوە کە ئەمە بە پێچەوانەی حاڵەتی ئاسایی رۆژانەیە.

توێژەرەوەکـە ئـەم تێکچـوونەی گێڕایـەوە بـۆ گـۆڕانی چـالاکی و خووەکـانی جووڵان لەلای ئەو ڕۆژووگرانەی کە بـە ڕۆژ دەخـەون و شـەو هـەمووی بـە خەبـەر دەبن، لەدواییدا بینییان کە (کۆرتیزۆڵ) گەڕایەوە بۆ حاڵەتی ئاسایی خـۆی پـاش (٤ هەفتـە) لـە تـەواو بـوونی مـانگی ڕەمـەزانی پـیرۆز، ئـەویش دوای ئـەوەی کـە سیستمی نوستن لە شەودا و چالاکی لە ڕۆژدا لەو کەسانەدا چەسپایەوە.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کـە بـە بەڵگـەی زانسـتی بێگومـان سـەلماوە کـە ڕۆژووی ئیسلامی هیچ جۆرە کاریگەرییەکی سەلبی و خراپـی نییـە لەسـەر چـالاکی ماسولکەکان و توانـای هەسـتان بـە کـارە جەسـتەییە هیلاککـەرەکان، بـەڵکو بـە پێچەوانەوە ئەنجامەکانی ئەو توێژینەوە گرنگەی کە بەڕێزان (د. أحمد القاضـي) و هاوڕێکانی پێیهەستان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەریخسـت کـە توانـای هەسـتان بـە ئەرکـە جەسـتەییەکان و چـالاکی ئەرکـە ماسـولکەییەکان بەرێـژەی (٢٠٠٪) زیادی کرد لەلای (٣٠٪)ی ئەوانەی تاقیکردنەوەکەیان لەسـەر ئـەنجام درا، و هەروەها بە ڕێژەی (٧٠٪) لە (٤٠٪)ی خۆبەخشەکانی تردا زیادی کرد.

ئەمە بووە هـۆی هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو بۆچـوونە هەڵەیـەی کـە لای زۆرێـك لـە خەڵکی باوە کە ڕۆژوو دەبێتە هۆی لاوازکردنی لەش و خاوکردنـەوەی چـالاکیەکان و وای لە خەڵك کردووە کـە زۆری ڕۆژ بـە خـەو و تەممەڵیـەوە بەسـەر بـەرن، هـەر لەبەر ئەم خاڵەیە کە دەبینین لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـاتووە کـە خۆی و هاوەڵانی و موسوڵمانە یەکەمەکان هیچ جۆرە جیاوازیـەکیان نـەکردووە لـە هەستان بە کارەکانیان لە کـاتی ڕۆژووی ڕەمـەزان یـان لـە کاتـەکانی تـری ساڵدا، تەنانەت لە ڕەمەزاندا ئاڵای شـەڕیان هەڵـدەکرد و جـەنگی بـەرگرییان دەکـرد دژی بێباوەڕان بە زمانی بەڕۆژووەوە، لێرەوە دەپرسین کە: ئایا کـاتی ئـەوە نـەهاتووە کـە موسـوڵمان ڕزگـاری ببێـت لـە ترسـی جووڵـە و هەسـتان بـە چـالاکی لـە کـاتی ڕۆژوودا؟! و ئایا هەڵناسن و دەرناپەڕن بۆ ئەوەی بەوپەڕی چالاکیەوە کاربکـەن و

بەرهەم بهێنن و جیهاد بکەن، و ببنە شوێن کەوتەیەکی راستەقینەی پێغەمبەر (ﷺ) و پێشینە چاکەکانیان (رەزای خودا لە هەموویان بێت)؟!

## بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە رۆژووەوان کردووە کە هێمن بێت و دوور بکەوێتەوە لە شەڕ و ئاژاوە؟

ئەگەر مرۆڤی رۆژووەوان تووڕە ببێت یان گرژببێت ئەوا رێژەی دەردانی ماددەی ئەدرینالین لە خوێنیدا زیاد دەکات و لەوانەیە بگاتە (٢٠) یان (٣٠) ئەوەندەی رێژەی ئاسایی لە کاتی تووڕەبوون و تێکچوونی دەروونی بەهێزدا، ئەگەر ئەم حاڵەتە لە سەرەتای رۆژوودا رووبدات (واتە لەکاتی هەرس کردن و مژینی خۆراکدا) ئەوا ئەم کردارە تێکدەچێت، ئەمە هاوشانە لەگەڵ تێکچوونێکی گشتی لە هەموو لەشدا، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەدرینالین کاردەکاتە سەر ماسولکە لووسەکانی کۆئەندامی هەرس و خاویان دەکاتەوە، هەروەها گرژبوونەکانی توورەکەی زراویش کەمدەکاتەوە، و لوولە خوێنەکانی پەلەکان تەنگ دەکاتەوە و گرژیان دەکات و لەهەمان کاتدا خوێنبەرەکانی دڵ فراوان دەکات و دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەو برە خوێنەی کە دەچێتەوە بۆ دڵ و ژمارەی لێدانەکانیشی لە دەقیقەیەکدا زیاد دەکات.

ئەگەر ئەو تووڕەبوون و شەڕە لە نیوەڕۆ یان لە کاتی کۆتایی رۆژدا بێت، ئەوەی کە ماوە لە گلایکۆجین لە جگەردا شیدەبێتەوە، و پاشان پرۆتینی لەش شیدەبێتەوە بۆ ترشە ئەمینیەکان، و بڕێکی زۆرتریش لە ترشە چەوریەکان دەئۆکسێنرێن، ئەمانە هەمووی بۆ ئەوەیە کە رێژەی گلوکۆز لە خوێندا بەرزببێتەوە، کە پاشان دەسووتێنرێت بۆ ئەوەی ووزەی پێویست بدات بەلەش بۆ ئەو حاڵەتی شەڕ و ئاژاوەیە، هەروەها ووزەکە بە شێوەیەکی ژیرانە سەرف ناکرێت، تەنانەت هەندێك لە گلوکۆز لەرێی میزەوە بەفیڕۆ دەڕوات کاتێك کە

لەخوێندا لە ڕێژەی ئاسایی خۆی زیاتر دەبێت، لێرەوە لەش بڕێکی زۆر لە ووزەی پێویست لەدەست دەدات، کە پاشان شانەکان ناچار دەبن هەستن بە ئۆکساندنی ڕێژەیەکی زیاتر لە ترشە چەوریەکان، کە ئەمانیش دەبنەهۆی پەیدابوونی تەنە کیتۆنیە مەترسیدارەکان لە خوێندا.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامۆژگاری ڕۆژووەوانی کردووە کە ئارام وهێمن بێت، ودوور بێت لە ئاژاوە وتێکچوونە دەروونیەکان و هاوار و ناڵە و شەڕکردن لەگەڵ خەڵکانی تردا، ئەوەتا فەرموویەتی:

[إذا كانَ يَوْمُ صَوْمُ أَحَدِكُم فَلا يَرْفُث، وَلا يَصْخَب، فَإن سابَهُ أَحَدٌ أَو قاتَلَهُ، فَلْيَقُل: إِنّي صائِم] (**متفق عليه**)، واتە: هەر کەسێك لە ئێوە کە بەڕۆژوو دەبێت با ڕەفتار و ئاژاوە و ووتەی ناشرین و هاوار نەکات، هەر کەسێکیش جنێوی پێبدات یان شەڕی پێبفرۆشێت با ئەو تەنها بڵێت: من بەڕۆژووم.

## هێزە ڕۆحییەکان و هەستەکان لەکاتی ڕۆژوودا:

وەك باسمانکرد هەموو ئاینە ئاسمانیەکان هانی مرۆڤەکان دەدات بۆ ڕۆژووگرتن، لە هەموویان زیاتر وەك باسمان کرد ئاینی پیرۆز ئیسلامە، کە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە جیددی هانی مرۆڤ دەدەن نەك بە تەنیا لە ڕەمەزاندا بەڵکو بە بەردەوامی و لە هەموو ساڵەکەدا چەندین کاتی تر بەڕۆژوو بن.

ڕۆژوو چەندین سیفاتی تەندروستبەخشی تێدایە کە لە زۆرێك لە چارەسەرە نوێکانیشدا نییە، بە تایبەتی هێزی ژیریی وبیرکردنەوە و تەنانەت زاکیرەش بەهێز دەبێت، هەروەها هێزە ڕۆحییەکانیش وەك: هەست کردن بە سۆز و خۆشەویستی و هێزی لێکدانەوە هەموویان بەهۆی ڕۆژوەوە بەهێزدەبن، زۆرێك لە پزیشکانی ڕۆژئاواش لەمڕۆدا شوێنکەوتەی ئەو پەندە ڕۆمانیەن کە دەڵێت: (گەدەی پڕ لە

خواردن حەزی لە بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن نییە)، بۆیە ئامۆژگاری هەر کەسێك دەکەن کە دەیەوێت بیری باش بێت بەوەی زۆر بەڕۆژوو بێت، لە چەندین لێکۆڵینەوەدا لەسەر قوتابیانی زانکۆ دەرکەوتووە کە ڕۆژوو گرتن بۆ چەند ماوەیەکی کورت دەبێتە هۆی باشتر کردنی هێزە فیکری و ژیرییەکانیان، توانای وەرگرتنی وانەکانیان باشتر بوو.

هەروەها ڕۆژوو دەبێتە هۆی باشترکردنی هەستەکان بەگشتی و بیستن و بینین بە تایبەتی، کە بینراوە زۆر جار ڕۆژوو بووەتە هۆی باشترکردنی بینین لەلای ئەو کەسانەی کە لاوازی بینینیان هەبووە.

**سەرچاوە:**

کتێبی: ڕۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە – نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون– لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی.

# توێژینەوەکان لەسەر ڕۆژوو
# لە نەخۆشی و لەشساغیدا

زۆرێك لە توێژەرەوان و لێکۆڵەرەوان تاقیکردنەوە و توێژینەوەی زۆریان لەسەر ڕۆژووی ئیسلامی و ڕۆژووی پزیشکی کردووە لە کاتی لەشساغی و نەخۆشیدا، کە ئەم توێژینەوانە بوونە هاندەرێك بۆ زۆرێك لە زانایانی تر کە زیاتر لەم بوارەدا کاربکەن و بە تایبەتی تاقی کردنەوە لەسەر ڕۆژووی ئیسلامی بکەن، کە ئومێدەوارین -بە پشتیوانی خوای گەورە- گەنجینەی تر لەم توێژینەوانە ببینین لە داهاتوویەکی نزیکدا، نوێترین توێژینەوەکان دووپاتی سوودەکانی ڕۆژوو دەکەنەوە بۆ لەش لە کاتی لەشساغی و تەنانەت لە نەخۆشیشدا، فەرموون ئێوە و هەندێك لەو توێژینەوانە:

## ڕۆژوو و کۆئەندامی بەرگری لەش:

هەردوو دکتۆر (ریاض البیبي) و دکتۆر (أحمد القاضي) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چەند توێژینەوەیەکی تاقیکارییان لەسەر چەند کەسێکی خۆبەخش ئەنجامدا لەکاتی بەڕۆژوو بوونیان لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، ئەم کەسانە تاقیکردنەوەی جۆراوجۆر بۆ خوێنیان کرا لەپێش دەستپێکردنی ڕۆژوودا، هەروەها لە کاتی مانگی ڕەمەزاندا و لەپاش بەڕۆژوو بوونیش، ئەم تاقیکردنەوانە بریتی بوون لە پێوانی ڕێژەی پرۆتینە چەورەکان (Lipoproteins) لە لەشیاندا لەگەڵ چەند تاقیکارییەکی تایبەت بۆ دیاریکردنی چالاکی کۆئەندامی بەرگری، کە ئەم شیکارانە بریتی بوون لە دیاریکردنی ژمارەی خانە لیمفاویەکان (لیمفە خانەکان Lymphocytes) لە خوێندا و ڕێژەی جۆرە جیاوازەکانیان لەگەڵ یەکتریدا، و ڕاددەی باش بوونی هەستان بە کارەکانیان، ئەمانە لەگەڵ پێوانی ڕێژەی دژە تەنەکان و دژە میکرۆبەکان لە لەشدا (Antibodies).

ئەم تاقیکردنەوانە کاریگەرییەکی ئیجابی و سوودبەخشی ئاشکرایان بۆ رۆژوو دەرخست لەسەر کۆئەندامی بەرگری، چونکە بینییان کە پێوەری چالاکی خانە لیمفییەکان دەریخست کە ئەم خانانە ۱۰ ئەوەندە چالاکتربوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەی ئەم خانانە وەك خۆی مابووەوە، بەڵام بینییان رێژەی ئەو خانانەی کە بەرپرسن لە بەرگریکردن دژی نەخۆشییە جیاوازەکان (واتە لیمفە خانەی جۆری T-Lymphocytes (T) ژمارەیان لەچاو جۆرەکانی تر زۆر زیادیکرد، هەروەها لەگەڵ زیادکردنێکی کەم لە یەکێك لە جۆرەکانی دژەتەن لە خوێندا (IgE)، کە یەکێکە لە دژە تەنە پرۆتینییەکان لەخوێندا.

هەروەها بینییان ئەو گۆرانکارییانەی روویاندا بەسەر پرۆتینە چەورەکاندا بریتیبوو لە زیادبوونی رێژەی پرۆتینی چەوری چڕی نزم (LDL)، لەگەڵ روونەدانی هیچ زیادبوونێك لە جۆری پرۆتینی چەوری چڕی بەرزدا (HDL)، کە ئەم گۆرانکارییە کارگەریەکی چالاککەری هەیە لەسەر وەڵامە بەرگریەکان لەلەشدا.

ئەگەر ئێمە دوور بکەوینەوە لە سۆزی دینداریی، و لەرووی پێوەری زانستی رووتەوە سەیری ئەم حاڵەتە بکەین، بابزانین هیچ هۆکارێکی تر نییە کە ئاوا بەو شێوەیە توانای سیستمی بەرگری گشتی و تایبەتی و ئاستی پرۆتینە بەرگرییەکان لە لەشدا بەرزبکاتەوە بێجگە لە رۆژوو، تەنانەت ئەو دەرمانانەشی بەکاردێن بۆ زیادکردنی بەرگری تەنها تایبەتن بە ۱ جۆری بەرگری، نەوەك هەموو توانای کۆئەندامی بەرگری لە لەشی مرۆڤدا.

## رۆژوو و پێکهاتەکانی خوێن لە مرۆڤدا:

(د. محمد منیب) و هاورێکانی لە تورکیا هەستان بە توێژینەوەیەك لەسەر (۱۰۰) کەس لە موسوڵمانان، نموونەیەك لە خوێنیان وەرگیرا لەپێش رەمەزان و لەدوای رەمەزانیش، بەمەبەستی شیکاری کردن و پێوانی: پرۆتین، و بڕی چەوری بە گشتی، و چەورییە فۆسفاتییەکان، و ترشە چەورییە سەربەستەکان،

وكۆليسترۆڵ، و ئەلبۆمين، و گلۆبيولين، و شەكرى خوێن، و يۆريا، و چەورى سيانى گليسرۆڵ، و چەندين ماددەى تر، ئەنجامەكانى بەم شێوەيە بوو:

١- هيچ جۆرە گۆڕانكارييەك لە ئاستى پرۆتينى گشتى لە پلازماى خوێندا روونەدا، و لە بڕى گشتى چەورييەكانيشدا روونەدا، و لە ئاستى كۆليسترۆڵ بە هەردوو جۆرەكەيەوە (چرپى نزم و چرپى بەرز)، و ئاستەكانى ترشى يۆريك و يۆريادا روونەدا.

٢- چەند بەرزبوونەوەيەكى گرنگ روويدا لە بڕى چەوريە فۆسفاتيەكان و صۆديۆم و پۆتاسيۆمدا.

٣- نزم بوونەوەيەكى گشتى لە بڕەكانى شەكر و چەورى سيانى گليسرۆڵ لە رۆژووەواندا روويدا.

٤- دابەزينێكى جوزئى كەم لە كێشى لەشدا روويدا.

٥- لەم توێژينەوەيەوە سەلما كە رێژەى نێوان ئەلفا بۆ بێتا لە چەوريە فۆسفاتيەكاندا (Ratio of A:B Phospholipids) لەدواى رۆژوو دابەزى، كە پێش رۆژوو رێژەكە (٦٨:٣٠.١) بوو و دواى رۆژوو بوو بە (٤٥:٩.٨)، كە ئەم جياوازييەى نێوانيان گرنگە لە رووى ژمێريارييەوە.

٦-هيچ جۆرە (ئەسيتۆن)ێك لەناو ميزدا نەبينرا، نە لە سەرەتاى مانگەكە و نە لە كۆتاييەكەيدا، ئەمە ئەو راستييە دووپات دەكاتەوە كە لە كاتى رۆژووى ئيسلاميدا تەنە كيتۆنيە زيانبەخشەكان دروست نابن.

٧-بەهۆى رۆژووى رەمەزانەوە گلايكۆجين لە لەشى مرۆڤدا نوێ دەبێتەوە بە بەردەوامى، هەروەها جووڵەى چەوريە هەڵگيراوەكان چالاك دەبێت، و زياتر بەكاردێن بۆ دەستخستنى ووزە لێيانەوە.

توێژەرەوەكان لە كۆتايى توێژينەوەكەياندا دەڵێن: لەشى مرۆڤ بەهۆى رۆژووەوە رێى لێدەگيرێت كە خواردنى زياد لە پێويستى خۆى وەربگرێت، ئەمە

دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پاشماوەی زیندە چالاکییەکان لەناو خانەکانی لەشدا، لێرەوە لەش ئیسراحەتێکی نیسبیی دەست دەکەوێت بۆ ماوەی یەك مانگ لە ساڵێکدا، کە خۆی لە حەوانەوەی کۆئەندامی هەرس و جگەر و گورچیلەکان و چەندین سیستمی تری لەشی مرۆڤدا دەبینێتەوە.

هەروەها (د. محمود أبوالمكارم) و هاوڕێکاری لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (ئەزهەر) توێژینەوەیەکی نزیك لەو توێژینەوەیەی سەرەوەیان ئەنجامدا، لەسەر کاریگەریی ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر پرۆتینەکان و چەورییەکانی خوێن، ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە پرۆتینی گشتی و ئەلبۆمین و پرۆتینی جۆری ئەپۆ(B) (Apoprotien B)، و ترشە چەورییەکان هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی ئەووتۆیان تێدا ڕوونەداوە، هەروەها کۆلیسترۆڵ و چەوری سیانی گلیسرۆڵ بە ڕادەیەکی زۆر کەم زیادیان کرد، و جۆری کۆلیسترۆڵی چڕی بەرز و پرۆتینی جۆری ئەپۆ (A) (Apoprotien A) بە ڕادەیەکی بەرچاو زیادیان کرد، کە هەردووکیان دوو فاکتەری پارێزەرن لە دژی نەخۆشی ڕەقبوونی خوێنبەرەکان و نەخۆشی جەڵتەی دڵ.

(د. الحازمي الفالح) لە (سعوديە) لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەسەر کاریگەریی ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر هەندێك پێکهاتەی کیمیایی زیندەگی، و پێکهاتەکانی خوێن لەلای (٣٦) کەسی ساغ و تەندروست، تێبینی ئەوەی کرد کە زیادبوونێکی کەم لەرێژەی کۆلیسترۆڵدا ڕوودەدات و هەموو هەفتەیەك ئەم زیادبوونەی تۆمارکرد، هەروەها هەردوو (د. جمعة و د.شکري) لە توێژینەوەیەکدا کە لە گۆڤاری خۆراکزانی بەریتانیدا بڵاوکرایەوە بەهەمان شێوە ئەو زیادبوونەیان تۆمارکرد کە لە هەردوو جۆری پرۆتینی چەوری چڕی نزم و چڕی هەرە نزمدا (LDL & VLDL) ڕوویدا، (د. رياض سليماني)یش لە (سعوديە) ئەم زیاد بوونە دەگێڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی چەوری و شەکرەمەنی بە ڕادەیەکی زۆر

لـەکاتی ڕۆژوودا، هـەروەها بـەهۆی جووڵـەی خێـرای چـەوری هـەڵگیراو لـە شـانە چەوریەکاندا لەلەشدا و زیادبوونی دروستکردنی کۆلیسترۆڵی ناوخۆیی لە ەشدا.

لەوانەیە ئەم زیادبوونەش هەر بەسوود بێت لەبەر ئەوەی کۆلیسـترۆڵ دەچـێتە پێکهاتـەی دیـواری خانـە نوێکانـەوە، و خانـەکانی کـوێرە ڕژێنـەکانیش هۆرمۆنـە (ئیسترۆیدیەکان)ی لێوە دروستدەکەن کە زۆر گرنگن بۆ لەش، هەروەها لەوانەشـە زیـادبوونی ڕێـژەی پرۆتینـی چـەوری چڕی نـزم یارمەتیـدەر بێـت لـە چارەسـەری بەرزبوونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا، ئەویش بە کاریگـەریی خاوکـەرەوەی لەسەر ئـەو خانانـەی کۆلیسـترۆڵ دروسـتدەکەن، ئـەویش بـەهۆی میکانیزمێکـەوە پێیـدەوترێت کـۆنترۆڵی پێچـەوانەوە (Feed back Mechanism)، لـەپاش ماوەیەك لە ڕۆژووی نموونەیی کە تێیدا جووڵـە و چـالاکی ئاسـایی ئـەنجام بـدرێت، وڕۆژووەوان پابەندبێت بە خۆراکی ئاسایی و دوور لە چـەوریی حـەیوانی، هـەروەها ئـەم زیادبوونـەی پرۆتینـی چـەور سوودبەخشـە بـۆ خێرایـی و بـەهێزیی وەڵامـە بەرگرییەکان لە لەشدا و بەرگری لەش بۆ نەخۆشی زیاد دەکات و چالاك دەبێت.

هـەروەها (الحـازمی) لـە کاریگـەریی ڕۆژووی کۆلیـیـەوە لەسـەر پێکهێنـەرە سـەرەکییەکانی خـوێن، تێبینـی کاریگەرییـەکی گرنگـی نـەکرد لـە هیمۆگلـۆبینی خوێنـدا و لـە پێوانـەکانی خڕۆکـە سـوورەکانی خـوێن، بـەڵام تێبینـی کـەمبوونی رادەی ئاسنی کرد لە پلازمای خوێندا، و توانای گشتی بەندکردنی ئاسـنیش کـەم بووەوە (Total Iron Binding capacity)، کـە ئەمـەش وەك توێژەرەکـە دەڵێت: ئەوە دەسەلمێنێت کە ئاسنی هـەڵگیراو لـەکاتی ڕۆژوودا سـەرف ناکرێـت، هەروەها (د. سکۆت Scott) لە ساڵی ١٩٨١دا سەلماندی کە گۆڕانکاری ڕوونادات لە خڕۆکە سپییەکانی خوێن، و لە خێرایی نیشتنندا لە کاتی ڕۆژوودا.

لێـرەوە بەگشـتی دەتـوانین بڵـێن کـە پێکهێنـەرە کیمیـایی و فیسـیۆلۆژیەکانی خوێن وەك (د. ریاض سلیماني) دەڵێت: گۆڕنکارییەکی گـەورەیان تێـدا ڕوونـادات،

و ئەگەر بشبێت ئەوا کەمە و زۆر بە ئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ راددە ئاساییەکەی، هەروەها توێژینەوەیەکی نوێ کاریگەریی بەسوودی رۆژووی سەلماند لەسەر ئاستەکانی (apo AI, apo B & LP AI) لە پلازمادا، توێژینەوەکە لەسەر (٣٢) پیاوی تەندروستی پێگەیشتوو ئەنجامدرا، ئاستی ئەم ماددانەی خوارەوە لە پلازمای خوێنیاندا لە هەموو هەفتەیەکی مانگی رەمەزاندا دەپێوران، ماددەکان ئەمانە بوون:

apolipoprotiens, apolipoprotien AI (Apo AI), apo B, ) apo AIV) هەروەها گەردەکانی پرۆتینی چەوریش (Lipoprotien) هەموو هەفتەیەکی رەمەزان دەپێوران، و ئەنجامەکان بەراورد کران لەگەڵ پێوانەکانی پێش و دوای رەمەزان، سەلمێنرا کە رۆژووی ئیسلامی بە شێوەیەکی بەرچاو راددەی (Apo B) لە پلازمادا دادەبەزێنێت.

بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو (Apo AI) بەرزدەکاتەوە بە بەراورد لەگەڵ ماوەی پێش رۆژوودا، راددەی زیاد بوونی (Apo AI) لە رۆژی ٢٩ی رەمەزاندا گەیشتە (١١.٨٪)، کە ئەمە زۆر سوودبەخشە چونکە وەك پێشتر باسمان کرد پرۆتینە چەوریەکان لە جۆری (A) پارێزەرن لە تووش بوون بە رەقبوونی خوێنبەرەکان و جەڵتەی دڵ.

شیکاری چەوریەکانی (LP AI:AII, LP AI) لە پلازمای خوێندا دەریخست کە ئاستەکانی (LP AI:AII) نەگۆڕان بەڵام ئاستی (LP AI) بەشێوەیەکی تێبینیکراو زیادی کرد لە کۆتایی مانگی رۆژوودا، ئەم دۆزینەوانە دەریانخست هەڵس وکەوت و عاداتی خواردن لە مانگی رۆژوودا کاریگەرییەکی بەسوودی هەیە لەسەر کرداری نواندنی خۆراك بۆ پرۆتینە چەوریەکان لە پلازمای خوێندا، کە دووبارە دووپاتی ئەوەی کردەوە کە ئەم کردارە دەتوانێت یارمەتی خۆپاراستن بدات لە نەخۆشیەکانی دڵ و بۆریەکانی خوێن.

## کاریگەریی ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر هەندێك لە پێکهاتەکانی خوێن لە کەسانی تەندروستدا:

ڕۆژووی ڕەمەزان بووە هۆی زیادبوونێکی بەرچاو لە کۆلیسترۆڵی چڕی نزمدا، لە توێژینەوەیەکی نوێ کە لە ساڵی ١٩٩٧دا لە کۆلیژی زانست لە (الدار البیضاء)ی وڵاتی (مەغریب) و پەیمانگای (لایلی) لە (فەرەنسا)دا ئەنجامدرا، لەلایەن (أحمد الدواني و نصرالدين فاليبم و عبدالله بن سليمان و جيان ميتشيل ليسيرف و رشيد صايل)ەوە ئەنجام درا، ئەم توێژینەوەیە لەسەر (٣٢) کەسی تەندروستی پێگەیشتوو کرا، ئەنجامەکانی بەم شێوەیە بوو:

کەمبوونێکی ئاشکرای گرنگ و سوودبەخش لە کۆلیسترۆڵی گشتی و سیانی گلیسرۆڵ لە پلازمای خوێندا ڕوویدا، کە گەیشتە (٣٠٪) لە کاتی مانگی ڕەمەزاندا بە بەراورد بە کاتی پێش ڕۆژوو، لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا زیادبوونێکی ئاشکرا لە کۆلیسترۆڵی چڕی بەرز (HDL)ی پلازمای خوێندا ڕوویدا، کە گەیشتە ڕێژەی (١٤.٣٪) و پاش مانگێکیش لە ڕەمەزان هەر بەو بەرزییە مایەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا کەمبوونێکی ئاشکرا لە کۆلیسترۆڵی چڕی نزم (LDL) ڕوویدا، کە گەیشتە ڕێژەی (١١.٧٪) و بەم نزمیە مایەوە پاش مانگێکیش دوای ڕەمەزان، هەروەها کێشی لەشیش بە ڕێژەی (٢,٦٪) دابەزی لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، خواردنی ترشە چەوریە تێرەکانیش لە ڕەمەزاندا کەم بووەوە، و لەژێر چەند بارێکی تایبەتی و هەڵس وکەوتی تایبەتی ئەو کەسانەی کە توێژینەوەکەیان لەسەر کرا، تێبینی کاریگەرییە بەسوودەکانی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کرا لەسەر چەورییەکان و چەورییە پرۆتینیەکان لە پلازمای خوێندا.

### ڕۆژوو و هۆرمۆنەکانی ئافرەت:

(د.حسن نصرت) و (د.منصور سليمان) لە زانکۆی (شا عبدالعزيز) ساڵی ١٩٨٧ توێژینەوەیەکیان سازدا لەسەر کاریگەریی ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر ئاستی

(پرۆجیستیرۆن) و (پرۆلاکتین) له پلازمای خوێندا، ئەویش بۆ چەند ئافرەتێکی تەندروست ئەنجامدرا کە تەمەنیان لە نێوان (٢٢–٢٥) ساڵدا بوو، بە مەبەستی دیاری کردنی کاریگەریی رۆژووی رەمەزان لەسەر فیسیۆلۆژی وەچە خستنەوە لەلای ئافرەت.

ئەنجامەکان دەریانخست کە ٨٠٪ی ئەو ئافرەتانە ئاستی پرۆلاکتین (کە هۆرمۆنی زیادکردنی دەردانی شیرە لە ئافرەتی شیردەردا و وەچە خستنەوەش رادەگرێت) لە پلازمای خوێنیاندا دابەزیوە، بەڵام ئاستی پرۆجیستیرۆن نەگۆڕا، هەردوو توێژەرەوەکە ئامۆژگاری ئافرەتی شیردەریان بە رۆژوو شکاندن کرد (لێرەدا حیکمەتی شەرعی پیرۆزمان بۆ دەردەکەوێت کە بواری داوە بە ئافرەتی شیردەر کە رۆژوو نەگرێت).

ئەم توێژینەوەیە دووپاتی گرنگی رۆژوو گرتن دەکاتەوە بۆ چارەسەری نەزۆکی لە ئافرەتدا کە هۆکارەکەی بریتی بێت لە زیاد بوونی هۆرمۆنی (پرۆلاکتین)، چونکە بەهۆی رۆژووەوە رێژەکەی کەم دەکات و ئەو ئافرەتە دەگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی لە وەچە خستنەوەدا.

## رۆژوو و هۆرمۆنە چالاککەرەکان

(د. صباح الباقر) و هاوڕێکانی لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (شا سعود) لە (سعودیە) لە ساڵی ١٩٩٠دا توێژینەوەیەکیان ئەنجام دا لەسەر کاریگەریی رۆژووی رەمەزان لەسەر هۆرمۆنە چالاککەرەکانی وەك: پرۆلاکتین، ئینسۆلین و کۆرتیزۆڵ.

پێوانەی ئاستەکانی (پرۆلاکتین، ئینسۆلین و کۆرتیزۆڵ) لە کاتژمێر ٩ی بەیانی، ٤ی عەسر، ٩ی شەو، و ٤ی بەیانی لەلای ٧کەسی تەندروست وەرگیرا لەکاتی رۆژووی رەمەزاندا، دواییش پێوانەی هاوشێوە بۆ هەمان ئەو کەسانە لە رۆژی ئاسایی دوای رەمەزاندا وەرگیرا، لەمانەوە تێبینی چەند گۆڕانکاریەکی گرنگ کرا لەم هۆرمۆنانەدا لەکاتی رۆژدا، لە رۆژە ئاساییەکاندا تێبینی ئەوە کرا کە

ئاستی پـرۆلاکتین لـه کاتـژمێر ٤ی عەسـردا بـەرز دەبێتـەوە، بـەڵام جیاوازیـەکی ئەووتۆ لـه ئاسـتی ئـەم هۆرمۆنـه لـه سـێ کاتەکـەی تـردا تێبینـی نـەکرا، لـەکاتی رەمەزانـدا بینـرا کـه ئاسـتی پـرۆلاکتین گەیشـته لوتکـه لـه کاتـژمێر ٩ی شـەودا و گەیشته نزمترین ئاستی له کاتژمێر ٤ی بەیانیدا، هۆرمـۆنی ئینسـۆلینیش لـه رۆژی ئاساییدا بەرزترین ئاستی له کاتژمێر ٤ی عەسردا تۆمار کرد، بەڵام بەرزترین ئاستی له کاتی رەمەزاندا له کاتژمێر ٩ی شەودا تۆمار کرد، ئاستی زۆر نزمی ئینسۆلین له کۆتـایی رۆژی رۆژوودا لـه کاتـژمێر ٤ی عەسـردا تۆمـار کـرا، لـه رۆژانـی ئاسـاییدا ئاستی کۆرتیزۆڵ له کاتژمێر ٩ی بەیانیدا گەیشته لوتکـه، و لەکاتـژمێر ٩ی شـەودا دەگەیشته نزمترین ئاستی، بەڵام هیچ جۆره گۆڕانکارییەکی بەرچاو تێبینـی نـەکرا له ئاستەکانی کۆرتیزۆڵ له مانگی رەمەزاندا.

بـه پشـت بەسـتن بـەو گۆڕانکارییـه زۆر کەمـەی لـه ئاسـتەکانی کۆرتیزۆڵـدا روودەدات، و هەروەها دابەزینی ئاستی پـرۆلاکتین لـه کاتـژمێر ٤ی عەسـردا (واتـه پاش ١٢ سەعات رۆژوو)، ئەمه له کـاتی مـانگی رەمەزانـدا و بـه بـەراوردکردنی بـه رۆژانی ئاسایی که رۆژووی تێدا نییه، توێـژەرەوەکان گەیشـتنه ئـەو راسـتیەی کـه رۆژووی رەمەزان به هیچ جۆرێك به کارێکی قورس و گران دانانرێت.

## رۆژوو و خڕۆکه سوورەکانی خوێن:

(د.محمد الحضرامي) لـه کۆلیـژی پزیشـکی زانکـۆی (شـا عبـدالعزیز) لـه سـاڵی ١٩٨٨ توێژینەوەیەکی ئەنجامدا سەبارەت به کاریگـەریی رۆژووی مـانگی رەمـەزان لەسەر ژیانی خڕۆکه سوورەکانی خوێن له کاتی مـانگی رەمەزانـدا، ئـەو کەسـانەی که خرانه ژێر ئەم توێژینەوەیه بریتی بوون له (٦ کەس)ی پێگەیشـتووی ئاسـایی، لەگەڵ ٣ کەسی تردا که نەخۆشی خڕۆکه سوورەکانیان هەبوو له جـۆری خڕۆکـەی داس شێوه(Sickle cell Anemia).

ئەم ٩ کەسە هەستان بە گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان، بڕی ئەو ماددە کرۆمە تیشکدەرەی کە لە تاقی کردنەوەکەدا بۆ دیاری کردنی تەمەنی خڕۆکە سوورەکان بەکارهێنرا، (**51 Crt 50**) لەلای کەسە ئاساییەکان لە کاتی ڕەمەزاندا بۆ ماوەی (٢٥–٤٠) ڕۆژ بوو، و لەلای نەخۆشەکان بۆ ماوەی (١٠–١٢.٥) ڕۆژ بوو.

هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ تێبینی نەکرا لە خڕۆکە سەرەتاییەکانی خوێندا (کە خڕۆکەی سووری پێنەگەیشتوون Reticulocytes)، هەروەها قەبارەی خڕۆکەکانیش بە ئاسایی مانەوە و گۆڕانکارییان بەسەردا نەهات، ڕێژەی خەستیی (هیمۆگلۆبین Hemoglobin)یش لەناو خڕۆکەکاندا بە ئاسایی مایەوە، ئەو ژمارانەی پێشوو هەمان ئەو ژمارانە بوون کە لە کەسە ڕۆژوو نەبووەکانەوە دەستکەوت بە هەردوو کۆمەڵە تەندروست و نەخۆشەکانیشەوە، ئەم توێژینەوەیە لەسەر ئەو خۆبەخشانە گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە ڕۆژوو هیچ جۆرە کاریگەریەکی خراپ و نێگەتیڤانەی نییە لەسەر توانای خڕۆکە سوورەکانی خوێن بۆ مانەوە و هەستان بەکارەکانیان، تەنانەت لەو کەسانەشدا کە نەخۆشی خڕۆکە سوورەکانیان هەیە لە حاڵەتی (Sickle cell Anemia)، کە هیچ جۆرە بیانویەك نییە بۆ ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان نەگرن.

## ڕۆژوو و مەیینی خوێن

(د. جلال ساعور) پرۆفیسۆری نەخۆشیەکانی هەناو لە نەخۆشخانەی (شا فەیصەڵ) لە (سعودیە)ساڵی ١٩٩٠ توێژینەوەیەکی سازکرد سەبارەت بە کاریگەریی ڕۆژوو لەسەر ئەو کەسانەی نەخۆشی دڵیان هەیە و دەرمانی دژە مەیینی خوێن بەکاردێنن، ئەم پزیشکە کورتەیەکی دەربارەی توێژینەوەکەی نووسیوە کە تێیدا دەڵێت:

زوربەی هەرە زۆری موسوڵمانان هەموو ساڵێك لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو دەبن، بەهۆی ئەم ڕۆژووەوە گۆڕانکاری گەورە ڕوودەدات لە چالاکی جەستەیی و

شێوازەکانی نوستن لەلای موسوڵمانان، ئەمە و بێجگە لە گۆڕانکاری لە کاتەکانی خواردن و خواردنەوە، و جۆرەکانیان، و بڕەکانیاندا روودەدات، لێرەوە لەوانەیە وا تێبگەین کە رۆژوو کایگەریەکی سەلبی هەبێت لەسەر توانای لەش بۆ کۆنترۆڵ کردن و نەهێشتنی مەیینی خوێن، ئەویش بەهۆی لەدەست دانێکی رێژەیی شلەمەنیەکانی لەش، و کەمبوونەوەی ئەرك و کاری دڵ، و زیاد بوونی هیلاکی لەش، و لینج بوونی خوێن، ئەمانە بێجگە لەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر توانای مژینی دەرمانەکان و سوود لێوەرگرتنیاندا دێت.

لە توێژینەوەکەدا لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨١–١٩٨٥)دا (٢٨٩) نەخۆش پشکنینیان بۆ ئەنجامدرا لە کلینیکی رێگرتن لە مەیینی خوێن لە نەخۆشخانەی (شا فەیصەڵ)ی پسپۆڕیی، (٢٤٧) نەخۆشیان دەرمانی دژی مەیینی خوێنیان وەردەگرت بەهۆی نەخۆشی دڵ کە هەیانبوو، و (٤٢) کەسی تریان بەهۆی حاڵەتی مەیینێکی زۆری خوێنبەرەکانیان کە هەیانبوو دەرمانی دژە مەیینیان بەکار دەهێنا لەگەڵ بوونی یان نەبوونی گیرانی خوێنبەرەکانی سیەکانیانەوە.

لە ماوەی چارەسەریاندا (واتە ٤ ساڵ) (١٠٦) کەس لەو نەخۆشانە کۆی گشتی (٣٠٩) مانگی رەمەزان بەرۆژوو بوون، و (١٨٣) کەسەکەی تریان کۆی (٥٩٤) مانگی رەمەزان بەرۆژوو نەبوون[٩٢]، ئەوەی تێبینیکرا ئەوە بوو کە کاریگەرییە لاوەکیەکانی گیرانی جەڵتەیی خوێنبەرەکان و خوێن بەربوون لە هەردوو گرووپەکەدا وەك یەك بوو، کە ناوەندی ئەو بڕی دەرمانی (وارفارین Warfarin)ەی کە پێویستە بۆ دروستکردنی باشترین کاریگەریی دژە مەیین و

[٩٢] ژمارەی ئەو مانگانەی کە لێرەدا حیساب کراوە بریتیەیە لە کۆی هەموو ئەو مانگی رەمەزانانەی کە هەموو ئەو کەسانە (١٠٦ کەس) بەرۆژوو بوون تێیدا لە ماوەی تاقی کردنەوەکەدا (٤ ساڵ) کە تێیاندا هەبوو ٤مانگ، یان سێ مانك، یان دوو مانگ بەرۆژوو بووە، بەرامبەر ئەمانیش ئەوانەی رۆژوویان نەگرت، ژمارەی مانگەکانی سەرەوە (٥٩٤) بریتییە لە کۆی ئەو مانگانەی کە لە کاتی تاقی کردنەوەکەدا هەموویان بەرۆژوو نەبوون تێیدا.

ڕێگر لە دروست بوونی جەڵتە لە مانگی ڕەمەزاندا لە هەردوو گرووپەکەدا وەك یەك بوو: واتە (٦.٥±٢.١ میللیگرام) بەرامبەر بە (٦.٧±٢.٢ میللیگرام).

لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە ئەم پزیشکە ئامۆژگاری ئەو نەخۆشانەی کە دەرمانی دژە مەیین لەرێی دەمەوە بەکاردێنن بەوە دەکات کە هیچ جۆرە زەرەرێك نییە بۆیان ئەگەر مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبن، کە لەم ماوەیەدا (٢٧٧) نەخۆش لەوانەی کە زمانەی دڵیان بۆ گۆڕرا بوو هەستان بە بەڕۆژوو بوونی کۆی (١٠٥٤) مانگ، کە لەسەر هیچ کەسێکیان لەم ماوەیەدا کاریگەریە لاوەکیەکانی گیرانی جەڵتەیی خوێنبەرەکان پەیدانەبوو.

## ڕۆژوو و نەخۆشی شەکرە:

(د. ریاض سلیماني) و هاوڕێکانی لە کۆلیژی پزیشکی نەخۆشخانەی (شا خالد)ی زانکۆیی لە (سعودیە) هەستان بە توێژینەوەیەك لە ساڵی ١٩٩٠دا لەسەر کاریگەریی ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی شەکرە لەلای (٤٧) نەخۆش لەوانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەبوو (لە جۆری دووەم)[٩٣]، و لەلای کۆمەڵێك خەڵکی تریش کە ئەم نەخۆشیەیان نەبوو، لەلای هەردوو گرووپەکە ئەم شتانە دیاریکران و شیکارییان بۆ کرا: کێشی لەش، بڕی پرۆتینی شەکردار، و هیمۆگلۆبینی شەکرداری خوێن، لە پێش ڕەمەزان و یەکسەر دوای کۆتایی ڕەمەزان بۆ هەردوو گرووپەکە سازکرا.

پێوانەی پرۆتینی شەکردار (البروتين السكري Glycosylated Protein) لەلای ٩ نەخۆشی شەکرە کرا، و تێبینی ئەوە کرا کە هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە کێشی ئەو نەخۆشانەدا ڕووینەدا، کە پێش ڕەمەزان (٧٥.٢±١٢.٨) بوون، و دوای ڕەمەزان (٧٥.١±١٢.٤) بوون، هەروەها هیچ گۆڕانکاریەکی ئەووتۆش بەسەر

---

[٩٣] کە ئەو جۆرەی نەخۆشیەکەیە کە بەزۆری کەسی تووشبوو پشت بە بەکارهێنانی (ئینسۆلین) نابەستێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشیەکە.

هیمۆگلۆبینی شەکرداردا (Glycosylated Hemoglobin) نەهات، کە پێش ڕەمەزان بڕەکەی (١٠.٩±٣.١) بوو بەرامبەر بە (١٠.٥±٢.٨) میللیگرام لە ١٠٠ میللیلیتردا دوای ڕەمەزان، هەروەها گۆڕانکاریش لە بڕی پرۆتینی شەکرداردا (Glycosylated Protein) ڕوویندا، کە پێش ڕەمەزان (١.١٩±٠.٣٥) بوو بەرامبەر بە (١.١٧ ± ٠.٣٩) میللیگرام لە ١٠٠ میللیلیتردا پاش تەواوبوونی ڕۆژووی ڕەمەزان.

بەڵام لەو گرووپەدا کە ئەندامەکانی نەخۆشی شەکرەیان نییە، تێبینی دابەزینێکی گرنگ کرا لە کێشیاندا لە کاتی ڕۆژوودا (٧٤.٢ ± ١٠.٤) کغم، بەرامبەر بە (٧٢.٥ ± ١٠.٢) کغم، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەکی ئەووتۆ لە هیمۆگلۆبینی شەکرداردا (Glycosylated Hemoglobin) ڕووی نەدا.

توێژەرەوەکان لێرەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هیچ جۆرە لەدەست دانێکی گرنگ لە کێشی لەشدا دروست ناکات، و کاریگەرییەکی ئەووتۆی خراپی نییە لەسەر کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی شەکرە لە جۆری دووەم.

(د. ئۆلفۆنشۆ Olufonsho) و هاوڕێکانی لە کۆلیژی پزیشکی نەخۆشخانەی (شا خالد)ی زانکۆیی لە شاری (ریاض) لە ساڵی ١٩٩٠دا هەستان بە دابەشکردنی فۆرمێکی زانیاری وەرگرتن بەسەر (٢٠٣) نەخۆشی شەکرەدا (٨٩ نێرینە و ١١٤ مێینە)، ئەویش بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکان، و کردار و چالاکیەکانیان لە مانگی ڕەمەزاندا.

تەمەنی زۆربەی ئەم نەخۆشانە لە نێوان (١٤ بۆ ١٨) ساڵدا بوو، زوربەی ئەو نەخۆشانە (٨٩٪) یان هەستان بە گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان، کەمترین ڕێژەی ڕۆژووگرتن (٧٢٪) لەناو ئەوانەدا بوو کە تەمەنیان لە خوار (٢٥) ساڵەوە بوو، تەنیا (١٢٪)یان دانیان بەوەدا نا کە لە ڕەمەزاندا بڕێکی زۆرتر لە خۆراك دەخۆن، بەڵام ژمارەیەکی زۆرتریان (٢٧٪)یان ووتیان کە بڕێکی زیاتر لە شیرینی

بەکاردێنن، زیاتر لە سێیەکیان (٣٧٪) ووتیان کە چالاکی جەستەییان لە ڕەمەزاندا لاوازبووە، کە ئەم لاوازیە زیاتر لەلای ئەو کەسانە بوو کە ڕۆژووی ڕەمەزانیان نەگرت (٦١٪) وەك لەوانەی بەڕۆژوو دەبوون (٣٥٪)، ڕێژەیەکی زۆریان (٥٩٪) باسی ئەوەیان کرد کە تەندروستیان لە مانگی ڕەمەزاندا باشتر بووە، کە تەنها ڕێژەیەکی کەمیان (٦.٥٪)یان سەردانی نەخۆشخانەیان کرد بەهۆی حاڵاتی کوتوپڕەوە، و تەنیا (٥٪)یان بەهۆی شەکرەوە لە نەخۆشخانە داخڵ کران و خەوێنران.

بەڵام لەلای ئەوانەی کە بەڕۆژوو نەبوون ئەنجامەکانیان کەمتر دڵخۆشکەر و باش بوو، چونکە تەنیا (١٠٪)یان باسی باش بوونی تەندروستیانیان کرد، و ڕێژەی سەردانی نەخۆشخانە بەهۆی حاڵاتی کوتوپڕیەوە لەلای ئەمان بەرزبوو (١٥٪)، و ڕێژەی داخڵ بوون لە نەخۆشخانە بەهۆی شەکرەوە لەلای ئەمان گەیشتە (١٥٪)، بیروبۆچوونێکی باو هەبوو لەلای (٧٥٪)ی نەخۆشەکان کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەبێتە هۆی باشتربوونی تەندروستی، کە ئەم بۆچوونە زیاتر لەلای ئەو نەخۆشانە بەهێزبوو کە مانگەکە بەڕۆژوو بوو بوون (٨٠٪)یان، بەرامبەر بەو نەخۆشانەی کە بەڕۆژوو نەبوون کە تەنیا (٢٦٪)یان وایان دەووت،ئەم لێکۆڵینەوەیە دەریخست کە زوربەی ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە حەزدەکەن ڕەمەزان بەڕۆژوو بن و باوەڕیان وایە کە ڕۆژوو کاریگەریەکی باش و ئیجابیانەی هەیە لەسەریان.

د. باربەر (Barber S. G.) و هاوڕێکانی ساڵی ١٩٧٩ لە زانکۆی (بێرمینگهام) لە (بریتانیا) سەلماندیان کە گۆڕانکاریەکی کەم هەیە لە کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی شەکرە لەلای ئەو موسوڵمانانەی کە ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبن، و ژمارەی ئەوانەیان کە سەردانی کلینیکەکانی شەکرە دەکەن کەمبووەوە، و بە هیچ شێوەیەك ژمارەی ئەوانەی کە نەخۆشی شەکرەی بەرز و کۆنترۆڵ نەکراویان هەیە و لە نەخۆشخانەدا دەهێڵرێنەوە لە مانگی ڕەمەزاندا زیادی نەکرد.

ئەو نەخۆشانەی شەکرەیان هەیە و ئامۆژگاری دەکرێن بەوەی کە بەڕۆژوو نەبن توێژینەوەی (هەڵسەنگاندنی تەواو) دیاری کردوون، کە لەلایەن (د. ریاض سلیماني) و هاوڕێکانی پێی هەستان لە ساڵی ١٩٩٨ لەسەر (نەخۆشەکانی شەکرە و ڕۆژووی رەمەزان)، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١-ئەو نەخۆشانەی مەترسی زیاد بوونی تەنە کیتۆنیەکانیان هەیە لەخوێنیاندا (Prone to Ketosis).

٢-ئەو نەخۆشانەی کە بەرز و نزمیی زۆر و گۆڕانکاری خێرایان هەیە لە رێژەی گلوکۆز لە خوێنیاندا.

٣-ئافرەتی دووگیان (سکپڕ).

٤-ئەو منداڵانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە.

٥-ئەو کەسانەی کە شەکرەیان هەیە و دووچاری کاریگەرییە خەتەرناکەکانی (موزاعەفاتەکانی) بوون وەك: سستبوونی گورچیلەکان (الفشل الکلوی) و سنگە کوژە (الذبحة الصدرية).

٦-ئەو نەخۆشانەی تر کە شەکرەیان هەیە و نەخۆشی تریان هەیە، وەك: ژەهراوییبوونی خوێنی قورس (التسمم الدموی الشدید Sever Sepsis)، یان سستبوونی تەواوی دڵ (Congestive Heart Failure).

هەروەها توێژینەوە نوێکان سەلماندوویانە کە: هیچ گۆڕانکاری نەخۆشی و موزاعەفاتی کلینیکی لەسەر ئەو نەخۆشانەی کە شەکرەیان هەیە و ڕۆژووی رەمەزان دەگرن روونادات، بە تایبەتی لەم پێکهاتە و ئاوێتانەدا:

گلوکۆزی ناو خوێن، هیمۆگلۆبینی (C. Peptide AIC)، ئینسۆلین، کۆلیسترۆڵ، چەوری سیانی گلیسرۆڵ، و کێشی لەش.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە زۆر پێویستە ئەو نەخۆشانە گرنگی تەواو بدەن بە رێکخستنی بڕی دەرمانەکانیان، و بەردەوام بن لەسەر

چالاکی رۆژانەیان، و ڕێك وپێك بن لە پابەند بوون بە ڕژێمەکانی خواردنیانەوە، بە تایبەتی ئەو نەخۆشانەی کە ئینسولین بەکار دێنن.

لە ئاکامی ئەو توێژینەوانەی کە لەسەر ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە ئەنجامدراون لەم ٣ دەیەی رابوردوودا، دەتوانین ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی لێکورت بکەینەوە:

١) ڕۆژوو قەدەغەیە لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

أ- هەموو حاڵەتەکانی (Brittle) کە جۆرێکە لە نەخۆشی شەکرە.

ب- ئەو حاڵەتانەی کە کۆنترۆڵی شەکرەکەیان لاوازە، یان ئەوانەی لە کاتی ڕۆژوودا کۆنترۆڵ ناکرێن، جا چ لە جۆری یەکەم یان لە جۆری دووەم بێت.

ج- ئەو نەخۆشانەی کە ئامۆژگاریی وەرناگرن، سەبارەت بە ڕژێمی خۆراك بێت یان بەکارهێنانی دەرمان یان چالاکیە جەستەییەکان.

د- ئەو نەخۆشانەی کە کاریگەریی خراپی شەکرە تێیاندا دەرکەوتووە، وەك: سنگە کوژە (الذبحة الصدرية) یان بەرز بوونەوەی کۆنترۆڵ نەکراوی پەستانی خوێن.

هـ- ئەو نەخۆشانەی کە پێشتر تەنە کیتۆنیەکان لە لەشیاندا بەرزبووەتەوە (Ketoacidosis).

و- ئەو ئافرەتە دوو گیانانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە.

ز- ئەو نەخۆشانەی شەکرەیان هەیە و تووشی هەوکردنی بەردەوام بوون.

ح- ئەو نەخۆشانەی کە تووشی دوو نۆرە یان زیاتری کەمبوون یان زیاد بوونی شەکری خوێن بوون.

٢) هەموو نەخۆشەکانی تر بواریان پێدەدرێت بە ڕۆژوو گرتن، و بە تایبەتی ئەو نەخۆشانەی کە ئامۆژگاریە پزیشکیەکان جێبەجێ دەکەن، هەروەها هانی ئەو نەخۆشانەی شەکرە دەدرێت کە کێشیان زیادە و لە جۆری دووەمن (واتە ئەوانەی

که پشت به ئینسۆلین نابەستن) بێجگە لە ئافرەتی دووگیان و شیردەر بەوەی کە بەڕۆژوو بن، بە کورتی زوربەی توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕۆژووی مانگی رەمەزان بۆ ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە بێزیانە لەرووی تەندروستیەوە بەو مەرجەی کە وورییایی خۆراکی و دەرمانی هەبێت.

زوربەی نەخۆشەکانی جۆری دووەم دەتوانن بە دڵنیاییەوە بەڕۆژوو بن، و تەنانەت هەندێك کات نەخۆشەکانی جۆری یەکەمیش دەتوانن بەڕۆژوو بن بە مەرجێك ئاگاداریی و رێك وپێکی هەبێت لە خۆراك و بەکارهێنانی دەرمان و هەستان بە جووڵە و چالاکیەکانیان.

## کاریگەریی ڕۆژووی ئیسلامی لەسەر کێشی لەش:

توێژینەوە پزیشکیەکان لەم بوارەدا جیاوازن، هەندێکیان کاریگەریەکی گرنگی بۆ سەلماندووین، لە توێژینەوەیەکدا کە (فیدایل Fedail) و هاوڕێکانی پێی هەستان و لە گۆڤاری خۆراکزانی پزیشکی ئەمریکی (Am J Clin Nutr)دا بڵاوکرایەوە، کە لەسەر (٢٨) کەسی تەندروست پێی هەستان کە ڕۆژووی رەمەزانیان گرتبوو.

سەلماندیان کە کەمبوونێکی کێشی لەش هەیە لە هەموو ڕۆژوو گرەکاندا کە گەیشتە (١.٨ ± ٦٦ کیلۆگرام) بۆ هەموو گرووپەکە، بەڵام ئەو توێژینەوەیەی کە (د. شکري) پێی هەستا لەسەر (٣٠) کەس (١٩ ئافرەت و ١١پیاو)، ئەم توێژینەوە کەمکردنێکی بەرچاوی تۆمارنەکرد لە کێشی پیاوەکاندا، تەنیا کەمکردنی چەند ئافرەتێك نەبێت کە هۆکاری ئەم کەمکردنەی گێڕایەوە بۆ روودانی عادەی مانگانە لەو ئافرەتانەدا.

دەتوانین بڵێین ئەم توێژینەوانە ئەو جێگیریە دەسەلمێنن کە ڕۆژووی ئیسلامی بەکردارەکانی بنیاتنان و تێکشکاندنی دەبەخشێت لە لەشدا، ئەو برە کەمەی کێش کە لەش لەدەستی دەدات زۆر گرنگ و پێویستە بۆ پاراستنی تەندروستی.

## کاریگەریی رۆژوو لەسەر ئەرکە جەستەییەکان:

(د. أحمد القاضي) و هاورێکانی لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەستان بە توێژینەوەیەکی زانستی سەرنج راکێش کە تێیدا بە بەڵگەی زانستی سەلماندیان کە: رۆژووی ئیسلامی هیچ جۆرە کاریگەریەکی سەلبی و خراپی نییە لەسەر ئەرك و توانا ماسولکەییەکان و توانای بەرگەگرتنی ئەرکە هیلاککەرە جەستەییەکان، و بە هیچ جۆرێك نابێتە هۆی هیلاککردن و ئیرهاق و بێتوانا کردنی مرۆڤ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە باشتر بوون روودەدات لە توانای تەحەممول کردنی ئەرکە جەستەییەکان و هیلاکیدا، لێرەوە دەرکەوت کە توانا ماسولکەییەکان باشتربوون، هەروەها کاری دڵیش لەم کاتەدا لە رۆژوودا باشتردەبێت، باشتربوونێکی کەمیش لە پلەی هەستکردن بە هیلاکیدا روویدا.

توێژینەوەکە لەسەر (٢٠) کەسی خۆبەخشی تەندروست (٨مێینە و ١٢نێرینە) ئەنجامدرا، تەمەنیان لە نێوان (١٢–٢٥)ساڵدا بوو، پلەی ئەرکی جەستەیی و کاری دڵ لەلای خۆبەخشەکان پێش رەمەزان پێورا و لەکاتی هەفتەی سێیەمی رەمەزاندا بەپێی ئەم رێگەیەی خوارەوە:

پێش رەمەزان بە ٢ هەفتە پلەی چالاکی دڵ لەگەڵ هیلاکیدا پێورا بەپێی بەرنامەی باڵك (Balk)، کە بریتیە لە راهێنانێك کە بە ئامێرێکی رۆیشتن دەکرێت و بەرەو زیادبوون دەڕوات و بەخێرایی (٤.٣) میلە لە سەعاتێکدا، هەموو ٢دەقیقە جارێك خێراییەکەی بە پلەی (٢.٥٪) زیاد دەکات، لەناویدا ئامێرێك هەیە بۆ پێوانی ئۆتۆماتیکی لێدانی دڵ و پەستانی خوێن و هەروەها ئەنجامدانی هێڵکاریی دڵ (تخطیط القلب)، ئەم پشکنینە بەردەوام دەبوو تاوەکو خۆبەخشەکە دەگەیشتە پلەی هیلاك بوونی تەواو و هەستکردن بە تێکشکان، کە بە پێوەری بورج (BORG) دیاریدەکرا، کە ئەمیش پلەکەی دیاریدەکرێت بە هەستکردن بە تەنگە نەفەسی و هیلاك بوونی قاچەکان.

ئەمە پشکنینی یەکەم بوو پێش رەمەزان بە ٢هەفتە ئەنجامدرا بۆ دیاریکردنی ئاستی هەرە بەرزی توانای هەر خۆبەخشێك، پێش رەمەزان بە یەك هەفتە پشکنینی دووەم بۆ هەر خۆبەخشێك کرا، ئەویش بۆ تاقیکردنەوەی توانای جەستەیی و توانای دڵ لەژێر بارودۆخێکدا کە یەکسانە بە (٨٥٪)ی هەرە توانای جەستەیی، ئەمە پێیدەووترێت قۆناغی (توانای جێگیر-الجهد الثابت) بۆ هەر یەکێك لە بەشداربووان.

لەم پشکنینەدا پێوانەی زۆرترین کات کرا کە هەر خۆبەخشێك تەحەمولی کرد و تەواوی کرد لەگەڵ پێوانەی پلەی کاری دڵ و پلەی هەستکردن بە هیلاکیی (ئەویش لەرێی پلەی تەنگەنەفەسی و هیلاکبوونی قاچەکان لە کۆتایی پشکنینەکەدا).

لە هەفتەی سێیەمی رەمەزانیشدا پشکنینی سێیەم ئەنجامدرا بۆ زانینی پلەی توانا جەستەییەکان، کە ئەنجامەکانی ئەم پشکنینەی سێیەم (لە کاتی رۆژوودا) پێوانە کرا لەگەڵ ئەنجامەکانی پشکنینی دووەم (لە پێش رەمەزان)، ئەویش بەپێی ئەم بنەما و ستانداردانەی خوارەوە:

١- ئەو ماوەیەی کە خۆبەخشەکە تەواوی کرد لەسەر ئامێری رۆیشتنەکە.

٢- پلەی توانا و کاری دڵ لە کۆتایی پشکنینەکەدا، ئەویش بە زانینی خێرایی لێدانی دڵ و دەرەنجامی: پەستانی خوێن کە لێکدرا لە خێرایی دڵ.

٣- پلەی هیلاکبوونی جەستەیی ئەویش لەرێی هەستکردن بە تەنگەنەفەسی و هیلاکیی قاچەکان، کە پشکنینەکان لە کاتی عەسردا ئەنجام دران و لە بارودۆخێکی هاوشێوەدا، کە تەنها جیاوازی نێوان پشکنینی دووەم و سێیەم ئەوەبوو کە ئایا خۆبەخشەکە بەڕۆژوو بوو یان نا.

لەرێی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەوە ئەنجامەکان بەشێوەیەکی ژمێریاریی دەرهێنران، ئەویش بە بەراورد کردنی ئەنجامەکانی پشکنینی سێیەم بە

ئەنجامـەکانی دەرچـوو لـە پشـکنینی دووەمـەوە لـەڕێگای بـەکار هێنـانی یاسـای ژمێریاری (T-Test)، ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوون:

١-ماوەی ڕاهێنان کە خۆبەخشەکان تەواویان کرد لەسـەر ئـامێری ڕۆیشـتنەکە لە (٧.٣ ± ١٠.٢) دەقیقـەوە لـەپێش ڕەمەزانـدا زیـادی کـرد بـۆ (٨.١٦ ± ١٤.٤) دەقیقە لەکاتی ڕەمەزاندا، واتە توانایـان بـە ڕێـژەی (٦٥٪) باشـتر بـوو، هـەروەها ماوەی ڕاهێنانەکە بە گشتی لەکاتی ڕۆژوودا سێ ئەوەنـدە بـوو وەك لـەوەی پـێش ڕۆژووگرتن، واتە (٢٠٠٪) باشتربوو لەلای (٣٠٪)ی خۆبەخشەکان و ماوەی ڕاهێنان (٧٠٪) باشتربوو لەلای (٤٠٪)ی خۆبەخشەکان وەك لەوەی پێش ڕۆژووگرتن.

٢-خێرایی لێدانی دڵ دابەزی لە (١٧٠ ± ١٧.٧) لێدان لە دەقیقەیەکدا لـەپێش ڕەمەزاندا بۆ (١٥٩ ± ٢٢.٣) لێدان لـە دەقیقەیەکـدا لـەکاتی ڕۆژوودا، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنێت کە خێرایی لێدانی دڵ بەڕێژەی (٦٪) باشتربوو.

٣-دەرەنجامی لێدانی پەسـتانی خـوێن لـە خێرایـی لێـدانی دڵ: لـە (٢٤٤٤١ ± ٣٧٩٧) لێدان/ دەقیقە/ میللیمەتر جیوە لە پێش ڕەمەزاندا دابەزی بـۆ (٢١٢٣٢ ± ٣٩٧٢) لێدان/ دەقیقە/ میللیمەتر لە کاتی ڕۆژوودا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کـە بـە ڕێژەی (١٢٪) باشتر بوو.

٤-پلـەی هەسـتکردن بـە تەنگەنەفەسـی لـە (٥.٦ ± ٢.٣) پلـەوە لـەپێش ڕەمەزانـدا دابـەزی بـۆ (٥.٩ ± ٢.٢) پلـە لـەکاتی ڕۆژوودا، واتـە بەڕێـژەی (٩٪) باشتربوو.

٥-پلـەی هەسـتکردن بـە هیلاکـی قاچـەکان لـە (٦.١ ± ٢.٥) پلـەوە لـەپێش ڕەمەزانـدا دابـەزی بـۆ (٥.٤ ± ٢.٥) پلـە لـەکاتی ڕۆژوودا، واتـە بەڕێـژەی (١١٪) باشتربوو.

لێرەوە بە بەڵگەی زانستی سـەلما کـە ڕۆژووی ئیسـلامی کاریگـەریی سـەلبی و خراپی لەسەر کاری ماسولکەکان و توانای بەرگەگرتنی هیلاکی لاشەیی نییە.

## کاریگەریی ڕۆژووی بەردەوام لەسەر نەخۆشەکانی هەوکردنی ڕۆماتیزمی جومگەکان (Rheumatoid Arthritis):

(١٣) نەخۆشی تووشبوو بە نەخۆشی ڕۆماتیزمی (ڕۆماتۆید Rheumatoid Arthritis) پشکنینیان بۆ کرا پاش بەڕۆژوو بوونی تەواو بۆ ماوەی ١ هەفتە، ئەویش بۆ زانینی کاریگەریی ڕۆژووی بەردەوام لەسەر جۆرێك لە خڕۆکە سپیەکانی خوێن بەناوی (Neutrophil)، و هەروەها بۆ زانینی ڕەوتی حاڵەتی نەخۆشیەکە لەلای ئەو نەخۆشانە، ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوون:

* کێشی نەخۆشەکان بە بڕی (١-٥) کغم کەمی کرد.
* هەوکردن لە جومگەکاندا باشتر بوو، و خێرایی نیشتنیش تێیاندا کەمی کرد.
* لە کاتی ڕۆژوودا توانای لەناوبردنی بەکتریاکان زیادی کرد.

توێژینەوەکە ئەوەی دەرخست کە پەیوەندیەك هەیە لە نێوان باشبوونی هەوکردنەکانی جومگەکان و زیادبوونی توانای خڕۆکە سپیەکان لە خوێندا لە جۆری (Neutrophil) بۆ لەناوبردنی بەکتریا و باشتربوونی باری کلینیکی نەخۆشەکانی ڕۆماتۆید لەگەڵ بەڕۆژوو بوونی بەردەوامدا.

## کاریگەریی ڕۆژووی بەردەوام لەسەر ڕژێنە جنسیەکان:

گۆڤاری (کوێرە ڕژێنەکان و زیندەچالاکی کلینیکی)ی جیهانی لە ژمارە ٥٣ی ساڵی ١٩٨١دا توێژینەوەی کۆمەڵێك زانا و پزیشکی بڵاوکردەوە، کە تێیدا هەستابوون بە لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ڕۆژوو لەسەر ڕژێنە جنسیەکان لەلای نێرینە، توێژینەوەکە لە نەخۆشخانەی (ماساتشوستس) لە ئەمریکا سازدرا، لەسەر ٦ کەسی تەندروستی قەڵەو کە تەمەنیان لە نێوان (٢٦-٤٥) ساڵدا بوو، توێژینەوەکە کرا بە ٣ قۆناغەوە:

١- قۆناغی یەکەم قۆناغی هەڵسەنگاندن و کۆنترۆڵ بوو (Control): کە ٣ ڕۆژی خایاند، و ئەو کەسانە خواردنی ئاسایی خۆیان درایە بەپێی ئەو سیستەمە ڕۆژانەیەی کە خۆیان پێشتر هەیانبوو.

٢- قۆناغی دووەم: قۆناغی بەڕۆژوو بوون بوو، کە ئەو کەسانە بە تەواوەتی بەڕۆژوو دەبوون بۆ ماوەی ١٠ڕۆژی لەسەریەك، کە ڕۆژووی تەواو ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ جۆرە خواردن یان خواردنەوەیەك، چ لە ڕۆژ و چ لە شەودا ڕێنادرێت بەکاری بهێنن، تەنیا ئاوی ڕووت نەبێت کە ڕێیان دەدرا لە ڕۆژ و لە شەودا بیخۆنەوە.

٣- قۆناغی سێیەم: دووبارە خواردن پێدانەوەیان کە بۆ ماوەی ٥ڕۆژی تر بەردەوام بوو.

لە ڕۆژەکانی دواییدا شیکاری خوێنیان بۆ ئەنجامدرا بۆ دیاریکردنی ئاستی هۆرمۆنە جنسیەکان لە خوێنیاندا، ئەویش لەم ڕۆژانەدا:

١- ڕۆژی دووەم: واتە لە کاتی هەڵسەنگاندندا.

٢-ڕۆژی یانزەیەم: واتە لە کاتی ڕۆژوودا، کە دەیکردە ڕۆژی هەشتەمی ڕۆژوو گرتنەکەیان.

٣- ڕۆژی شانزەیەم: واتە لە سێیەم ڕۆژی پێدانەوەی خۆراکدا.

هەروەها شیکاری خوێنیان بۆ دەکرایەوە پاش ئەوەی کە ژێرمێشکە ڕژێنیان ئاگادار دەکرا و هاندەدرا بەهۆی هۆرمۆنی (L.R.H.)، ئەویش لە ڕۆژەکانی سێیەم، و دوانزەیەم، و حەڤدەیەمدا، ئەم هۆرمۆنە جنسیانەی خوارەوە توێژینەوەیان لەسەر ئەنجامدرا:

١- هۆرمۆنی نێرینە، یان تێستۆستیرۆن (Testosterone).

٢- هۆرمۆنی چالاك کەری هێلکۆکەکان (F.S.H.).

٣- هۆرمۆنی (L.H.).

هـــەردوو هۆرمـــۆنی چـــالاك كـــەری هێلكۆكـــەكان (F.S.H.) و (L.H.) لـــە هۆرمۆنەكانی گەشەپێكەری رژێنە جنسیەكان دادەنرێن (Gonadotropins)، ئەنجامەكانی توێژینەوەكە بەم شێوەیە بوون:

١- هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن) بە شێوەیەكی بەرچاو رێژەكەی دابەزی لە كاتی رۆژوودا، كە ئەم دابەزینە بۆ ماوەی ٣رۆژ دوای خۆراك پێدانەوە بەردەوام بوو، لە رۆژی چوارەمی خۆراك پێدانەوەدا ئاستی ئەم هۆرمۆنە زۆر بەرزبووەوە بە شێوەیەك كە ئاستی ئاسایی پێش رۆژووبوونیشی تێپەڕان.

٢- رژانـــدنی هۆرمۆنـــەكانی گەشـــەپێدەری رژێنـــەكانی زاووزێ لـــە میـــزی بەشـداربووەكاندا زیـادی كـرد، بـۆ هـەردوو هۆرمـۆنی: چـالاككەری هێلكۆكـەكان (F.S.H.) و هۆرمۆنی (L.H.) بە شێوەیەكی زۆر لە كاتی رۆژوودا، كە ئەمە بۆ ماوەی ٣ رۆژ دوای تەواوبوونی رۆژوو بەردەوام بوو.

٣- زیادبوونی رژاندنی هۆرمۆنی (L.H.) لە خوێندا لەكاتی رۆژوودا، كە ئەمـە شـــتێكی چـــاوەڕوان كـــراوە بـــەهۆی دابـــەزینی رێـــژەی هۆرمـــۆنی نێرینـــە (تێستۆستیرۆن).

٤- هۆرمۆنی چالاككەری هێلكۆكەكان (F.S.H.) لـەكاتی رۆژوودا لـە خوێنـدا دابــەزی، كــە وا چــاوەڕوان دەكــرا رژانــدنی زیادبكــات، لەوانەیــە ئەمــە ئــەوە روونبكاتــەوە كــە رۆژوو كاریگەریــەكی دیــاریكراوی هەیــە لــە دابەزانــدنی توانــای جنسیدا.

لێرەوە دەركەوت كە رۆژووی ماوەیـەكی دیـاریكراو (١٠ رۆژ)ی بـەردەوام بـووە هۆی دابەزاندنێكی بەرچاو لـە هۆرمۆنـەكانی نێرینـەدا (تێستۆسـتیرۆن)، كـە بـووە هـۆی لاوازكردنــی ئـارەزووی جنســی، ئـەم كاریگەرییـە كاتییـە و كارناكاتـە سـەر شانەكانی تایبەت بە پیتاندن، و كاریگەریەكەی دوای ٣ رۆژ لە خۆراكپێدان نەما، و لە رۆژی چوارەمی دوای خۆراك پێدانەوەدا ئاستی هۆرمۆنی نێرینە بەرزبووەوە بـۆ

ئاستێکی زیاتر لەوەی پێش دەست پێکردنی ڕۆژوو هەیبوو، ئەمە ڕوونی دەکاتەوە کەوا کاریگەریی ڕۆژوو لەسەر ئارەزووی جنسی بە ٢ قۆناغدا دەڕوات:

یەکەم: دابەزاندنی ئارەزووی جنسی لە ماوەی ڕۆژوودا و بۆ چەند ڕۆژێکی کەمیش دوای ڕۆژوو گرتن[٩٤].

دووەم: بەرزکردنەوەی ئاستی توانا جنسیەکان و باشترکردنیان دوای تەواو بوونی ماوەی ڕۆژووەکە، بۆ ئاستێکی باشتر لەوەی پێش دەست پێکردنی ڕۆژوو هەیبوو.

## ڕۆژووی ڕەمەزان وکاریگەریی لەسەر هەندێك لەنەخۆشیەکانی بۆریەکانی خوێنی پەلەکان:

زۆرێك لە نەخۆشی هەیە کە تووشی لوولە خوێنەکانی پەلەکان دەبێت، کە وادیارە پەیوەندی هەیە بە چالاکی زیادی کۆئەندامی دەماریی بەسۆز (سیمپەساوی) لەکۆتایی خوێنبەرەکانی خوێندا (Arterioles)، نەخۆشی راینۆید (Raynoud's disease) یەکێکە لەو نەخۆشیانە، کە تێیدا ماسولکەکانی دیواری خوێنبەرەووردەکان خۆییانە گرژدەبن بەشێوەیەکی زۆر توند، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی ئازاری زۆر توند لە پەلەکاندا، ئەم تاوی ئازارانە زیاتر لە کاتی سەرمابوون یان پەستانی دەروونیدا دروست دەبن، کە ئەگەر بێتو بۆ چەند ساڵێك بەردەوام بێت لەوانەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی ئەو پەلانە، بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشیە سەرمابوون تا بتوانرێت قەدەغەیە، دەبێت ئەو کەسە واز لە جگەرەکێشان بهێنێت، و نەخۆشەکە هەندێك دەرمانی

---

[٩٤] لێرەدا راستیی و گەورەیی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ دەردەکەوێت کە دەفەرموێت: ﴿یا مَعْشَرِ الشَّباب! مَن استطاعَ مِنكم الباءَةَ فَلْيَتَزَوَّج، فَإِنَّه أَغَضُّ للبَصَر وَأحصَنُ للفَرج، وَمَن لَم يَسْتَطِع فَعَلَيه بِالصَّوم فَإِنَّه لَه وِجاء﴾ واتە: ڕۆژوو پارێزەرە بۆ مرۆڤ لە کەوتنە ناو تاوانە جنسیەکانەوە، وەك لەسەرەوە روون کراوەتەوە ئارەزووی جنسی مرۆڤ بە تەواوی دادەبەزێنێت.

فراوانکەری بۆرییەکانی خوێنی دەدرێتێ، هەروەها ئەو دەماری سیمپەساویەی کە دەچێت بۆ ئەو پەلانە دەبڕدرێت، و دەبێت ئەو کەسە دوور بێت لە پەستانە دەماری و دەروونیەکان.

نەخۆشیەکی تر هەیە بە ناوی (Buerger's disease) کە لە هەمان جۆری پێشووە، و کاردەکاتە سەر خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی پەلەکان، جگەرەکێشان ئەم نەخۆشیە چالاك دەکات و خراپتری دەکات، و لە کاتی وازهێنان لە جگەرەکێشان نەخۆشەکە بەشێوەیەکی بەرچاو باش دەبێت، هەندێك لە نەخۆشەکان لەوانەیە پێویستی بێت بە بڕینی ئەو دەمارە سیمپەساویەی کە دەچێت بۆ پەلەکان، لە کۆتاییدا لەوانەیە ئەو نەخۆشە پێویست بکات کە پەلەکانی بۆ ببڕدرێتەوە ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر جگەرە کێشان.

(د. صباح الباقر) لە توێژینەوەیەکدا لە ساڵی ١٩٩١ باسی ئەوە دەکات کە ڕۆژووی ئیسلامی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە چارەسەری نەخۆشیەکانی لوولە خوێنە ووردەکاندا، کە ئەم ڕۆڵەی لە ٢ خاڵدا کورت کردووەتەوە:

١- حەرامکردنی جگەرەکێشان لە کاتی ڕۆژوودا خزمەتێکی گەورە دەبەخشێت بەو نەخۆشانە لە چارەسەری نەخۆشیەکەیاندا.

٢- ڕۆژوو هیچ جۆرە قورسیەك یان پەستانێك لەسەر لەش دروست ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە فاکتەرێکی هێمنکەرەوە دادەنرێت، کە تێیدا بنەماکانی بەهێزکردنی ئیمان چالاك دەبن، وەك: نوێژکردنی زۆر و زیکر و یادی پەروەردگار و خوێندنەوەی قورئان.

توێژینەوەکان لەسەر ئاژەڵانی تاقیکردنەوە سەلماندیان کە کەمبوونێکی بەرچاو هەیە لە چالاکیی کۆئەندامی دەماریی بەسۆز (سیمپەساوی)دا لەکاتی بێبەشکردنی ئەو ئاژەڵانە لە خۆراك، لێرەوە (د. الباقر) گەیشتە ئەوەی کە خاوکردنەوەی کۆئەندامی دەماریی بەسۆز لە کاتی ڕۆژوودا فاکتەری دووەمی

دروستکەری ئـەو نەخۆشـیانەی سـەرەوە لادەبـات، و لێـرەوە سـوودی ڕۆژووی ئیسلامی دەردەکەوێت لە چارەسەری ئەم جۆرە نەخۆشیانەدا.

## کاریگەریی ڕۆژووی ئیسلامی لەسەر ئایۆنەکان و پاڵاوتن بۆ ناو میز و خوێن:

(د. صباح الباقر) توێژینەوەیـەکی ئەنجامـدا لەسـەر ١٠کەسـی تەندروسـت لـە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (شا سعود) لە شاری (ریاض) لە کاتی مانگی ڕەمەزانـدا، بینی کە زیادبوونێکی گرنگ هەیە لە ڕێژەی صـۆدیۆم و پۆتاسـیۆم لـە میـزدا، کـە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ توانای گورچیلەکان بۆ خەسـت کردنـەوەی میـز و زیـادبوونی کـاری هۆرمـۆنی دژەدەردانـی میـز (Antidiuretic Hormone)، بـەڵام زیادبوونێکی گرنگ نەبینرا لە هێزی پاڵاوتندا (Osmosis) لە میزدا.

هەروەها زیادبوونێکی گرنگی تر هەبوو لە خەسـتیی صـۆدیۆم و پۆتاسـیۆم لـە خوێندا، توێژەرەکە دەڵێت لە چوارچێوەی ڕێژەی ئاسایی ڕێپێدراودایە.

لێرەوە دەرکەوت کـە ڕۆژوو فاکتـەرێکی گرنگـە لـە چالاککردنی سیسـتمەکانی لـەش بـۆ کـارکردن (لـەڕێی زیـادکردنی توانـای گورچـیلەکان بـۆ خەسـتکردنەوەی خوێیـەکانی میـز، و زیـادکردنی کـاری هۆرمـۆنی دژەدەردان)، لەگـەڵ پاراسـتنی ڕێژەی خوێکان و پاڵاوتن لە ئاستە ئاساییەکانی خۆیدا، بەوپێیە ڕۆژوو هیچ جـۆرە مەترسـییەك لەسـەر پێکهاتـەکانی خـوێن دروسـت ناکـات لـە ئایۆنـە کارەباییـە بەرەڵاکان، ولەسەر هێزی پاڵاوتن یان تێپەڕاندن لە میز یان لە خوێندا.

**سەرچاوە**: کتێبی (ڕۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە – نووسینی: د.کاوە فـەرەج سەعدون).

# رۆژوو و رزگاربوون لە ژەهرەکان

لەشی مرۆڤ رۆژانە دوچاری چەندین ماددەی زیانبەخش و ژەهر دەبێت، کە وورده وورده لە شانەکانیدا کەڵەکە دەبن، زوربەی ئەم ژەهرانە لەرێی ئەو خواردنانەوە دێن بۆ لەش کە مرۆڤ رۆژانە بەرێژەیەکی زۆر دەیانخوات، بە تایبەتی لەم سەردەمەدا کە خۆشگوزەرانی زۆرێك لە گەلانی ئەمرۆی گرتووەتەوە، و زیادەیەکی زۆر لە پێویستی مرۆڤەکان لە خواردنە جۆراوجۆراکان هەیە، هۆکارە تەکنۆلۆجیەکانیش رۆڵێکی گەورەی بینیوە لە رازاندنەوەی ئەو خواردنانە و سەرنج راکێشانی خەڵکی بۆیان، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی خەڵکی سەربکەنە ئەم خواردنانە و بە ئارەزوویەکی زۆرەوە بیانخۆن، ئەم زۆرخۆریە رۆڵێکی گەورەی هەیە لەو تێکچوونانەی کە روودەدات لە زۆرێك لە زیندە چالاکیەکانی ناو خانەکانی لەشدا، و بەهۆی ئەمەوە چەندین نەخۆشی جۆراوجۆر و خەتەرناك رێژەیان یەکجار زیادی کردووە کە پێیان دەووترێت (نەخۆشیەکانی شارستانیەت)، لەوانە: قەڵەوی، رەقبوونی خوێنبەرەکان، بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن، جەڵتە و نۆرەکانی دڵ و مێشك و سیەکان، نەخۆشی شێرپەنجە (سەرەتان)، و نەخۆشیەکانی کۆئەندامی بەرگری و هەستیاریی.

لەشی مرۆڤ رۆژانە دوچاری چەندین ژەهر و ماددەی مەترسیدار دەبێت، سەرچاوە پزیشکیەکان بۆمان باس دەکەن کە هەموو ماددە خۆراکیەکان لەم سەردەمەدا بەرێژەیەکی کەم ژەهریان تێدایە، کە ئەم ماددانە دەخرێنە ناو پێکهاتەی خۆراکەوە لەکاتی ئامادەکردنیدا، یان بۆ هەڵگرتن و پاراستنیان لە خراپبوون، لەوانە: تامدەرەکان (تام بەخشەرەکان)، رەنگەکان، ماددە ئۆکسێنەرەکان، ماددە پارێزەرەکان، یان ئەو ماددە کیمیاییانەی دەدرێن بە رووەك یان ئاژەڵ لە کاتی گەشەکردنیدا وەك: هاندەرەکانی گەشەکردن و زۆر کەرەکان وهۆرمۆنەکان، دژە تەنەکان، هەروەها هەندێك لە رووەکەکان لە

پێکهاتەیاندا ماددەی زیانبەخشی تێدایە، یان زۆرێك لە خواردنەکان ڕێژەیەك لە زیندەوەرە وردەکانی تێدایە کە ژەهرەکانیان دەڕژێنە ناو خۆراکەکە و پیسی دەکەن، ئەمانە بێجگە لەو ژەهرانەی کە لە هەواوە ڕۆژانە هەڵیدەمژین لە: دووکەڵی ئۆتۆمبیلەکان، و گازی کارگەکان، و ژەهری ناو دەرمان کە خەڵکی بەبێ کۆنترۆڵ بەکاری دێنن، هەروەها چەندین ماددەی ژەهری تر کە لەلایەن ئەو زیندەوەرانەوە دەردەدرێن کە بە هاوژیانی بە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لەناو لەشی مرۆڤدا دەژین.

لە کۆتاییدا ئەو ژەهرانەمان لەیاد نەچێت کە لەناو لەشی مرۆڤ خۆیدا و بەهۆی لەش خۆیەوە دروستدەبن، کە ئەوانیش پاشماوەی کردای سووتاندنی خۆراك و زیندە چالاکیەکانن و لەناو خوێندا مەلە دەکەن، وەك: گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، یۆریا (Urea) و ترشی یۆریك (Uric Acid)، کریاتینین (Creatinine)، ئامۆنیا، و کبریتەکان (گۆگردەکان)، هەروەها پاشماوەکانی خۆراکی هەرسکراو و ئەو گازە ژەهراویانەی لە ئەنجامی ترشان و تێکچوونیان دروستدەبن وەك: گازەکانی (ئیندۆڵ و سکاتۆڵ و فینۆڵ).

هەموو ئەم ژەهرانە خوای پەروەردگار ڕێگای دەرکردن و فڕێدانی لە لەشەوە بۆ ئەندامەکان دیاریکردووە، ئەوەیە (جگەر) کە ئەندامی سەرەکی پاککردنەوەی لەشە لە ژەهرەکان هەڵدەستێت بە نەهێشتنی کاریگەریی زۆرێك لەم ماددە ژەهراویانە، و بەڵکو دەیانگۆڕێت بۆ ماددەی سوودبەخشی وەك: ترشەکانی ئامۆنیا و کریاتین.

بابزانین کە جگەر توانایەکی دیاریکراوی هەیە و لەوانەیە خانەکانی تووشی تێکچوون ببن بەهۆی نەخۆشیەوە یان بەهۆکاری سروشتی وەك چوون بەتەمەندا و پیربوون، کە ئەمە دەبێتە هۆی نیشتنی بەشێك لەو ماددە ژەهرانە لە شانەکانی لەشدا، بە تایبەتی لەناو عەمباری چەوریی شانە چەوریەکان لە هەموو لەشدا.




**پێکهاتەی جگەر و توورەکەی زراو و پەنکریاس روونده‌کاتەوه، بڕوانە بۆریەکانی زراو که لە جگەرەوە کۆدەبنەوە بۆ پێکهێنانی یەك بۆری زراو کە لە کۆتاییدا دەرژێتە ناو ریخۆڵەی دوانزەگرێ.**

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە پزیشکیەکان دەبینین بۆمان باس دەکەن کە جگەر هەڵدەستێت بە گۆڕینی کۆمەڵێکی زۆر لە گەردە ژەهرییەکان (کە زۆربەیان لە چەوریدا دەتوێنەوە) بۆ چەند گەردێکی تری بێزیان کە لەناو ئاودا دەتوێنەوە، و جگەر دەتوانێت لەرێی کۆئەندامی هەرس یان گورچیلەکانەوە لە لەش بیانکاتە دەرەوە، لەکاتی رۆژوودا رێژەیەکی ئێجگار زۆر لە چەوری هەڵگیراو لە لەشدا دەنێردرێت بۆ جگەر بۆ ئەوەی تێیدا بتۆکسێنرێن، و سوودیان لێوەرگیرێت بۆ دروستکردنی ووزە لە شانەکاندا، لەهەمان کاتدا ژەهرە کەڵەکەبووە تەواوەکان لەناو ئەم چەوریانەدا جیادەکرێنەوە و جگەر هەڵدەستێت بە نەهێشتنی ژەهرییەکەیان و پاشان فرێ دەدرێنە دەرەوەی لەش لەگەڵ پاشەرۆکاندا.

هەروەها ئەم چەوریانەی کە لەکاتی رۆژوودا لە جگەردا کۆدەبنەوە و لە عەمبارە جۆراوجۆرەکانی لەشەوە دێن، ئەو کۆلیسترۆڵەی تێیاندایە یارمەتی کۆنترۆڵکردن و زیادکردنی دروستکردنی پێکهاتەکانی زەرداوی جگەر دەدات، کە ئەمیش هەڵدەستێت بە تواندنەوەی ماددە ژەهرییەکان و دوایی لەرێی پیساییەوە دەکرێنە دەرەوە، رۆژوو کارێکی سوودبەخش و خزمەتێکی گەورەی خانەکانی جگەر دەکات بەوەی کە دەبێتە هۆی ئۆکساندنی ترشە چەورییەکان و ئەم خانانە رزگاردەکات لەم چەوریانەی تێیدا هەڵگیراوە، ئەمە دەبێتە هۆی چالاککردنی ئەم خانانەی جگەر و بەباشترین شێوە بە کارەکانیان هەڵدەستن.

لێرەوە زۆرێك لە ماددە ژەهرییەکان ناچالاك دەکەن، ئەویش بەوەی کە ترشی (کبریتیك) یان ترشی (گلوکۆنیك)یان بۆ زیاد دەکەن، و پاشان لە لەش دەکرێنە دەرەوە، هەروەها جگەر هەڵدەستێت بە قووتدانی ماددە وورده زیانبەخشەکانی ناو خوێن، وەك: ووردیلەکانی کاربۆن کە بەهۆی چەند خانەیەکی تایبەت کە ناسراون بە خانەکانی (توبفر) لەناو جگەردا ئەم مادانە کۆدەکەنەوە، و لەگەڵ زەرداودا فرێی دەدەنە ناو ریخۆڵەوە، لەکاتی رۆژوودا چالاکی ئەم خانانە لە بەرزترین رێژە و ئاستیدا دەبێت بۆ هەستان بە کارەکانیان، لەلایەکی تریشەوە هەڵدەستن بە قووتدانی بەکتریاکانیش ئەویش پاش ئەوەی کە دژە تەنەکان هەڵدەستن بە کوشتنیان.

لەبەرئەوەی کرداری تێکشکاندنی خۆراك (Catabolism) لەناو جگەردا لەکاتی رۆژوودا زاڵترە لە کرداری بنیاتنان، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بواری زیاتر هەبێت بۆ کردنە دەرەوەی ژەهرە کەڵەکەبووەکانی ناو لەش لەم کاتەدا، هەروەها چالاکی خانەکانی جگەریش بۆ لەناوبردنی ژەهرێتی زۆرێك لە ماددە ژەهرەکانیش زیاد دەکات، کەواتە رۆژوو هۆکارێکی تەندروستی گەورەیە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش، دکتۆر (ماك فادوون) یەکێکە لەو پزیشکانەی گرنگیان بە رۆژوو و

کاریگەریـەکانی داوە دەڵێـت: (هـەموو مرۆڤێـك پێویسـتی بـە ڕۆژوو هەیـە ئەگـەر نەخۆشیش نەبێت، لەبەرئەوەی ژەهری خواردەمەنی و دەرمانەکان کە لەناو لەشدا کۆدەبنەوە، و وەك نەخۆشی لێدەکەن و باری قورس دەکـەن و چـالاکیەکانی کـەم دەکەنەوە، هەرکاتێك مرۆڤ بەڕۆژوو ببێت لـەم بـارە قورسـەی ژەهرەکـان ڕزگـاری دەبێت و هەست بە چالاکی و هێزێك دەکات کە پێشتر هەستی پێنەکردووە).

## ڕۆژوو و جگەرەکێشان و مەی خواردنەوە:

هەردوو ئەم خووە پێچەوانەیە لەگەڵ کرداری ڕۆژوو گرتنـدا، بـە شـێوەیەك کـە ڕۆژوو هەرگیز یەك ناگرێتەوە لەگەڵ جگەرە کێشـان و مـەی خواردنـەوەدا، نهێنـی ئەمەش ئەوەیە مـەی کحـولی تێدایـە کـە بڕێکـی زۆری لـە ووزە و کـالۆری تێدایـە، بەکارهێنانی هەر شتێکیش کە بڕێکی گەورەی لە ووزە تێدا بێت پێچەوانەیە لەگەڵ بنەماکانی ڕۆژوو گرتندا، ئەمە سـەرەڕای ئـەو نەخۆشـیە خەتەرناکانـەی کـە مـەی خواردنەوە دروستی دەکات (لە پـێش هەموویانـەوە چـەندین جـۆری شـێرپەنجە)، هەروەها جگـەرە کێشانیش پێچەوانەیە لەگـەڵ ڕۆژوودا بـەهۆی ئـەو تێکچـوون و نەخۆشیە تێکدەرانەی دروستیدەکات، و دەبێتە هۆی بێسوود کردنی ڕۆژووەکە.

لەلایـەکی تـرەوە بینـراوە ئەوانـەی خوویـان بـە مـەی خواردنـەوە و جگـەرە کێشانەوە گرتووە و ئالوودەبوون، ئەگەر بەڕۆژوو بن ئەوا بە ئاسانتر دەتـوانن واز لەو خووانە بهێنن و کـەمتر تووشـی ئـەو نیشـانە ناخۆشـانە دەبـن کـە خـەڵکی تـر لەکاتی وازهێنانیاندا تووشی دەبن.

ئەویش لەبەرئەوەیە کە لەش لە کاتی ڕۆژوودا چالاکیەکی بۆ دروست دەبێت لە دژی کاریگەریـەکانی نیکـۆتین (لـە جگـەرەدا)، و مـاددەی کحـول (لـە مـەی دا)، هـەروەها لـەش توانـای ئـەوەی بـۆ دروسـت دەبێـت کـە خـۆی لەهـەموو خـووە خراپەکانی تریش ڕزگار بکات، وەك: بەکارهێنانی مـاددە سڕکەرەکان (المخـدرات) و زیادڕەوی کردن لە خواردنەوەی چا و قاوەدا.

ئێستا دەرکەوتووە کە لەشی ئادەمیزاد لە کاتی ماوەیەکی رۆژووی درێژدا (وەك رۆژووی مانگی رەمەزان)، ئیتر قبوڵی ماددەی ناتەندروست و زەرەر گەیەنەر بە فیسۆلۆجی لەش ناکات، وەك ماددە سەرخۆشکەرەکان و ماددە سڕکەرەکان، بەشێوەیەك کە لەش پێیان ناڕەحەت دەبێت ئەگەر لە کاتی رۆژوودا بەکاریان بهێنێت بەبڕی کاتەکانی پێش رۆژوو و لەوانەیە بگاتە راددەی کوشتنی ئەو کەسە.

هەروەها بەتازەییش ئەو بۆچوونە پەیدابووە کە لەشی مرۆڤ بە هەمان شێوە لەدوای ماوەیەکی رۆژووی درێژ قبوڵی ماددەی نافیسیۆلۆجی ناکات، لەگەڵ ئەمەشدا رۆژوو هەستکردن بە چالاکی و بەسووکی لەش دەبەخشێت، کە ئەمە هۆکارێکی زۆر یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی یەکجارەکی یان جوزئی واز لەو عادەت و خووگرتنە بهێنێت کە هەیەتی بە ماددە کحولیەکان و تووتن و ماددە سڕکەرەکان کە بەداخەوە زۆرێك لە گەنجانی ئەمڕۆ گیرۆدەی بوون.

## زیانە تەندروستیەکانی جگەرەکێشان:

لێرەدا بەتایبەتی حەزدەکەم کەمێك دەربارەی جگەرەکێشان و زیانەکانی بدوێین کە زۆرێك لە هاوولاتیانمان گیرۆدەی ئەم عادەتە ناتەندروستی و زیانبەخشە بوون.

جگەرەکێشان هەڵمژین و دانەوەی ئەو گازانەیە کە لە ئەنجامی نەسووتانی تەواوی رووەکی تووتنەوە دروست دەبێت بەشێوەی جگەرە، سیگار، سەبیل یان نێرگەلە، دووکەڵی جگەرە زیاتر لە ٤٠٠٠ ماددەی تێدایە کە چالاکن لەرووی کیمیاییەوە، ئەم ماددانە لەرووی دەرمانسازییەوە: چالاك، ژەهراوی، ورووژێنەر و بازپێدەرن، کە بەلایەنی کەمەوە ٤٣ ماددەیان لەرووی زانستیەوە سەلماوە کە دروستکەری شێرپەنجەن (Carcinogenic).

ئەو کەسەی رۆژانە پاکەتێك جگەرە دەکێشێت ساڵانە ٧٠.٠٠٠ قومی دووکەڵی جگەرە دەکاتە ناو سییەکانیەوە، بەتایبەتی ناوپۆشی دەم، لووت، قوڕگ،

قورقوڕاگە، ولقەکانی بۆرییەکانی هەناسە ڕاستەوخۆ و بەبەردەوامی دووچاری ئـەم دووکەڵە دەبێت، هەندێك پێکهاتەی ڕاستەوخۆ کاردەکاتـە سـەر ئـەم ناوپۆشـانە و هەندێکیان بۆ ناو خوێن دەمژرێن یان لەناو لیکدا دەتوێنـەوە و قـووت دەدرێـن بـۆ ناو کۆئەندامی هەرس، ودواتر دەچنە سووڕی خوێنەوە کاردەکەنەسەر ئەندامەکانی تر.

| ت | هەندێك پێکهاتەی دوکەڵی جگەرە | کاریگەرییەکەی |
|---|---|---|
| -١ | قەتران (Tar) | دروستکەری شێرپەنجە |
| -٢ | نیکۆتین (Nicotine) | ماددەیەکی ئالوودەکەر (إدمان) |
| -٣ | فینۆڵ (Phenol) | هەژێنەر و دروستکەری شێرپەنجە |
| -٤ | کریسۆڵ (Cresol) | هەژێنەر و دروستکەری شێرپەنجە |
| -٥ | بیتا نافثال ئەمین (B-Naphthylamine) | دروستکەری شێرپەنجە |
| -٦ | بێنزۆپایرین (Benzo Pyrene) | دروستکەری شێرپەنجە |
| -٧ | ئیندۆل (Indole) | خێراکەری شێرپەنجە |
| -٨ | کاربازۆڵ (Carbazole) | خێراکەری شێرپەنجە |
| -٩ | یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن (CO) | مژین و گواستنەوەی ئۆکسجین پەکدەخات |
| -١٠ | ترشی هایدرۆسیانیك (Hydrocyanic acid) | هەژێنەر و ژەهراوی بۆ ناوپۆشی بۆری هەناسە |
| -١١ | ئەکرۆلین (Acrolein) | هەژێنەر و ژەهراوی بۆ ناوپۆشی بۆری هەناسە |
| -١٢ | ئامۆنیا (Ammonia) | هەژێنەر و ژەهراوی بۆ ناوپۆشی بۆری هەناسە |
| -١٣ | فۆرمالدیهاید (Formaldehyde) | هەژێنەر و ژەهراوی بۆ ناوپۆشی بۆری هەناسە |
| -١٤ | نایترۆزئەمین (Nitrosamines) | دروستکەری شێرپەنجە |

گرنگترین و زەرەرمەندترین ماددەی جگەرە (نیکۆتینە)، کە بەرپرسە لە خاسیەتی ئالوودەبون بەدووکەڵی جگەرە، ژەهرێکی بێرەنگە و بەکاردێت لە دروستکردنی ماددە لەناوبەرەکانی رووەك و مێرووە زیانبەخشەکاندا، ئەگەر نیکۆتینی ناو یەك جگەرە جیابکرێتەوە و لەرێی خوێنەوە بەدەرزی بدرێت لە مرۆڤ ئەوا دەبێتە هۆی: دڵتێکهەڵهاتن، رشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، سەرگێژخواردن، سستبوونی لێدانی دڵ، و لە کارلێکە بەهێزەکاندا لەوانەیە ببێتە هۆی ئیفلیجبوونی ماسولکەکانی هەناسە و مردن.




دووکەڵی جگەرە گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن (Carbon Monoxide)ی تێدایە بەرێژەی ٢-٦٪، کە ئەم گازە بەربەرەکانی لەگەڵ ئۆکسجیندا دەکات بۆ یەکگرتن لەگەڵ هیمۆگلۆبینی خوێن و گازێکی خنکێنەرە، هەروەها ئەم دووکەڵە ماددەی هەژێنەری بەهێزی تێدایە بۆ رووپۆشی کۆئەندامی هەناسەدان و ماددەی ژەهراوی بۆ تووکەکانی ناوپۆشەکەی (Ciliotoxins)، کە سەرەنجام جووڵانی ئەم تووکانە پەکدەخات و دەبێتە هۆی کەڵەکە بوونی بەڵغەم و دەردراوەکان لە بۆریەکان و ناوسییەکاندا و دروستبوونی هەوکردنی کتوپڕ و درێژخایەن.

بەپێی ئامارەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) ئێستا لە جیهاندا ٢ملیار کەسی ئالوودەبوو (مدمن) لەسەر جگەرەکێشان هەیە (بەو کەسانە دەووترێت کە رۆژانە زیاتر لە ١٠جگەرە دەکێشن)، کە نزیکەی سێیەکی دانیشتووانی زەوی دەکات، و دوو لەسەر سێی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندان،

جگـــەرە كێشـــەكان تەمـــەنیان لەســـەروو ١٥ســـاڵیەوەیە و نزیكـــەی ســـێیەكی جگەرەكێشەكانیش لە جیهاندا ئافرەتن.

ساڵی (٢٠٠١) لـە جیهانـدا زیـاتر لـە (٦٠٥.٠٠٠.٠٠٠.٠٠٠.٠٠٠) جگـەرە كێشـراوە، ڕۆژانە بە ڕێژەی ٢جگـەرە بـۆ هـەر كەسـێك لـە دانیشـتووانی سـەر زەوی دروسـت دەكرێت لەلایەن كارگەكانـەوە، كارگـەكانی جگـەرە سـاڵانە ١٠ملیـار دۆلار سـەرف دەكەن بۆ پڕوپاگەندە و هاندانی گەنجان بۆ دەستكردن بە جگەرەكێشان، چـونكە بازاڕی جگەرە ڕۆژانە پێویسـتی بـە (١١٠٠٠) كەسـە بـۆ پڕكردنـەوەی شـوێنی ئـەو كەسانەی كە بەهۆی جگەرەوە گیانیان لەدەست دەدەن.

ئەو جگەرەیەی كە دەنێردرێت بۆ وولاتـە تـازە پێگەیشـتووەكان چـەندین جـار كاریگەریی خراپترە لەو جگەرەیەی كە بۆ وولاتانی پێشكەوتووی ڕۆژئـاوا دروسـت دەكرێت، بینراوە كە دوو ئەوەنـدە نیكۆتین و قـەترانی تێدایـە، بـا بـە ئەفسـانەی جگـەرەی سـووك و پاڵفتـەكراویش هەڵنەخەڵـەتێین، ١٠ بـۆ ١٥سـاڵ پـێش ئێسـتا ناوەندی تەمەنی كەسانی جگەرەكێش بە ٦٠ساڵ مەزەندە دەكرا، بـەڵام ئێسـتا و لەسـایەی جگـەرە سـووك و پاڵفتەكراوەكانـدا تەمـەنی چـاوەڕوانكراوی كەسـانی جگەرەكێش ٥٥ ساڵ و كەمتریشە ! !

بـەهۆی كاریگـەریی جگـەرەوە سـاڵانە ٤ ملیـۆن كـەس لـە جیهانـدا گیانیـان لەدەست دەدەن، ڕۆژانە ١١٠٠٠ كەس و لە هەر ٨ چركەیەكدا ١ كەس پێی دەمرێت و لـە هـەمان مـاوەدا یـەكێكی تـر دەسـت بـە جگەرەكێشـان دەكـات، لـە سـەدەی بیستدا بەهۆی جگەرە كێشانەوە ١٠٠ ملیۆن كەس گیانیان لەدەسـتداوە (لـە كـۆی قوربانیـانی هـەردوو جـەنگی جیهـانی زیـاتربووە)، لـە كـۆی قوربانیـانی هـەموو نەخۆشـیە درمیـەكانی وەك (كـۆلێرا، تـاعوون، سـیل، گـولی، گرانـەتا) زیـاتربووە، پێشبینیش دەكرێت لە ساڵی (٢٠٢٠)دا ژمارەی قوربانیانی ساڵانەی بگاتە ١٠ملیۆن كەس، كە زیاتر لە ٧٠٪ی لە وولاتانی تازە پێگەیشتوودا دەبێت، زانایان ئەو بڕوایـەیان هەیە كە كێشانی هەر جگەرەیەك ٢٠ دەقیقە لە ژیانی ئەو كەسە كەم دەكاتەوە.

جگەرەکێشان بەرپرسە لە ٢٥ هۆکاری جیاواز بۆ مردنی مرۆڤ وەك: مردنی کوتوپڕ (Sudden Death)، شێرپەنجە جۆراو جۆرەکان (السرطانات) بەتایبەتی شێرپەنجەکانی کۆئەندامی هەناسە هەر لە دەم و لووتەوە تا ناو سییەکان وەك: شێرپەنجەی (دەم، قورگ، قورقوڕاگە، سورێنچك، سییەکان، گەدە، میزەڵدان، گورچیلە، پەنکریاس، جگەر، خوێن وکۆئەندامی زاووزێ)، زیاتر لە ٩٥٪ی شێرپەنجەی سییەکان بەهۆی دووکەڵی جگەرەوەیە، کێشانی ١ پاکەت جگەرە لە رۆژێکدا چانسی توشبوون ١٠ جار زیاددەکات، کێشانی ٢ پاکەت چانسەکە زیاد دەکات بۆ ٢٥ جار، هەروەها نەخۆشییەکانی دڵ و کۆئەندامی سووڕانی خوێن، گیرانی درێژخایەنی بۆرییەکانی هەناسە (COPD)، و چەندین نەخۆشی کوشندەی تر. (**بڕوانە وێنە روونکەرەوەکانی لاپەڕە ٥٢٥-٥٢٧**)

نێرگەلە جۆرێکی ترە لە بەکارهێنانی تووتن، توێژینەوە نوێکان دەڵێن یەك دانیشتنی نێرگەلە لەوانەیە بەرامبەر کێشانی ١٠٠ جگەرە بێت، پیاوان ٢٠٪ و ژنان ٦٪ نێرگەلە دەکێشن، توتنەکە شەکر یان بۆنی تێدەکرێت و پێیدەووترێت معسل، کاتێك ئەمیش دەسووتێت ماددەی شێرپەنجەیی لێدروست دەبێت، هەروەها هەندێك جار تووتنەکە تێکەڵ دەکرێت بە ئاردی تەختە و دەبێتەهۆی دروستبوونی گازی (CO2) کە خنکێنەرە، هەروەها گلیسرین کە بە سووتان دەبێتە (ئەکرۆلین) کە ماددەیەکی شێرپەنجە دروستکەرە، ئاوی نێرگەلە هیچ پوختە ناکات، پاڵاوتنی= سفر، هەروەها بوونی میکرۆبی جۆراوجۆر لە ئاوەکەدا.



دەبێتــە هــۆی زیــادبوونی مردنــی کوتــوپڕی منــداڵان لــە ســاڵی یەکەمیانــدا (Sudden Infant Death Syndrome or SIDS) ئەگەر بێتـو بـە بــەردەوامی دووچــاری تــوتن و دووکەڵەکــەی بــبن لــە جگەرەکێشــانی دایــك وباوکیانەوە، هەوکردنە میکرۆبیەکانی کۆئەندامی هەناسە لە جگەرەکێشدا زیاترن و زوو زوو ڕوودەدەن و لەوانەیە ببنــە هــۆی مــردن بــەهۆی هــەوکردنی ســییەکان و ئینفلوەنزاوە، جگەرەکێشان لەوانەیە ببێتە هۆی نەزۆکی و کەمتوانایی سێکسی.

ئەو ئافرەتە دووگیانانەی کە جگەرە دەکێشن منداڵەکانیان بە ڕێژەی ٢٥٠ گرام کێشـیان لـە منـداڵانی تـر کـەمترە، مەترسـی منـداڵ لەبارچـوون و مردنـی منـداڵ لەناوسکدا و مردنی منداڵ دوای لەدایك بوون زیاتر دەکات، جگەرەکێشان مەترسی تووشبوون بە قورحەکانی گەدە و دوانزەگرێ زیاتر دەکات.

جگەرەکێشـان ڕوخسـاری مـرۆڤ زوو پـیر و چـرچ دەکـات، لەوانەیـە داخـورانی ئێسـکەکان، و ئـاوی سـپی چـاو و تێکچـوونی خـەو و خـەمۆکی (Depression) دروست بکات.

دیاردەیەکی تری مەترسیدار هەیە کە پێیدەوترێت جگەرەکێشـانی خۆنەویسـت یـان ناچـالاك (Passive Smoking)، کـە بریتییـە لـەوەی کەسـێك خـۆی جگەرەکێش نییە بەڵام لە باردودۆخێکدا یان لەگەڵ کەسانی جگەرەکێشدا دەژی، بینراوە ئەم کەسەش کاتێك دووکەڵی جگەرەی نـاو ژوورەکـە هەڵدەمـژێت زوربـەی ئەو ماددە زیانبەخشانەی کە باسمان کرد دەچێتە سـیەکانیەوە، پێشـتر وادەزانـرا کە تەنیا زەرەری بۆ چاوەکان هەیە و سووربوونەوە دروست دەکات، بـەڵام ئێسـتا بـە هۆکـارێکی شـێرپەنجەی سـیەکان و نەخۆشـیەکانی دڵ دەزانرێـت لـە کەسـانی جگەرەنەکێشـدا، جگەرەکێشـانی بـاوك و دایـك لەوانەیـە ببێتـە هـۆی تووشـبوونی منداڵــەکان بــە هەوکردنــە درێژخایەنــەکانی کۆئەنــدامی هەناســە، نەخۆشــی تەنگەنەفەسی (ڕەبو Asthma)، هـەوکردنی گـوێی نـاوەوە، و نەخۆشـییەکانی

دڵ، زوربەی ئەو منداڵانەی دەست بە جگەرەکێشان دەکەن وەك چاولێکەرییەکە بۆ دایك و باوکیان، لێرەوە پێویستە هەموو لایەك ئەو دروشمە بەرز بکەینەوە کە: (جگەرەکێشانی تۆ زەرەری بۆ منیش هەیە).





# بەها تەندروستییەکانی رۆژوو

رۆژووگرتن یان وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بریتییە لەو کردارەی کە زۆرێك لە گەلان و خاوەن بیروبڕوا جیاوازەکان پێی هەڵدەستن بەڵام بە شێوازی جیاواز، بۆیە دەبینین لەلایەن زانایان و پزیشکانەوە گرنگی تایبەتی پێدراوە و لە زۆر شوێنی جیهاندا چەندین توێژینەوە و تاقیکاریی لەسەر ئەنجامدراوە.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا گەورەیی و گرنگی رۆژوو لە بواری تەندروستیدا بە ئاشکرا دەرکەوتووە، ئێستا لە زوربەی وولاتانی رۆژئاوادا رۆژوو بۆ چارەسەری نەخۆشی جۆراوجۆر و بەدەستهێنانی سوودی تەندروستی بەکاردێت، لەم دواییانەشدا بە تایبەتی تر رۆژووی ئیسلامی هاتووەتە ئەم مەیدانە و کاری پێدەکرێت لەبەر ئەوەی سوودی زیاترە، کار گەیشتووەتە رادەیەك کە زوربەی رۆژئاواییەکان بۆ تەندروستی خۆیان وەك عادەت خویان پێوەگرتووە کە ساڵانە چەندین رۆژ بەرۆژوو دەبن.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر لە خەڵکی وادەزانن کە رۆژوو تەنها بریتییە لە بێبەش کردنی لەش بە شانە و خانەکانییەوە لە ماددە خۆراکیەکان (لە خواردن و خواردنەوە)، و وا تێدەگەن کە لەشی مرۆڤ وەك ئامێرێکی بێگیان وایە کە بە سووتەمەنی کاردەکات، هەر کاتێك لێی ببڕدرێت ئیتر لە کار وجووڵە دەکەوێت، بەڵام راستی بە دڵنیاییەوە لە پاش پێشکەوتنی گەورەی زانستەوە لەمڕۆماندا دەرکەوتووە، کە دەریخستووە لە لەشی مرۆڤدا چەندین عەمباری هەرە گەورەی ووزە هەیە، کە وا لە مرۆڤ دەکات کار و جووڵەی ئاسایی بۆ چەندین رۆژ بکات و بتوانێت چەند مانگێکیش بەبێ هیچ خۆراکێکی دەرەکی بە زیندوویی بمێنێتەوە.

ڕۆژووی ئیسلامی زۆر ئاسانە و جیاوازە و هیچ جۆرە ئەرکێکی قورس ناخاتە سەر لەشی مرۆڤ، و لە هەمان کاتدا ئەوەندە سوودی گەورەی پزیشکی و خۆپارێزی و چارەسەریی هەیە بۆ مرۆڤ، وای لێکردووەیەکێك بێت لە زەروورەت و پێویستییە گەورەکان بۆ لەش و دەروونی مرۆڤ و دەیکاتە یەکێك لە موعجیزە گەورەکانی تەشریعی ئیسلامی کە لە لایەن پێغەمبەرمانەوە (ﷺ) بۆمان هاتووە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا و لە هەموو جیهاندا چارەسەرگە پزیشکییەکان کە بەهۆی ڕۆژووەوە چارەسەری خەڵکی دەکەن، بەشێوەیەکی بەربڵاو بڵاوبوونەتەوە لە زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا.

هەندێك کەس لەوانەیە بپرسن: ئایا سوود چییە لە باس کردن و دەرخستنی سوودەکان و حیکمەت لە عیبادەت و پەرستشەکاندا، بە تایبەتی ڕۆژوو کە ئێمە لێرەدا تیشکی دەخەینەسەر؟

بۆ وەڵام دەڵێین:

١- خوای گەورە لە چەندین ئایەتی کتێبە پیرۆزەکەیدا نهێنی و سوودەکانی پەرستشەکان و تەشریعەکانی بۆ دەرخستووین، ئەمەش بۆ ئەوەیە هانی مێشك و بیری مرۆڤ بدات بۆ ئەوەی بەردەوام لە لێکۆڵینەوە و کارکردن و بیر کردنەوەدا بێت، هەروەها ئاماژەشە بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییەی کە ئەم بەرنامە پیرۆزە لەسەر بنەما بەرزەکانی (جێبەجێ کردنی سوود و مەصلەحەتەکانی مرۆڤ و دوور خستنەوەی لە زەرە و زیان) دامەزراوە.

٢- ئیسلام پشت لە ژیری و بیرکردنەوە هەڵناکات، و هەموو کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا دەکات بە ئاخاوتنێکی ڕاست و دروست و مەنتیقی و گوفتارێکی چەسپاو و زانستییانە، بەردەوام خەڵکیش لە هەموو سەردەمێکدا سوودەکانی یاسا و تەشریعەکانیان بینیوە، کە لەگەڵ بیرکردنەوە و گفتوگۆ و مەصلەحەتەکانیاندا گونجاوە، کە ئەمەش بەڵگە بووە لەسەر سەرچاوە بەرزەکەی

ئیسلام کە لەلایەن خودای تەنهاوەیە، رۆژووش ئەوەندە حیکمەت و سوودی جەستەیی و دەروونی لێوە دەرکەوتووە لەرووی پزیشکی و تەندروستیەوە کە بووەتە هۆی سەرسوڕمان و دەستەوسان کردنی هەموو مرۆڤەکان بە گشتی و زانایانی سەردەم بە تایبەتی.

لە لایەکی ترەوە زانین و لێکۆڵینەوە لە حیکمەت و سوودی تەشریعاتە ئیسلامیەکان هۆکارێکە بۆ زیادکردنی بیروباوەڕ لە دەروونی ئیمانداراندا، و لەهەمان کاتیشدا هۆکارێکە بۆ بانگەواز کردن بۆ ئەم بەرنامەیەی پەروەردگار، و دەتوانین بەهۆیەوە رێگای هیدایەت بۆ مرۆڤەکان روون بکەینەوە بە شێوەیەك کە بتوانن لێمانی وەربگرن و پابەندی ببن، لەبەرئەوەی شوێنکەوتنی ئەم بەرنامە پیرۆزە هەموو کاتێك مایەی سوود و قازانجە بۆ مرۆڤەکان لە دونیا و پاشەرۆژیاندا، و هەروەها بۆ لەش و دەروون و گیانیان.

چەندین ساڵە رۆژووی ئیسلامی پایەیەکی بەرزی گرتووە لەنێو ئەو توێژینەوانەی کە زۆرێك لە ناوەندەکانی توێژینەوە جیهانیەکان پێی هەڵدەستن بەتایبەتی لە رۆژئاوادا، ئەمەش دوای ئەوەی کە سوودە تەندروستیەکانی رۆژوویان بۆ دەرکەوت چ لە بواری خۆپاریزی یان لەبواری چارەسەری نەخۆشییەکاندا، ئەمە پاڵنەریش بوو بۆ ئەوەی کە یەکەم کۆنگرەی جیهانی دەربارەی سوودە تەندروستیەکانی رۆژووی رەمەزان لە ساڵی ١٩٩٤ لە (الدار البیضاء) لە وڵاتی مەغریب ببەسترێت کە زیاتر لە ٥٠ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی تێدا پێشکەشکرا بە بەشداری چەندین زانا و پزیشکی بەناوبانگ لە هەموو شوێنێکی دونیاوە بەبێ گوێدانە ئاین یان مەزهەبیان.

هەموو ئەو توێژینەوانە سوودە تەندروستیەکانی رۆژوو بەگشتی و رۆژووی رەمەزانیان بە تایبەتی بە ئاشکرا دەرخست، بەردەوام زانایانی بواری پزیشکی پێشبڕکێ دەکەن بۆ دۆزینەوەی سوودە تەندروستی و دەروونیەکانی رۆژوو، کە

چەوری زیانبەخشی تر لەناو دەبات، بەپێی ئەم پرۆگرامە بینیان کە مرۆڤ ڕۆژانە نزیکەی ٣٠٠ کیلۆکالۆری لەدەست دەدات.

ڕۆژووی ڕەمەزان دەبێتە هۆی زیاد بوونێکی بەرچاو لە کۆلیسترۆڵی چڕی بەرزدا، لە توێژینەوەیەك کە لە ساڵی ١٩٩٧دا لە کۆلیژی زانست لە (الدار البيضاء)ی وولاتی (مەغریب) و پەیمانگای (لایلی) لە (فەرەنسا)دا لەلایەن (أحمد الدواني و نصرالدين فاليم و عبدالله بن سليمان و جيان ميتشيل ليسيرف و رشيد صايل)ەوە ئەنجامدرا، ئەم توێژینەوەیە لەسەر (٣٢) کەسی تەندروست ئەنجامدرا، ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوو:

کەمبوونێکی ئاشکرای گرنگ و سوودبەخش لە کۆلیسترۆڵی گشتی و سیانی گلیسرۆڵ لە پلازمای خوێندا ڕوویدا، کە گەیشتە (٣٠٪) لە کاتی مانگی ڕەمەزاندا بە بەراورد بەکاتی پێش ڕۆژوو، لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا زیاد بوونێکی ئاشکرا لە کۆلیسترۆڵی چڕی بەرزی (HDL)ی پلازمای خوێندا ڕوویدا، کە گەیشتە ڕێژەی (١٤.٣٪) و پاش مانگێکیش لە ڕەمەزان هەر بەو بەرزییە مایەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا کەمبوونێکی ئاشکرا لە کۆلیسترۆڵی چڕی نزم (LDL) ڕوویدا، کە گەیشتە ڕێژەی (١١.٧٪) و بەم نزمییە مایەوە پاش مانگێکیش دوای ڕەمەزان، هەروەها کێشی لەشیش بە ڕێژەی (٢,٦٪) دابەزی لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، خواردنی ترشە چەورییە تێرەکانیش لە ڕەمەزاندا کەم بووەوە، و لەژێر چەند بارێکی تایبەتی و هەڵس وکەوتی تایبەتی ئەو کەسانەی کە توێژینەوەکەیان لەسەر کرا، تێبینی کاریگەرییە بەسوودەکانی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کرا لەسەر چەوریەکان و چەوریە پرۆتینیەکان لە پلازمای خوێندا.

گۆڤاری کۆمەڵەی پزیشکی شاهانەی بەریتانی لە ساڵی ١٩٩٧دا لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردەوە لەسەر چالاکی ڕۆژانە، و چالاکی و توانای خوێندن، و تەندروستی لەکاتی ڕۆژووی ڕەمەزاندا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بەشی خۆراك و زانستی خواردەمەنی لـە کۆلیـژی زانسـتی تەندروستی لە (کوەیت) ئەنجامدرابوو، ئەویش بۆ دەرخسـتنی کاریگـەریی رۆژووی رەمــەزان لەســەر چــالاکیەکانی رۆژانــە، و تەندروســتی، و توانــای خوێنــدن بــۆ ژمارەیەك لە قوتابیانی زانکۆ کە گەیشتە (٢٦٥) کەس (١٦٣ پیاو و ١٠٢ ئافرەت)، کە تەمەنیان لە نێوان (٢٠-٧٢) ساڵدا بوو، تاقی کردنەوەکان لەسەر ئەم کەسانە دەریخست کە زوربەی ئەو کەسانەی لە توێژینەوەکەدا بـوون لـە نـزمترین حاڵـەتی دڵەڕاوکێ و تێکچوونی دەروونیـدا بـوون و لـە چـالاکیەکی جەسـتەیی و رۆحـی زۆر باشدا بوون.

هەروەها ئەو شلەمەنیانەشیان دەخواردەوە کە رێژەیەکی کەم لـە (کافـایین)ی تێدابوو، جگەرەیان زۆر کەم دەکێشـا، گـۆڕانی کێشـی ئـەم کەسـانە جیـاواز بـوو، (٤٨٪)یان کێشیان نەگۆڕا، (٣٥٪)یان کێشیان دابەزی و (١٣٪)یان کێشیان زیادی کـرد، هــەروەها رێژەیــەکی بــاش لــە نەخۆشــەکان لــە کــاتی مــانگی رەمەزانــدا نەخۆشیەکانیان باش بوو، بە تایبەتی ئەوانەی کە قەبزی یان نەخۆشی کۆئەندامی دەماریان هەبوو.

(د. ألکسیس کاریل) کە هەڵگری خـەڵاتی نۆبڵـە لـە کتێبەکەیـدا (الأنسـان ذلـك المجهول) دەڵێت: زۆری ژەمەکانی خواردن و گەورەییان وای کردووە کردارێکی زۆر گرنگ لە مانەوەماندا لەکارکەوێت کە ئەویش راهاتنە بە کەم خـۆراکی کـە شـەکری جگەر و چەوری هەڵگیراوی ژێر پێست دەجوڵێنرێن و هــەموو ئەندامــەکان قوربـانی دەدەن بە هەندێك لە پێکهاتە گرنگەکانیان بە مەبەستی مانەوەی هاوسەنگی لەش و ســەلامەتی دڵ، کەواتــە رۆژوو لــەشمان پــاك دەکاتــەوە و شــانەکانمان نــوێ دەکاتەوە.

رۆژوو کاریگەریی تـەواوی هەیـە لـە هـێمن کردنـەوە دەمارەکـان بەتایبـەتی لـە حاڵەتی پەرکەمدا کە (د. ئـالان کـوت) لـە کتێبەکەیـدا دەڵێـت: ئـەوە زانـراوە کـە

نیوەی دانیشتوانی ئەمریکا کێشەی خەویان هەیە کە خەویان بەئاسانی لێناکەوێت یـان نـاتوانن بـەردەوام بـن لەخـەودا، زۆربـەی ئەمانـە دوای ڕۆژووگـرتن بۆیـان دەردەکەوێت کە خەویان زۆر باشتربووە لە ساڵانی ڕابوردوو، ئەمەش بـەهۆی ئـەو کاریگەرییە سەرسوڕهێنەرەی ڕۆژوو هەیـەتی لـە هـێمن کردنـەوەی دەمارەکـان و لابردنی تێکچوونە دەروونییەکان، پزیشکانی دەروونی زانکۆی (جـۆن هـۆبکنز) لـە ئەمریکا هەستان بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك بۆ زانینی کاریگـەریی ڕۆژوو لەسـەر ئەوانەی نەخۆشی پەرکەمیان هەیە، ئەوەبوو توێژینەوەکـە سـەلماندی کـە ٢٨٪ی نەخۆشەکانی پەرکەم بەئاشـکرا حاڵەتـەکانیان باشـتر بـوو بـە بـەکارهێنانی ڕۆژوو وەك یەکێك لە چارەسەرەکان، ئەمە لەگەڵ ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە بینی لە کۆنترۆڵ کردنی چارەکی ئەو حاڵەتە قورسانەی کە پێشتر ئەستەم بوو کۆنترۆڵ بکرێن.

(تۆم بێرنز) دەڵێت: من بەڕۆژوو بووم و وازم لە خواردن و خواردنـەوە هێنـا بـە مەبەسـتی ڕزگـاربوونم لـە کێشـی زیـادە بـەڵام بینـیم کـە ڕۆژوو زۆر بەسـوودە بـۆ تیژبوونی بیرم و بینینمی ڕوونتر کرد و بیری تازەی زۆرم بـۆ دەهـات و هەسـتمکرد کە دوور دەکەومەوە لە خەیاڵاتی خراپی وەك ئیرەیی و غیرە و خۆبەزل زانین.

توێژینەوەیـەکی پزیشـکی دەروونـی نـوێ کـە سـەرۆکی یەکـەی دەروونـی نەخۆشـخانەی نەفسـی کوێـت (د. رامـز تـەها) پـێی هەڵسـا دەربـارەی بـایۆلۆجی سیستمی دەمار و هەڵسوکەوت لـەکاتی ڕۆژوودا، دەریخسـت کـە کـۆنترۆڵ کردنـی ئارەزووەکان و هەستکردن بە برسێتی سـوودی گـەورەی هەیـە لەوانـە نەهێشـتنی هەستکردن بە خەمۆکی و هێنانەدی هاوسەنگی دەروونی و باشـترکردنی گفتوگـۆی خۆیی.

توێژینەوەکـە بـە ناونیشـانی (ئیعجـازی زانسـتی و دەروونـی لـە ڕۆژوودا) بـوو، دەڵێت: ئەم توێژینەوەیە وەڵامی زۆرێك لەو پرسیارانە دەداتـەوە کـە بۆچـی ئێمـە خۆمان بگرینەوە لەو ئارەزووانەی کە بە درێژایی ساڵ بۆمان ڕەوایە.

حیکمـەتی ڕۆژوو و سـوودەکانی لـەم توێژینەوەیـەدا بـۆم سـەلما کـە لەسـەر نموونەیەکی هەڕەمەکی لە خۆبەخشان و خاوەن کێشە دەروونییەکان ئەنجامدرا و ڕووەکانی ئیعجازی زانستی و دەروونی ڕۆژووی دەرخست کـە چـەند کاریگـەرە لـە ڕێککردنەوەی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و ڕزگاربوون لە خـووە نـەخوازراوەکان و بەهێزکردنی توانای خۆکۆنترۆڵ کـردن و حیکمـەت و ئـارامیی دەروون، کاریگـەریی بەرگـەگرتنی برسـێتی و ئـارامگرتن لەسـەری ئاسـتی مـاددەی (سـیرۆتۆنین و ئەندرۆفین و ئینکیفالین) لەمێشکدا باشتر دەکات کـە خاسـیەتی ئارامکـەرەوە و نەهێشتنی خەمۆکی و ئازاریان هەیە.

هـەر لـەم توێژینەوەیـەدا باسـی ئـەو توێژینەوەیـە دەکـات کـە (د.کانمـان) لـە زانکـۆی پرینسـتۆنی ئـەمریکی پـێی هەسـتا و دەریخسـت کـە کـۆنترۆڵ نـەکردنی ئارەزووەکان و ویستـەکان دەبێتە هۆی زیادبوونی حاڵەتی خەمۆکی و هەستکردن بـە داڕووخـان و بێزاریـی، هـەموو ئـەم توێژینەوانـە گرنگـی خۆڕاهێنـان بـۆ چـەند هەفتەیەك لەساڵێکدا لەسەر خۆگرتنەوە لە ئارەزووەکان و غەریزەکان دەردەخـەن ئەویش بە ئەنجامدانی ڕۆژووگرتن.

ئێستا دەرکـەوتووە کـە لەشـی ئـادەمیزاد لـە کـاتی ماوەیـەکی ڕۆژووی درێـژدا (وەك ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان)، ئـیتر قبـوڵی مـاددەی ناتەندروسـتی و زەرەر گەیەنەر بە فیسیۆلۆجی لـەش ناکـات، وەك مـاددە سـەرخۆش کـەرەکان و مـاددە سڕکەرەکان، بـە شـێوەیەك کـە لـەش پێیـان ناڕەحـەت دەبێـت ئەگـەر لـە کـاتی ڕۆژوودا بەکاریان بهێنێت بە بڕی کاتـەکانی پـێش ڕۆژوو و لەوانەیـە بگاتـە ڕاددەی کوشتنی ئەو کەسە.

هەروەها بە تازەییش ئەو بۆچوونە پەیدابووە کە لەشی مرۆڤ بە هـەمان شـێوە لـەدوای ماوەیـەکی ڕۆژووی درێـژ قبـوڵی مـاددەی نافیسـیۆلۆجی ناکـات، لەگـەڵ ئەمەشدا ڕۆژوو هەست کردن بـە چـالاکی و سـووکی لـەش دەبەخشێت، کـە ئەمـە

هۆکارێکی زۆر یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە شێوەیەکی یەکجارەکی یان جوزئی واز لەو عادەت و خووگرتنە بهێنێت کە هەیەتی بە مادده کحولیەکان و تووتن و مادده سڕکەرەکان و زۆرێکی تریش لەو حەبانەی کە بە داخەوە زۆرێك گەنجانی ئەمڕۆ گیرۆدەی بوون.

سەبارەت بە رزگارکردنی لەش لە ژەهر و میکرۆبەکان بینراوە کە رۆژوو رۆڵێکی گەورەی لەمەدا هەیە هەروەك (د. رۆبەرت بارتولو) سەلماندی کە دەڵێت: بێگومان رۆژوو یەکێکە لە هۆکارە کاریگەرەکان بۆ رزگاربوون لە میکرۆبەکان بەتایبەتی میکرۆبی (زوهری) بەهۆی ئەو میکانیزمی تێکدان و بنیاتنانەوەی خانەکان کە لەکاتی رۆژوودا روودەدات.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان رۆژوو باشبوونی نەخۆشیەکانی پێست مامۆستای جیهانی نەخۆشیەکانی پێست (د. محەممەد زەواهیری) دەڵێت: بەخشندەیی رەمەزان نەخۆشیەکانی پێستیش دەگرێتەوە، کە وا لە پێست دەکات بەرگری بۆ نەخۆشیەکان زیاتربێت و زۆر نەخۆشی پێستیش بەهۆی رۆژووەوە باشتردەبێت.

سەبارەت بە نەخۆشیەکانی چاو (د. ابراهیم محمد عامر) پسپۆری نەخۆشیەکانی چاو لە زانکۆی (شا عبدالعزیز) دەڵێت: بینیمان کە زۆر نەخۆشی چاو بەهۆی رۆژووەوە باشتر دەبن لەوانە نەخۆشی ئاوی رەشی چاو و تێکچوونی تۆڕی بینین.

لە رۆژوودا سوودێکی گەورە هەیە بۆ ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە، ئەویش وەك (د. حسان شەمسی باشا پسپۆری نەخۆشیەکانی دڵ دەڵێت) لەبەرئەوەی ١٠٪ ی رێژەی ئەو خوێنەی دڵ دەینێرێت دەچێت بۆ کۆئەندامی هەرس لەکاتی هەرسکردندا، و لەبەرئەوەی خۆراك هەرس کردن نییە لەکاتی رۆژوودا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دڵ توانایەکی کەمتر و ئیسراحەتێکی زیاتر دەکات.

هـەمان ئـەم پزیشـكە سـاڵی ١٩٩٨ توێژینەوەیـەكی لەسـەر ٨٦ نەخۆشـی جۆراوجـۆری دڵ ئەنجامـدا (وەك نەخۆشـی خوێنبـەرەكان و زمانـەكانی دڵ و لاوازبوونی دڵ)، ٨٦٪ توانیان بـەڕۆژوو بـبن، ١٠٪ تـەنها چـەند ڕۆژێك شـكاندیان، لەگەڵ تەواوبوونی ڕەمەزانیش ٧٨٪ هەستیان بە باشتربوونی تەندروستیان كرد، هەروەها ئەوەش دەڵێت كە ڕۆژوو زۆر بەسوودە بۆ بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، چونكە ئـەو كێشـەی لـەش كـە لـە ڕۆژوودا دادەبـەزێت دەبێتـە هـۆی دابەزانـدنی بەرچـاوی فشـاری خـوێن، هـەروەها ئـەو وەرزشـە جەسـتەییەی لـەكاتی نوێـژی تەراویحدا ئەنجامدەدرێت بەسوودە بۆ دابەزاندنی فشاری بەرزی خوێن.

پرۆفیسـۆر (نیكۆلاییـف بیلـوی) لـە مۆسـكۆ لـە كتێبەكەیـدا (برسـیكردن بـۆ دەستكەوتنی تەندروستی) دەڵێـت: (هـەموو مرۆڤێـك كـە هـەموو ساڵێك ٤ هەفتـە بـەڕۆژوو دەبێـت (وەك ڕۆژووی ئیسـلامی) و واز لـە خـواردن دێنێـت ئـەوا هـەموو تەمەنی بە تەندروستیەكی تەواوەوە بەسەر دەبات)، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾.

ئەم سوودانەی ڕۆژووی ڕەمەزان لە لـەش سـاغی و نەخۆشـییە جیاوازەكانـدا وا لە مرۆڤ دەكات، كە هەمیشە ئەم هۆكارە تەندروستیەی لەیاد بێت و بـە ئاواتـەوە بێت كە دووبارە ئەم مانگە پیرۆزە بگەڕێتـەوە و ئـەمیش بەشـی خـۆی لـەو خێـرو خۆشیانەی دونیا و پاشەڕۆژ وەرگرێت.

بەمەبەستی بەهێزكردنی ئەم كاریگەرییە بەسوودانە و درێژەپێدانیان بۆ ماوەی هـەموو سـاڵەكە باشـتروایە لـەكاتی تـری غـەیری ڕەمەزانیشـدا بـەڕۆژوو بـبین، لـە ئیسلامیشدا ڕۆژووی سوننەت دانراوە، كە چەندین كاتی تر بێجگە لـە ڕەمـەزان بـۆ مرۆڤی موسوڵمان دیاریكراوە بۆ ئەوەی خۆبەخشانە تێیدا بەڕۆژوو ببێت.

زانایانی ئەمڕۆمان بەچاوی خۆیان دەبینن كە ئـەوەی بـۆ محمـد (ﷺ) هـاتووە بریتییە لـە حـەق و ڕاسـتیی ولەلایـەن خـوداوە دابـەزیوە ﴿ويرى الذين أوتوا العلم الذي أنزل إليك من ربك هو الحق ويهدي إلى صراط العزيز الحميد﴾ (سبأ: ٦).

# ڕووەکانی ئیعجاز لە ڕۆژووی ئیسلامیدا

**<u>*ڕووی یەکەم*</u>: پاراستنی مرۆڤ لە تێکچوون و نەخۆشییەکان:**

خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە ئەو ڕۆژووی لەسەر ئێمە و لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێمە فەرز و پێویست کردووە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئێمە بەهۆیەوە تەقوا و خۆپارێزیی لێوە فێرببین، کە وامان لێبکات ڕێمان لێبگرێت لە تاوان و سەرپێچی کردنی پەروەردگار، هەروەها بۆ پاراستنی مرۆڤیشە لە زۆرێك لە نەخۆشی و تێکچوونە جەستەیی و دەروونییەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ] (البقرة١٨٣)﴾، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: [الصَّوْمُ جُنَّةٌ]، واتە: پارێزەر و داپۆشەرە.

سوودەکانی ڕۆژوو لە بوارەکانی خۆپارێزیی و چارەسەری نەخۆشییە جۆراوجۆرەکاندایە (چ جەستەیی بێت یان دەروونی)، بەکورتی دەتوانین لەم خاڵانەدا ئاماژە بە گرنگترین ئەو حاڵەتانە بدەینەوە:

١- کۆئەندامی بەرگری لەش بەهێز دەکات: بەهۆی ئەمەوە لەش دەپارێزێت لە زۆرێك لە نەخۆشییەکان، بینراوە کە پێوەری چالاکی لیمفە خانەکان ١٠ ئەوەندە باشتردەبێت، هەروەها ئەو خانە تایبەتانەی بەرگری کە ڕۆڵی سەرەکیان هەیە لەم پرۆسە و چالاکیەدا (وەك: لیمفەخانەکان لە جۆری T-Lymphocytes) بە ڕێژەیەکی زۆر زیاددەکەن، هەروەها ڕێژەی چەند جۆرێك دژەتەنەکان و دژەمیکرۆبەکان لە لەشدا بەتەواوەتی بەرزدەبنەوە، وەڵامە بەرگریەکانیش باشتر دەبن بەهۆی زیاد بوونی ڕێژەی پرۆتینی چەوری چڕی نزم.

٢- پاراستنی مرۆڤ لە تووش بوون بە قەڵەوی و لە مەترسیەکانی و سوودی بۆ دابەزاندنی کێشی لەش، لەبەر ئەوەی باوەڕ وایە کە قەڵەوی لە ئەنجامی تێکچوون لە کرداری نواندنی خۆراکدا دروست دەبێت، هەروەها بەهۆی پەستانە ژینگەیی و

دەروونــی و کۆمەڵایەتیەکانیشــەوە دروســت دەبێــت، کــە لەوانەیــە هــەموو ئــەم فاکتەرانە یەکبگرن لە دروست کردنیدا، چونکە لەوانەیە تێکچوونی دەروونی ببێتـە هۆی روودانی تێکچوون لە نواندنی خۆراکدا، هەموو ئـەو فاکتەرانـەی کـە لەوانەیـە ببنە هۆی دروست بوونی قەڵەوی دەتوانین بەهۆی رۆژووەوە لە هـەموویان خۆمـان بپارێزین، ئەویش بە هۆی ئـەو دامەزراویـەی لـە رووی دەروونـی و عەقڵیـەوە مـرۆڤ دەسـتی دەکـەوێت بـەهۆی ئـەو دەوروبـەر و ژینگـە ئیمانیـەی کـە چـواردەوری رۆژووەوان دەدات لە مانگی پیرۆزی رەمەزاندا.

هــەروەها بــەهۆی زۆریــی پەرســتن و عیبادەتــەکانی وەك: زیکــر و یــادی پــەروەردگار، و خوێندنــەوەی قورئــان، و بەخشــین لــە پێنــاوی خــوادا، و دوورکەوتنەوە لە هەڵچوون و تەوەتور، و ڕاگرتن و دوورکەوتنەوە لە ئارەزووەکـان و پاڵنەرەکان بـۆ خراپـە، و ئاراسـتە کردنـی هێـزە جەسـتەیی و دەروونیـەکان بـە ئاراستەیەکی باش و ئیجابیانە، لەگەڵ ئەم فاکتەرە سوود بەخشانەدا نابێـت رۆڵـی بەرچاو و نموونەیی رۆژوومان بیرچێت لە سەرف کردنی چەوریە کەڵەکە بووەکـانی ناو لەشدا.

لەلایـەکی تـرەوە رۆژوو سـوود بـەخش و کاریگـەرە لـە پاراسـتنی لـەش لـە کاریگـەری و نەخۆشـیە مەترسـیدارەکانی قەڵەویـدا، وەك: نەخۆشـیەکانی دڵ و بۆرییەکانی خوێن، ئـەمانیش وەك: لاوازبـوون و سسـتبوونی دڵ، و وەسـتانی دڵـی کوتـوپڕ، و گیرانـی خوێنبـەرەکانی دەوری دڵ، و هـەروەها نەخۆشـی رەقبـوونی خوێنبەرەکان.

٣- رۆژوو رۆڵـی هەیـە لـە پاراسـتنی لـەش لـە دروسـت بـوونی بـەرد و لمـی گورچیلە، ئەویش لەبەر ئەوەی رێژەی صۆدیۆم لە خوێندا بـەرز دەکاتـەوە، ئەمـە رێدەگرێت لە بەکریسـتاڵ بـوونی خوێیـەکانی کالیسـیۆم، هـەروەها بەرزبوونـەوەی رێـژەی مـاددەی یۆریـا لـە میـزدا رێـدەگرێت لـە نیشـتنی خوێیـەکانی میـز کـە

فاکتەرێکی سەرەکی دروست کردنی لم یان بەردن لە گورچیلەکاندا، ئەمەش بەپێی نوێترین توێژینەوەکان.

٤- ڕۆژوو لەش دەپارێزێت لە مەترسی ئەو ژەهرانەی لەناو خانەکاندا کەڵەکە دەبن: هەروەها لە نێوان شانەکاندا بەهۆی ئەو خۆراکانەی کە مرۆڤ دەیانخوات، بەتایبەتی ئەو خۆراکانەی لە کارگەکاندا دروستدەکرێن و ئەوانەی کە لە قوتوودا هەڵدەگیرێن، هەروەها لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ نەخۆشیە جۆراو جۆرەکاندا و ئەو ژەهرانەی کە لە هەوادا هەیە و ڕۆژانە هەڵیاندەمژین لەڕێی هەناسەدانەوە.

٥- ڕۆژوو هەڵچوون و شۆڕشی جنسی دادەمرکێنێتەوە و کپی دەکاتەوە بە تایبەتی لەلای گەنجان، بەهۆی ئەمەوە لەش دەپارێزێت لە تێکچوونە جەستەیی و دەروونیەکان و لادانە رەووشتیەکان، ئەگەر خوێنەری بەرێز بگەڕێتەوە بۆ (بابەتی: کاریگەریی ڕۆژوو لەسەر رژێنە جنسیەکان)، ئەوا دەتوانین سوود لەم بابەتە وەربگرین بۆ دەرخستنی رووی ئیعجاز لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ):

﴿يا مَعْشَرِ الشَّباب! مَن استطاعَ مِنكم الباءَة فَلْيَتَـزَوَّج، فَإنَّه أَغَضُّ للبَصَر وَأحصَنُ للفَرج، وَمَن لَم يَستَطِع فَعَلَيه بِالصَّوم فَإنَّه لَه وِجاء﴾، ئەگەر گەنجی موسوڵمان پابەند بێت بە ڕۆژووەوە و زۆری لێبگرێت، وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێدەدات ﴿فَعَلَيه بِالصَّومِ﴾ واتە: زۆر بەڕۆژوو بێت، لەگەڵ ناوەندێتیی لە خواردن و خواردنەوەدا و زۆرنەخوات، و ئەنجامدانی ئەرکە جەستەییە ئاساییەکان، ئەوا نزیك دەبێتەوە لە ڕۆژووی تەواو (واتە برسی کردن)، و سوودەکانی ئەم ڕۆژووەی دەستدەکەوێت لە دامرکاندنەوەی ئارەزووەکانی بە ئاسانی و تووشی زەرەرەکانی برسی کردنیش نابێت، کەواتە ئەم توێژینەوانە بەئاشکرا ئیعجازی زانستی لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ): [فَإنَّه لَه وِجاء] دەردەخات، ئەویش لە دوو ڕووەوە: یەکەم: ئاماژەدان بەوەی کە گونەکان لە پیاودا بریتین لە شوێنی دروست کردنی فاکتەرەکانی هەڵچوون و هاندانە

جنسیەکان، ئەویش لەبەر ئەوەی (وجاء) لە زمانی عەرەبیدا ماناکەی بریتییە لە: (خەساندن)، واتە: تێکشکاندنی گونەکانی نێرینەکانی ووشتر بە شێوەیەکی بەهێز کە وای لێدەکات ئارەزووی جنسی نامێنێت، کەواتە دەفەرموێت: رۆژوو بریتییە لە شێوەیەك لە (خەساندن) و دامرکانەوەی ئارەزووە جنسیەکان.

ئەوەش لە رووی زانستییەوە سەلماوە کە لە گونەکاندا خانەی تایبەتمەند هەن بە دروستکردن و رژاندنی هۆرمۆنی نێرینە (یان تێستۆستیرۆن Testosterone)، کە بریتییە لە هۆرمۆنی تایبەتمەند بە جووڵاندن و هەژاندنی ئارەزووە جنسیەکان، و بڕین و لەکار خستنی گونەکان (واتە خەساندن) ئەم ئارەزووانە نایەڵێت و بە تەواوەتی کپی دەکاتەوە.

دووەم: زۆر رۆژوو گرتن دەبێتە هۆی کپ کردنەوەی ئارەزووی جنسی و دامرکاندنەوەی، لە توێژینەوەکانەوە سەلما کە رێژەی هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن) لە کاتی رۆژووی بەردەوامدا زۆر بە ئاشکرا دابەزی، تەنانەت لە دوای خۆراك پێدانەوە بە ٣ رۆژیش هەر نزم بوو، پاشان بەرز بووەوە، ئەمە دەیسەلمێنێت کە رۆژوو توانای دامرکاندنەوەی ئارەزووی جنسی هەیە لە پیاودا و هەروەها باشتر کردنی لە دواییشدا، هەروەها دووپاتی سوودی رۆژوو دەکاتەوە لە باشتر کردنی توانای وەچە خستنەوە لە پیاودا لەدوای رۆژوو شکاندن، ئایا کەس دەیتوانی بەم چەند ووشە کەمە (کە هەموو ئەم ووردەکارییە زانستیانەی تێدایە) خەڵك لە گرنگی رۆژوو ئاگادار بکاتەوە، تەنها پێغەمبەرێکی نێردراو نەبێت لەلایەن ئەو پەروەردگارەی کە دروستکەری مرۆڤە و ئاگادارە بە هەموو ووردەکارییەکانی دروست بوونی؟!

٦- رۆژوو بە پارێزەرێك دادەنرێت لە نەخۆشیە عەقڵی و دەروونیەکان: بە تایبەتی کاریگەریی سەلماوە لەسەر نەخۆشی دەبڵ بوونی کەسێتی (إنفصام الشخصیە)، وەك پێشتر باسمان کرد (د. نیکۆلاییف) لە پەیمانگای پزیشکی

دەروونی لە (مۆسکۆ) ئامـاژەی بـەوەدا کـە نەخۆشـیە عەقڵیـەکان بـەهۆی ڕۆژوو گرتن و سیستمی خۆراکی گونجاوەوە دەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت، کە لە سـەردانی (١٠٠٠٠ نەخۆشـی) نەخۆشـیە دەروونیەکانـەوە کـە پابەنـدبوون بـە ڕۆژووەوە، دەرکەوت کە چاکبوونێکی بەرچاو لـەلای ٦٥٪یـان ڕوویـدا، کـە تەنانـەت لـەدوای (٦ساڵ) کاتێك پشکنین بۆ نیوەیان کرایـەوە بینـرا کـە هێشـتا لـە تەندروسـتیەکی دەروونی باشدان.

***<u>ڕووی دووەم لە ئیعجازی زانستی لە ڕۆژوودا</u> :***

## سوودەکان و قازانجەکانی ڕۆژوو گرتنە

دوای ئـەوەی کـە خـوای گـەورە (جـل جلالـه) و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) باسـی ئەوەیان بۆ کردین کە ڕۆژوو پارێزەرە لە نەخۆشـیە جەسـتەیی و دەروونیـەکان، و بەپارێزەرێك دادەنرێت بۆمان لە تووڕەیی و سزای پەروەردگار، لەوەش ئاگاداریـان کـردووین کـە ڕۆژوو نـەك بـە تـەنیا بـۆ لەشسـاغ و ئەوانـەی لـە سـەفەردا نـین و نیشتەجێن سوودی هەیە، بەڵکو بۆ نەخۆش و ئەوانەشی لە سـەفەردان بـە هـەمان شێوە بەسوودە، تەنانەت بۆ ئەوانەش کە بە زۆر ناڕەحـەتی بـەڕۆژوو دەبـن (وەك پیر و پەککەوتەکان و هاوشێوەکانیان) هەر بەسـوودە و زەرەمەنـد نییـە، ئـەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

[أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ <u>وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ</u>] البقرة ١٨٤.

(فـەخری رازی) موفەسـیر دەڵێـت: زانایـان بـە ٣ شـێوە تەفسـیری ووتـەی پەروەردگار (وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ)یان کردووە:

١– لەوانەیە ئەم ووتارە تەنها مەبەست پێـی ئەوانـە بـن کـە دەتـوانن بـەڕۆژوو بن، کەواتە ماناکەی بەم شێوەیەی لێدێت: واتە ئێوە ئـەی ئەوانـەی کـە تواناتـان

هەیە و دەتوانن نارەحەتی ڕۆژوو تەحەممول بکەن بۆ ئێوە باشترە کە ڕۆژووبگرن و قەرەبوو (کەفارەت) نەدەن، ئەم رایە (القاسمي) لە تەفسیری (محاسن التأویل)دا هەڵیبژاردووە.

٢- ئەم گوتارەی پەروەردگار بۆ هەموو ئەوانەیە کە پێشتر ئاماژەیان پێدراوە، واتە بۆ نەخۆش و ئەوەی لە سەفەردایە و ئەوانەشی کە بە نارەحەتی دەتوانن بەڕۆژوو بن، ئەم تەفسیرەش لەهەمووی راسترە لەبەرئەوەی ووشەکە گشتییە ومەرج نییە کە تەنها بەستراببێتەوە بە دەستەواژەی (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ)، واتە تایبەت بێت بەوانەی کە بە نارەحەتی زۆر دەتوانن بەڕۆژوو بن، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە دەستەواژەیەکی گشتییە و هیچ لادان نییە کە بڵێین بۆ هەموو ئەوانەی پێشتر باس کراون دەگەڕێتەوە، و پێویستە بەو شێوەیە لێکی بدەینەوە.

٣- ئەوەیە کە بگەڕێتەوە بۆ ئایەتی یەکەم، واتە بەم شێوەیەی لێدێت: ئێوە ڕۆژووتان لەسەر پێویست کراوە کە بەڕۆژوو بن باشترە بۆتان، ووشەی (خَيْر) لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە ناوێکی پێشخستن و باشترکردن (إسم تفضيل)، واتە بۆ خۆی ڕۆژوو باشتر و بەسوودترە لەبەر ئەو خۆشیە دەروونی و سوودانەی کە هەیەتی، کەواتە ڕۆژوو بۆ خۆی باشترە لەبەرئەو سوود و سەعادەت و خۆشیە ڕۆحیانەی بۆ مرۆڤی ئیماندار دروستی دەکات لە دونیا و پاشەڕۆژیشدا، مانای (إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) واتە ئەگەر ئێوە سوودەکان و گەورەیی ڕۆژووتان بزانیایە.

لەمەی سەرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە خوای پەروەردگار بڕیاریداوە ڕۆژوو چەندین سوود و قازانجی هەیە و بەدڵنیاییەوە دێنەدی بۆ هەموو ئەوانەی کە لەسەریان پێویستکراوە، لەوانەی کە تەندروست و جێنشینن، و ئەوانەی کە بەبێ نارەحەتی بەڕۆژوو دەبن، کە ئەم سوودانە ئەوانەش دەگرێتەوە کە دەتوانن بەڕۆژوونەبن و خاوەنی مۆڵەتن ئەگەر بێتو بەڕۆژوو بن، بەو مەرجەی کە زەرەری لێنەکەن، لێرەدا با ئەوە بزانین کە هیچ جۆرە دژایەتیەك نابینین لە نێوان ئەوەی

لێرەدا پەروەردگار بڕیاریداوە و ئەو ئایەتە پیرۆزەشی کە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾، واتە: خوای گەورە هەمیشە کارئاسانی بۆ ئێوە دەوێت و پێی خۆش نییە کە بتانخاتە نارەحەتیەوە، خوای گەورە ئەم ووتانە دوای ئەم دەستەواژەیە دەڵێت: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾، واتە: ئەوەی کە نەخۆشە یان لە سەفەردایە با بەڕۆژوو نەبێت و دوای ڕەمەزان لە چەند ڕۆژێکی تردا ڕۆژوەکەی بگرێتەوە، چونکە لێرەدا ئەو کارئاسانیەی خوای گەورە بڕیاریداوە بریتییە لە لابردنی فەرزی ڕۆژووەکە و دانانی مۆڵەت بۆ ڕۆژوو نەگرتن.

(القاسمي) لە تەفسیری (محاسن التأويل)دا دەڵێت: (يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ) واتە: تەشریع کردنی کارئاسانیە بە مۆڵەتدانی نەخۆش و ئەوەی سەفەر دەکات، و هەروەها تەنها دانانی یەك مانگە بۆ ڕۆژوو گرتن، (وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ) واتە: ڕۆژوو گرتنی کردووە بە عەزیمەتێك و کارێکی ناوازە ئەگەر بێتو هەموویان بەڕۆژوو بن، و ئەگەر لە مانگێکیش زیاتر بێت ڕۆژوو گرتنی ساڵانە.

خوای گەورە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەو ئازادی هەڵبژاردنی لە نێوان ڕۆژوو گرتن و ڕۆژوو شکاندنی داوەتە دەست ئەو کۆمەڵانە لە نەخۆشەکان و ئەوانەی لە سەفەردان و ئەوانەشی کە بە نارەحەتی بۆیان دەگیرێت، لەگەڵ هاندانیان بۆ ڕۆژوو گرتن لەبەر سوودەکانی و خێرەکەی –کە ئەوان بە زۆری نایزانن–،ئەمە ئەو یاسا و تەشریعەیە کە خودا بۆی داناون، کە بریتییە لە تەشریعێکی سادە و ئاسان چونکە ئەگەر ڕۆژوو لەسەر نەخۆشان و موسافیران و بێتوانایانیش فەرزبووایە ئەوا دەبووە نارەحەتی و زۆر لێکردن و بێتواناییەك کە خودا هەرگیز فەرمانی پێناکات.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ جۆرە دژایەتیەك نییە لە نێوان بڕیاردانی خێرێتی و سوودەکانی ڕۆژوو بۆ ئەو کۆمەڵانە و ووتەی پەروەردگار ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ

﴿الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾، ئـەویش لەبەرئەوەیـە کـەس نـەیوتووە کـە عوسـر و ناڕەحەتیەکەی ئایەتەکە بریتییە لـە ڕۆژووگـرتن، بـەڵکو جیـاوازی نێـوان زانایـانی موسوڵمان هەمیشە لە نێوان خێرێتی و باشتردا بووە، کە ئایـا کامـەی ئاسـانترە و کامەی باشترە: ڕۆژووگـرتن یـان ڕۆژووشـکاندن؟ هەنـدێك ووتوویانـە ڕۆژووگـرتن و هەندێکی تر دەڵێن ڕۆژووشکاندن، تەنانەت هەندێکی تر ووتوویانـە کـە ڕۆژووگـرتن باشتر و ئاسانترە بۆ هەندێکیان لە ڕۆژووشکاندن.

زانایانی موسوڵمان ووتوویانە کـە زۆر نەخۆشـی هەیـە بـە ڕۆژوو باشـتر دەبێـت یان چاك دەبێتەوە یان یارمەتی چاکبوونەوەی دەدات، هەربۆیە لێرەوە زۆرێـك لـە شەرع ناسان بڕیاری ئەوەیان داوە کە مۆڵەتی ڕۆژوو شکاندن بۆ نەخۆشـی گشـتی نییە، و ووتوویانە: ئەو نەخۆشـیانەی مۆڵەتـدراوە بـە مـرۆڤ تێیـدا بـەڕۆژوو نـەبێت تەنها ئەوانەن کە لەوانەیە زەرەر بە لەش بگەیەنن، یان نەخۆشـیەکەی زیـاتر بێـت ئەگەر بەڕۆژوو ببێت، ووتەی زانا (إبـن الجـوزي) زۆر بـە تایبـەتی تـر ئەمـەی روون کردووەتەوە کە دەڵێـت: نەخۆشـی و سـەفەر وەك ڕوخسـەتێك بـە گشـتی نـین لـە هەموو حاڵەتێکدا، هەربۆیە ئەو نەخۆشەی کـە ڕۆژوو زەرەری پێنەگەیـەنێت ئـەوە بۆی نییە ڕۆژوو بشـکێنێت، بـەڵکو مۆڵەتـدان تـەنها بەسـتراوەتەوە بـە زیـادبوونی نەخۆشیەکە بە ڕۆژوو.

بابەتی زەرەر پێگەیشتن و ئەو ناڕەحەتیـەی کـە لەوانەیـە تووشـی نـەخۆش و موسـافیر و بـە تەمەنـەکان و هاوشـێوەکانیان ببێـت بـەهۆی ڕۆژووەوە هەمیشـە بابەتێکی ڕێژەیی بووە، کە لـە یەکێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر و لـە ژینگەیەکـەوە بـۆ ژینگەیەکی تر دەگۆڕێت بەهۆی باری دەروونی و میزاجـی کەسـەکانەوە و عـادەتی کۆمەڵگا و گومانەکانی پزیشکانەوە کاری تێدەکرێت، و دەتـوانین بڵـێین کـە هـیچ شتێك نییە ئەوە بسەلمێنێت بە دڵنیاییەوە کە ڕۆژووی ئیسلامی زەرەری هەیە بـۆ زووربەی نەخۆشیەکان و بۆ کاری ئەندامەکان لە پیریدا، یـان لـە کـاتی دووگیـانی و

شیردان و له سەفەردا، هەربۆیە لێرەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە هەمیشە ڕۆژووی ئیسلامی خێر و سوودی تێدایە بۆ زوربەی نەخۆشەکان و بۆ موسافیر و پەککەوتەکانیش، و ئەوەندە سوودیان پێدەگەیەنێت کە خۆیان هەرگیز نەیانزانیوە و بیریان لێنەکردوّتەوە.

ئەگەر گومانی ئەوەش دانێین کە لە هەندێك باردا یان لە هەندێك کەسدا لەوانەیە زەرەر ڕوویدات لە ڕۆژوو گرتنەوە، ئەوا ئەمە دەبێتە ئەو حاڵەتی (عوسر)ەی ئایەتەکە ئاماژەی پێداوە، و ڕاستەوخۆ تەشریعەکە دەگەڕێتەوە بۆ کارئاسانی و مۆڵەتدان، کە بریتییە لە پێویست بوونی ڕۆژوو شکاندن لەسەر ئەو کەسە نەك ڕۆژووگرتن.

بابزانین کە نەتوانایی و (عوسر) چییە: بریتییە لەو هیلاکیە زۆرەی تووشی لەش دەبێت و ئیتر لە توانایدا نامێنێت، ئەمە لەش ماندوو دەکات و لە کاری دەخات، یان بریتییە لە هەموو ئەو زەرەرە ڕاستەقینانە یان لاوازییەی کە تووشی لەش دەبێت و ببێتە هۆی تووشبوونی زیانێکی گەورە یان نەتوانین و فەوتانی قازانجێکی سەلماو بۆ لەش، ئەم (عوسر)ە خوای گەورە بۆی گۆڕیوین بە کارئاسانی، کە بریتییە لە هەموو کارێك کە لەش و دەروون ماندوو و قورس ناکات، و پێشی دەووترێت ڕوخسەت یان مۆڵەت کە بریتییە لە ئازادی هەڵبژاردن لە نێوان ڕۆژووگرتن و ڕۆژوو شکاندندا بۆ هەموو ئەوانەی کە ناودەبرێن بە نەخۆش، یان لە سەفەردان، یان پیر و پەککەوتەن، لەگەڵ ئەمەشدا یاسای ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ڕۆژوو گرتن لەگەڵ ئەو ناڕەحەتیانەی نەخۆشی و سەفەر و ناڕەحەتی وازهێنان لە خواردن بۆ مرۆڤی پیر و هاوشێوەکانی هەر دەمێنێتەوە، و هانیان دەدات بۆ ڕۆژووگرتن بۆ ئەوەی سوودی جەستەیی و دەروونییان دەستکەوێت، و بۆ ئەوەی زانینی نهێنییەکانی ڕۆژوو و سوودەکانی یارمەتیدەر بێت بۆ ئەو کەسانە بۆ تەحەممول کردنی ئەو ناڕەحەتیە خۆویستانەی کە لە تواناداییە.

خەڵکیش جیاوازن لەمەدا و خوای گەورەش بەپێی توانا داوا لە خەڵکی دەکات ﴿لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفساً إلاّ وُسْعَها﴾، بەڵام ئەگەر بێتو زەرەر رووبدات یان دڵنیا بین لە روودانی ئەوا تەشریعەکە دەگەڕێتەوە بۆ حەرام بوونی رۆژووگرتن و پێویست بوونی رۆژوو شکاندن، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لە سەفەردا زۆر جار بەرۆژوو دەبوو و زۆر جاریش بەرۆژوو نەدەبوو، و وەڵامی ئەو کەسەی کە پرسیاری لێکرد دەربارەی رۆژووگرتن لە سەفەردا بەم شێوەیە دایەوە: [إنْ شِئْتَ فَصُم وَإن شِئْتَ فَأَفْطِر] (رواه البخاري)، واتە: ئەگەر توانیت و ئارەزووت لێبوو بەرۆژوو ببە، و ئەگەر نەتتوانی و ئارەزووت لێنەبوو بەرۆژوو مەبە.

ئەوەتا لە شوێنێکی تردا پێویستی دەکات کە خەڵك بەرۆژوو نەبن، ئەویش لەکاتی سەفەری چوون بۆ جەنگدا کاتێك کە بینی هاوەڵەکانی دەکەون لەبەر گەرمای زۆر و ناتوانن برۆن، خۆی یەکەم کەس لەبەر چاویان رۆژووەکەی شکاند و فەرمانی بە هەموو خەڵك کرد کە رۆژوو بشکێنن، و بەوانەشی ووت کە رۆژووەکەیان نەشکاند: [أُولئِكَ العُصاة، أُولئِكَ العُصاة] (رواه مسلم)، واتە: ئەوانە یاخین و لە فەرمانی من دەرچوون، ئەوانە یاخین و لە فەرمانی من دەرچوون.

لە گێڕانەوەیەکی تری (ئیمامی موسلیم) بۆ فەرموودەکەدا هاتووە: کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا سەفەریان کرد بۆ شاری مەککە کە بەرۆژووش بوون، ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو: ﴿إنّكُمْ قَد دَنَوتُم مِن عَدُوِّكُم وَالفِطْرُ أَقوى لَكُم﴾، واتە: ئێوە نزیکبوونەتەوە لە دوژمنەکانتان و رۆژووشکاندن بۆ ئێوە باشترە و بەهێزترە، ئەوەبوو رۆژوو شکاندنەکە روخسەتێك بوو بۆیان و هەندێکیان رۆژوویان شکاند، بەڵام هەندێکی تریان هەر بەرۆژوو بوون، پاشان کە چوون بۆ جێگایەکی تر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: [إنّكُم مُصْبِحوا عَدُوِّكُم وَالفِطْرُ أَقْوى لَكُم فَأَفْطِروا﴾، واتە: ئێوە سبەینێ لەگەڵ دوژمندا لە جەنگدا بەیەك دەگەن و رۆژوو شکاندن بەهێزترتان دەکات، بۆیە رۆژوو بشکێنن، ئیتر ئەمە وەك

پێویست بوونی لێهات و هەموویان ڕۆژووەکانیان شکاند، پاشان ئـەو هاوەڵـەی کـە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە دەڵێت: ئـیتر ئێمـە زۆر جـار لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بەڕۆژوو دەبووین لە سەفەردا.

کەواتــە ڕۆژوو گــرتن بــۆ نــەخۆش و موســافیر و پەککەوتــەکان باشــترە و لەپێشترە، بەو مەرجەی لەش و دەروون لاوازنەبێت لە بەرگەگرتنی ناڕەحەتیدا، و تووشی زەرەرێکی راستەقینە نەبن، کە لە یەکەمیاندا ڕۆژوو شـکاندن روخسـەتە و لە دووەمیاندا پێویستە، کە ئەمە وتەی زوربەی موفەسیرەکان و شەرع زانانە.

لەمانەی باسمان کرد بۆمان روون دەبێتەوە کە خوای گەورە سـوود و قـازانجی دەروونی و جەستەیی ڕۆژووی سەلماندووە، لەگەڵ سوود و پاداشتی پاشەڕۆژدا بۆ ئــەو کەســانەی کــە روخســەتیان بــۆ دانــراوە لــە نــەخۆش و موســافیر و پــیر و هاوشێوەکانیان، کە ئـەم سـوودانە بـۆ ئەوانـەی تەندروسـتن زۆرتـر و سـەلماوترە، ئــەویش لەبــەر مانــا گشــتییەکەی دەســتەواژەی ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾، کـە دەگەڕێتــەوە بـۆ هــەموو ئەوانــەی پێشــتر باســکراون لەوانــەی کــە خاوەنی عوزرن.

ئەم سوودانەی ڕۆژوو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەرکەوتووە و سەلماوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە تەندروسـتن و خـوای گـەورە ڕۆژووی لەسـەر پێویسـت کـردوون، هەروەها بۆ ئەوانەش کە دەتوانن بەڕۆژوو بن لەوانەی خاوەنی عـوزرن و دەتـوانن هەردوو ژەمی پارشێو و بەربانگ بخۆن.

لێرەدا با لەبیرمان نەچێت کە بیسەلمێنین: هیچ توێژینەوەیەکەی زانستی نییـە کە لەسەر ڕۆژووەوانـە تەندروسـتەکان ئەنجامـدراوە لـە حاڵـەتی ئاسـاییدا ئـیللا ٢ سوودی بۆ دەرخستووین:

١- یان ئەوەی کە کاریگەریی ڕۆژوو لەسـەر ئەندامـەکان و پێکهاتـەکانی لـەش بەهیچ ئەندازەیەك مەترسی لەسەر جەستە دروست ناکات.

٢- یان ئەوەیە کە سوودێکی گەورە و بەرچاو لە کاری ئەو ئەندامانەدا دروست دەکات، و ڕێژە و هاوسەنگیی پێکهاتەکانی لەش باشتر دەکات:

* پێشتر وادەزانرا کە لەدەست دانی نیسبی شلەمەنیەکانی لەش، و کەمبوونی لێدانەکانی دڵ، و زیادبوونی هیلاکی لەکاتی ڕۆژوودا بە شێوەیەکی خراپ کاردەکاتە سەر کۆنترۆڵ کردنی نەهێشتنی مەیینی خوێن -کە یەکێکە لە هەرە مەترسیدارترین نەخۆشیەکان-، دواتر سەلما ڕۆژووی ئیسلامی هیچ کاریگەریەکی خراپ ناکاتە سەر ئەو نەخۆشیە لەو کەسانەدا کە بڕی دیاریکراو بۆیان لە دەرمانەکانیان دەخۆن.

* سەلماوە کە ڕۆژووی ئیسلامی مەترسی دروستناکات لەسەر زوربەی ئەوانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە، بەڵکو زۆریان سوودی لێدەبینن.

* ڕۆژوو زۆرێک لە نەخۆشییە مەترسیدارەکان چارەسەر دەکات، کە گرنگترینیان بریتین لە:

أ- نەخۆشییەکانی بەهۆی قەڵەوییەوە ڕوودەدەن، وەك: ڕەقبوونی خوێنبەرەکان، بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن، و زۆرێك لە نەخۆشیەکانی دڵ.

ب- زۆرێك لەو نەخۆشییانە چارەسەر دەکات کە بەهۆی کەڵەکە بوونی ژەهرەکان و پاشماوە زیانبەخشەکانەوە لە لەشدا دروستدەبن.

ج- زۆرێك لە نەخۆشیەکانی کۆئەندامی سووڕانی خوێن و لوولەکانی خوێن، وەك: نەخۆشی ڕاینۆید (Raynaud's disease)، و نەخۆشی بێرگەر (Berger's disease) کە بە زۆری لە جگەرەکێشەکاندا ڕوودەدات.

د- ڕۆژووی بەردەوام نەخۆشی هەوکردنی درێژخایەنی جومگەکان (ڕۆماتۆید)، و هەندێك نەخۆشی تری جومگەکان باشتردەکات.

هـ- ڕۆژووی ئیسلامی هیچ جۆرە مەترسییەك لەسەر ئافرەتی شیردەر دروست ناکات، یان لەسەر ئافرەتانی دووگیان (سکپڕ)، و هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە

پێکهاتەی کیمیایی لەش و گۆڕانکاریی لە زیندە چالاکیەکان لە ئافرەتانی شیردەردا دروست ناکات، هەروەها لە مانگەکانی سەرەتا و ناوەڕاستی سکپڕیشدا گۆڕانکاری دروست ناکات.

جا ئەگەر باسی ئەو سوودانە بکەین کە ڕۆژووەوانان دەستیان دەکەویت، ئەوا لە ژمارە نایەن، لێرەدا بە کورتی باسی هەندێك لە راستییە زانستییە گشتیەکان و هەندێك لە توێژینەوە تایبەتیەکان دەکەینەوە کە دووپاتی سوودەکانی ڕۆژوو بۆ مرۆڤ دەکەنەوە، و لە دوو توێی ئەم کتێبەدا پێشتر سەلماندمان:

١- ڕۆژوو بوار دەدات بە میکانیزمەکانی هەرس کردن و مژینی خۆراك لە کۆئەندامی هەرس و پاشکۆکانیدا بۆ ئەوەی کارەکانیان بە باشترین و تەواوترین شێوە ئەنجام بدەن، ئەویش بەوەی دوای خواردنی ژەمی خۆراکەکە ئیتر بوار نەدرێت کە خواردنی تر بکرێت بەسەریدا، لە کاتێکدا کە کۆئەندامی هەرس سەرگەرمی هەرس کردنێتی (نموونەی ئەم ژەمە خواردنی پارشێوە).

هەروەها ڕۆژوو ئیسراحەتێکی فیسیۆلۆجی دەدات بە کۆئەندامی هەرس و پاشکۆکانی، ئەویش بە ڕێگرتن لە خواردن و خواردنەوە بۆ ماوەیەکی زەمەنی دیاری کراو، کە لە نێوان (٩-١١) سەعات دەخایەنێت دوای مژینی خۆراك، ئیتر لیکە ڕژێنەکان دەحەوێنەوە و گەدە و ریخۆڵەکان و (پەنکریاس)یش لە دەردانی بەشێکی زۆر لە دەردراوەکانیان ئیسراحەت دەکەن.

هەروەها جگەریش دەحەوێتەوە لە ڕژاندنی بەشێکی زۆری زەرداوەکەی، و لە پێکهاتەکانی کە بریتین لە: خوێی جۆراوجۆر و ترشی زەرداو و ڕەنگکەرە زەردەکانی هەرسکەری خۆراك، کۆئەندامی هەرس دەحەوێتەوە لە دەردانی هۆرمۆن و ئەنزیمەکانی لە گەدە و ریخۆڵەکانەوە دەردەدرێن، هەروەها میکانیزمەکانی مژینی خۆراك لە ریخۆڵەکاندا بە درێژایی ماوەی ڕۆژوو دەحەوێنەوە، لەلایەکی ترەوە گرژبوونە تایبەتیەکان لە کۆئەندامی هەرسدا

(Migrating Motor Complex) هەڵدەستن بە پاککردنـەوەی ریخۆڵـەکان چونکە ئەمان لەکاردا دەبن بە بەردەوامی لە کاتی رۆژووشدا.

٢- رۆژوو بوار دەدات بەو کوێرە رژێنانەی کە پەیوەندیان هەیە بە کردارەکانی زیندەچالاکیەوە -لە ماوەی دوای مژینی خۆراکدا- بەوەی بە کارەکانیان هەستن، لە رێکخستن و دەردانی رژێنـە گرنگـەکانیان بـە باشـترین شـێوە، ئـەویش بـەهۆی چـالاککردنی رۆژانـەی میکانیزمـەکانی خاوکـەر و چـالاککەر بۆیـان بـۆ ماوەیـەکی جێگیری بەردەوام کە لەوانەیە تا ١ ساڵ بخایەنێت، بـەهۆی ئەمـەوە هاوسـەنگیەك روودەدات لـە نێـوان ئـەو هۆرمۆنانـەی کـە بـە پێچـەوانەی یەکتریـەوە کاردەکـەن، ئەویش وەك هۆرمۆنەکانی: (گەشەکردن و ئینسۆلین) کە دوو هۆرمـۆنی بنیاتنـەرن لە لایەکـەوە، و هـەردوو هۆرمـۆنی (گلوکـاگۆن و کـۆرتیزۆڵ) لەلایـەکی تـرەوە کـە ئـەمان دوو هۆرمـۆنی رووخێنـەرن، کـە بـەهۆی هاوسـەنگی ووردی نێـوان ئـەم هۆرمۆنانەوەیـە کـە رێـژە و خەسـتی ترشـە ئەمینیـەکان لـە خوێنـدا و هاوسـەنگی زیندە چالاکیەکان رادەگیرێت.

٣- رۆژوو میکانیزمەکانی زیندە چالاکیەکان چالاك دەکات، و کرداری نوانـدنی خـۆراك بـۆ گلوکـۆز و چـەوریەکان و پرۆتینـەکانی نـاو خانـەکان باشـتردەکات، بـۆ ئـەوەی بـە کارەکانیـان هەسـتن بـە باشـترین شـێوە، چـونکە میکانیزمـەکانی سـووتاندنی گلوکـۆز لـە سـووڕی ترشـی سـیتریکدا بـۆ دەرپەڕانـدنی ووزە، و میکانیزمـەکانی هـەڵگرتن و خـەزن کردنیـان لـە شـێوەی گلایکۆجینـدا و هـەروەها دووبـارە هەڵوەشـاندنەوە و دەرپەڕانـدنی گلوکـۆز لێیانـەوە و میکانیزمـەکانی ئۆکساندیان دەگەنە ئەوپەڕی چالاکی و باش بوونیان.

هـەروەها چـالاك کردنـی میکانیزمـەکانی تـری وەك: کۆکردنـەوەی ترشـە ئەمینییەکان بۆ دروستکردنی پرۆتینەکانی خانەکان و شانەکان، و پلازمای خـوێن، و هیمۆگلۆبین، و دروستکردنی هۆرمۆن و ئەنزیمـە جۆراوجۆرەکـانی تـری لـەش، و

میکـــانیزمی خاوکردنـــەوەی ئـــەم پرۆســـە گـــرنگ و زیندەگیـــە، و میکـــانیزمی دروستکردنی ترشە ئەمینیـەکانی وەك: ئـەلانین و پایرووڤـەیت و ئـەوانی تـریش، و میکانیزمی دروستکردنی گلوکۆزی نویٚ لە جگەردا لەم ترشـە ئەمینیانـەوە، و ئـەو میکانیزمە ووردانەی کە ئەم کردارانـە دەبەسـتێت بەیەکـەوە لـە کـرداره کیمیاییـە ئالۆزەکاندا، و ئەوەی کە پێویسـتێتی لـە ئەنزیمـەکان، و هۆرمۆنـەکان، و خویٚیـە کانزاییەکان، و ...هتد.

ئـەو هاوسـەنگیەی روودەدات لـە پێکهاتـەکانی خانـەکان و شـانەکانی لەشـدا بەگشتی، و هەموو ئەم کردار و پرۆسـانە بـە باشـترین و تـەواوترین شـێوە و بـەبیٚ بوونی هیچ کەم و کورتیەك روودەدات لە کاتی رۆژوو گرتندا.

بەلاَم ئەگەر بێتو لەش تەنیا بە کرداری بنیاتنانەوە خەریك بێت و تـەنها ئیشـی بریتی بێت لە هەلگرتن و خەزن کردنی خواردەمەنی لەناویدا، ئـەوا میکانیزمـەکانی بنیاتنـــان زالّ دەبـــن بەســـەر میکانیزمـــەکانی رووخانـــدنـــدا، ئـــیتر ئـــەو کردارانـــەی رووخانـــدن لاوازی و نوقســـانیان تێـــدا روودەدات، لەبەرئـــەوەی بـــە هـــەموو تواناکیانەوە بەکار ناهێنرێن، کە ئەنجامەکانی ئەم لاوازیە کاتێك دەردەکەون کە لەش تووشی بارێکی نائاسایی کوتوپڕ دەبێت، ئەویش بە نەمانی پێدانی خۆراك لە لەشساغی یان نەخۆشیدا، و لەوانەیە ئەو کەسە نەتوانێت درێـژە بـە ژیـانی بـدات، یان نەتوانێت بەرەنگاری نەخۆشیەکەی ببێتەوە.

٤- رۆژوو توانای وەچە خستنەوە لەلای پیاو و ئافرەت باشتر دەکات.

٥- مرۆڤ سـوود وەردەگرێـت لـە برسـێتی و تینـوو بـوون لـە کـاتی رۆژوودا بـە شێوەیەکی زۆر گەورە، چـونکە یارمـەتی ئامـادەکردن و خسـتنە بەردەسـتی ووزە دەدات بۆ هەموو لەش، و توانای فێربـوون زۆر بـاش و چـالاك دەکـات، و هـەروەها بـیرەوەری و زاکـیرەی مـرۆڤ بـەهێز دەکـات، بۆیـە بیرمەنـدەکان هەلّدەسـتان بـە خۆبرسی کردن بە مەبەستی بەهێزبوونی زیهنیان.

٦- خانە نەخۆش و لاوازەکان لە لەشدا تێك دەشکێنرێن کاتێك کە کرداری رووخاندن زاڵ دەبێت بەسەر کرداری بنیاتناندا لەکاتی رۆژوودا، و هەروەها خانەکان نوێ دەبنەوە لەکاتی پرۆسەی بنیاتناندا.

٧- هەستان بە کرداری رۆژوو گرتنی ئیسلامی بە مەبەستی ئەنجامدانی گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ خودا و لە ترسی سزادانی خودایی و ئومێدبوون بەوەی لەلای پەروەردگاری بالادەست هەیە لە پاداشتی چاکە، ئەمە خۆی لەخۆیدا کردارێکی زۆر بەسوودە بۆ لەشی مرۆڤ و بۆ ناخ و دەروونی، لەبەرئەوەی کە دڵنیایی و ئارامی بە نەفس و دەروونی مرۆڤ دەبەخشێت.

کاریگەریی ئەم دڵنیاییە لە میکانیزمەکانی زیندەچالاکیەکاندا خۆی دەبینێتەوە، و وایان لێدەکات کە بە باشترین و بە ئاسانترین و بە بەسوودترین شێوە ئەنجام بدرێن، کە دەبێتە هۆی گەیاندنی سوودێکی بێئەندازە بە لەش و ئەندامەکانی و پێکهاتەکانی.

رۆژووگرتن -بە قەناعەتێکی فیکری و ئەنجامدانی بەکردەوە- زۆرێك لە لایەنە دەروونیەکانی مرۆڤ بەهێزدەکات، لایەنەکانی سەبر و ئارام گرتن، و خۆڕاگرتن و بەهێزیی وویست و ئیرادە، و ڕاگرتنی ئارەزوو و وویستە خراپەکان زیاتر دەکات، هەروەها ئارامی و رازی بوون و خۆشی بە نەفس و دەروون دەبەخشێت، پێغەمبەریش (ﷺ) هەواڵی ئەمەی پێداوین کە دەفەرموێت: [للصّائِمِ فَرْحَتان يَفْرَحُهُما: إذا أَفْطَرَ فَرِحَ بِصَوْمِه، وَإذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِه] (**متفق عليه**).

واتە: مرۆڤی رۆژووەوان دوو دڵخۆشی بۆ هەیە: کاتێك کە رۆژوو دەشکێنێت ئێواران دڵی خۆش دەبێت بە ئەنجامدانی رۆژووەکەی، و کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار دڵی خۆش دەبێت بە پاداشتی رۆژووەکەی، ئەوەی کە رۆژووەوان دڵخۆش دەکات ئەو بەڵێنەی پەروەردگارە بۆی کە لە رۆژی دواییدا لە دەرگایەکی تایبەتیەوە دەچێتە بەهەشتەوە کە دەرگای (رەییان)ە.

هەر کەسێك لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار ١ ڕۆژ بەڕۆژوو ببێت ئەوا خوای گەورە ڕووخساری لە ئاگری دۆزەخ بۆ ماوەی ٧٠ پایز دوور دەخاتەوە، و هەر کەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و مەبەستی بەهێز کردنی بیروباوەڕی و پاداشتی پەروەردگار بێت، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشتری خۆش دەبێت، و چەندین فەرموودەی تر کە مژدە دەدەن بە ڕۆژووەوان و دڵی خۆشدەکەن و هانی دەدەن، ئەمە خۆشی و ئارامییەکە تەنها ڕۆژوو بە دەروونی دەبەخشێت.

***ڕووی سێیەم لە ئیعجازی ڕۆژوو:***

## ئاسانیی ڕۆژووگرتنی ئیسلامی و سادەییەکەیەتی

۞ توێژینەوە زانستیە سەلمێنراوەکان لە بواری کارئەندامزانی (فیسیۆلۆجی) لەشدا لەکاتی قۆناغەکانی برسیکردندا ئاسانیی و سادەیی ڕۆژووی ئیسلامی دەردەخەن.

خوای گەورە ڕاستییەکی زانستی تری بۆ ڕوون کردووینەتەوە کە بریتییە لەوەی ئەو ڕۆژووەی کە لەسەری پێویست کردووین ماوە زەمەنیەکەی لەنێوان بەرەبەیان و خۆرئاوا بووندایە، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ] (**البقرة: ١٨٧**)، واتە: بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو بۆتان جیادەبێتەوە، ڕوشتەی سپی (ڕۆژ) لە ڕوشتەی ڕەشی (شەو)، لە پاشان ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن تا شەوی دوایی.

خوای گەورە هەواڵی ئەوەی پێداوین کە ئەم ڕۆژووە ئاسان و بێعەزێتە، و ناڕەحەتی و زەرەری تێدا نییە: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾، (فەخری ڕازی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: خوای پەروەردگار ڕۆژووی فەرزکردووە بە شێوەیەکی ئاسان و بێئەرك، و تەنها لە ماوەیەکی کەمیساڵیشدا پێویستی کردووە، تەنانەت ئەو کەمەشی لەسەر نەخۆش و موسافیر پێویست نەکردووە.

کەواتە ڕۆژووی ئیسلامی ڕۆژووەیەکی سادە و ئاسانە بۆ ئەوانەی تەندروست و نیشتەجێن، و ناڕەحەتی بۆ نەفس و دەروون تێدانییە، و لەش بەهۆیەوە تووشی هیچ جۆرە زەرەر و زیانێك نابێت، ئەمەش بە دڵنیاییەوە دووپاتی دەکەینەوە، ئاسانی ڕۆژووی ئیسلامی لەم خاڵانەدا خۆیان دەبیننەوە:

١- ڕۆژووی واجب و پێویست تەنها چەند ڕۆژێکی کەم و دیاریکراون لە هەموو ساڵێکدا (کە بریتییە لە ١ مانگ)، خوای گەورە پێویستی نەکردووە کە مرۆڤ هەموو ڕۆژەکانی ساڵ یان زوربەی بەڕۆژوو ببێت، کە ئەگەر ویستی بوایە پێویستی دەکرد، بەڵام ڕەحمەت و بەزەیی بێپایانی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە ئەم ئەرکەی لەسەر موسوڵمانان ئاسان و کەمکردووە.

٢- ڕۆژووی ئیسلامی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی تەندروست و نیشتەجێ، ئەو هەستەی مرۆڤ کە ئەم ڕۆژووە لەسەر هەموو کەسێك پێویستە بەبێ جیاوازی، چ لە ئێستا و چ لە ڕابوردوودا، بووەتە هۆی هەستکردنی موسوڵمان بە ئاسانی ئەم کارە و خەیاڵاتی ناڕەحەتی و قورسی لە ئەنجامی وازهێنانێکی کاتی لە خواردن و خواردنەوە لە مێشکی دووردەخاتەوە.

لەلایەکی ترەوە هیوابوون بەدەستکەوتنی سوودەکانی ڕۆژوو هەستە دەروونییە ناڕاستەکانی قورسی و ناڕەحەتی ڕۆژوو لە ڕۆژووەوان دووردەخاتەوە.

٣- تەشریع کردنی ڕوخسەت و مۆڵەتی ڕۆژوو نەگرتن بۆ نەخۆش و موسافیر و پیر لەگەڵ ئەو سوودانەشی کە دەستیان دەکەوێت ئەگەر بەڕۆژوو بن، بریتییە لە کارئاسانیەك بۆ ئەو کەسانە لە بەرامبەر ناڕەحەتیەکانی نەخۆشی و سەفەردا، هەروەها ناڕەحەتی دووگیانی و شیردان، و کەم بەرگە گرتنی بەتەمەنەکان لە بەرامبەر بێبەش کردنیان لە خۆراك، و هەروەها حەرام کردنی ڕۆژوو بوونیان ئەگەر زەرەرێکی سەلماویان تووش ببێت یان سوودێکی گشتی و تایبەتی گرنگیان لەدەست بچێت، ئەم یاسایانە هەمووی نموونەی ئاسانین لە ڕۆژووی ئیسلامیدا.

٤- پێویستکردنی ڕۆژوو لەسەر ئەو کەسانەی بەهۆی بیانوویەکی کاتیی وەك: نەخۆشی یان سەفەر ڕۆژوویان شکاندووە، کە دەبێت لە کاتێکی تری ساڵدا ڕۆژووەکە بگرنەوە ئەویش بۆ ئەوەی بێبەش نەبن لە سوودەکانی، لەهەمان کاتدا لابردنی ئەم پێویستییە لەسەر ئەو کەسانەی کە بیانوو و عوزری هەمیشەییان هەیە، وەك: بەتەمەنەکان بە گشتی، وتەنانەت ئەوانەشی کە بیانووی نیمچە بەردەوامیان هەیە، وەك: ئافرەتی دووگیان و شیردەر، و ئەوانەی کە نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە و بەزۆری ئومێد لە چاکبوونەوەیان ناکرێت، ئەمە هەمووی وەك کارئاسانیەك و بەزەییەك بۆیان.

٥- ئاسانیی ڕۆژووی ئیسلامی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەموو پێویستییە خۆراکییەکان بۆ لەش دابین دەکات، و لە هیچ لە ماددە پێویست و بەسوودەکان بێبەشی ناکات، چونکە مرۆڤ لەم ڕۆژووەدا تەنها بۆ ماوەیەکی کەم دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵدەگرێت —لە بەرەبەیانەوە تا خۆرئاوا بوون—، و دوای ئەمە سەربەستە لە خواردنی هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی حەڵاڵ لە شەودا، بەهۆی ئەمەوە ڕۆژووی ئیسلامی تەنها بە گۆڕینێك دادەنرێت بۆ کاتەکانی خواردن وخواردنەوە.

خوای گەورە وازهێنانی بەردەوامی لە خۆراك پێویست نەکردووە بۆ ماوەی دوورودرێژ، تەنانەت بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێکیش لەسەریەك، ئەمیش هەر کارئاسانیەکە بۆ ئوممەتی کۆتایین پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

گرنگی ئەم شێوازە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەهۆی پێشکەوتنی هۆکارەکانی زانین و تەکنۆلۆجیاوە دەرکەوتووە، کاتێك کە مرۆڤ پێکهاتەووردەکانی خۆی و خانە ئینسانیەکانی بینی بەهۆی ووردبینە ئەلیکترۆنییەکانەوە، و بۆی دەرکەوت کە پێکهاتەکانی چین و کارەکانیان چۆن دەکەن، و زۆرێك لە نهێنیەیەکانیانی بۆ ڕوون بووەوە، و بەهۆی زانیاریەیەکانی گەیشتە زانینی هەموو پێکهاتەکانی خواردن و

خواردنەوەکان، و چۆنێتی سوود وەرگرتنی لەشی زیندەوەرەکان لێیان، هەروەها ئەو مەترسیانەشی کە بەهۆی زۆر خواردن و ئیسراف لە خۆراکدا رودەدەن بە ئاشکرا بۆ روونبووەوە، و زۆرێکی تریش لە سوودەکان و گرنگی ئەم شێوازەی رۆژووی ئیسلامی کە لە دوو توێی ئەم کتێبەدا بە ئاشکرا بۆ هەموو لایەك روون بوونەتەوە، ئیتر بەتەواوەتی گەورەیی رۆژوو سەلمێنرا.

**ئەمانەش چەند بەڵگەیەکی زانستی ئاشکرا و سەلمێنراون لەسەر ئاسانیی رۆژووی ئیسلامی و بێزیانیەکەی:**

لەکاتی قۆناغی یەکەمی وازهێنان لە خۆراك (قۆناغی دوای مژینی خۆراك، کە ماوەی رۆژووی ئیسلامیە): هەموو میکانیزمەکانی زیندە چالاکیەکان چالاك دەبن، کرداری گۆڕینی گلایکۆجین بۆ گلوکۆز پەرە دەسێنێت، و کرداری گۆڕین و سەرف کردنی چەوریەکانیش چالاك دەبێت، و دەگۆڕێن بۆ ترشە چەوریەکان و گلیسرۆڵ، پاشان ترشە چەوریەکان دەئۆکسێنرێن لە سووڕی ترشی (سیتریك)دا بۆ بەرهەم هێنانی ووزە، و گلیسرۆڵیش دەچێتە سووڕی دروستکردنی گلوکۆزی نوێ لە جگەردا، هەروەها میکانیزمی بەکارهێنانی پرۆتینەکانیش چالاك دەبێت، و ترشە ئەمینیەکان سەرف دەکرێن لە کرداری دروستکردنی گلوکۆزی نوێدا، کە بینراوە لە رۆژێکدا جگەر نزیکەی (٢٠٠ گرام)ی لێدروست دەکات.

ئەمەش بۆ پاراستنی رێژەی گلوکۆزە لە خوێندا لە ئاستێکی جێگیردا بۆ ئەوەی بدرێت بەو شانانەی کە پشتی پێدەبەستن بۆ دروست کردنی ووزە لێیەوە، کرداری شیبوونەوەی گلایکۆجین بۆ گلوکۆز بەرێژەیەکی خێراتر دەبێت لە سەعاتە سەرەتاکانی رۆژوودا، بەڵام کرداری شیبوونەوە و ئۆکساندنی چەوریەکان، لەگەڵ کرداری گۆڕینی ترشە ئەمینیەکان بۆ گلوکۆز، ئەمانە بە رێژەیەکی زیاتر دوایی روو دەدەن لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا.

گرنگترین رووداوەکانی ئەم قۆناغەی دوای مژینی خۆراك —کە رۆژووی ئیسلامی تێدا روودەدات— بریتین لە:

١- گلوكۆز بریتییە لە تاكە سووتەمەنی بۆ مێشك.

٢- چەورییەكان بەو ئەندازە زۆرە ئاتۆكسێنرێن كە ببنە هۆی دروستبوونی زیادەی تەنە كیتۆنیەكان لە خوێندا.

٣- ئەوەندەش پرۆتین بەكارناهێنرێت بۆ بەرهەمهێنانی ووزە، كە ببێتە هۆی دروست بوونی خەلەل و نوقسانی لە هاوسەنگیی نایترۆجینی لە لەشدا.

ئەم راستیانە وا لە رۆژووی ئیسلامی دەكەن كە ناوازە بێت لە ئاسانیی و بێزیانیدا، تەنانەت هەندێك لە زانایان ماوەی دوای مژینی خۆراك یان كاتی سەرەتای وازهێنان لە خۆراك بە كردارێكی برسی كردن دانانێن.

سەبارەت بە قۆناغی دووەم (كە برسی كردنی مام ناوەندییە): كرداری دروست كردنی گلوكۆزی نوێ زیاتر چالاك دەبێت، و كرداری ئۆكساندنی چەورییەكان بە برێكی زیاتر لە قۆناغی یەكەم روودەدات، كە دەبێتە هۆی دروستبوونی تەنە كیتۆنیەكان كە هەڵدەستن بە دابین كردنی ووزە بۆ شانەكانی لەش، بۆ نموونە مێشكی مرۆڤ نزیكەی (١٠-٢٠٪)ی ووزەكەی لەم تەنانەوە وەردەگرێت، گلوكۆزی بەرهەمهاتوو لەم قۆناغەدا دەگاتە ٢ تا ٣ ئەوەندەی ئەوەی لە قۆناغی پێشتردا بەرهەم دێت، لەگەڵ ئەوەشدا كە گلیسرۆڵ و لاكتەیت بە شێوەیەكی پێویست هەن بۆ بەرهەمهێنانی گلوكۆزی نوێ، بەڵام لەهەمان كاتدا رێژەی شیبوونەوەی پرۆتینەكانیش بەرز دەبێتەوە و لێرەوە هاوسەنگییەكی نایترۆجینی نێگەتیڤانە پەیدا دەبێت، كە بەهۆیەوە نایترۆجین دەكرێتە دەرەوە لە شێوەی یۆریادا، هەروەها جگەریش برێكی زیاتر لە ترشە چەوریە سەربەستەكان وەردەگرێت، كە برێكی زۆری دەئۆكسێنرێن و ئەمە دەبێتە هۆی دروست بوونی زیاتری تەنە كیتۆنیەكان، گرنگترین ئەو كردارانەی لەم قۆناغەدا روودەدەن ئەمانەن:

١- زیادبوونی رێژەی سەرف بوون و شیبوونەوەی پرۆتینەكان و دروست بوونی هاوسەنگیەكی نایترۆجینی سالب.

٢- کرداری دروستبوونی گلوکۆزی نوێ زیاد دەکات بە زیادبوونی ئۆکساندنی چەوریەکان.

٣- دروستبوونی تەنە کیتۆنیەکان، و پشت بەستنی مێشک پێیان بۆ دەستکەوتنی بڕێك لە ووزەکەی زیاددەکات.

لە قۆناغی سێیەمدا کە بریتییە لە برسی کردنی ماوەدرێژ، ئەم کردارانە روودەدەن کە لە خوارەوە باسیان دەکەین:

١- کەمبوونەوەی ڕێژەی شیبوونەوەی پرۆتینەکان و کردنە دەرەوەی نایترۆجین بۆ دەرەوەی لەش.

٢- زیاتر پشت بەستن بە چەوری سیانی گلیسرۆڵ (چەوریەکان) بۆ دروست کردنی ووزە بەرێژەیەکی زۆر لێیانەوە.

٣- چالاکبوونی کرداری دروست کردنی گلوکۆزی نوێ، و دروستکردنی (٨٥٪)ی گلوکۆز لە جگەردا بەم کردارە، ئەویش لە ترشە نائەمینیەکانی وەك: لاکتەیت، و پایرووڤەیت، و گلیسرۆڵ، کە جگەر بەم رێگەیە تەنها ٥٠گرام لە گلوکۆز لە رۆژێکدا دروست دەکات، لەبری (٢٠٠)گرام رۆژانە کە لە قۆناغی یەکەمدا دروستدەکرێت، هەروەها گورچیلەکانیش بەشداری دەکەن لە دروستکردنی گلوکۆزدا، کە نزیکەی (٤٠)گرام لە رۆژێکدا دروستدەکات.

٤- داواکاری لەسەر گلوکۆز لەم قۆناغەدا کەمدەکات، و مێشك پشت دەبەستێت بە تەنە کیتۆنیەکان (بە رێژەی ٧٠-٨٠٪) بۆ دەستخستنی ووزە لێیانەوە، ئەویش بەهۆی زیادبوونی شیبوونەوەی چەوریەکانەوە.

لە ئەنجامی ئەو راستیەیانەی پێشتر باسمان کرد بۆمان روون دەبێتەوە کە ماوەی رۆژووی ئیسلامی، کە لە نێوان (١٢-١٦) سەعاتدایە لە ناوەندا، کەمێکی دەکەوێتە قۆناغی مژینی خۆراکەوە لە ریخۆڵەکانەوە، و زوربەی دەکەوێتە قۆناغی دوای مژینی خۆراکەوە.

که تێیدا هەموو میکانیزمەکانی مژین و سەرف کردنی خۆراکەکان و زیندە چالاکیەکان چالاك دەبن بە شێوەیەکی هاوسەنگ، کرداری شیبوونەوەی گلایکۆجین چالاك دەبێت، و شیبوونەوە و ئۆکساندنی چەوریەکان، و شیبوونەوەی پرۆتینەکان و دروستبوونی گلوکۆزی نوێ لێیانەوە، هیچ جۆرە خەلەل و نوقسانیەك روونادات لە کارەکانی ئەندامەکانی لەشدا، چەوریەکان ئەوەندە نائۆکسێنرێن که ببنە هۆی پەیدابوونی تەنە کیتۆنیە زەرەرمەندەکان بۆ لەش، هەروەها هاوسەنگیەکی نایترۆجینی نێگەتیڤانە روونادات لە سەرفکردنی پرۆتینەکانەوە، شانەکانی مێشك و خڕۆکە سوورەکانی خوێن و کۆئەندامی دەمار هەموویان تەنها پشت بە گلوکۆز دەبەستن بۆ دروست کردن و دەرپەڕاندنی ووزە لێیەوە.

بەڵام برسیکردن یان رۆژووی پزیشکی –ئەگەر درێژ بێت یان کورت– تەنها بە چالاککردنی ئەو میکانیزمانەوە ناوەستێت، بەڵکو ئەوەندە زیاددەکات کە دەبێتە هۆی دروستکردنی خەلەل لە هەندێك لە فرمانەکانی لەشدا، تێبینی ئەم جیاوازیانەش دەکەین:

١– بوونی هاوسەنگی نێوان بنیاتنان و رووخاندن لە رۆژووی ئیسلامیدا، کە رێژەی بنیاتنان باشتر دەبێت لە رووخاندن، بە پێچەوانەی برسیکردنەوە کە رێژەی رووخاندن زیاتر دەبێت لە بنیاتنان، کە ئەمەش لەسەر حیسابی تێکشکاندنی خانە ماسولکەییەکان دەبێت.

٢– لە رۆژووی ئیسلامیدا تەنی کیتۆنی دروستنابێت، چونکە ترشە چەوریەکان بە کەمی دەئۆکسێنرێن، بەڵام لە برسیکردندا پەیدا دەبن، لەبەرئەوەی ئۆکساندنی ئەم ترشانە بەرێژەیەکی بەرز دەبێت.

٣– بەرهەمهێنانی ووزە لە سووڕی ترشی سیتریکەوە باشتردەبێت لە رۆژووی ئیسلامیدا، باشتر لەوانەی بەرۆژوو نابن، و زۆر باشتر لەوانەی لە برسی کردندان.

٤- هاوسەنگی لە بەرهەم هێنـانی گلوکـۆزی خوێنـدا و گـۆڕانی گلایکـۆجین بـۆ گلوکۆز لە ڕۆژووی ئیسلامیدا، و بەپێچـەوانەی ئەمـەوە لـە برسـیکردندا، جیـاوازی نێوان ڕۆژووی ئیسـلامی و برسـیکردن و خـواردنی خـۆراکی ئاسایی ڕۆژانـە کـورت دەکاتـەوە، کـە ئەمانـە هـەمووی لەپێشـیی ڕۆژووی ئیسـلامی دەردەخـات بەسـەر ڕۆژووی پزیشکی، کە هەموو سوودەکانی ئەویش دێنێتەدی، هەردووکیان بەشدارن لە چالاککردنی کردارەکانی ڕووخاندن و تێکشکاندن، و ڕزگار کردنی لەش لە شـانە نەخۆشەکان و لە پاشماوە ژەهرییەکان.

ئەو ماوە زەمەنیەی خوای گەورە دایناوە لـە بەرەبەیانـەوە تـا خۆرئـاوا بـوون، بریتییە لە کاتێکی زۆر گونجاو و پێویست بۆ چالاککردنی سەرجەم کردارە گرنگ و زیندەگیەکان لەناو لەشی مرۆڤدا، و زیادبوون لـەم ئاسـتە دەبێتـە هـۆی هیلاکـی و ناڕەحـەتی بـۆ لـەش، و لـەم زیادبوونـەوە سـوودێکی ئـەوتۆی دەسـت ناکـەوێت، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری و نەهی کردووە لـە ڕۆژوو بـوونی بـەردەوام، کـە بریتییە لە برسیکردنی ڕەها کە مرۆڤ تێیدا هیچ جۆرە خۆراکێك ناخوات بۆ مـاوەی چەند ڕۆژێك یان زیـاتر، ئـەویش لەبـەر ئەوەیـە کـە سـوودێکی زیـادە ناگەیـەنێت، بەڵکو شانەکان تێکدەشکێنرێت بۆ ئەوەی هاوسەنگی ووزە لە لەشدا ڕابگیرێـت، و لەوانەیە ببێتە هۆی بەمۆم بوونی جگەر و تێکچوونی فرمانـەکانی و بەرزبوونـەوەی ئاستی تەنە کیتۆنیەکان، و لە کۆتاییدا ترشبوونی خوێنی مەترسیدار.

لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) هاتووە کە ووتوویەتی: [نَهى النَّبيّ (ﷺ) عن الوِصـال، قـالوا يا رسـول الله (ﷺ): إنَّـكَ تواصـل، قـالَ: إنِّ لَسْـتُ مِثْلَكُم، إنِّ أُطْعَمُ وَأُسْقى] (**رواه البخاري**)، واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) بـەرگری کـردووە لـە ڕۆژوو گرتنی بەردەوام، هاوەڵەکانی لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) تۆ لەسەریەك بەڕۆژوو دەبیت، ئەویش فەرمووی: من وەك ئێوە نیم، من خوای گـەورە خواردن و خواردنەوەم پێدەدا لە کاتی ڕۆژووەکەمدا.

ئەم فەرموودەیە دووپاتی گرنگی خواردن و خواردنەوە دەكات لەكاتی رۆژوودا، كـە بـەردەوام بـوون لەسـەر بێبـەش بـوون لێیـان زەرەر و ناڕەحـەتی تێدایـە، و ئەوەشی كە هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بینییان لـە بـەردەوامی و لەسـەر یـەكیی رۆژووی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها تایبەت بووە بە خۆیەوە، لەبەرئەوەی خوای گەورە بە رێگەیەكی تر خواردن و خواردنەوەی پێدەدا، كە ئاسایی نییە لەلای مرۆڤەكان.

۞ رۆژووی ئیسلامی نواندنێكی ناوازەیە بۆ پێكهاتەكانی خۆراك، لەبەرئـەوەی هەردوو قۆناغی تێكشـكاندن و بنیاتنـان دەگرێتـەخۆی، لـەدوای خـواردنی هـەردوو ژەمـی بـەربانگ و پارشـێو، دروسـتكردنی پێكهاتـە گرنگـەكانی خانـەكان دەسـت پێدەكات و ماددە هەڵگیراوەكان نوێ دەكرێنەوە، كە بەكارهێنرا بوون بۆ دروسـت كردنی ووزە.

لەدوای قۆناغی مـژینی پێكهاتـەكانی ژەمـی پارشـێو ئـیتر قۆنـاغی تێكشـكاندن دەست پێدەكات، كـە خۆراكـە هـەڵگیراوەكان لـە شـێوەی گلایكـۆجین و چـەوریدا شیدەبنەوە، بۆ ئەوەی ووزەی پێویست بۆ لەش دابـین بكـەن، لـە كـاتی جووڵـە و چالاكی لە رۆژەكانی رۆژوو گرتندا.

۞ مـاوەی تێكشـكاندن لـە رۆژووی ئیسـلامیدا لـەنێوان (٨-١٦) سـەعات دەخایەنێت، كە ئەم ماوەیە بە شێوەیەكی بێگومان و بەدڵنیاییەوە دەكەوێتە ئـەو قۆناغەی كە زانایان بە قۆناغی دوای مژینی خـۆراك ناویـان بـردووە، كـە لـە نێـوان (٦-١٢) سەعاتدایە و لەوانەیە بۆ (٤٠) سەعات درێژ ببێتەوە، بەپێی دابەشـكردنی قوتابخانــە جۆراوجۆرەكــان بــۆ قۆناغــەكانی برســیكردنی تــەواو (التجویــع Starvation)، كە زانایان ئەم كاتە بە ماوەیەكی دڵنیایی تەواو دادەنێن، و هـیچ جۆرە زەرەرێك بـەرەهایی بـە هـیچ بەشـێكی لـەش ناگـات، بـەڵكو بەپێچـەوانەوە لەشی مرۆڤ سوودی زۆر گـەورە و لەبەرچـاوی دەسـت دەكـەوێت لـەم كاتـەدا، كـە هەندێكیمان پێشتر ئاماژە پێدا.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دووپاتی خواردنی پارشێوی کردۆتەوە بۆ ئەوەی لەش ژەمێکی بنیاتنەری پێبدرێت کە بۆ ماوەی (٤ سەعات) سوودی لێدەبینێت، کە لەو کاتەوە حیسابی بۆ دەکرێت کە مرۆڤ واز لە خواردن دێنێت، بەهۆی ئەمەوە ماوەی دوای مژینی خۆراك کورت دەکرێتەوە بۆ کەمترین کاتی توانراو، هەروەها هاندانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ موسوڵمانان بۆ زوو رۆژوو شکاندن، و دواخستنی پارشێو کردن، ئەمیش ماوەی رۆژووەکە کورت دەکاتەوە بۆ کەمترین ماوەی توانراو، ئەویش بۆ ئەوەی لە ماوەی دوای مژینی خۆراك تا بتوانرێت تێنەپەڕێت، کەواتە رۆژووی ئیسلامی هیچ جۆرە قورسی و ناڕەحەتیەك دروست ناکات و هیچ پەستانێکی دەروونی زیانبەخش بۆ لەش دروست ناکات.

– (زەیدی کوڕی ثابت) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) پارشێومان کرد و یەکسەر هەستاین بۆ نوێژ، لێیان پرسی: چەند ماوە لەنێوان ئەو دووانەدا بوو، ووتی: بە ئەندازەی خوێندنی ٥٠ ئایەت لە قورئان (متفق علیه).

– لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە (رەزای خوایان لێبێت) هاتووە کە ووتوویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) ٢ بانگبێژی هەبووە: بیلالی حەبەشی و عبدالله ی کوڕی ئیبن ئوم مەکتوم، پێغەمبەر (ﷺ) پێمانی فەرموو: ﴿إِنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيل، فَكُلُوا واشْرَبوا حتَّى يُؤَذِّنَ ابن أم مَكتوم﴾، واتە: بیلال لە کۆتایی شەودا بانگ دەدات، ئێوە دەتوانن بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو (ئیبن ئوم مەکتوم) بانگ دەدات، (ئیبن عومەر) دەڵێت: تەنها ئەوندە لە نێوان بانگەکانیاندا هەبوو کە کاتێك ئەم دادەبەزی ئەوی تر سەردەکەوت بۆ بانگدان (متفق علیه).

– لە (عیربازی کوڕی ساریە)وە (رەزای خوای لێبێت) کە ووتوویەتی: رۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردم بۆ خواردنی پارشێو و فەرمووی: ﴿هَلُمَّ الى الغَداء المُبارَك﴾، واتە: فەرموو وەرە با پێکەوە خواردنە پڕبەرەکەتە بخۆین (رواه أبوداود والنسائي وابن حِبّان)، لە (ئەبی دەرداء)یشەوە (رەزای خوای لێبێت):

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿هُوَ الغَداءُ المُبارَك﴾ يعني السّحور، واتە: نانی پارشێو بریتییە لە ژەمە خواردنە پیرۆزەکە (رواه ابن حبان في صحيحه).

– لە (عبدالله ی کوڕی حارث)ەوە کە لە هاوەڵێکی پێغەمبەرەوە گێڕاویەتەوە کە ووتوویەتی: ڕۆژێك چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە لەو کاتەدا پارشێوی دەکرد، و پێی فەرمووم: ﴿إنَّها بَرَكة أَعْطاكُمُ اللهُ إيّاها فَلا تَدَعُوه﴾، واتە: ئەم خواردنە بەرەکەتێکە خوای گەورە داویێتی بە ئێوە، لەبەرئەوە وازی لێمەهێنن (رواه النَّسائي بِإسناد جيد).

– لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إنَّ اللهَ وَملائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على المُتَسَحِّرين﴾، واتە: خوای گەورە و فریشتەکانی ڕەحمەت و بەزەیی دەنێرن بۆ ئەو کەسانەی کە پارشێو دەکەن (حديث صحيح رواه الطبراني وابن حبان).

– لە (عەمری کوڕی عاص)ەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فَرْق ما بَينَ صِيامِنا وَصِيام أهل الكِتاب: أَكْلَةُ السَّحر﴾، واتە: جیاوازی نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی دیانەکان (ئەهلی کیتاب) بریتییە لە خواردنی پارشێو (رواه مسلم).

– لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ووتوویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿تَسَحَّروا فَإنَّ في السُّحور بَرَكة﴾، واتە: پارشێو بکەن لەبەر ئەوەی خواردنی پارشێو پڕە لە بەرەکەت بۆ ئێوە (متفق عليه).

– لە (سەهلی کوڕی سەعد)ەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا يَزالُ النّاسُ بِخَيْرٍ ما عَجَّلُوا الفِطْرَ﴾، واتە: هەمیشە خەڵکی لە خێر و چاکەدا دەبن تاوەکو زوو ڕۆژوو بشکێنن (متفق عليه).

– لە (ئەبو هورەیرە)وە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لا يَزالُ الدِّينُ ظاهِراً ما عَجَّلَ النّاسُ الفِطْرَ، لأَنَّ اليَهود والنَّصارى

يُؤَخِّرون﴾، واته: دینی ئیسلام سەلامەت و پارێزراو دەبێت تا ئەو کاتەی کە رۆژوو زوو بشکێنرێت، لەبەر ئەوەی جوولەکە و گاور دینەکەیان تێکداوە و رۆژوو درەنگ دەشکێنن (صحيح: رواه أبوداود وابن ماجة وابن خزيمة).

– لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە (رەزای خوای لێبێت) ووتوویەتی: هیچ کاتێك پێغەمبەرم (ﷺ) نەدیوە کە نوێژی (مەغریب) بکات تاوەکو رۆژووەکەی نەشکاندایە، ئەگەر بە قومێك ئاویش بوایە (حديث حسن رواه ابن خزيمة وابن حبان وأبو يعلى).

۞ بوونی عەمبارێك لە ووزە لە لەشی مرۆڤدا، کە بەشی پێویستیەکانی مرۆڤ دەکات کاتێك واز لە خواردن بهێنێت بە تەواوەتی بۆ ماوەی مانگێك تا سێ مانگ کە هیچ شتێك نەخوات لەو ماوەیەدا، خوای گەورە ئەم عەمبارە ئێجگار گەورەیەی ئامادە کردووە لە لەشی مرۆڤدا بۆ ئەوەی هۆکارەکانی ژیانی پێببەخشێت لە کاتی پێویستیدا، وەك کاتی رۆژوو گرتن، یان نەخۆشی، و لە کاتی نارەحەتی و بێبەش بوون لە خۆراکدا، ئەو گلوکۆزەی لە جگەر و ماسولکەکاندا هەڵگیراوە لە شێوەی گلایکۆجیندا، ووزە بە لەش دەبەخشێت لە ماوەی سەرەتای وازهێنان لە خواردندا، هەروەها چەوریە هەڵگیراوەکان لە شانە چەوریەکاندا و پرۆتینە هەڵگیراوەکان لە ماسولکەکاندا ووزەی پێویست بۆ لەش پێشکەش دەکەن لە ماوە ناوەند و درێژەکانی وازهێنان لە خواردندا (واتە برسێتی رەها).

بە پشت بەستن بەم راستیە دەتوانین دووپاتی بکەینەوە کە ئەوەی دەوەستێت لە ماوەی رۆژوودا بریتییە لە کردارەکانی هەرس کردن و مژینی خۆراك، نەوەکو کردارەکانی خۆراك پێدان بە شانەکان، چونکە خانەکانی لەش زۆر ئاساییانە لە کارەکانیاندا بەردەوام دەبن، و هەموو پێویستیەکانیان لەو عەمبارە هەڵگیراوەوە وەردەگرن کە شیدەبێتەوە، ئەمە بریتییە لە کردارێکی هەرسکردنی ناوخۆیی لەناو خانەکاندا.

ئەوەتا گلایکۆجین دەگۆڕێت بۆ گلوکۆز، و چەوری و پرۆتینەکان شیدەبنەوە بۆ ترشە چەوری و ترشە ئەمینیەکان، ئەمەش بەهۆی تۆڕێکی ئاڵۆز لە ئەنزیمەکان و کارلێکە کیمیاییە زیندەگیە ووردەکانەوە روودەدات، کە لە بەرامبەر ووردەکاری و ئاڵۆزییاندا مرۆڤ سەرسام رادەوەستێت و دان بە گەورەیی و زانایی و دانایی ئەو دروستکەرە باڵادەستەدا دەنێت کە ئەم ووردەکاریە بەڕێوە دەبات.

ئادەمیزاد لەدوای چوار رۆژ لە دابڕانی لە خۆراك لە چارەسەرگە پزیشکیەکاندا (کە چارەسەری مرۆڤ بە وازهێنانی تەواو لە خواردن یان رۆژووی پزیشکی دەکەن) دەست دەکاتەوە بە ژیانی ئاسایی خۆی لە رۆیشتن و خوێندنەوە و نووسین، تەنانەت بە یارییە وەرزشیەکانیش هەڵدەستێت بەڵام لەژێر چاودێریەکی ووردی پزیشکیدا، مرۆڤ تەنیا لە چوار رۆژی یەکەمدا لە وازهێنانی لە خواردن هەست بە هیلاکی و ماندوویی دەکات، و تەنیا لەم چوار رۆژەدا هەست بە برسێتی عادەتیی دەکات، کە دوای ئەم چوار رۆژە ئیتر نامێنێت، (د. بریزتنس) ئەمە روون دەکاتەوە بەم شێوەیە: هەستکردن بە هیلاکیی وماندوویی کە هاوشانە لەگەڵ برسێتیدا بە تەنیا بارێکی فیزیایی رووتە، و بە پشت بەستن بە چەندین تاقیکردنەوە لە شیکارگەکاندا دەرکەوتووە کە رۆژوو خۆی نابێتە هۆی دروست بوونی ئەم نیشانانە، و نابێتە هۆی دروست بوونی ئازار و لاوازیی بە تایبەتی لە رۆژەکانی یەکەمیدا، هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین فاکتەری تر —کە رۆژوو یەکێکیان نییە—، و هەروەها نەمانی ئەم نیشانانە لەگەڵ بەردەوام بوونی رۆژوودا ئەوە دەسەلمێنێت کە رۆژوو هیچ پەیوەندیەکی پێیانەوە نییە.

گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە ئەم نیشانانە دروستدەکەن بریتین لە: وازهێنانی کوتوپڕ لە خواردنەوەی ماددە ئاگادار کەرەوەکان (المنبهات) کە خەڵکی عادەتیان گرتووە بە خواردنەوەیان، هەروەها عادەتە خراپەکانی خۆراك خواردن کە لە سەروو هەموویانەوە بریتییە لە زیادڕەوی و ئیسراف کردن لە خواردندا،

بینراوە ئەو کەسانەی کە قەڵەون و لە بارێکی ئیسراحەتدا دەژین بریتین لەوانەی کە لە هەموو کەس زیاتر تووشی ئەم نیشانە ناڕەحەتانە دەبن، جیاوازی نێوان ئەم نیشانانە و هەست کردن بە برسێتی راستەقینە ئەوەیە کە ئەمیان بریتییە لە دیاردەیەکی فیسیۆلۆجی، و هاواری لەش بۆ دەستکەوتنی خۆراکی پێویست بۆی، کە ئەمەش روونادات تاوەکو بەشێکی زۆر لە خۆراکی هەڵگیراو لە لەشدا سەرف نەکرێت و نەمێنێت.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم توانا و ئیمکانیاتە گەورانەی خوای گەورە بۆ لەشی مرۆڤی ئامادە کردووە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە خۆی بکات لە کاتی وازهێنانی و دابڕانی تەواویدا لە خۆراك، لەگەڵ هەموو ئەمەدا خوای گەورە رۆژوویەکی لەسەر پێویست کردووین کە تێیدا دابڕین لە خۆراك بە تەواوەتی و تەنها بۆ ماوەیەکی دیاریکراوە کە لە زوربەی بارەکاندا لە رۆژێك کەمتر دەخایەنێت، دەی بزانە چەند ئاسان و لە تواناداپە ! !

مرۆڤی رۆژووەوان دەتوانێت تێیدا ناڕەحەتترین و قورسترین کار ئەنجام بدات بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە زیانێکی پێبگات، بەڵکو بچووکترین زەبری لێناکەوێت، ئەویش لەبەرئەوەیە کە ووزەی جووڵێنەر لەبەردەستدا زۆرە، و کرداری دروست کردنی خانەکان و تازەکردنەوەی زەرەرمەند بووەکان بە هیچ شێوەیەك کاری تێناکرێت، چونکە ٣ پێکهاتە گرنگەکان: پرۆتینەکان و چەوریەکان و کاربۆهیدرات دەتوانرێت هەریەکێکیان بگۆڕدرێت بۆ ئەوی تریان لەناو خانەکاندا.

هەروەها لێیانەوە هەموو پێکهاتەکانی ناو خانەکە دروست دەکرێن، هەربۆیە لێرەوە هیچ کردارێکی زیندەگی ناو لەش کاری تێناکرێت، بەڵکو هەموو ئەندام و سیستەمەکانی ناو لەش سوودمەند دەبن بە رۆژووگرتن، و چالاك دەبن بۆ ئەنجامدانی کاری زیاتر، هەروەها خواردنی خۆراك لە ژەمەکانی بەربانگ و پارشێودا هەڵگیراوەکانی لەش کە لەکاردا سەرف دەکرێن جارێکی تر نوێ

دەکاتەوە، و پێویستیەکانی لەش دابین دەکات لە: ترشە ئەمینی و ترشە چەوریە سەرەکیەکان، کە لەش ناتوانێت لەناوخۆیدا دروستیان بکات، هەروەها پێویستیە رۆژانەکەشی دەداتێ لە ڤیتامینەکان و کانزاکان، کە پێویستە مرۆڤ لە خواردنەوە وەریبگرێت.

هەربۆیە مرۆڤ دەتوانێت هەموو ساڵەکە بەرۆژوو ببێت بە رۆژووی ئیسلامی کە تەنیا ژەمەکانی بەربانگ و پارشێو بخوات، بەبێ ئەوەی تووشی زەرەرێك ببێت کە هەرەشە لە ژیانی بکات، بەڵام لەبەر رەحمەت و بەزەیی خودایی بە مرۆڤەکان خوای گەورە ئەم ئەرکەی دانەناوە و رۆژووەکەی کەم کردووەتەوە و سووکی کردووە و تەنها یەك مانگی پێویست کردووە لە هەموو ساڵێکدا، و ئازادی کردووە کە هەڵبژێرێت لە رۆژووە سوننەتەکان کە پێغەمبەر (ﷺ) هانی موسوڵمانانی داوە بە گرتنی، ئەویش بەپێی توانای خۆی بیانگرێت و بەردەوام بێت لەسەریان، وەك رۆژووی سێ رۆژ لە هەموو مانگێکدا، یان رۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەی هەموو هەفتەیەك، هەروەها رۆژوو گرتنی شەش رۆژ لە مانگی (شەووال)، و رۆژی (عاشورا) و رۆژی (عەرەفە)، و چەند رۆژێکی تر کە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کە هانی موسوڵمانانی داوە بۆ گرتنیان و خۆیشی گرتوویەتی.

هەروەها بەرگری کردووە لەوەی کە ئادەمیزاد خۆی بچەوسێنێتەوە و سزای خۆی بدات بەوەی کە بە درێژایی ساڵ بەرۆژوو بێت، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ناڕەزایی دەربڕی بەرامبەر بەو هاوەڵەی کە لەسەر خۆی پێویست کردبوو کە بە درێژایی ساڵ بەرۆژوو ببێت، و وای لێهات کە لەشی زۆر لاواز و باریك بوو و شێوە و روخساریشی تێکچوو، ئەوە بوو پێی فەرموو: ﴿لِمَ عَذَّبْتَ نَفْسَكَ﴾ وَأَمَرَهُ بِالإِعْتِدال (رواه أبوداود وابن ماجة والنسائي)[95]، واتە: بۆ تۆ خۆت سزادا، و ئەوەبوو فەرمانی

---

[95] درێژەی فەرموودەکە کە ئیمامی (أبوداود) لە (سنن)ەکەیدا گێراویەتەوە بەم شێوەیەیە: رۆژێك هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) بەناوی (باهیلی) هاتە لای پێغەمبەر ئەویش روخساری لەلا جوان بوو،

پێکرد کە ناوەندبێت و خۆی نارەحەت نەکات، ئیتر لەمە کارئاسانتر چییە؟ پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ (النساء:٢٨)، واتە: خوای گەورە دەیەوێت کارەکانتان لەسەر ئاسان بکات لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە لاوازی دروست کراوە، ئیتر کام کارئاسانیە لەمە ئاسانترە ﴿يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾.

لێرەوە ئیعجازی زانستی رۆژووی ئیسلامی دەردەکەوێت بە دەرکەوتنی راستیە زانستییەکان لەم سەردەمەماندا، کە هیچ مرۆڤێك پێش ١٤سەدە لەمەوپێش نەیدەتوانی باسی بکات و بەدڵنیاییەوە دووپاتی بکاتەوە.

کاتێکیش کە راستیەکان دەربارەی لەشی مرۆڤ و کردارەکانی نواندنی خۆراك بە ئاشکرا دەرکەوتن، و هەروەها مەترسیەکانی زۆر خواردن روون بوونەوە، زانایان هاوڕیان لێبەرزبووەوە کە دەبێت مرۆڤ مامناوەند بێت لە خواردن و خواردنەوەیدا، و پێویستە مرۆڤ رۆژووبگرێت بە مەبەستی خۆپارێزی و چارەسەر، و بۆ بەدیهێنانی زۆرێك لە سوود و قازانج، (د. ئالان کوت) لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا (رۆژووی پزیشکی) کورتی کردووەتەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە: ئایا ئێمە بۆ رۆژوو دەگرین؟ ئەویش دەڵێت: بۆ دابەزاندنی کێشی لەش بە

---

ئەوەبوو پاش ساڵێك کە هاتەوە بینی کە حاڵی و شێوە و روخساری گۆڕاوە، کابرا بە پێغەمبەری ووت: ئەی پێغەمبەری خودا نامناسیتەوە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: تۆ کێیت؟ کابراش ووتی: من ئەو (باهیلی)یەم کە پار هاتمە خزمەتت، پێغەمبەریش (ﷺ) پرسی: بۆ وا گۆڕاویت، کە تۆ رووخسارت جوان بوو؟ ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەتەی تۆم بەجێ هێشتووە تەنیا بە شەو نەبێت خۆراکم نەخواردووە (بە درێژایی ئەم ساڵە هەموو رۆژەکان بەڕۆژوو بووە)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بۆ وا سزای خۆت داوە، و پێی فەرموو: مانگی رەمەزان بەڕۆژوو ببە و تەنها یەك رۆژیش لە هەموو مانگێك، کابرا ووتی: بۆم زیاد بکە لەبەرئەوەی من بەتوانام، فەرمووی: کەواتە دوو رۆژ لە هەموو مانگێك، ووتی: بۆم زیاد بکە، ئەویش فەرمووی: سێ رۆژ بەڕۆژوو ببە، کابرا هەر دەیووت: بۆم زیاد بکە، ئەویش فەرمووی: لە هەموو مانگێکدا چەند رۆژێك بەڕۆژوو ببە و دوایی بیشکێنە، و بەردەوام مەبە لەسەر رۆژوو گرتن بە درێژایی هەموو ساڵەکە.

ئاسانترین و خێراترین ڕێگە، هەروەها بۆ ئەوەی سیستەمەکانی لەش ماوەیەکی ئیسراحەتی گونجاویان پێبدرێت، هەروەها بۆ پاکردنەوەی لەشمان بە دەرهێنان و کردنە دەرەوەی ژەهر و پاشماوەکان لێیەوە، و بۆ ئەوەی بواربدەین بە لەشمان بۆ ئەوەی خۆی بنیات بنێتەوە، و بۆ چارەسەری زۆرێك لە نەخۆشیە باوەکان، و بۆ ڕزگار بوونمان لە دڵەڕاوکێ و تەوەتوری دەروونی، و بۆ بەهێزکردنی هەستەکان، و زیندوو کردنەوەی تواناکان و بەهرەکان، و بۆ ئەوەی کە توانای کۆنترۆڵ کردنی دەروون و بەرز بوونەوەی ڕۆحی وەرگرین، کە بەهۆی ئەمانەوە جەستە و بیرو عەقڵمان باشتر دەبێت، و کرداری ڕۆیشتن بەرەو پیربوون خاودەبێتەوە.

لە کۆتاییدا (د. کوت) داوا لە پزیشکان دەکات کە ڕۆژوو وەك هۆکارێکی خۆپارێزی و چارەسەر بەکار بێنن.

هەروەها (د. هـ. م. شیلتۆن) لە کتێبەکەیدا کە بە ناونیشانی (چارەسەر بە ڕۆژوو)ە دووپاتی دەکاتەوە کە ڕۆژوو گرتن ئیسراحەتێکی تەواو دەدات بە ئەندامە گرنگ و زیندەگیەکانی لەش، و پرۆسەی مژینی ئەو خواردنانەی لە ریخۆڵەکاندا شیدەبنەوە دەوەستێنێت، و کۆئەندامی هەرس خاڵی دەکاتەوە، و ڕزگاری دەکات لە میکرۆب و کەڕووەکان، و بوار دەدات بە سیستەمەکانی خاڵی کردنەوە بۆ ئەوەی کە چالاکی وەرگرنەوە، و هەروەها پێکهاتەی کیمیایی وفیسیۆلۆجی دەردراوە سروشتیەکانی لەش نوێ دەکاتەوە، و کرداری مژینی نیشتەنی و کەڵەکە بووەکان و پاشماوە نا ئاساییەکان ئاسان دەکاتەوە، و گەنجێتی دەگێڕێتەوە بۆ خانە و شانەکان، و ئەندامەکان نوێ دەکاتەوە بەوەی شانە مردوو و لاوازەکان لەناو دەبات، و شانەی نوێ و چالاك دەخاتە شوێنیان.

پاشان (د. شیلتۆن) لە کتێبەکەیدا ٢ بەش تەرخان دەکات بۆ باس کردنی چارەسەری نەخۆشییە کوتوپڕ و درێژخایەنەکان بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە.

**راستیه زانستیەکانی ناو کتێب و توێژینەوە زانستیەکان دووپاتی سوودەکانی ڕۆژووی ئیسلامی دەکەنەوە لە نەخۆشی و لەشساغیدا:**

۞ بریتییە لە هۆکارێکی خۆپاراستن لە زۆرێك لە نەخۆشی و تێکچوونەکان، کە زۆرێك لەم نەخۆشیانە بەهۆی زۆر خواردن و بەردەوام بوون لەسەریەوە بەبێ وەستان بەدرێژایی ساڵ دروست دەبن.

۞ بریتییە لە هۆکارێکی چارەسەر بۆ زۆرێك لە نەخۆشیە کوتوپڕ و درێژخایەنەکان (وەك لە بەشی حەوتەمدا درێژەی پێدراوە).

۞ بریتییە لە چالاك کەرێك بۆ هەموو کردارە زیندەگیەکانی ناو لەش، کە ئاستی کارکردنیان بەرز دەکاتەوە، و پێکهاتە سەرەکیەکانی خانەکانیان نوێ دەکاتەوە، و عەمباری ووزە لەناویاندا تازەدەکاتەوە، بۆ ئەوەی کە بەهێزتر و بەتواناتر بێت لە بەرەنگار بوونەوەی ناڕەحەتیەکاندا، کاتێك کە خۆراك کەم دەبێت یان مرۆڤی لێ بێبەش دەبێت بەهۆی هەر هۆکارێك و بارێکی نالەبارەوە.

۞ هەروەها خاوکەرەوەیە بۆ ئارەزووە جنسیە ورووژاو و کڵپە سەندووەکان، و کپکەرەوەیە بۆی بە تایبەتی لەلای گەنجان.

۞ هەروەها ڕۆژوویەکی ئاسانە و لە توانای هەموو مرۆڤێکدایە لە هەموو شوێنێکدا، و لەژێر هەر بارودۆخێکی ژینگەییدا لەسەر رووی زەوی، کە لە کاتی ڕۆژووگرتندا یان بەهۆیەوە هیچ جۆرە خەلەلێك یان تێك چوونێك روونادات، لە هیچ یەکێك لە کردارە زیندەگیەکانی ناو لەشدا.

۞ هەروەها هیچ گۆڕانکاریەکی زیانبەخیش لە پێکهاتە گرنگەکانی لەشدا روونادات، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە لەشی ئادەمیزاد ئەوەندە ووزەی تێدا هەڵگیراوە کە وای لێبکات بتوانێت بەردەوام بێت لە حاڵەتی دابڕانی تەواو لە خواردن بۆ ماوەیەکی زەمەنی لە نێوان یەك تا سێ مانگ بەدوای یەکدا، کەواتە خۆراك پێدانی خانەکانی لەش بە هیچ شێوەیەك ناوەستێت، و تەنها ئەوەی

دەوەستێت لە ماوەی دوای مژینی خۆراکدا بریتییە لە کردارەکانی هەرس کردن و مژینی خواردەمەنیەکان.

۞ هەروەها رۆژوویەکە ناڕەحەتی و بێتوانایی راستەقینە بۆ لەش دروست ناکات، و تەنها خەیاڵاتە ئەو ناڕەحەتیانەی کە لەوانەیە هەستی پێبکرێت و هۆکارەکەی تەنها گۆڕانی عادەت و خووی خواردنی خۆراکەکانە، ئەو برسێتیەش —کە بریتییە لە یەکێك لە نیشانەکانی ئەو ناڕەحەتیە— و هەستی پێدەکرێت تەنها خەیاڵاتە و راستەقینە نییە، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ عادەتی خواردن لە چەند کاتێکی دیاریکراودا، و دەگەڕێتەوە بۆ خواردنەوەی ماددە ئاگادار کەرەوەکان، و ئەم برسێتیە تەعبیر لە پێویستی راستەقینەی خانەکان ناکات بۆ خۆراك.

۞ هەروەها رۆژوویەکە کە هەردوو کردارەکانی بنیاتنان و رووخاندن لەیەك کاتدا تێیدا روودەدات.

کە تێیدا گلوکۆز دەخرێتە بەردەست وەك سووتەمەنیەك بۆ مێشك، و سووتەمەنیەکی سەرەکیشە بۆ هەموو شانەکانی تر، هەروەها لەش دەپارێزێت لە مەترسیەکانی چالاك کردنی کردارەکانی رووخاندن بە تەنیا —وەك ئۆکساندنی خێرا و توندی چەوریەکان—، و شیبوونەوەی پرۆتینەکانی خانەکان و تێکشکانی پێکهاتەکانیان، هەروەها کەڵەکە بوونی تەنە کیتۆنیەکان لە لەشدا و روودانی هاوسەنگیی نایترۆجینی نێگەتیڤانە لە لەشدا، وەك ئەوەی کە لە رۆژووی پزیشکی یان رۆژووی کورت و درێژخایەندا روودەدات، هەروەها لەش بێبەش ناکات لە پێدانی مادده گرنگەکان پێی لە خۆراکەوە، وەك: ترشە ئەمینی و ترشە چەوریە سەرەکیەکان و کانزاکان و هەندێك لە ڤیتامینەکان، کە لەش ناتوانێت لەناو خانەکانیدا دروستیان بکات.

کەواتە رۆژووی ئیسلامی رۆژوویەکی بێوەیە بە هەموو پێوەرە زانستیەکان، کە هەموو سوودەکانی رۆژووی پزیشکیش دێنێتەدی، و پێشیشی دەکەوێتەوە بە

تایبەتی ئەگەر بێتو ئەو مەرجە نموونەییانەی تێدا بێت کە یاسادانەری دانا و زانا فەرمانی پێکردووە.

- باشە کێ بە محمدی (ﷺ) ڕاگەیاند کە لە ڕۆژوودا خۆپاراستنی تێدایە لە زیان و زەرەرە دەروونی و جەستەییەکان؟!

- کێ پێی ڕاگەیاند کە ڕۆژوو ئەو هەمووسوود و قازانجەی تێدایە کە دەست لەشساغ و تەندروستەکان دەکەوێت؟! تەنانەت بۆ ئەوانەشی کە ناتوانن بەڕۆژوو ببن و خاوەنی بیانوو و عوزرن؟!

- کێ پێی ڕاگەیاند کە ڕۆژووی ئیسلامی ئاسان و لە توانادایە، و هیچ زەرەرێك بە لەش ناگەیەنێت و نەفس ماندوو ناکات؟!

- کێیە بۆی ڕوون کردووەتەوە کە زۆر ڕۆژووگرتن دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی ئارەزووە جنسیەکان، و توندیەکەی و کڵپەکەی کەم دەکاتەوە بە تایبەتی لەلای گەنجان؟! لێرەوە گەنجان پارێزراو دەبن لە تێکچوونە غەریزی و دەروونیەکان، و پارێزراو دەبن لە بەرامبەر لادانە ڕەووشتیەکان.

خوای پەروەردگار -جل وعلا- ئەوە کە پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کردووە لەم ڕاستیانە و پێی ڕاگەیاندووە، هەر ئەویشە -سبحانه وتعالى- کە دروستکەری مرۆڤە، و ئاگادارە لە پێکهاتەی ووردی، و شارەزایە بە هەموو ئەو شتانەی کە تەندروستی دەکەن و ئیصلاحی دەکەن ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك:١٤)، واتە: ئایا ئەو خوایەی کە مەردوومانی دروستکردووە ئاگای لە نهێنییان نییە، لە کاتێکدا کە ئەو ووردبین و ئاگادارە.

نهێنیەکانی ڕۆژوو بەهۆی زیاتر ڕوون بوونەوەی ڕاستیە زانستیەکانەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاشکراتر دەبن، و زانایان بە چاوی خۆیان دەیبینن و بەهۆی ئامێرەکانیانەوە هەستی پێدەکەن، و جارێکی تر ڕاستی ئەو نیگا و وەحیە دەسەلمێنن کە ئەم تەشریعە بەسوود و ئاسانانەی بۆ مرۆڤ هێناوە، هەر خوای

گەورەش لە قورئانەکەیدا هەواڵی پێداوین دەربارەی ئەو زانایانە کە دەفەرموێت: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ:٦)، واتە: ئەوانەی زانان و زانیارییان پێدراوە دەزانن کە ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە تەنها ئەوە کە ڕاستە و ڕێنموونی (خەڵك) دەکات بۆ ڕێگای خوای باڵادەستی ستایشکراو.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بە ئاشکرا راستیی ڕۆژوو دەرکەوتووە، کە موعجیزەیەی زانستیە و زەرووڕەتێکی ئینسانیە، ئەم ڕاستیە زیاتر و زیاتر دەردەکەوێت، هەر کاتێك کە مرۆڤ زانیارییەکانی دەربارەی سوننەتەکانی دروستبوون زیاتربن، ئەو کەسانەی کە کەللە ڕەق و خۆبەزل زانن بۆیان دەردەکەوێت کە ئەم قورئانە نیگایەکی خوداییە لەلایەن پەروەردگارێکی ئاگادارەوە بە نهێنیەکانی دروست بوون و دروست کراوەکانەوە نێردراوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الفرقان:٦)، واتە: (ئەی محمد ﷺ) بڵێ زاتێ (ئەم قورئانەی) ناردووەتە خوارێ کە هەموو نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت، بەڕاستی ئەو (خودا) لێبوردەی میهرەبانە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَّكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيدًا﴾ (النساء:١٦٦)، واتە: بەڵام خودا شایەتی دەدات بە (ڕاستێتی) ئەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بۆت، بەزانینی خۆی ناردوویەتیە خوارەوە و فریشتەکانیش شایەتی دەدەن و خودا بەسە کە شایەت بێت لەسەر ئەم ڕاستیە.

هەروەها بەدڵنیایی و بەبێ گومان ئایەتەکان و بەڵگەکانی خودا دەبینن لەناو لەشی خۆیان و لە دەوروبەریان، کە شایەتی لەسەر ئەو ڕاستیە دەدەن، ئیتر بۆ ئەوەی هیچ کەسێك بەڵگە و گومانی بەدەستەوە نەمێنێت لەسەر پێغەمبەرانی نێردراوی خودا و پەیامەکانیان.

خودا دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣)، واتە: ئێمە لە داهاتوودا و لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین، لە ئاسۆکانی گەردوون و لە خودی خۆیاندا هەتاوەکو بۆیان روون ببێتەوە کە بێگومان (ئەم قورئانە) راستە، ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بە ڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

خوای گەورەش لە هەموو ئایەتێکی گەردوونیدا راستیەکانیمان پیشان دەدات بۆ ئەوەی نهێنیەکانی و وردەکارییەکانیمان بۆ دەربکەوێت، ئیتر بەهۆی بینین و هەست پێکردنەوە دەیناسین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل:٩٣)، واتە: تۆ بڵێ هەموو سوپاس بۆ خودایە، ئەو (خودایە) بە زوویی لە داهاتوودا ئایەت و نیشانەکانی پیشانی ئێوە دەدات و ئێوەش دەیانناسن (کە ئایەتی خودان)، و پەروەردگارت بێئاگا نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن.

سووپاس بۆ ئەو خودایەی کە کەمێك لە نهێنیەکانی رۆژووی پێناساندین، و بە شێوەیەکی بێگومان و بە دڵنیاییەوە ئەم راستیانەمان بۆ روون بووەتەوە، بە شێوەیەك کە یارمەتید ،رمان بێت بۆ زاڵ بوون بەسەر ئارەزووەکانماندا، و ئاشکرا بوونی ئەم حەقیقەتە بەرچاوانە زۆرێك لە وەهم و خەیاڵاتی ناو دەروونمانی لابرد، کە هیوادارم روون بوونەوەی ئەم بابەتانە لای هەموومان ببێتە هاندەرێکی کاریگەر بۆ بەرەوپێش چوونمان لەسەر رێی راستی پەروەردگار و دەست گرتنمان پێوەی.

## سەرچاوە:

کتێبی (رۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە – نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون).

# چەند ئامۆژگارییەك بۆ مرۆڤی ڕۆژووەوان

بۆچوونەكانی خەڵكی و بیر وباوەڕەكانیان بریتییە لە پاڵنەر و هاندەر بۆ هەڵس و كەوتەكانیان، و زۆریان بەندی دەستی بیروباوەڕ و بۆچوونە هەڵەكانیانن دەربارەی تەندروستی و خۆراك، خەڵكی وا عادەتیان كردووە كە خواردنی ٣ ژەمی ڕۆژانە كارێكی گرنگە بۆ پاراستنی ژیانیان، و ئێستا وا تێدەگەن كە وازهێنان لە یەك ژەمی خواردن كاریگەریەكی خراپ و سەلبی هەیە لەسەر تەندروستی تاكەكان و ساغی و تەواویی پێكهاتەكانی لەشیان.

لێرەوە ئێمە داوا لە موسوڵمانان دەكەین كە ڕۆشنبیری و بۆچوونەكانیان لەسەر فەرمانەكانی پەروەردگاریان و ئامۆژگاری پێغەمبەرەكەیان (ﷺ) دامەزرێنن، كە دۆزینەوە زانستیەكان لە هەموو بوارێك و لقێكدا ڕاستیەكانیانی سەلماندووە.

خوای گەورە دەربارەی خواردن و خواردنەوە تەشریعێكی دەمەزراوی ناردووە كە پاك و بەسوودەكانی حەڵاڵ كردووە، و پیس و زیانبەخشەكانی قەدەغە و حەرام كردووە، هەروەها یاسای مامناوەندێتی داناوە لە خواردنی شتە حەڵاڵەكاندا، وەك دەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ﴾ (الأعراف:٣١)، واتە: بخۆن و بخۆنەوە (لە حەڵاڵ كراوەكان) و زیادڕەوی تێدا مەكەن، لەبەرگرنگی و گەورەیی ئەم یاسایە و كاریگەریە گەورەكەی لەسەر ژیانی خەڵكی ئیمامی (ئیبنولقەییم) ناوینـاوە: یاسای زێڕین بۆ پاراستنی ژیانی مرۆڤەكان (القاعدة الذهبية في حفظ الحياة البشرية).

ئەو زەرەر و مەترسیانەی كە دروست دەبن لە زۆر خواردن و زۆریی جۆراوجۆری ئەو خۆراكانەی كە مرۆڤ دەیانخوات بەبێ كات و بەبێ سنوور، بووە بە ڕاستیەك كە جیاوازی تێدا نییە لەنێوان زانایان و پزیشكانی سەردەمدا،

(د.بلاکبێرن Blackburn) مامۆستای نەشتەرگەری لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (هارڤارد) لە ئەمریکا دوای ئەوەی کە لە هەندێك لە کاریگەریە فیزیاییەکانی رۆژووی کۆڵیەوە دەڵێت: دڵنیابووین لەوەی کە خواردن بە تایبەتی بەدوای یەکدا (واتە: إدخال الطعام على الطعام) بارێکی قورس دروست دەکات لەسەر لەش بەهۆی کرداری نواندنی خۆراکەوە، کە دەبێتە هۆی رژاندنی برێکی زۆر لە ئەنزیم و هۆرمۆنەکانی کۆئەندامی هەرس و ئینسۆلین، کە نەهێشتنی ئەم عادەتە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی رژاندنی ئەم هۆرمۆنانە، ئەمە دەبێتە هۆی پاراستنی تەندروستی لەش و ژیانێکی نوێ و درێژتر بە مرۆڤ دەبەخشێت.

زۆر توێژینەوە ئەنجامدرا لە سەنتەری لێکۆڵینەوەکانی پیریی (جیرۆنتۆلۆجی) لە (بالتیمۆر)، و بینرا کە ئەو مشکانەی کە رۆژ نا رۆژێك خۆراکیان دەدرێتێ ماوەی (٦٣) هەفتە تەمەنیان زیاتر بوو لە چاو ئەو مشکانەی کە رێیان درابوو هەر کاتێك بیانوویستایە خواردنیان دەخوارد، هەروەها لەوانیش چالاکتربوون لە هەفتە کۆتاییەکانی تەمەنیاندا.

مرۆڤ لە سەردەمی نوێدا وەك (د. ماهلەر Mahler) دەڵێت لە توێژینەوەیەکدا دەربارەی قەڵەوی: ناخوات لەبەر ئەوەی برسیەتی، بەڵکو دەخوات بە مەبەستی تێرکردنی ئارەزووی بۆ خواردن.

پێغەمبەر (ﷺ) بە ئاشکرا ئاماژەی داوە بە مەترسیەکان و زیانەکانی خواردن و سنوورەکانی ناوەنجێتی و رێك و رەوانی لە خواردندا دیاری کردووە لەو فەرموودەیەی ئیمامی (إبن ماجة و الترمذي) و غەیری ئەمان گێراویانەتەوە: عن المقدام بن معد يكرب (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ﴿ما مَلأَ آدَميٌّ وِعاءً شَرّاً مِنْ بَطْنِهِ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ لُقَيماتٍ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كانَ لا مَحالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعامِهِ، وَ ثُلُثٌ لِشَرابِهِ، وَ ثُلُثٌ لِنَفَسِهِ﴾ حديث صحيح رواه أحمد والترمذي والنسائي وابن ماجة وابن حبّان والحاكم وصححه ووافقه الذهبي، واتە: لە (میقدامی

کوڕی معد یکرب)ەوە کە هاوەڵێکی پێغەمبەر بووە (ڕەزای خوای لێبێت) ووتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: مرۆڤ هیچ دەفرێکی پڕنەکردووە کە لە سکی خۆی خراپتر بێت (واتە سکتان پڕ مەکەن بە زیادڕەوی لە خواردن و خواردنەوەدا)، هەرئەوندە بەسە بۆ مرۆڤ کە چەند پاروویەك بخوات بۆ ئەوەی هێزی تێدابێت و بتوانێت خۆی ڕاگرێت، ئەگەر هەر ناتوانێت خۆی ڕاگرێت و پێویست بکات با سکی بکات بە ٣ بەشەوە: بەشێکی بۆ خواردن، بەشێکی بۆ خواردنەوە، و بەشەکەی تر بە خاڵی بهێڵێتەوە بۆ هاتووچۆی هەوا و هەناسەکەی (واتە ئەوەندە نەخوات کە نەتوانێت بە ئاسانی هەناسە بدات).

خوای گەورە ڕۆژووی تەشریع کردووە بۆ پاکردنەوەی دەروونی مرۆڤ و باشتر کردن و ڕێککردنی هەڵس و کەوتی، و هەروەها وەك پارێزەرێك و چارەسەرێك بۆ ئەو نەخۆشی و تێکچوونانەی کە لەوانەیە تووشی جەستە و دەروونی ببن بەهۆی زۆر خواردن و بەردەوام بوون لەسەری.

ئایا ئیتر موسوڵمانان هەوڵ دەدەن تێبگەن لە تەشریعاتی ئاینەکەیان و لە حیکمەت و داناییان، بۆ ئەوەی بەرچاو ڕۆشن بن لە پەرستنەکان و کارەکانیاندا و تەنها کەسانێکی بێکەسایەتی نەبن کە دوای هەموو بانگەوازێکی بێناوەڕۆك بکەون لەلایەن ئەو کەسانەوە کە شوێن ئارەزووەکانیان کەوتوون و وەك ئاژەڵ دەخۆن و سکیان پڕدەکەن؟!

ئێمە ئامۆژگاری خۆمان و برا موسوڵمانەکانمان بەم خاڵانە دەکەین:

١- پێویستە هەموو موسوڵمانێك خۆی ڕزگاربکات لە وەهم و خەیاڵاتی ناڕاست و هەڵس وکەوتی زیانبەخش لە بابەتی ڕۆژوو و خۆراکدا، و دەبێت جارێکی تر بیرو بۆچوونەکانی ڕاست بکاتەوە و بونیادی ڕەووشت و خووەکانی بکاتەوە بەپێی ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە و هەڵس وکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) و پێشینە

چاكەكان، دەبێت خۆی بەرز ڕاگرێت لەسەروو ئارەزووەكانیەوە، و دەبێت خواردن تەنیا مەبەست نەبێت كە لە پێناویدا دەژی، و دەبێت لە پێناوی مەبەستێكی گەورەتر و بەرزتردا بژی كە بریتییە لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار، و هەستان بە جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی و سەرخستنی دینەكەی و خۆشەویستی بەندەكانی خودا و یارمەتیدانیان.

٢- داوا لە موسوڵمانان دەكەین كە تێبگەن لە حیكمەتی ڕاستەقینە لە ڕۆژوودا و پابەندبن بە سوننەتی پێغەمبەرەكەیان (ﷺ) و هاوەڵەكانی بۆ جێبەجێ كردنی بە شێوەیەكی نموونەیی، كە دەتوانرێت بە ڕەچاو كردنی ئەم خاڵانە بەدەست بێت:

أ- خواردنی ژەمی پارشێو و پشتگوێ نەخستنی.

ب- كەمكردنەوەی ماوەی ڕۆژووی ڕۆژانە، ئەویش بە دواخستنی پارشێو و زوو ڕۆژوو شكاندن لەگەڵ خۆرئاوادا.

ج- ناوەندێتی بگرن لە خواردن و خواردنەوە لە كاتی بەربانگ و پارشێودا، و تەنها ئەم دوو ژەمە بخۆن لە شەودا و واز بهێنن لەو عادەتە خراپەی كە زۆر خەڵك هەیانە و بریتییە لە خواردن بەدرێژایی شەو.

د- هەستان بە جووڵە و چالاكیی ڕۆژانەی كە خووی پێوە گرتووە.

هـ- خەوتن لە بەشێكی شەودا و وازهێنان لە شەونخوونی بەردەوام.

٣- داوا دەكەین لە ناوەندەكان و هۆكارەكانی ڕاگەیاندن لە جیهانی ئیسلامیدا كە وازبهێنن لە پاڵنانی خەڵكی بۆ زۆر خواردن و سەرفكردنی بڕێكی زۆر لە خۆراك بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا، ئەویش لەڕێی پروپاگەندە بازرگانیەكانیان كە گەورە و بچووك دەگرێتەوە، و نابێت شوێن عادەتە هەڵەكانی خەڵك بكەون و گەورەیان بكەن و ڕەواجیان پێبدەن، دەبێت ئامرازێك بن بۆ ڕاستكردنەوەی بۆچوونەكان و ڕێنومایی كردنی هەڵس وكەوت، دەبێت بزانین كە مانگی ڕەمەزان

مانگی خواردن و تەممەڵی نییە بەڵکو قوتابخانەیەکی پەروەردەکردنی دەروونی مرۆڤە.

٤- با هەموو بزانین کە ڕۆژوو قوتابخانەیەکی پراکتیکیە بۆ ڕازی بوون و قەناعەت و ڕاهێنانی نەفس بە ئارامیی و خۆڕاگریی، و توانای خۆگرتن لە بەرامبەر کێشەکان و ناڕەحەتیەکان، و ڕاگرتنی ئارەزوو و وویستەکان.

دوژمنانی ئیسلام نایانەوێت ئەمانە بێنەدی و دەبێت موسوڵمانان زیرەك بن و هەوڵبدەن کە بەری ڕۆژووەکانیان بچننەوە، ئەویش بە پەروەردە کردنی دەروونیان و پاراستنی تەندروستی لەشیان، هەروەها ڕۆژوو گرتن هێشتنەوە و خستنە لاوەی ژەمێك خواردنە ڕۆژانە بۆ ئەوەی بیدات بەو برا موسوڵمانانەی کە بەدەست هەژاریی و نەدارییەوە دەناڵێنن.

٥- داوا لەو موسوڵمانانە دەکەین کە خوویان بە عادەتی زەرەرمەند و خراپەوە گرتووە وەك جگەرە کێشان، و ئەوانەی بە دەستی دەردی بەکارهێنانی مادده سڕکەرەکانەوە دەناڵێنن، دەبێت ڕەمەزان بە فرسەتێك بزانن بۆ وازهێنان لەم بەڵایانە، و پەشیمان بوونەوەی ڕاستەقینەیان لە ئەنجامدانی ئەم تاوان و لەناوبەرانە، هەروەها ئاراستەکردنی تواناکانیان بۆ ئەنجامدانی هەموو شتێك کە بەسوودە بۆ دین و دونیایان، هەروەها هانی پزیشکان و کارمەندانی تەندروستی دەدەین کە هەستن بە ڕۆڵی خۆیان لە دژایەتی کردنی ئەم خووە پیسانە و دەبێت پێشەنگ بن لە کردەوە و هەڵس وکەوتیاندا.

٦- داوا لە موسوڵمانان دەکەین بە گشتی و گەنجان بە تایبەتی کە بەردەوام بن لەسەر گرتنی ڕۆژووە سوننەتەکان، بە تایبەتی گرتنی ٣ ڕۆژ لە هەموو مانگێك بە لایەنی کەمەوە.

٧- سەبارەت بە بەکارهێنانی دەرمان لەکاتی ڕۆژوودا بەتایبەتی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە ڕۆژانە ٣ یان ٤ جار دەبێت بەکاریبهێنن، بابزانین بەکارهێنانی

دەرمان لەکاتی رۆژوودا هیچ رێگر نییە لە رۆژوو گرتن، بەتایبەتی لەو نەخۆشانەدا کە پێشتر باسمان کرد رۆژوو بەسوودە بۆیان، بۆ ئەو کەسانەی نەخۆشی درێژخایەن (مزمن)یان هەیە وەك (بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، شەکرە، نەخۆشیەکانی دڵ و بۆرییەکانی خوێن، رەبۆ .....و هتد) لەمانەدا بەشێوەیەکی گشتی زوربەی ئەو دەرمانانە رۆژانە جارێك یان دوو جار بەکاردێن، و ئەگەر دەرمانەکان لە شەودا بخورێن زۆر ئاساییە، سەبارەت بە نەخۆشیەکانی تریش دەتوانرێت دەرمانەکان بەشێوەیەك دەستکاری بکرێن کە رۆژانە پێویست بکات تەنها دوو جار بەکاربهێنرێن، واتە لەکاتی بەربانگ و پارشێودا بەکاربهێنرێت کە دەکاتە نزیکەی ١٢ سەعات، بەڵام با ئەوەشمان بیرنەچێت کە هەندێك نەخۆشی هەیە کە ناتوانرێت دەستکاری دۆزی دەرمانەکەی بکرێت یان کەمبکرێتەوە و پێویستە نەخۆش پابەندی کاتی بەکارهێنانەکەی بێت (جا ئەگەر ٨ سەعات یان ٦ سەعات جارێك بەکاربێن)، بۆ ئەمەش پێویستە پرس بکرێت بە پزیشکی پسپۆری باوەڕپێکراوی موسوڵمان بۆ دەستکەوتنی زانیاری راست لەسەر ئەو مەسەلەیە.

٨- بەشێوەیەکی تایبەتی نەخۆشیەکانی هەڵامەت و ئینفلوەنزا و حەساسیەتی هەناسەدان دەتوانرێت بەرۆژوو کۆنترۆڵ کردنیان باشتر بکرێت، رۆژوو کاریگەرییەکی ئیجابی هەیە بۆ سەر ئەو نەخۆشیانە بەتایبەتی و رۆڵێکی باش دەگێرێت لە کۆنترۆڵ کردنیاندا، ئەویش بەهۆی ئەو کاریگەرییە ئیجابیانەی هەیەتی بۆ بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگری لەش لەبەرامبەر ئەو میکرۆب و فاکتەرە زیانبەخشانەدا، هەربۆیە رۆژوو گرتن لەکاتی ئەم نەخۆشیانەدا بەسوود و قازانج دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

٩- زەرووڕەتی گرنگیدان بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە تاقیکارییەکان دەربارەی رۆژوو لەلایەن ئەو کەسانەوە کە گرنگی بە پزیشکیی ئیسلامی دەدەن لە زانکۆ و سەنتەرەکانی توێژینەوەدا، و دەبێت ئەم توێژینەوانەیان بڵاوبکەنەوە بەپێی

بنەمای ستاندارده جیهانییەکان و بنەمای زانستیی یەکگرتوو، ئەویش بۆ ئەوەی کە بەراوردکردنی ئەنجامەکانیان ئاسان بێت.

١٠- هانی پزیشکانی موسوڵمان دەدەین کە ڕۆژووی ئیسلامی وەرگرن وەك هۆکارێکی کاریگەر بۆ خۆپاراستن و چارەسەری زۆرێك لە نەخۆشییەکان و تێکچوونەکانی لەشی مرۆڤ، و چاو بخشێننەوە بە هەندێك بۆچوونیاندا کە پەیوەندبدارە بە خۆراکی نەخۆشەکانەوە.

١١- داوا لە پزیشکە پسپۆڕەکان و هەموو زانایان لە لقە زانستییە جیاوازەکاندا دەکەین کە جارێکی تر چاو بخشێننەوە بە خوێندنەوەی زانست، لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەکانی قورئان و سوننەتی پیرۆز، بەیارمەتی پەروەردگار لە ئاسۆکان و لە نەفسەکاندا ئەوەند بەڵگە دەبینن کە دڵ ودەروونیان پاراو دەکات، ئەویش لەو یەکگرتنەوە ووردانەی کە لە نێوان راستیە زانستیەکان و ماناکانی دەقە کەونیەکانی قورئان و سوننەتدا دەیبیننەوە.

١٢- داوا لە هەموو زانست دۆستانی کورد دەکەین لە هەموو بوارەکاندا کە هاوکاربن بە بۆچوونەکانیان و توێژینەوەکانیان، ئەمەش هەمووی بە مەبەستی دەرخستنی راستیەکان، و روونبوونەوەی رێنوماییە سوودبەخشەکانی ئیسلام و رێگای راست بۆ هەموو لایەك ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (التوبة:٣٣).

لە کۆتاییدا لەگەڵ ئەو زانا و پزیشکانەدا کە گرنگیانداوە بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە دەربارەی ڕۆژوو دەڵێین:

ڕۆژوو تا ئێستاش گەنجینەیەکی شاراوەیە لەلای ئەو کەسانەی کە گرنگی بە تەندروستی مرۆڤ دەدەن، لەسەروو هەموویانەوە پزیشکان و ئەوانەی بە چارەسەر و ئاگادار بوونی نەخۆشەوە کاردەکەن، و دەبێت جارێکی تر ڕۆژوو بەرز بکرێتەوە بۆ ئەو پلە بەرزەی کە پێشتر هەیبووە، کە ڕۆژوو لەسەرو پزیشکیەوە بووە، و

زۆرێك له زانایان لەسەر ئەوە سوورن کە جارێکی تر رۆژوو دەبێت بدۆزرێتەوە، و دەبێت ئیعتیباری بۆ بگەڕێنرێتەوە لەبەرئەوەی یەکێکە لە زەرووورەتەکانی ژیان، هەروەها پزیشکان ئەو ئەرکەیان لەسەر شانە کە زیانەکان و مەترسیەکانی زۆر خواردن و جۆراوجۆری زۆری ئەو خواردنانەی کە بەبێ بنەما وجڵەو دەخورێن بۆ خەڵکی روونبکەنەوە.

هەروەها رۆشنبیری خۆراك لەناو کۆمەڵگاکانیاندا بڵاوبکەنەوە، و بە تایبەتی هانی خەڵکی بدەن بە دەستگرتن بە ئامۆژگاریەکانی خودا و کردەوە و ووتەکانی پێغەمبەرەکەی لەبواری خۆراکدا، هەمیشە ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی و کەسانی ئەوەڵی سەدە باشەکانی ئیسلام بە باشترین بەڵگە دەمێنێت لەبەر دەستماندا لەسەر هەڵەی بۆچوونەکان و خووەکانمان لە بواری خواردن و خواردنەوەدا، و هەمیشە ئەم مینبەرە پرشکۆیانە بە رووناکی دەمێننەوە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت وەك ئەوان هەنگاو بنێت و بە رێڕەوی ئەواندا بڕوات، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) جاری واهەبوو کە مانگ و دوو مانگ و سێ مانگ تێدەپەڕین بەبێ ئەوەی لەماڵەکانیدا خواردنێك لێبنرێت، کە تەنیا لەسەر خورما و ئاو دەژیان، ئەم رەووشتانە بوو کە کردنی بە پێشەوا و سەروەری هەموو جیهان.

ئەمە حاڵی ئەوان بوو کە بوونە سەروەری جیهان، بەڵام ئێمە لە رۆژگاری ئەمرۆدا تەنها مەبەستمان بریتییە لە چۆنێتی بەرهەمهێنان و دروست کردنی جۆرەکانی خواردن، بەشێوەی هەڵگیراو و بەستراو و قوتوو کراو -کە زۆر جاریش پیس دەبن-، و پێشبڕکێمانە لە چۆنێتی باشترکردن و رەنگاورەنگ کردنیان، و پاشان دەستدەکەین بە خواردنیان بە هەڵپەوە، و خەمی سەرەکیمان بریتییە لە پڕکردنی سکمان و تێر خەوتن، کە ئەم خووە ناتەندروستانە بوونە هۆی پەیدابوونی قەڵەوی لەناوماندا و بیرکردنەوەمان ووشکبوو، و غەم و نارەحەتیەکانیشمان زیادیان کرد.

لێرەوە بانگەوازێك دەكەین بۆ هەمووخاوەن ژیری و نەجیب زادەكان كـە: ئـەی خـاوەنی ژیرییـەكان بگەڕێنـەوە بـۆ ئاینەكـەتان و دەسـتبگرن بـە دینەكەتانـەوە، لەبەرئـەوەی مایـەی سـەربەرزی و سـەرفرازیتانە لـە دونیـا و پاشـەڕۆژدا، پـاك و بێگەردیش بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە بەڕێزەكەی.

## سەرچاوە:

كتێبی (ڕۆژوو موعجیزەیەكی زانستییە – نووسینی: د.كاوە فەرەج سەعدون).

# کەڵەشاخ گرتن (الحجامة)

بریتیە لە شێوازێکی چارەسەر بە دەرهێنانی ڕێژەیەك خوێن لە لەشی مرۆڤ لەڕێگەی بریندارکردنی پێستەوە، کە دەرکەوتووە چەندین سوودی هەیە لەڕووی پزیشکیەوە.

دوو جۆری هەیە: کەڵەشاخی ووشك بەبێ دەرهێنانی خوێن دەبێت و تەنها بە دانانی کاسەکانی حیجامە لەسەر پێست و هەڵمژینی هەوای ناویان دەبێت، کە ئەم جۆرەیان لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) نەهاتووە و تەنها ئیجتیهادێکی پزیشکە موسوڵمانەکان و غەیری ئەمانە، و کارێکی بەسوودە لە چارەسەری شوێنی ئازار و نەخۆشیەکانی جومگەکان.

جۆری دووەم کەڵەشاخی تەڕ یان خوێناویە، کە ئەمەیان لەگەڵ بریندار کردنێکی ڕوویی (سطحي) پێست و دەرهێنانی خوێن لێیەوە دەبێت (برینەکان نابێت لە ٣سم درێژتر و لە ١ملم زیاتر قووڵبن)، ئەم جۆرەیان سوننەتێکی گەورەی پێغەمبەرە (ﷺ) و لە زیاتر لە ٧٠ فەرموودەدا هاتووە، لەوانە: ﴿إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِي شَرْطَةِ مُحْجَمٍ أَوْ شَرْبَةٍ مِنْ عَسَلٍ أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ . قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : «وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»﴾ (رواه مسلم)، یان: ﴿الشفاء في ثلاثة: شربة عسل أو شرطة محجم، أو كية نار وإني أنهى أمتي عن الكي﴾ (رواه البخاري)، یان: ﴿إن أفضل ما تداويتم به الحجامة، أو هو من أمثل دوائكم﴾ (متفق عليه).

واتە: ئەگەر شیفا و سوود هەبێت لە دەرمانەکانتاندا ئەوە یان لە بریندارییی کەڵەشاخ گرتندا یان خواردنەوەی هەنگوین یان داخکردندا هەیە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من حەز لە داخکردن ناکەم، ڕێگری لە ئوممەتەکەی کرد کە بە داخکردن چارەسەر بکەن.

کەڵەشاخ لەسەر زۆر شوێنی لەش ئەنجامدەدرێت وەك: ناوشان و بەشی سەرەوەی پشت، پشتەسەر، پشتەمل، لەسەر جومگەکان، و لەسەر پێ، ئەویش بەپێی شوێنی ئازار و نەخۆشیەکان، بەڵام باشترین شوێن بۆ کەسی تەندروست کە وەك عادەتێکی خۆپارێزیی ساڵانە ئەنجامی بدات ﴿وەك لە فەرموودەدا هاتووە: (نعم العادة الحجامة) واتە: باشترین نەریت و خوو کەڵەشاخ گرتنە﴾ بریتیە لە ناوشان وەك لە فەرموودەدا هاتووە: ﴿كان رسول الله (ﷺ) يحتجم في الكاهل﴾ (رواه أبوداود والترمذي وحسنه والحاكم وصححه)، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە ناوشان یان خوار دەفەی شان کەڵەشاخی دەگرت.

سەبارەت بەو فەرموودانەی کە هاندەدات بۆ ئەنجامدانی لە چەند رۆژێك و وەرزێکی ساڵ یان ئەنجامنەدانی لە چەند رۆژێکی تردا هەموویان فەرموودەی لاوازن و نابنە رێگر لەبەردەم ئەنجامدانی ئەم کردارە بەسوودە و سوود وەرگرتنی نەخۆشەکان لێی لە هەموو کاتێکدا.

بۆ کەسی تەندروستیش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إستعينوا على شدة الحر بالحجامة) (أخرجة الهندي في كنز العمال والحاكم في المستدرك وابن حبان). واتە: پشت ببەستن بە حیجامە بۆ بەرەنگار بوونەوەی گەرمای زۆر، کەواتە پێش هاتنی وەرزی گەرما لە وەرزی بەهاردا (مانگەکانی ٣ و ٤ و ٥) وەك عادەتێکی ساڵانە ئەنجامبدرێت سوودی زۆری دەبێت، لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: (اذا اشتد الحر فاستعينوا بالحجامة ولايتبيغ الدم باحدكم فيقتله) (صححه الألباني).

تەمەنی گونجاو بۆ کەڵەشاخ گرتن واباشترە لە ٢٠ ساڵ کەمتر نەبێت، ئەویش لەبەر پێویستی لەش بە مادەی ئاسن لە تەمەنی منداڵی تاوەکو تەمەنی پێگەیشتن بەمەبەستی گەشەکردنی لەشی مرۆڤ.

میکانیزمی کارکردن و سوودەکانی حیجامە توێژینەوەی زۆری لەسەرکراوە لە ئەمریکا و ئەڵمانیا و بەریتانیا و روسیا و چین و یابان و میسر و سعودیە و چەندین

شوێنی تر و چەندین بیردۆز دەربارەی دانراون لەوانە: بیردۆزی هەژاندنی کۆتاییە دەمارییەکان و چالاککردنیان، بیردۆزی کاریگەریی لەسەر بواری کارۆموگناتیسی لەش (وەك کرداری دەرزی ئاژنی صینی)، بیردۆزی زیادکردنی رژاندنی ماددەی ئۆکسیدی نیتریك (کە دەبێتە هۆی زیادکردنی رژاندنی ماددە هێمنکەرەوەکانی لەش وەك: ئەندرۆفین و ئینکیفالین بۆ شکاندنی ئازار).

هەندێك لە سوودەکانی حیجامە لەرووی پزیشکیەوە (بەپێی دوایین توێژینەوەکان):

١- دابەزاندنی ڕێژەی خوێن، و دابەزاندنی چەوری لەخوێندا و چالاککردنی خوێنبەرەکان.

٢- دابەزاندنی پەستانی خوێن: لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ﴿إحتَجموا... لايتبيَّغُ بكم الدم فيقتلكم﴾ (رواه ابن ماجة والحاكم والطبراني وابن حبان وصححه الألباني) واتە: کەڵەشاخ بکەن نەوەکو خوێنتان تووشی زیادبوون و لەسنووردەچوون ببێت (واتە فشاری بەرزببێتەوە) و بتانکوژێت.

٣- بۆ ئەوانەی نەخۆشیەکانی دڵیان هەیە وەك تۆرەکانی دڵ و سنگەکوژە و دڵ پەلەپەلی.

٤- سیستەمی بەرگری لەش بەهێزدەکات بەهۆی زیادبوونی ماددەی (ئینتەرفیرۆن وئینتەرلیوکین) دوای حیجامە.

٥- بۆ هەوکردنی جومگەکان و ئازار و ڕۆماتیزمی جومگەکان (لەتوێژینەوەیەکدا بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لەلایەن (د.صهباء محمد) لە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی ئەزهەر لە میسر لەسەر کاریگەریی حیجامە لەسەر نەخۆشی ڕۆماتیزمی جومگەکان، دەرکەوت کە ٨٠٪ی نەخۆشەکان سوودی جۆراوجۆریان لە کەڵەشاخ وەرگرت بۆ چارەسەر و کەمبوونەوەی ئازاری جومگەکانیان).

٦- یارمەتیدانی لاوازی بیرکردنەوە و بیرچوونەوە و زیادبوونی تەرکیز و ڕێگرتن لە تووشبوون بە جەڵتەی مێشك و دووبارە بوونەوەی لەوانەدا کە تووشبوون.

٧- بۆ سەرئێشەی درێژخایەن و سەرئێشەی نیوەیی (شەقیقە) زۆر بەسوودە، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ﴿احتجم رسول الله (ﷺ) وهو محرم في رأسه من شقيقة كانت به﴾ (رواه البخاري)، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کەڵەشاخی گرت لەسەریدا بەهۆی شەقیقەیەکەوە کە تووشی بوو.

هەندێك باری تایبەتی یان نەخۆشی هەیە کە قەدەغەیە بۆیان کەڵەشاخ بگرن، وەك: ئافرەت لەکاتی سووڕی مانگانەدا، یان ئافرەتی دووگیان و شیردەر، منداڵ پێش باڵغبوون لەگەڵ کەسانی بەتەمەن، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە روونبوونەوەی خوێن یان خوێنبەربوون یان کەمخوێنیان هەیە.

## چۆنێتی ئەنجامدانی حیجامە و ڕێنماییەکانی:

پێویستە لەکاتی کەڵەشاخ گرتندا کۆمەڵێك ڕێنمایی و یاسا رەچاوبکرێن بۆ ئەوەی زیانی لێنەکەوێتەوە، دەبێت ئەو کەسانەی بەو کارە هەڵدەستن خولی ڕاهێنان ببینن بۆ فێربوونی کارەکە، و باشتروایە دەرچووی بەشێکی پزیشکی بن، دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت کە کەڵەشاخگر کار لەگەڵ خوێندا دەکات و بوونی هەر هەڵەیەك یان کەمتەرخەمیەك لەوانەیە زیان بەخۆی و نەخۆشەکە بگەیەنێت، ئەو کەسانەی کە ڕاهێنانی پێویست و زانیاریی تەواویان نییە بەهیچ جۆرێك نابێت بەو کارە هەستن:

١- بەکارهێنانی ئامێری کەڵەشاخ گرتنی نوێ (کە ئێستا لە بازاڕدا دەست دەکەوێت) کە پێویستی بەئاگر نیە بەڵکو ئامێرێکی کارەباییە، و ئەو کاسانەی کە بەهۆیەوە خوێن لە نەخۆشەکان دەگیرێت بۆ یەکجار بەکاردێن کە چانسی هەوکردن و گواستنەوەی نەخۆشی بەهۆی بەکارهێنانەوەی کاسەکانەوە ناهێڵێت،

دەبێت دوورکەوینەوە لە رێگە کۆنەکەی کە پشت بە پەرداخ و بەکارهێنانی ئاگر دەبەستێت، چونکە زۆر جار بووەتە هۆی سووتاندنی پێستی ئەو کەسەی کەڵەشاخی بۆ دەکرێت.

٢- رەچاوکردنی دۆخێکی پاکژ لە هەموو هەنگاوەکانی کارەکەدا، هەر لەسەرەتاوە دەستکێش بەکاربهێنرێت لەلایەن کەڵەشاخگرەوە.

٣- بەکارهێنانی لۆکە و شاشی پزیشکی تەڕکراو بە ماددەی پاکژکردنەوەی پزیشکی (تعقیم) وەك: یۆد یان هیپتادین یان دیتۆڵ بۆ پاکژکردنەوەی پێستی نەخۆشەکە پێش دانانی کاسەی حیجامە و پاشان بەستنی ئامێری کەڵەشاخگرتنەکە لێی، کە هەڵدەستێت بە هەڵمژینی هەوای ناو کاسەکە، ئەمە دەبێتەهۆی راکێشانی پێستەکە بۆ ناو کاسەکە و خوێنتێزانی، ئەمە کەڵەشاخی ووشکە و زۆرجار ئەوەندە بەسە کە سوودی باشی هەیە.

٤- بۆ کەڵەشاخی تەڕ دەبێت دوای خوێنتێزانی پێستەکە کاسەکە لابرێت و دووبارە ئەو شوێنە تەعقیم بکرێتەوە، پاشان بە بەکارهێنانی کەتەر (شفرە)ی پزیشکی پێستەکە برینداربکرێت بەشێوەیەکی رووکەشیی (کە درێژی برینەکان لە ٣سم و قووڵیی لە ١ملم زیاتر نەبێت)، چەند جارێك پێستەکە دەبڕدرێت پاشان کاسەی حیجامەکەی بۆ دادەنرێتەوە و دەبەسترێتەوە لە ئامێرەکە بۆ راکێشانی خوێن لە پێستەکەوە. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٢٨**)

٥- لە کاتی نیوە بوونی کاسەکە دەبێت لێی بکرێتەوە (نزیکەی ١٥٠مل خوێن دەکات)، وەرگرتنی چوار کاسە خوێن بەسە بۆ کەسێکی ئاسایی، دوان لای ڕاست و دوان لای چەپ، کە دەکرێت لە هەندێك نەخۆشی تایبەتدا زیاتر بکرێن.

٦- دوای تەواو بوونی کردارەکە و لابردنی کاسەکان شوێنی برینەکە بەباشی پاك دەکرێتەوە بەبەکار هێنانی دەرمانی پاکژکردنەوەی پزیشکی و پاشان بە شاش دادەپۆشرێت و پلاستەری لێدەدرێت بۆ ئەوەی هەونەکات.

٧- دەبێت شوێنی تایبەت بەو کارە بە باشی پاکژ بکرێتەوە، لەگەڵ بەکارهێنانی شەرشەف کە بۆ یەکجار بەکاردێت و فڕێ دەدرێت، هەروەها کەرەستەکانی تری وەك کاسەکان و کەتەر و شاش و پلێتە کە بەکاردێت بۆ لێدانی دەرمان، ئەمانە پێویستە بۆ کەسی تر بەکارنەیەن و لە ناو ببرێن.

٨- لەناوبردنی خوێنی کەڵەشاخ و کەرەستە بەکارهاتووەکان و سووتاندنیان بۆ دڵنیابوون لە بڵاونەبوونەوەی نەخۆشی لەم ڕێیەوە.

٩- ئەو کەسەی حیجامەی بۆ دەکرێت دەبێت چەند کاتژمێرێك دوای کردارەکە پشووبدات و شلەمەنی باش بخوات بۆ ئەوەی فشاری خوێنی دانەبەزێت.

١٠- لەوانەیە هەست بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لە ڕۆژی دووەمی کەڵەشاخ گرتندا بکرێت، یان هەندێك کەس هەست بە دڵتێکچوون دەکەن، یان توشی سکچوون دەبن، کە ئەمانە سروشتین و دواتر نامێنن.

١١- ئەنجامدانی ئەم کردارە دەبێت پێش هەموو شتێك وەك جێبەجێکردنی سوننەتێکی پێغەمبەربێت (ﷺ)، پاش کردارەکەش کۆمەڵێك زیکر و نزای سوننەت بخوێنرێت.

# پەنجەمۆرە تاکەکەسیەکان لەنێوان قورئان وزانستدا

## البصمات الشخصية بين القرآن والعلم

### توێژینەوەیەکە پێشکەشکراوە بۆ کۆنگرەی نێودەوڵەتی یەکەمی ئیعجازی زانستی کە لەلایەن ( ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی ) رێکخرابوو سلێمانی / ١٤٣٨ك – ٢٠١٧ز


### پوختەی توێژینەوەکە

مرۆڤەکان هەر لەکۆنەوە ژیرییان خستۆتەگەڕ لەپێناوی زانینی نهێنییەکان دەربارەی گەردوون و جەستەی خۆشیان، لەم ساڵانەی دواییدا دوای چەندین توێژینەوەی زانستیی ئەو راستییە روونبووەوە کە هەر مرۆڤێك لەئێمە چەندین تایبەتمەندی خۆی هەیە کە لە هەموو مرۆڤەکانی تری جیادەکاتەوە و توێژینەوەش لەم بابەتەدا بەردەوامی هەیە، لە قورئانی پیرۆزدا لەچەندین ئایەت ئاماژە بەوە دراوە کە مرۆڤەکان ناوازەن، و هەرکەسێك لەئێمە پەروەردگار بەشێوەیەك دروستیکردووە کە جیاوازە لە مرۆڤەکانی تر.

ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە پێداچوونەوە و بەدواداچوونێك دەربارەی ئەم بابەتە، سەرەتا لەرووی زانستییەوە گەڕانمان کردووە بەناو توێژینەوە زانستییەکان و بابەتە بڵاوکراوەکان لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە بۆ بابەتی جۆرەکانی پەنجەمۆر (البصمات – Fingerprints) لە مرۆڤەکاندا و ووتەی شارەزایانمان لەمبارەیەوە خستۆتەروو، دواتر گەڕانمان کردووە بۆ بابەتی تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانی مرۆڤەکان لە قورئانی پیرۆزدا و لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە، لە تەفسیر و ووتەی زانایان بۆمان دەردەکەوێت کە پەروەردگار هەر مرۆڤێکی تایبەتمەند کردووە بەبوونی چەند جیاکەرەوەیەك کە لە هەموو

مرۆڤـەكانی تـری جیاكردۆتـەوە، بەئاشـكرا لەچـەندین ئایـەتی قورئانـدا ئامـاژە بەمەدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە بەناو ووشەی (پەنجەمۆر) لـە قورئانـدا نـەهاتووە، بەڵام ئەم ئاماژە قورئانییانە هەمان تایبەتمەندی مرۆڤەكان دەردەخات كە نوێترین توێژینەوە زانسـتییەكان دەربـارەی جۆرەكـانی پەنجـەمۆر لەمرۆڤـدا باسـیدەكەن، ئەم یەكگرتنەوەیەی ئایەتەكانی قورئان لەگەڵ راسـتییە زانسـتییەكان ئیعجـازێكی زانستی قورئان لەمرۆماندا ئاشكرا دەكات.

لەبەشـی یەكەمـدا باسـی نـاوازەیی مرۆڤـەكانمان كـردووە لـە پەنجـەمۆری سـەرەپەنجەكاندا، كـە ئـەم بابەتـە سـەدەیەك زیـاتر دەبێـت بـۆ مرۆڤـەكان روونبووەتەوە كە شكڵی پەنجەمۆری هـەر ١٠ پەنجەكـەی مـرۆڤ لەیـەكتر و لەگـەڵ مرۆڤەكانی تریش جیاوازە، و تا ئێستا بە تۆماركردنی سـەدان ملیـۆن پەنجـەمۆری سەرەپەنجەی مرۆڤەكان لـە وولاتـە جیاوازەكـانی سـەر زەوی لـە هـیچ شـوێنێك و لەهیچ توێژینەوەیەكی زانستیدا باسی ئەوە نەكراوە كە هی ٢ مـرۆڤ لەیەكتربچێت، تەنانـەت لـە دووانـە لێكچووەكانیشـدا (Identical Twins) سـەرەپەنجەكان لەیەكتر ناچن كـە ئەمانـە لـە هـەموو شتەكانی تریانـدا وەك یـەكن، هـەروەها ئـەم پەنجـەمۆرە بەشـێوەیەك ووردە بـۆ هـەر مرۆڤێـك كـە تەنانـەت لـەرێی شـكڵی پەنجەمۆرەوە دەتوانرێت نێر ومـێ لەیـەكتری جیابكرێتـەوە و تەمـەنی كەسـەكە و جۆری كەسایەتییەكەی دیاری بكرێت، پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ، بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾ (القيامة ٣-٤) واتـە: ئایـا مـرۆڤ وادەزانـێ كـە ئێسـكە رزیوەكـانی كۆناكەینـەوە؟ بـەڵێ: بـەتواناین لەسـەر رێكخستنەوەی نەقشی سەرەپەنجەكانیشی، لێرەدا دەپرسـین بـۆ پـەروەردگار بـۆ وەڵامدانـەوەی بێبـاوەڕان و دەرخسـتنی ووردەكـاریی گـەورەی زیندووبوونـەوە سەرەپەنجەكانی وەك نموونە هێناوەتەوە؟ ئەی بۆ باسی دروستبوونەوەی دڵ یان مێشك یان ئەندامە ئاڵۆزەكانی تری نەكردووە؟

لەبەشی دووەمدا باسی جۆرەکانی تری پەنجەمۆر لەمرۆڤدا دەکەین وەك: پەنجەمۆری رەشێنەی چاو، پەنجەمۆری بۆن، پەنجەمۆری دەنگ و....هتد، دەربارەی هەندێك تایبەتمەندی تری مرۆڤەکان پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢)، واته: وە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خودایە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانەکانتان و رەنگەکانتان بەڕاستی لەمانەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان، موفەسیرەکان دەربارەی ئەم ئایەتە ووتوویانە کە پەروەردگار جیاوازی و جۆراوجۆری دەنگەکان و زمانەکان و جیاوازی رەنگی مرۆڤەکانی بەشێوەیەك دروستکردووە بۆ ئەوەی هیچ مرۆڤێك لەوی تر نەچێت لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموویان نەوەی ئادەمن، هەوڵدەدەین لەرێی نوێترین توێژینەوە زانستییەکانەوە گەورەیی ئاماژە قورئانییەکان دەربارەی تایبەتمەندی دەنگ و رەنگی مرۆڤەکان دەربخەین.

لە بابەتێکی تردا چەند ئاماژەیەکی قورئانیی بۆ بابەتی جیاوازیی رەنگی مرۆڤەکان، وەك لە ئایەتەکانی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢)، واتە: وە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خودایە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانەکانتان و رەنگەکانتان بەڕاستی لەمانەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان، موفەسیرەکان دەربارەی ئەم ئایەتە ووتوویانە کە پەروەردگار جیاوازی و جۆراوجۆری دەنگەکان و زمانەکان و جیاوازی رەنگی مرۆڤەکانی بەشێوەیەك دروستکردووە بۆ ئەوەی هیچ مرۆڤێك لەوی تر نەچێت لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموویان نەوەی ئادەمن، هەروەها ئایەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ

الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر: ٢٧-٢٨)، واتە: ئایا نەتبینیوە کە بەراستی خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، پاشان رواندمان بەو بارانە هەموو جۆرە میوەیەك کە رەنگەکانیان جیاوازە، و لە چیاکاندا چەندین رێگا هەیە کە رەنگیان سپی و سووری جیاوازن و هەشیانە رەشێکی تۆخە، لە مرۆڤەکانیش و زیندەوەر و ئاژەڵ و ماڵاتیشدا رەنگی جۆراوجۆری جیاواز هەیە وەك میوەکان، بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوادا تەنیا زانایان وەك پێویست لەخودا دەترسن.

ئەم ئایەتانە دەکەینە خاڵی دەستپێك بۆ بووچوونێکی زانستی کە لە ئایەتەکەوە وەریدەگرین، ئەویش ئەوەیە: هیچ دوو مرۆڤێك لە رەنگی پێستیاندا لەیەك ناچن، یەك توێژینەوەی چەند دکتۆرێکی موسوڵمانمان باسکردووە کە لەسەر ئەم ئاماژە قورئانیانە کردوویانە و هیوادارین چەندین توێژینەوەی گەورەتری لەسەر بکرێت بۆ سەلماندنی ئەوەی قورئان و سوننەت کانگای زانستن.

لەبەشی سێیەمدا لە چەند خاڵێکدا ئەنجامگیریی بۆ توێژینەوەکەمان دەکەین و دواتریش چەند راسپاردەیەك دەخەینەروو و لە کۆتاییشدا ئەو سەرچاوانەمان خستووەتەروو کە بۆ توێژینەوەکەمان سوودمان لێبینیوە.

قورئان بڕیاری ئەوەیداوە کە مرۆڤ دروستکراوێکی بەرێزە و دروستکراوێکی سەربەخۆیەوە، خودا ئەو هەموو تایبەتمەندیەی پێداوە بۆ ئەوەی ناوازەیی خۆی بزانێت و رێزی یەکتر بگرن، نەك وەك بیردۆزە نازانستییەکانی بێباوەڕان کە باسی گەشە کردنی مرۆڤ لە زیندەوەرەکانی ترەوە دەکەن، و بێرێزی دەکەن بەوەی دەیکەن بە نەوەی مەیمون و ئاژەڵەکان، ئەم رێزەی قورئان بۆمرۆڤەکانی دادەنێت جیاوازی ناکات لەنێوان تاکەکانی مرۆڤایەتی چونکە هەموویان یەك پەروەردگاریان هەیە و هەموویان لە مرۆڤایەتیدا یەکسانن، تەنها جیاوازی لە کەیفیەتی مرۆڤەکاندا کردووە کە هەیانە باوەڕدارە و هەشیانە بێباوەڕە، بۆیە ئەم پەیامە گفتوگۆ لەگەڵ هەموویاندا دەکات بێجیاوازی و دان بەیەکسانیاندا دەنێت لە کەسایەتیاندا.

مرۆڤـــەکان هەریـــەکێکیان جیهـــانێکی ســـەربەخۆیە بـــۆ خـــۆی و خـــاوەنی تایبەتمەندی تاکەکەسیی وەهایە کە لە هەموو مرۆڤەکانی تری جیادەکاتەوە، بۆیە هیچ کاتێك نابێت بەبێ هەق ئەم جیهانە تێکبدرێت، تێکچوونی هەموو ئاسمانـەکان و زەوی لای خودا ئاسانترە لە کوشتنی مرۆڤێـك بەناهـەق وەك لـە فەرموودەکانـدا هاتووە، هەروەها پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾ (المائدە: ٣٢) واتە: ئەوەی تەنیا کەسـێك بکوژێـت کە لە تۆڵەی کەسێکی کوژراودا نەبێت یان خراپەکاری و ئاژاوەی نابێتـەوە لەسـەر زەویدا ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی کوشتبێت.

## پێشەکی:

لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ یەکێکە لەو بوارە گەورانەی کـە ژیریـی مرۆڤـەکان هـەر لـە سەرەتای دروستبوونیان لەسەر زەویدا پێوەی سەرقاڵ بووە، لەگـەڵ فراوانبـوونی زانیارییەکانی و درکی مرۆڤ بەخودی خۆی لەهەمان کاتدا درککردنیشی بەگەردوون و دروستکراوەکان لە دەوروبەریـدا فـراوانتر بـووە، بـەردەوامیش لـەلای مرۆڤـەکان ناسینی گەردوون و دیاردەکانی و خودی خۆی لەو بارانـەی کـە بەسـەریدا دێـن لـە لەشساغی و نەخۆشی و منداڵی و پێگەیشتن، و پاشان پیریی و نوسـتن و ئاگـاهیی و نێرینە و مێینە و تەنهایی و بەکۆمەڵ و زیندوێتیی و مردن کۆششێکی بەردەوامی تاکەکەسیی و بەکۆمەڵی مرڤەکان بـووە، چـونکە زانینـی نهێنییـەکانیان بـەردەوام پێویستییەکی تێرنەکراوی مرۆڤەکان بووە لە هەموو سەردەمەکاندا.

لەلایـەکی تـرەوە قورئـانی پـیرۆز کـە کۆتـایین شـێوازی نیگـای خوداییـە بـۆ مرۆڤەکان بۆ پڕکردنـەوەی ئـەم غەریزەتـە مرۆییـە بـەردەوام داوای لێکـردوون کـە بیربکەنــەوە و ژیرییــان بخەنەگــەڕ و تێــبڕوانن بــۆ دۆزینــەوەی راســتییەکان لــە گەردوونـدا، چـونکە پـەروەردگار دەزانێـت کـە ئەمـە دەبێتـەهۆی گەیشـتنیان بـە راسـتیی رەهـا کـە ئـەویش ناسـینی پـەروەردگار و داننانـە بـە تـاك و تەنهاییـدا،

لەهەمان کاتدا گەیشتن بەراستییە زانستییەکان دەبێتەهۆی دەرخستنی راستیی و گەورەیی ئەم پەیامە پیرۆزەش، چونکە پەروەردگار لەم قورئانەدا زانیاریی شاردراوە و زانستی خودایی ناردووە کە بەتێپەڕبوونی رۆژگارەکان کاتێك ئەم راستییانە بۆ مرۆڤەکان روونده‌بێته‌وه گەورەیی و راستیی ئەم پەیامەیان زیاتر بۆ دەچەسپێت، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَّكِنِ اللهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً﴾ (النساء:١٦٦)، ئیمامی راڤەکاری قورئان (إبن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿خوای گەورە شایەتی پێغەمبەرایەتیت بۆ دەدات ئەی محمد (ﷺ)، ئەو کەسەی کە کتێبەکەی بۆ ناردوویت کە قورئانی پیرۆزە، هەربۆیە دەفەرموێت: (أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ) واتە: ئەم قورئانە زانیاری و زانستی خودایی تێدایە کە وویستوویەتی نیشانی بەندەکانی بدات، کە بریتین لە بەڵگەکان و رێنموویيکەرەکان، و جیاکەرەوەکان لە نێوان کوفر و ئیماندا، هەروەها زانیاریشی تێدایە بە بابەتە غەیبی و نەزانراوەکان، لە رابوردوو و داهاتووشدا﴾[96].

لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ، وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ (ص: ٨٧-٨٨)، لە تەفسیری (حِين) کە لە ئایەتەکەدا هاتووە (الفراء)ی موفەسیر دەڵێت: {مەبەستی لە پێش مردن و دوای مردنە، واتە راستیی ئەو ووتانەی من (مەبەست لە پێغەمبەرە (ﷺ)) دەیڵێم پاش ماوەیەك (لە داهاتوودا) بۆتان دەردەکەوێت}[97]، (الطبري)یش دەڵێت: {راستترین ووتە ئەوەیە کە بڵێین خوای گەورە بێبڕوایانی ئاگادار کردووە بەم قورئانە کە هەواڵەکانی لە داهاتوودا دەزانن، بەبێ دیاری کردنی کاتێکی دیاریکراو لە داهاتوودا، و بەرەهایی هێڵاوێتیەوە}[98].

---

[96] بڕوانە: تفسير ابن كثير- ج٣ ص ٢٨١.

٩٧ بڕوانە: تفسير الطبري- ج٢١- ص ٢٤٣-٢٤٥.

٩٨ هەمان سەرچاوە.

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ، سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٢-٥٣)، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، و پاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت! دەزانن چ سەرەنجامێكی سامناك چاوەڕێتانە؟! جا ئیتر كێ هەیە لە ئێوە سەرسەختتر؟! و كێ لاڕێتره لەوەی كە ڕێگەی جیا و دوور لە ڕاستیی گرتبێتەبەر؟! ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆكانی بوونەوەر و لە خودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی بۆیان روونببێتەوە ودڵنیابن كە قورئانە نێردراوەكەی حەق وراست ورەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە كە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!

قورئانی پیرۆز كتێبی هیدایەت و ڕێنموویی مرۆڤەكانە تا ڕۆژی دوایی، لەبەرئەوەش كە محمد (ﷺ) كۆتایین پێغەمبەرە خوای گەورە دینەكەی بۆ پاراستووە و لەهەمان كاتیشدا بەچەند بەڵگەیەكی ئاشكرا و گەورە پشتگیری كردووە كە تا ڕۆژی دوایی خەڵكی سەرسام دەكات، بەڵگەی قورئانیش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بریتییە لە ئیعجازی زانستی، چونكە خوای گەورە بە زانستی فراوانی خۆی دەزانێت كە ڕۆژگارێك دێت مرۆڤایەتی دەگەنە ئاستێكی بەرز لە زانینی نهێنییەكان و سوننەتەكانی گەردوون، و پێشكەوتنێكی زانستی وا بەرپادەكەن كە هیچ نەوەیەكی پێشتر پێینەگەشتووە، بۆیە دەبینین لە قورئاندا لە سەدان ئایەتدا ئاماژەدراوە بە یاساكان و دیاردەكان لە گەردووندا و پێكهاتەی زیندەوەرەكان بە ووردەكارییەكی زانستی وەها كە مرۆڤەكان دوای دەیان و سەدان ساڵ لەلێكۆڵینەوە پاشان گەشتنە ئەم ڕاستییانە، كە ئەمە دەیسەلمێنێت قورئان ووتەی مرۆڤ نییە بەڵكو پەیامی ئەو پەروەردگارەیە كە دروستكەر و ئاگاداری ئەم دیاردەو ڕاستییانەیە لە گەردووندا.

لەم توێژینەوەیەدا بەیارمەتی پەروەردگار باسی بابـەتێکی گرنگـی زانسـتی لـە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەکەین کە بەردەوام توێژینەوەی زانسـتی لەسـەردەکرێت کـە ئـەویش تایبەتمەندییـە جەسـتەییە تاکەکەسـییەکانی مرۆڤەکانـە یـان پەنجـەمۆرە جۆراوجۆرەکان لـە جەسـتەی مرۆڤـدا و پاشـان ئـەم راسـتییانە دەبەسـتینەوە بـە ئاماژە قورئانییەکان لەم بوارەدا، کە دواتر بۆمان دەردەکەوێت قورئانی پـیرۆز بـە وردەکارییەکی تەواوەوە ئاماژەی بەم بابەتە نوێیانە داوە.

لەبەشی یەکەمدا هەوڵدەدەین بەپشتبەستن بە نوێترین دۆزینەوە زانسـتییەکان ئاماژەیەکی قورئانی دەربارەی پەنجەمۆری سەرەپەنجەکان روونبکەینەوە و ئـەوە بسەلمێنین کە قورئان زیاتر لە ١٤٠٠ساڵە ئاماژەی بەوەداوە کە مرۆڤەکان نـاوازەن لە سەرەپەنجەکانیاندا و زانستی نـوێش ئـەم بابەتـەی سـەلماندووە بەشـێوەیەکی قەطعی و کۆتایی کە پەنجـەمۆری سـەرەپەنجەی هـیچ مرۆڤێـك لـەوی تـر ناچـێت، تەنانـەت لـە دوانـە لێکچووەکانیشـدا (Identical Twins) سـەرەپەنجەکان لەیەکتر ناچن کـە ئەمانـە لـە هـەموو شـتەکانی تریانـدا وەك یـەکن، هـەروەها ئـەم پەنجـەمۆرە بەشـێوەیەك وردە بـۆ هـەر مرۆڤێـك کـە تەنانـەت لـەرێی شـکڵی پەنجـەمۆرەوە دەتوانرێـت نێـر ومـێ لەیـەکتری جیابکرێتـەوە و تەمـەنی کەسـەکە دیاری بکرێت.

لەبەشـی دووەمـدا باسـی جۆرەکـانی تـری پەنجـەمۆر لەمرۆڤـدا دەکـەین وەك: پەنجەمۆری رەشێنەی چاو، پەنجـەمۆری بـۆن، پەنجـەمۆری دەنـگ، پەنجـەمۆری رەنگ....هتـد، کـە لـەرێی نـوێترین توێژینـەوە زانسـتییەکانەوە گـەورەیی و وردەکاریی ئاماژە قورئانییەکان لەمبوارەدا دەخەینەروو.

لەبەشی سێیەمدا لە چەند خاڵێکدا ئەنجامگیریی بۆ توێژینەوەکەمان دەکـەین و لە کۆتاییشدا چەند راسپاردەیەك دەخەینەروو بۆ ئەو بەرێزانەی لەبواری ئیعجـازی زانستیی قورئان و سوننەتدا کاردەکەن.

## بەشی یەکەم: پەنجەمۆری سەرەپەنجەکان

**پێناسە**: بریتییە لەو هێڵە سروشتیانەی کە لەسەر پێستی پەنجەکان و ناولەپی دەست، پەنجەکان و ناولەپی پێکان بوونی هەیە، وێنەی پەنجەمۆر لەسەر رووکەشەکان لە ئەنجامی ووشکبوونەوەی ئەو عارەقەی لەسەر پەنجەکان هەیە دەردەکەوێت، کە عارەق وەك حیبرێکی سرووشتی کاردەکات بەهۆی بوونی ماددەی چەوری و کانزاکان تێیدا [99].

لەسالّی (١٨٢٣ز)دا پزیشکی توێکاریی چیکی (پێرکنجی Johannes Purkinj) ووردەکاریی سەرەپەنجەکانی مرۆڤی دۆزییەوە و بینی ئەو هێڵە ووردانەی لە سەرەپەنجەکاندا هەیە لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر دەگۆڕێت، و چەند جۆرێکن: بەشکڵی کەوانە یان بازنە یان گرێ یان پێکهاتەی ئاڵۆزن [100].


Plain Arch


Tented Arch


Ulnar Loop


Radial Loop


Plain Whorl


Central Pocket Loop


Double Loop Whorl


Accidental Whorl

( هەروەها بڕوانە وێنەکانی لا پەڕە ٥٢٩ )

---

[99] سەرچاوەی ژمارە (٦) و (١٩).

[100] سەرچاوەی ژمارە (٩).

سـاڵی (١٨٥٨ن) زانـای ئینگلیـزی (ولیـەم هێرشـل William Herschel) ئاماژەی بەوەدا کە سەرەپەنجەکان شێوەی دەگۆڕێت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تـر کـە ئەمـە دەیکاتـە بەڵگەیـەکی جیاکـەرەوەی مرۆڤـەکان لەیـەکتری، سـاڵی (١٨٧٧ن) (د.هنـری فۆڵـدز Henry Faulds) چـاپکردنی وێنـەی پەنجـەمۆری سەرەپەنجەکانی داهێنا لەسەر کاغەز بە بەکارهێنانی حیبری چاپکردن، و لەساڵی (١٨٨٠ن)دا مەقالەیەکی لەسەر پەنجـەمۆر لـە گۆڤـاری زانستـی بـەریتانی (نەیچـەر Nature) بڵاوکـردەوە، سـاڵی (١٨٩٢ن)یـش (د.فرانسـیس گـاڵتۆن Francis Galton) سەلماندی کە وێنـەی سـەرەپەنجەی هەرپەنجەیـەکی مـرۆڤ بەدرێـژایی ژیـانی ئـەو کەسـە وەك خـۆی دەمێنێتـەوە بێگۆڕانکـاریی لەگـەڵ هـەموو ئـەو حاڵەتانـەی کـە بەسـەر ئـەو کەسـەدا دێـت و لەگـەڵ نوێبوونـەوەی بـەردەوامی خانەکانی پەنجەشدا.




هەروەها د.گاڵتۆن سەلماندی کە هیچ کەسێك لەجیهاندا وێنـەی سـەرەپەنجەی لە کەسێکی تر ناچێت بەشێوەك کە چانسی ئـەوەی ٢ سـەرەپەنجە لەیـەك بچێت پێویستمان بە ٦٤ ملیار مرۆڤ هەیـە جـا لەوانەیـە ٢ سـەرەپەنجەی ٢ مـرۆڤ لەیـەك بچێت (کە ئێستا ژمارەی دانیشتووانی زەوی تەنیا سەروو ٧ ملیار کەسـە)، سـاڵی (١٨٩٣ن) فەرماندەی پۆلیسی بەریتانیا (سـکۆتلەندیارد) بـەناوی (ئیـدوارد هینـری

Edward Henry) سیسـتمێکی سـادەی دامەزرانـد بـۆ پـۆلێن کـردن و کۆکردنـەوەی پەنجـەمۆری کەسـەکان، و هـەمان سـاڵ دەسـتکرا بەبـەکارهێنانی پەنجەمۆری سەرەپەنجەکان وەك بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر ئەنجامدەری تاوانەکان لە فەرمانگەکانی پۆلیس وەك لە ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیدا هاتووە [101].

لێرەوە زانایان دەستیانکرد بەئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر خەڵکانێکی ئێجگار زۆر لـە رەگـەزە جیاوازەکـان و بـەهیچ شـێوەیەك ٢پەنجـەمۆری لەیەکچوویان نەدۆزییەوە، پەنجەمۆری سـەرەپەنجەکان لـە مـانگی چوارەمی کۆرپەلـە لەسـکی دایکیـدا دروسـتدەبێت و بەدرێـژایی ژیـان بـە نـەگۆڕیی و نـاوازەیی دەمێنێتـەوە، هەربۆیـە پەنجـەمۆری سـەرەپەنجەکان بەشـێوەیەکی نێودەوڵـەتی وەك هۆکـاری نموونەیی دیاریکردنی ناسنانەی مرۆڤەکان دیاریکراوە [102]. **(بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٢٠)**

لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەیەکی زۆر وورد و ناوازە ئاماژە بـەم راسـتییە دراوە کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ، بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾ (القيامـة ٣-٤) واتـە: ئایـا مـرۆڤ وادەزانـێ کـە ئێسـکە رزیوەکـانی کۆناکەینـــەوە؟ بـــەڵێ: بـــەتوانایین لەســـەر رێکخســـتنەوەی نەقشـــی سەرەپەنجەکانیشـی [103]، لـە (مفـردات ألفـاظ القـرآن: ص١٤٧)دا هـاتووە: البنـان: الأصابع، واتە: بریتییە لە پەنجـەکان. هـەروەها لـە (لسـان العـرب: ج٢ ص١٥٨)دا هـاتووە: البنـان : الأصـابع ، وقيـل : أطرافهـا، واحـدتها بنانـة، واتـە بریتییـە لـە پەنجـەکان یـان سـەرە پەنجـەکان، (ئـیبن عـەبباس) و زوربـەی موفەسـیرەکان لـە راڤەی ئەم ئایەتەدا ووتویانە: واتە دەستەکانیمان وەك دەسـتی ئـاژەڵ لێـدەکرد و نێوان پەنجەکانمان بۆ نەدەهێڵا، کەواتە مەبەست پێی پەنجەکانە.

---

[101] سەرچاوەی ژمارە (٩) و (١٠) و (٢٠ تا ٣٢).

[102] هەمان سەرچاوەکانی پێشتر.

[103] بۆ مانای (البنان) لە زمانی عەرەبیدا بڕوانە فەرهەنگەکانی (لسان العرب) و (المعجم الوسيط) کە بەمانای: کۆتایی پەنجەکان یان سەرەپەنجەکان دێت.

لێرەدا دەپرسین بۆ پەروەردگار بۆ وەڵامدانەوەی بێباوەڕان و دەرخستنی ووردەکاریی گەورەی زیندووبوونەوە سەرەپەنجەکانی وەك نموونە هێناوەتەوە؟ ئەی بۆ باسی دروستبوونەوەی دڵ یان مێشك یان ئەندامە ئاڵۆزەکانی تری نەکردووە؟ موفەسیرەکانی پێشوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە باسی ووردەکاریی دروستبوونیان کردووە لە پەنجەکاندا، بەڵام وەڵامی ئەم پرسیارەمان لەدوای سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستکەوت کە زانستی پەنجەمۆر دۆزرایەوە و بۆماندەرکەوت کە سەرەپەنجەکان کلیلی تایبەتمەندێتی مرۆڤەکانە.

لێرەدا قورئان وەڵامی ئینکاریکردنی رۆژی دوایی و زیندووبوونەوە دەداتەوە لەلایەن بێباوەڕانی شاری مەککەوە بەشێوەیەکی رەوانبێژیی زۆر وورد کە بە خەیاڵیاندا نەدەهات [١٠٤]، کە نەك تەنها پەروەردگار ئێسکە رزیوەکان زیندوودەکاتەوە دوای مردن بەڵکو مردووەکان بەشێوەیەك لەرۆژی دواییدا زیندوو دەکاتەوە کە تەنانەت سەرەپەنجەکانیشیان وەك خۆی لێدەکاتەوە! ئەو بەشە ووردەی کە خاوەنەکەی دەناسێنێت و هەموو مرۆڤێکیش لەوانی ترجیادەکاتەوە.

---

[١٠٤] (د. عبدالله المصلح) لە کتێبی (هذا محمد رسول الله وهذه براهين رسالته) لاپەڕە (٤٤٧) ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە: فەیلەسوفی بەریتانی (تۆماس کاریل) کە شارەزا بووە لە زمانی عەرەبیدا لە زانایانی ئەزهەر دەپرسێت: بۆچی کەس ناتوانێت کتێبێکی وەك قورئان دابنێت؟ ئەوانیش پێیدەڵێن وەرە بابۆت روونبکەینەوە و لێیدەپرسن: تۆ دەتوانیت وەسفی فراوانیی دۆزەخمان بۆبکەیت؟ ئەویش چەند رستەیەکی جۆراوجۆر دەنووسێت لەوانە: دۆزەخ زۆر لەوە فراوانترە کە درکی پێبکەن، ئەگەر مرۆڤەکان و جنۆکەکان کۆببنەوە دۆزەخ قووتیان دەدات، لێرەدا زانا ئەزهەرییەکان پێکەنین و پێیانووت با وەسفی قورئانت بۆ باس بکەین دەربارەی فراوانی دۆزەخ کە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ (ق:٣٠)، واتە: رۆژێك دێت کە بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕبوویت؟ دۆزەخیش دەڵێت: ئایا کەسی تر هەیە بیهێنن؟ لێرەدا (تۆماس کاریل) ووتی: ئەم وەسفە مرۆڤ ناتوانێت بیکات، چونکە ئایەتەکە بەهەردوو گریمانەی مانای پرسیارکردنەکە ئیعجازە، ئەگەر پرسیارکردنەکە بۆ دانپێدانان (تقرير) بێت ئەوە مەبەستەکەی ئەوەیە: ئەی پەروەردگار هەموویانی گرتووە و جێگەش ماوە، ئەگەر پرسیارکردنەکەش بۆ ئینکار بێت واتە: پەروەردگار جێگە نەماوە چونکە هەموویانی گرتوتەخۆ.

لێرەدا ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە سەرەپەنجەکان مرۆڤەکان لەیەکتری جیادەکاتەوە، ئەمەش لەرووی زانستییەوە چەسپاوە کە سەرەپەنجەکان مرۆڤەکان لەیەکتری جیادەکاتەوە هەربۆیە لایەنە نێودەوڵەتییەکان بۆ ئەم مەبەستە بەکاریدێنن، ئەم ئاماژەدانە لایەنێکی ئیعجازیی گەورەی قورئان دەردەخات لەپەیوەندی نێوان تاکەکان و وێنەی سەرەپەنجەکانیان کە تەنها لەسەدەی نۆزدەهەمدا ئەم راستییە دۆزرایەوە، هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بە دروستکردنەوەی وێنەی هەموو سەرەپەنجەکان دەکات نەك تەنها یەك پەنجە، چونکە ووشەی (بنان) بۆ کۆ بەکاردێت واتە هەموو پەنجەکان، چونکە توێژینەوە زانستییەکان ئەوەشیان سەلماندووە کە وێنەی سەرەپەنجەکانی هەردوو دەستی هەموو مرۆڤێکیش لەوی تر ناچێت! ! پاك و بێگەردیی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم نهێنییەی لە سەرەپەنجەی مرۆڤەکاندا داناوە و کردوویەتیە بەڵگەش لەسەر راستیی و ووردیی پەیامە پیرۆزەکەی.

**پەنجەمۆر لە دووانە لەیەکچووەکاندا :**

دووانەی لەیەکچوو ئەو منداڵانەن کە لەسکی دایکدا لە یەك هێلکەی پیتێنراوەوە دروست دەبن، کاتێك لە هەندێك حاڵەتدا ئەو هێلکە پیتێنراوە لە قۆناغی دوو خانەییدایە هەریەکێك لەو دوو خانەیە گەشەدەکەن بۆ دروستکردنی کۆرپەلەیەکی جیاواز، کەواتە ئەم دوو کۆرپەلەیەی دروستدەبن دەبێت بەتەواوەتی لەیەکبچن چونکە هەمان ماددەی بۆماوەییان هەیە.



هەندێك كەس لەوانەیە بڵێن دووانە لەیەكچووەكان دەبێت هەمان پەنجەمۆری سەرەپەنجەكانیان هەبێت چونكە هەمان ماددەی بۆماوەییان هەیە، لەنوێترین توێژینەوە زانستییەكاندا كە لە سەرەتای سەدەی ٢١ ئەنجامدراون دەركەوتووە كە تەنانەن لەم دووانانەشدا جیاوازییەكی كەم لە وێنەی پەنجەمۆریان هەیە كە دەتوانرێت بەهۆی ئامێرە نوێیەكان بپێورێت و لەیەك جیابكرێنەوە، كەواتە ئەمانیش لەم سیفەتەدا ناوازەن وهەركەسە وپەنجەمۆری خۆی هەیە، هۆكاری ئەم جیاوازییەش ئەو گۆڕانكارییانەیە كە روودەدات لەئەنجامی كاریگەریی هێزە میكانیكییەكان و هۆرمۆنەكان لەسەر پێست لەكاتی گەشەكردنی كۆرپەلە لەسكی دایكیدا [١٠٥].




---

[١٠٥] بڕوانە ئەو توێژینەوە نوێیانەی لە سەرچاوەكانی ژمارە (٣٣ تا ٤١)دا ئاماژەیان پێدراوە.

## Can Identical Twins be Discriminated Based on Fingerprints?

Anil K. Jain & Salil Prabhakar — Dept. of Comp. Sci. and Eng., Michigan State University, East Lansing, MI 48824, {jain,prabhaka}@cse.msu.edu

Sharath Pankanti — IBM T. J. Watson Research Center, Yorktown Heights, NY 10598, sharat@watson.ibm.com

Abstract

1 Introduction

SCIENCE

### Do Identical Twins Have Identical Fingerprints?



The famous identity swapping tricks played by twins have met their match

Format: Abstract ▾ Send to ▾

### Fingerprint recognition with identical twin fingerprints.

Tao X, Chen X, Yang X, Tian J.

+ Author information

Abstract

Fingerprint recognition with identical twins is a challenging task due to the closest genetics-based relationship existing in the identical twins. Several pioneers have analyzed the similarity between twins' fingerprints. In this work we continue to investigate the topic of the similarity of identical twin fingerprints. Our study was tested based on a large identical twin fingerprint database that contains 83 twin pairs, 4 fingers per individual and six impressions per finger: 3984 (83*2*4*6) images. Compared to the previous work, our contributions are summarized as follows: (1) Two state-of-the-art fingerprint identification methods: P071 and VeriFinger 6.1 were used, rather than one fingerprint identification method in previous studies. (2) Six impressions per finger were captured, rather than just one impression, which makes the genuine distribution of matching scores more realistic. (3) A larger sample (83 pairs) was collected. (4) A novel statistical analysis, which aims at showing the probability distribution of the fingerprint types for the corresponding fingers of identical twins which have same fingerprint type, has been conducted. (5) A novel analysis, which aims at showing which finger from identical twins has higher probability of having same fingerprint type, has been conducted. Our results showed that: (a) A state-of-the-art automatic fingerprint verification system can distinguish identical twins without drastic degradation in performance. (b) The chance that the fingerprints have the same type from identical twins is 0.7440, comparing to 0.3215 from non-identical twins. (c) For the corresponding fingers of identical twins which have same fingerprint type, the probability distribution of five major fingerprint types is similar to the probability distribution for all the fingers' fingerprint type. (d) For each of four fingers of identical twins, the probability of having same fingerprint type is similar.

Free PMC Article

Full text links

Save items

Similar articles

Cited by 1 PubMed Central article

Semantic Scholar — Search over 40 million papers from ArXiv, PubMed, and more

### On the similarity of identical twin fingerprints

Pattern Recognition · 2002

Cite · Save · Share

**Abstract**

Reliable and accurate verification of people is extremely important in a number of business transactions as well as access to privileged information. Automatic verification methods based on physical biometric characteristics such as fingerprint or iris can provide positive verification with a very high accuracy. However, the biometrics-based methods assume that the physical characteristics of an individual (as captured by a sensor) used for verification are sufficiently unique to distinguish one person from another. Identical twins have the closest genetics-based relationship and, therefore, the maximum similarity between fingerprints is expected to be found among identical twins. We show that a state-of-the-art automatic fingerprint verification system can successfully distinguish identical twins though with a slightly lower accuracy than nontwins.

DOI: 10.1016/S0031-3203(01)00218-7

چەند نموونەیەك لەو توێژینەوە زانستییانەی لەسەر بابەتی (جیاوازی پەنجەمۆری سەرە پەنجەكان لە دووانە لەیەكچووەكاندا) لە جیهاندا ئەنجامدراون.

## جیاوازی پەنجەمۆر لەنێوان نێر ومێدا :

لە چەند توێژینەوەیەکی نوێی تردا کە تێیدا لێکۆڵینەوەی وێنەی پەنجەمۆری سەرەپەنجەی دانیشتووانی چەندین ناوچە و وولاتی جیاواز لە جیهاندا ئەنجامدرا (وەك: ئەوروپا، ئەفریقیا، هیندستان، چین، مالیزیا، ئەرجەنتین)، لە ئەنجامدا توانرا بە ووردییەکی زۆرەوە تەنانەت رەگەز و تەمەنی خاوەن پەنجەمۆرەکە دیاری بکرێت، ئەم ئەنجامانە ئەوەندەی تر راددەی تایبەتمەندیی پەنجەمۆری سەرەپەنجەی مرۆڤەکانی دەرخست [١٠٦]. (**بڕوانە وێنەی رەنگاوڕەنگی لاپەڕە ٥٣١**)

تەنانەت لە توێژینەوەیەکدا کە لە مانگی ١١ی ساڵی ٢٠١٦دا بڵاوکراوەتەوە باسی پەیوەندی نێوان چڕیی هێڵەکانی پەنجەمۆر و جۆری کەسێتی کراوە، کە ئەم توێژینەوەیە بەراوردی کردووە لەنێوان پەنجەمۆری ١٠٠ کەسی تاوانباری بەندکراو و ٥٠کەسی ئاساییدا، لەئەنجامدا باسی جیاوازییەکی گرنگ دەکات لەنێوان وێنەی پەنجەمۆری هەردوو گروپەکەدا [١٠٧].




[١٠٦] بڕوانە ئەو توێژینەوە نوێیانەی لە سەرچاوەکانی ژمارە (٤٢ تا ٥٣) ئاماژەیان پێدراوە.

[١٠٧] بڕوانە: https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/27810584

Science.gov

*Your Gateway to U.S. Federal Science*

Fingerprint ridge density in the Argentinean population and its application to sex inference: A comparative study

Abstract

Format: Abstract

Send to

J Forensic Leg Med. 2011 Feb;18(2):79-81. doi: 10.1016/j.jflm.2011.01.006. Epub 2011 Jan 23.

**Gender differentiation by finger ridge count among South Indian population.**

Nayak VC, Rastogi P, Kanchan T, Yoganarasimha K, Kumar GP, Menezes RG.

Author information

Abstract
The goal of this study is to determine the gender based on finger ridge count within a well-defined area. Rolled Fingerprints were taken from 550 subjects (275 men and 275 women) belonging to South Indian population all within the age range of 18-65 years. Results show that women have a significantly higher ridge count than men. Application of Baye's theorem suggests that a fingerprint possessing ridge density <13 ridges/25 mm(2) is most likely to be of male origin. Likewise, a fingerprint having ridge count >14 ridges/25 mm(2) are most likely to be of female origin. These results are helpful as a tool for fingerprint experts as they can be used as a presumptive indicator of gender based on the degree of ridge density.



PMID: 21315302 DOI: 10.1016/j.jflm.2011.01.006
[Indexed for MEDLINE]

Format: Abstract

Send to

Forensic Sci Int. 2010 Apr 15;197(1-3):67-9. doi: 10.1016/j.forsciint.2009.12.055. Epub 2010 Jan 13.

**Sex differences from fingerprint ridge density in Chinese and Malaysian population.**

Nayak VC, Rastogi P, Kanchan T, Yoganarasimha K, Kumar GP, Menezes RG.

Author information

Erratum in
Forensic Sci Int. 2010 Oct 10;202(1-3):112.

Abstract
The fingerprints are very typical for a human being. The present study was undertaken to study the gender differences in fingerprint ridge density in Chinese and Malaysian population. The study done on 200 subjects (100 males and 100 females) of Chinese origin and 100 subjects (50 males and 50 females) of Malaysian origin revealed that significant gender differences occur in the finger ridge density. Fingerprint mean ridge density of 12 ridges/25 mm(2) or less is found to be more likely to be of males and a mean ridge count of more the 13 ridges/25 mm(2) is more likely of female origin in Chinese subjects. Fingerprint mean ridge density of 11 ridges/25 mm(2) or less is found to be more likely to be of males and a mean ridge count of more the 11 ridges/25 mm(2) is more likely of female origin in Malaysian subjects.



PMID: 20071110 DOI: 10.1016/j.forsciint.2009.12.055
[Indexed for MEDLINE]

چەند نموونەیەك لــــەو توێژینــــەوە زانستییانەی لەسەر بابەتی (ناسینەوەی نێر ومێ لەجیاوازی پەنجـەمۆری سـەرە پەنجەكانیانەوە) كە لــــە جیهانــــدا ئەنجامدراون.

## بەشی دووەم: جۆرەکانی تری پەنجەمۆر لەمرۆڤدا

پەروەردگار رێزی لە مرۆڤ گرتووە، و تایبەتمەندی تەواوی پێداوە، ئەمە وای کردووە هەر مرۆڤێك بۆخۆی ناوازە بێت و لە مرۆڤەکانی تر نەچێت بەتەواوی، لەم بەشەدا بەیارمەتی پەروەردگار باسی هەندێك لەو تایبەتمەندییە تاکەکەسیانەی تری مرۆڤەکان دەکەین کە خۆیان لە جۆرەکانی تری پەنجەمۆر لە مرۆڤدا دەبینێتەوە، کە بەپێی دوایین توێژینەوەکان نزیکەی ١٣جۆری تری پەنجەمۆر لە مرۆڤدا بوونی هەیە، وەك: پەنجەمۆری ناولەپی دەستەکان و ناولەپی قاچەکان کە بێجگە لە سەرەپەنجەکان وێنەی ناولەپی هەردوو دەست و هەردوو ناولەپی قاچی هەر مرۆڤێك ناوازە و تایبەتە بەخۆی، پەنجەمۆری روخسار و سیمای دەم وچاو، پەنجەمۆری شێوەی لوولەکانی خوێن لەچاودا، پەنجەمۆری شێوە و شکڵی گوێی دەرەوە، پەنجەمۆری شێوەی لێوەکان، پەنجەمۆری زمان ئەویش کە شکڵ و شێوەیەکی تایبەتی هەیە بۆ هەر مرۆڤێك. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٣١**)



پەنجەمۆری ناولەپی دەست    پەنجەمۆری ناولەپی قاچ    پەنجەمۆری گوێ    **پەنجەمۆری شێوەی لێوەکان**

تەنانەت توێژینەوەیەك لە ٢٠١٣دا ئەوەی روونکردەوە کە جۆری ئەو بەکتریایەی لەسەر زمانی مرۆڤەکان و لەژێر لێوەکان دەژی دەتوانرێت بەهۆیەوە کەسەکان و رەگەزیان دیاری بکرێت چونکە هەر رەگەزێکی جیاواز چەند بەکتریایەکی جیاواز لەناودەمیاندا دەژی، هەروەها قژی مرۆڤ دەتوانرێت وەك پەنجەمۆرێکی تاکەکەسی بەکاربهێنرێت، لەناسینەوەی تەمەن و رەگەز و

نەخۆشــییەکان و عادەتــە خراپــەکانی خاوەنەکــەی وەك بــەکارهێنانی مــاددە هۆشبەرەکان[108].

**پەنجەمۆری رەشێنەی چاو (القزحیة Iris):** بریتییە لەو بازنە رەنگاورەنگـەی لەناو چاودا هەیە، و هەموو مرۆڤێـك شـکڵ و پێکهاتـە و رەنگـی رەشـێنەی چـاوی جیاوازە لەوانی تـر، توێـژەر (جـۆن دۆگمـان Daugman) دۆزییـەوە کـە شـکڵی رەشـێنەی چـاو بەدرێـژایی ژیـان نـەگۆڕە، ئەمـە وادەکـات کـە تایبەتمەندییـەکی ناوازەبێـت بـۆ جیاکردنــەوە و ناسـینەوەی کەسـەکان، لـەرۆژگاری ئەمڕۆشمانـدا رەشێنەی چاو وەك هۆکارێکی ناسینەوەی مرۆڤەکان بەکاردێت لە زۆرێك لە دەزگا بازرگـانی و ئاسایشـییەکان لـە جیهانـدا، ئـەویش بـەهۆی بـەکارهێنانی ئـامێرێکی تایبەتەوە کە دەتوانێت زیاتر لـە ٢٠٠خـاڵ و جیاکـەرەوەی رەشـێنەی چـاو دیـاری بکات و پاشان بەراوردی دەکات بەو داتایانەی پێشتر داخڵ کراون بـۆ ناسـینەوەی کەسەکان[109]. **(بڕوانە وێنەی لاپەڕە ٥٣١)**

**پەنجەمۆری تۆڕی بیـنین لەناوچـاودا** (الشـبکیة Retina): کـە بریتییـە لـەو چینە دەمارییەی دەکەوێتە بەشـی دواوەی ناوچـاوی مـرۆڤ، ئـەم چـینە بـەتۆڕێکی ئاڵۆز لە موولوولەکانی خوێن خۆراکی پێدەدرێت کە شـکڵێکی تایبـەتی و نـاوازەی تاکەکەسی دەدات بەم تۆڕی بینینە. **(بڕوانە وێنەی لاپەڕە ٥٣١)**

**پەنجـەمۆری ددانـەکان:** ددانـەکانی هـەموو مرۆڤێـك تایبەتمەنـدە بەخۆیـەوە لەرووی سیفاتە توێکاری و کیمیاییەکانی و لەرووی وێنەی تیشکییەوە، دەتوانرێت ئـەم جیاکەرەوەیـە بـەکاربهێنرێت لـەبواری پزیشـکیی دادوەری بـۆ ناسـینەوەی پاشمـاوەی تەرمـەکان، تەنانـەت ددانـەکان دەتوانرێـت بـەکاربهێنرێت بـۆ دیـاری کردنی سیفاتی مرۆڤەکان لە تەمەن و رەگەز و جۆری کارەکەی و نەخۆشییەکانی،

---

[108] سەرچاوەکانی (٦) و (٧٠).

[109] هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

دەتوانرێت ناسنامەی مرۆڤێك دیاری بکرێت لەرێی بەراوردکردنی وێنەی تیشکی ددانەکانی پێش مردن و دوای مردن، هەروەها شوێنەواری گازی مرۆڤ دەتوانرێت وەك پەنجەمۆر بەکاربهێنرێت بۆ دیاری کردنی ناسنامەی کەسەکە.



**پەنجەمۆری بۆماوەیی** (البصمة الوراثية Genetic Fingerprint): بریتییە لەو ماددە بۆماوەییەی لەناو ناوکی خانەکانی لەشدا هەیە، هەموو خانەکان هەمان پێکهاتەی بۆماوەییان لەترشی ناووکی (DNA) تێدایە کە فاکتەرە بۆماوەییەکان (جینەکان) دروستدەکەن، ئەم جینانەیە کە تایبەتمەندییە کەسییەکانی هەموو مرۆڤێك دیاری دەکەن لە درێژی و رەنگی قژ و رەنگی چاو و روخساری دەرەوەی مرۆڤ و .....هتد، ئەگەر نموونەیەك لە خانەکانی کەسێك وەربگرین و شیبکرێتەوە ئەوا دەتوانرێت ملیۆنەها گەردی بۆماوەیی لێجیابکرێتەوە و پەنجەمۆری بۆماوەیی ئەو کەسە دیارییبکرێت، کە بە درێژایی ژیان جێگیرە و ناگۆرێت، بۆ یەکەم جار ئەم تەکنیکە لەساڵی ١٩٨٥دا بەکارهێنرا، زانای ئینگلیزی (ئەلیك جیفریز) ئەوەی سەلماند کە گریمانەی لەیەکچوونی پێکهاتەی بۆماوەیی ٢مرۆڤ دەگاتە یەك بۆ یەك تریلیۆن (ژمارەی مرۆڤەکان لە ئێستادا تەنها ٧ ملیار کەسە)، تەنها لەدووانە لەیەکچووەکاندا نەبێت کە هەڵگری هەمان ماددەی بۆماوەیین چونکە لە دابەشبوونی یەك هێلکەی پیتێنراوەوە دروستدەبن[١١٠]. (**بڕوانە وێنەی لاپەرە ٥٣٢**)

---

[١١٠] بۆ ئەو جۆرانەی سەرەوەی پەنجەمۆر بروانە: سەرچاوەکانی (٦) و (٧٠).



تەنانەت شێوازی ڕۆیشتنی مرۆڤەکان بەسەر زەویدا تایبەتە و دەتوانرێت وەك پەنجەمۆرێك بۆ دیاری کردنی کەسەکان بەکاربهێنرێت، ئەویش لەرێی وێنەگرتنی بەڤیدیۆ و بەراوردکردنی، هەروەها وێنەی تیشکی مێشکی مرۆڤ لە رۆژگاری ئەمرۆدا وەك پەنجەمۆرێکی تاکەکەسیی جیاکەرەوەی مرۆڤەکان لەیەکتری باسی لێوەدەکرێت.

هەندێك جۆری پەنجەمۆر بەدرێژتر باس دەکەین چونکە چەند ئاماژەیەکی قورئانی هەیە سەبارەت بەم بابەتانە و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیان هاوئاهەنگی و یەکگرتنەوەی دەقە قورئانییەکانمان لەگەڵ راستییە زانستییە نوێکان زیاتر بۆ روووندەبێتەوە.

## پەنجەمۆری بۆنی لەش لەمرۆڤدا:

یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی مرۆڤەکان ئەوەیە کە هەموو مرۆڤێك بۆنێکی تایبەت بەخۆی هەیە (Odortypes or Odourprint) کە جیای دەکاتەوە لە مرۆڤەکانی تر و پێکهاتووە لە چەندین ماددەی کیمیایی (یان فێرمۆنەکان Pheromones)، بەتایبەتیش عارەقی مرۆڤەکان بۆنێکی تایبەتمەندی هەیە بەهەر کەسێکەوە، و دەتوانرێت ئەم جیاکەرەوەیە بەکاربهێنرێت بۆ ناسینەوە و شوێنپێ هەڵگرتنی کەسەکان لەرێی بەکارهێنانی سەگی مەشقپێکراو، کە هەستێکی بۆنکردنی بەهێزی هەیە و دەتوانێت لەنێوان

هەزاران کەسدا ئەو بۆنە تایبەتییە و خاوەنەکەی دیاریبکات، هەروەها لەمڕۆدا چەندین ئامێری زانستی دروستکراون یان لەژێر تاقیکردنەوەدان بۆ ناسینەوەی پەنجەمۆری بۆنی مرۆڤەکان و کۆکردنەوەی کە پێیاندەووترێت (OLFACTRONICS).

بۆنی لەشی مرۆڤ بەهۆکاری بۆماوەیی دروستدەبێت و بەتەواوی ناگۆڕێت تەنانەت ئەگەر خواردنەکەشت بگۆڕیت، بەڵام بەهۆی خۆراکەوە کاری تێدەکرێت، هەروەها گۆڕانکاریی بۆنی لەش و بۆنی هەناسە دەتوانرێت لە داهاتوودا وەك دیاریکەرێکی بەهێزی سەرەتای نەخۆشییەکان بەکاربهێنرێت.

لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیەك بۆ ئەم تایبەتمەندییەی مرۆڤەکان کراوە کە بریتییە لەبۆنی لەش لە چیرۆکی (یعقوب) پێغەمبەر (علیه السلام) لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (٩٤)دا کە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ واتە: کاتێك کاروانەکە دەرچوو باوکیان ووتی بەراستی من بۆنی یوسف دەکەم ئەگەر ئێوە بە خەڵەفاوم دانەنێن، لێرەدا ئاماژە بەو تایبەتمەندی و پەنجەمۆرە تاکەکەسییەی (یوسف) دەدات کە باوکی توانی پێیدا بیناسێتەوە کە بۆنی کراسەکەیەتی، و هەموو مرۆڤەکانیش ئەم تایبەتمەندییەیان هەیە کە لە خەڵکانی تر جیایان دەکاتەوە..

ئەو بۆنە بەشێوەیەکی سەرەکی بەکاریگەریی بوونی عارەق لەسەر لەش و پۆشاکەکان دروستدەبێت، کە پێکهاتەی عارەقیش لە هەر مرۆڤێکدا تایبەتمەندیی خۆی هەیە و دەتوانرێت بەئامێریی جیاکردنەوەی شەبەنگەکان پێکهاتەکەی دیاری بکرێت و بەبەراورد بە پێکهاتەی ئارەقی کەسەکان خاوەنی عارەقەکە دیاری بکرێت، ئەمە وادەکات عارەقی لەشی مرۆڤەکانیش جۆرێك بێت لە پەنجەمۆری تاکەکەسی[111].

---

[111] بڕوانە ئەو توێژینەوانەی لە سەرچاوەکانی (٥٤ تا ٥٩) ئاماژەیان پێدراوە.

## پەنجەمۆری دەنگ لە مرۆڤدا:

دەنگ بەهۆی دەنگەژێکان و بۆشایی دەم و لووتەوە دروستدەبێت، چینەکان و لەرە دەنگییەکانی هەموو کەسێك جیاوازە لە کەسەکانی تر، دەنگ سوودێکی گەورەی هەیە بۆ دیاری کردنی کەسێتی تاکەکان، کە دەتوانرێت بەهۆی دەنگیانەوە کەسەکان بناسێنرێنەوە، تەنانەت دیاری کردنی نێر ومێ، ئەویش بەبەکارهێنانی ئامێری ناسینەوەی لەرە دەنگییەکانی وەك (Oscilloscope).






دوای چەندین توێژینەوەی زانستی بۆ مرۆڤەکان دەرکەوت کە هەر کەسێك دەنگێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە لە کەسەکانی تر جیای دەکاتەوە لەبەرئەوەی دەنگی مرۆڤەکان خاوەنی زیاتر لە ١٠٠سیفەتی تایبەتییە، لەرۆژگاری ئەمڕۆشدا دەنگی کەسەکان وەك پەنجەمۆر بەکاردەهێنرێت بۆ کردنەوەی ماڵەکان و ناسینەوەی تاوانباران تەنانەت بەیەك ووشەش بێت، تەنانەت وەك رێگایەکی پاراستنی حساباتی بانکەکانیش بەکاردەهێنرێت[١١٢].




[١١٢] بڕوانە سەرچاوە زانستییەکانی (٦٠ تا ٦٥).

لە قورئانی پیرۆزدا چەند ئاماژەیەك بۆ ئەم تایبەتمەندییەی دەنگی مرۆڤەکان کراوە، خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کردووە لە دووروەکان و فێڵەکانیان، و ڕێگەیەکی بۆ دیاری کردووە بۆ ناسینەوەیان ئەویش لەڕێی گۆڕینی لەرەی دەنگەکانیان، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ﴾ (محمد:٣٠)، واتە: بێگومان بەشێوازی قسەیاندا دەیانناسیتەوە و دڵنیابن خودا بە هەموو کردەوەکانتان دەزانێت، ئەم گۆڕینی شێواز و لەرەی دەنگە ئاماژەیە بۆ کەسێتی و سروشتی خاوەنەکەی، سروشتی دەنگی مرۆڤی ئیماندار و ڕاست جیاوازە و جیادەکرێتەوە لە سروشتی دەنگی مرۆڤی درۆزن و ناڕاست، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەرکەسێك کە دەیەوێت درۆبکات یان ئەوەی لەدڵیدایە دەرینەبڕێت یان ڕاستییەکان بشێوێنێت ئەوا لە سروشتی دەنگیدا دەردەکەوێت، کەواتە پەنجەمۆری دەنگی دەرخەرێکی ووردی کەسێتی مرۆڤەکانیشە وەك توێژینەوە زانستییەکانیش دەریانخستووە، پاك وبێگەردیی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم هەمەرەنگییەی لە دەنگی مرۆڤەکاندا دروستکردووە، کە ملیارەها مرۆڤ لەم سەر زەوییە ژیاون و هەرکەسێکیشیان خاوەنی سروشتی دەنگیی خۆی بووە، ئایا ئەم جیاوازیی و جۆراوجۆرییە بەڕێکەوت بووە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو ئەندازە بۆ دانەری پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتە [١١٣].



---

[١١٣] بڕوانە بابەتی: بصمة الصوت: عبدالدائم الكحيل:
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-17-58/1829-2015-09-02-18-25-28

له ئایەتێکی تردا پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢)، واتـە: وە لـە نیشـانەکانی دەسـەڵاتی خودایـە دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی و جیـاوازی زمانـەکانتان و رەنگـەکانتان بەڕاسـتی لەمانـەدا بەڵگـەی زۆر هەیـە بـۆ زانایـان، موفەسـیرەکان دەربـارەی ئـەم ئایەتـە ووتوویانـە کـە پـەروەردگار جیـاوازی و جۆراوجـۆری دەنگـەکان و زمانـەکان و جیـاوازی رەنگـی مرۆڤـەکانی بەشـێوەیەك دروسـتکردووە بـۆ ئـەوەی هـیچ مرۆڤێـك لـەوی تـر نەچـێت لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هەموویان ئەوەی ئادەمن [١١٤].

له تەفسیری (السعدي)دا هاتووە: (على كثرتكم وتبـاينكم مـع أن الأصـل واحـد ومخارج الحروف واحدة، ومع ذلـك لا تجـد صـوتين مـتفقين مـن كـل وجـه ولا لـونين متشابهين من كل وجه إلا وتجد من الفرق بين ذلك ما به يحصـل التمييـز، وهـذا دال على كمال قدرته، ونفوذ مشيئته)، واته: لەگەڵ زۆری مرۆڤەکان و جیاوازییان بەڵام یەك سەرچـاوەیان هەیـە، و شـوێنی دروسـتبوون ودەرچـوونی پیتـەکان لـە دەم و قوڕگـدا لـە هـەموو مرۆڤـەکان هـەمان شـوێنە بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا ٢ دەنگـی لەیەکچـوو لەهـەموو روویەکـەوە نادۆزیتـەوە و ٢ رەنگـی لەیەکچـووش لـە هـەموو مرۆڤەکاندا نادۆزیتەوە، تەنانەت ئەوەنـدە جیـاوازی دەدۆزیتـەوە کـە دەبێتـەهۆی جیاکردنەوەی مرۆڤەکان لەیەکتری، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر تـەواویی دەسـەڵاتی پەروەردگار و جێبەجێبوونی ویستەکانی [١١٥].

لەراسـتیدا دەرکـەوتنی زیـاتری دەسـەڵاتی گـەورەی پـەروەردگار لـە رۆژگـاری ئـەمرۆدا بـوو دوای پێشـکەوتنی زانسـتی و تەکنـەلۆجی کاتێـك بـۆ مرۆڤـەکان

---

[١١٤] بڕوانە: صفوة التفاسير- ج٢ ص ٤١٢.

[١١٥] بڕوانە: تيسير الكريم الرحمان في تفسير كلام المنام- عبدالرحمان بن ناصر السعدي- دار طيبة الخضراء- دار ابن حزم - الطبعة الأولى - ٢٠٠٣ / ص ٦١٠.

دەرکەوت سەرەڕای جیاوازی ئەو سەدان زمانانەی مرۆڤەکان قسەی پێدەکەن، لەرەی دەنگی مرۆڤەکانیش یەکێکە لە تایبەتمەندییە تاکەکەسیەکانی هەر مرۆڤێك و دەنگی هیچ کەسێك بەتەواوەتی لەدەنگی مرۆڤەکانی تر ناچێت و دەتوانرێت لەرێی ئامێرە دەنگییە پێشکەوتووەکانەوە ئەم جیاوازییانە دەربخرێت، و لەرەی دەنگیی هەرکەسێك وەك جۆرێك لە پەنجەمۆر لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ناسراوە.

## پەنجەمۆری رەنگیی مرۆڤەکان:

ئەم بۆچوونە تێگەیشتنێکی نوێی زانستییە بۆ ئایەتی (٢٢)ی سوورەتی (روم) کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ واتە: وە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خودایە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانەکانتان و رەنگەکانتان بەڕاستی لەمانەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان، وەك ووتمان موفەسیرەکان باسی ئەوەیان کردووە کە ئەم جیاوازییەی نێوان مرۆڤەکان بەجۆرێکە کە هیچ مرۆڤێك لەوی تر ناچێت و هەر کەسێك تایبەتمەندی خۆی هەیە لە زمان و رەنگیدا [١١٦].

لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر: ٢٧–٢٨)، واتە: ئایا نەتبینیوە کە بەراستی خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، پاشان رووانمان بەو بارانە هەموو جۆرە میوەیەك کە

---

[١١٦] بڕوانە (تفسير ابن كثير) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (فجميع أهل الأرض بل أهل الدنيا منذ خلق الله آدم الى قيام الساعة، ليس يشبه واحد منهم الآخر ، بل لابد أن يفارقه بشيء من السمت أو الهيئة أو الكلام ، كل وجه منهم أسلوب بذاته وهيئته لاتشبه الأخرى، ولو توافق جماعة في صفة من جمال أو قبح لابدّ من فارقٍ بين كل واحد منهم وبين الآخر) (ج٦ ص٨٩)، واتە مەبەستی ئەوەیە مرۆڤەکان لەوەتەی پەروەردگار ئادەمی دروستکردووە تا رۆژی دوایی هەموویان تایبەتمەندن و جیاوازن لەیەکتری و کەس لەوی تر ناچێت، ئایەتە پیرۆزەکە لێرەدا دەنگ و رەنگی مرۆڤەکانی کردووە بەنموونە.

رەنگەكانیان جیاوازە، و لە چیاكاندا چەندین رێگا هەیە كە رەنگیان سپی و سووری جیاوازن و هەشیانە رەشێكی تۆخە، لە مرۆڤەكانیش و زیندەوەر و ئاژەڵ و ماڵاتیشدا رەنگی جۆراوجۆری جیاواز هەیە وەك میوەكان، بەڕاستی لەناو بەندەكانی خوادا تەنیا زانایان وەك پێویست لەخودا دەترسن.

لە (صفوة التفاسير)دا هاتووە: (أي وخلق من الناس والدواب والأنعام خلقاً مختلفاً ألوانه كاختلاف ألوان الثمار والجبال)، واتە خوای گەورە لە مرۆڤەكان و زیندەوەر و ئاژەڵەكان دروستكراوی رەنگ جیاواز و جۆراوجۆری دروستكردووە وەك جیاوازی رەنگی میوەكان و شاخەكان و هەموویشیان دروستكراوی پەروەردگارن، پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی باشترین بەدیهێنەرە [117].

لە قورئانی پیرۆزدا ووشەی (لون یان ألوان) ٩ جار هاتووە لە ٦ ئایەتدا، سەبارەت بە ئایەتی (٢٢)ی سوورەتی (روم) ئیمامی (الطبري) لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت: مانای ئەوەیە كە جیاوازی لە رەنگی جەستەی مرۆڤەكاندا هەیە [118].

لە تەفسیری (في ظلال القرآن)دا هاتووە:

(ثم ألوان الناس، وهي لاتقف عند الألوان المتميزة العامة لأجناس البشر، فكل فرد بعد ذلك متميز اللون بين بني جنسه، بل متميز من توأمه الذي شاركه حملا واحداً في بطن واحدة!)، واتە: پاشان رەنگی مرۆڤەكان تەنها لەو رەنگە تایبەتییانەدا ناوەستێت كە لەلای رەگەزە جیاوازەكانی مرۆڤەكاندا هەیە، چونكە دوای ئەمە هەموو تاكێكیش ناوازە و تاكە لە رەنگیدا لەنێوان هاوڕەگەزەكانیشیدا، بەڵكو ئەوەندە ناوازەیە تەنانەت رەنگی جیاوازە لەو دووانەیەی كە بەهەردووكیان لەسكی دایكێكدا بوون [119].

---

[117] بڕوانە (صفوة التفاسير) ج٢ ص٤٩٦ .

[118] بڕوانە: http://quran.ksu.edu.sa/tafseer/tabary/sura35-aya28.html

[119] بڕوانە (في ظلال القرآن) ج٥ ص٢٩٤٢.

لێرەدا لە تێگەیشتنمان لە ئایەتە پیرۆزەکەوە دەستپێدەکەین و بۆچوونێکی زانستی نوێی لێوەردەگرین کە رەنگی پێستی هیچ مرۆڤێك لەوی تر ناچێت، بەبێئەوەی مەبەستمان ئەوە بێت کە ئەمە تەنها تێگەیشتن و تەفسیرە بۆ ئایەتەکە.

تا ئێستا لەرووی زانستییەوە هیچ توێژینەوەیەکی زانستی لەمبارەوە بوونی نییە (جگە لەو توێژینەوەیەی دواتر باسی دەکەین)، دەزگا زانستییەکان لە چەند شوێنێك ئاماژەیان بەوەداوە کە رەنگی پێستی مرۆڤەکان ناوازە و جۆراوجۆرە بەڵام بەتوێژینەوە باسی ئەوەیان نەکردووە کە رەنگی پێستی هیچ مرۆڤێك لەوی تر ناچێت[120]. (**بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٣١**)

هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر ئەم بابەتە دەبێتەهۆی دەرخستنی لایەنێکی ئیعجازی زانستی قورئان کە رەنگی هیچ مرۆڤێك لەوی تر ناچێت و ئەم جیاوازیی و ناوازەییە لەهەمان کاتدا مەزنیی دەسەڵاتی پەروەردگار و ووردەکاریی لە دروستکراوەکاندا زیاتر دەسەلمێنێت، لێرەوە ژیریی دەبێت دان بەوەدا بنێت کە ئەم جۆراوجۆرییە لە هەموو شتێکدا بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر بوونی خودایەکی دانا و زانا و ووردەکار بۆ ئەم گەردوونە و دروستکراوە ناوازەکانی.

**توێژینەوەیەکی نوێ:**

لە توێژینەوەیەك کە پێشکەشکرا بوو بۆ زانکۆی (الرباط الوطني) لە (سودان) بەشی (معهد الدراسات المعرفية والاعجاز القرآني) لەلایەن (جيهان عيسى) بەمەبەستی بەدەستهێنانی پلەی (ماستەر) لە زانستی کارئەندامزانی (Physiology) بەناونیشانی پەنجەمۆری رەنگیی (البصمة اللونية)، توێژەر لەم توێژینەوەیەیدا فیکرەکەی لەو ئایەتە قورئانیانەوە وەرگرتووە کە باسی جیاوازی رەنگی مرۆڤەکان دەکات، و بەپشت بەستن بە بنەماکانی توێژینەوەی زانستیی

---

[120] بڕوانە سەرچاوەکانی ژمارە (٦٦) و (٦٧).

پراكتيكـى و بـه جێبـهجێكردنى ئـهم ٣ هـهنگاوەى خـوارەوە ئـهم بۆچـوونەى پشتڕاست كردووەتەوە:

١- بـهبينين و تێـڕوانين بەچـاوى ئاسـايى بـۆ زانينـى ئايـا رەنگـى مرۆڤـەكان لەيەكدەچن يان نا؟

٢- بەكارهێنانى وێنەى ديجيتاڵى و بەراوردكردنيان لە كۆمپيوتەردا.

٣- ئامێرى پێوانى پلەى رەنگيى كە بـەكاردێت بـۆ دۆزينـەوە و بەدواداچـوونى شێرپەنجەى پێست، كە دەتوانێت بە ووردييەكى زۆرەوە پلەى رەنگەكانى پێست ديارى بكات.

پاشان ئەم توێژەرە بەهاوكارى چەند توێژەرێكى پسپۆرى تر كـە بـريتى بـوون لە بەرێزان: (پرۆفيسۆر د.عمر عبدالعزيز موسى، د.محمد توم عبدالمجيد، و د.عـامر المجـذوب) لـە زانكـۆى (الربـاط الـوطني لـە سـودان) هەسـتاون بـەفراوان كردنـى توێژينەوەكە و پاشان بڵاويانكردەوە لە گۆڤارى زانستى:

(Saudi Med J. 2011 Aug; 32(8):825-9.) لـەژێر ناونيشـانى: (Skin color. Could it be a new fingerprint?)[١٢١]، دواتـر بەشـى يەكەمى ئەم توێژينەوەيان لە ژمارە (٥٤)ى گۆڤارى (الإعجـاز العلمـي) بڵاوكـراوەى (الهيئـة العالميـة للإعجـاز العلمـي في القـرآن والسـنة)دا بڵاوكردۆتـەوە[١٢٢]، ئەمـەش پوختەى توێژينەوەكەيە:

رەنگى پێست چەند هۆكارێك دروستى دەكەن كە بريتين لـە: مـاددەى مـيلانين كە خانەكانى ميلانۆسايت لە پێستدا دەريدەكەن، رێژەى هيمۆگلۆبين لەخوێنـدا، و هەروەها رێژەى ماددەى كارۆتين لەلەشدا، چـەند دابەشـكردنێك هەيـە بـۆ رەنگـى پێست لەرووى زانستييەوە لەوانە: دابەشكردنى كـارل ڤـۆن لينيـە ( Carl Von

[١٢١] بڕوانە: https://www.smj.org.sa/index.php/smj/article/view/7249/0

[١٢٢] بڕوانە: http://www.cajaz.org/eajaz_magz/isuue-54.pdf

Linnet)، دابەشکردنی فیتزپاتریك (Fitzpatrick) كە ٦ جۆری سەرەكی رەنگی مرۆڤەكانی داناوە و هەریەكێكیان چەندین پلەی جیاوازی هەیە:




لە توێژینەوەكەیاندا ٣ هەنگاویان بەكارهێنا: سەرەتا بەراوردكردنی رەنگی ئەو كەسانەی بەشداربوون لە توێژینەوەكەدا بەچاو لەلایەن ٣ كەسەوە، پاشان وێنەگرتنی كەسەكان بە كامێرایەكی دیجیتاڵی و بەراوردكردنی لە كۆمپیوتەردا، دواتر بەكارهێنانی ئامێرێكی زانستی نوێ بەناوی (Medisun Skin Check) كە پلەكانی رەنگی پێستی مرۆڤەكان دەپێوێت، ئەم ئامێرە كۆمپانیایەكی ئەڵمانی دروستیكردووە (بڕوانە ئەم وێنەیەی خوارەوە):



**چۆنێتی پشکنین:**



**ئەو شوێنانەی پێست کە ڕەنگەکەی پشکنرا:**



سەرەتا زانیاریی کەسی پشکنراو داخڵی بەرنامەیەکی کۆمپیوتەریی تایبەت دەکرێت، پاشان ئەو داتایەی لەم ئامێرەوە وەردەگیرێت لەگەڵ زانیارییەکانی کەسی پشکنراو بەهۆی ئەو بەرنامە تایبەتمەندەوە کە لە کۆمپیوتەرەکەدا تایبەتە بەم ئامێرە لێکدانەوەی بۆ دەکرێت و ژمارەیەکت دەداتێ کە پلەی ڕەنگیی پێستی کەسەکە دەردەخات[١٢٣].

ئەم توێژینەوەیە لەسەر (١٣٩) کەسی سودانی ئەنجامدرا کە تەمەنیان لەنێوان: ٦مانگ بۆ ٦٠ساڵ بوو، ٤١کەسیان دووانەی لەیەکچوو بوون، لەگەڵ ٧ کەسی چینی کە لە سودان کاردەکەن وەك نموونەی گەلێکی تر، پاش بەکارهێنانی بەرنامەی ژمێریاریی (SPSS) گەیشتن بەم دەرەنجامانە:

---

[١٢٣] بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی توێژینەوەکە و دەرەنجامەکانی بڕوانە:

https://www.slideshare.net/ribat/ss-9701470
https://pdfs.semanticscholar.org/5fea/b870d8ca89939fab49e8183f1c3c659e6f1a.pdf

ڕێـژەی نێرینــە ٥٢٪ بـوو، ڕێـژەی مێینــەش ٤٨٪ بـوو، هــەموو بەشـداربووان جیاوازییــەکی بەرچــاویان هــەبوو لــە پلــەی ڕەنگــی پێســتیان بــە دووانــە لەیەکچووەکانیشەوە، کەسیان وەك یەك نەبوون لـە پلـەی ڕەنگـی پێستیان دوای پشکنین بەچاو و وێنەی دیجیتاڵی لەناو کۆمپیوتـەردا، وبەتایبـەتی بەبـەکارهێنانی ئەو ئامێرەی ژمارەیەکی دەدا بەهـەر کەسێك بۆ ڕەنگـی پێستەکەی، وەك لـەم نموونانەدا: ( **هەروەها بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ٥٣٢** )



**Figure 6** - Differences in skin color between identical twins as seen visually and by photos as confirmed by skin color typing (skin color type: left - 4.73, and right - 4.47).



**Figure 4** - Differences in skin color between identical twins as seen visually and by photos as confirmed by skin color typing (skin color type: left - 4.49, and right - 4.35).



**Figure 7** - Differences in skin color between the identical twins as seen visually and by photos, and confirmed by skin typing (skin color type: left - 3.74, and right - 3.56).



**Figure 5** - Differences in skin color between identical twins as seen visually and by photos as confirmed by skin color typing (skin color type: left - 4.68, and right - 4.36).








**لەم وێنانەدا بەئاشکرا جیاوازی ڕەنگی پێست لە دووانە لەیەکچووەکاندا دەبینین کە لە جیاوازی ژمارەی هەر یەکێکیاندا دەبینرێت کە ئامێرەکە پێیداوە.**

**Figure 3** - Differences in skin color between the identical twins as seen visually and by photos, and confirmed by skin typing (skin color type: left - 3.62, and right - 3.81

Saudi Medical Journal

Home > Vol 32, No 9 (2011) > Musa

# Skin color. Could it be a new fingerprint?

*Omer A. Musa, Jehan E. Abdel Rahman, Asmr A. Magzoub, Mohamed T. Abdel Mageed*


## Abstract

**OBJECTIVES**

To prove that the difference in human skin color can be used as a new fingerprint.

**METHODS**

A cross-sectional descriptive study was conducted in the Faculty of Medicine, The National Ribat University, Khartoum, Sudan between January and June 2010. The study consists of 139 subjects, which includes 41 Sudanese identical twins (82 subjects), 50 subjects from the general population, and 7 Chinese. All subjects were free of skin lesions. Based on reflectance spectrophotometry, the skin color has been read for all subjects from the inner upper arm using the Medisun skin check. Visual judgment on color differences was carried out directly with 3 normal observers, and through digital photos.


PubMed

**Format** Abstract ▾ **Send to** ▾

Saudi Med J. 2011 Aug;32(8):825-9.

# Skin color. Could it be a new fingerprint?

Musa OA[1], Abdel Rahman JE, Magzoub AA, Abdel Mageed MT.

Author information


**Abstract**

**OBJECTIVE:** To prove that the difference in human skin color can be used as a new fingerprint.

**METHODS:** A cross-sectional descriptive study was conducted in the Faculty of Medicine, The National Ribat University, Khartoum, Sudan between January and June 2010. The study consists of 139 subjects, which includes 41 Sudanese identical twins (82 subjects), 50 subjects from the general population, and 7 Chinese. All subjects were free of skin lesions. Based on reflectance spectrophotometry, the skin color has been read for all subjects from the inner upper arm using the Medisun skin check. Visual judgment on color differences was carried out directly with 3 normal observers, and through digital photos.

**RESULTS:** Skin color was found to be different in all subjects under the study depending on visual judgment, digital photos, and skin color readings. Differences in skin color were also found between different parts of the body (color map). Color intensity reading in the first twin was 4.010 +/- 0.5, and in the second twin was 3.89 +/- 0.44 with a significant difference (p=0.001). The general population sample showed significant differences in skin color from each other, and from the Chinese group (p=0.002).

**CONCLUSION:** In this study, we found that skin color between identical twins is different, as well as in the whole population, and could be a new personal identification method, which needs further international studies.


PMID: 21858397

[Indexed for MEDLINE]



## بەشی سێیەم: ئەنجامگیریی و ڕاسپاردەکان

لەگەڵ ئەوەدا کە پەروەردگار هەموو مرۆڤەکانی دروستکردووە، وهەموویان بەشدارن لە یەکەی دروستبوون و یەکەی پێکهاتن و یەکەی کارە کیمیاییەکانی خانەکان و هەموویان لە گۆشت و خوێن و ئێسك پێکهاتوون و بنەچەی هەموویان لەگڵەوەیە، لەگەڵ هەموو ئەم لێکچوونە لە دروستبوون و دەنگ و شێوەی ئێسکەکان و بۆن و ڕەنگ بەڵام هەر یەکێکمان تایبەتمەندیی تاکەکەسیی تەواوی پێدراوە، بەشێوەیەك پەنجەمۆری تاکەکەسیی و ناوازەمان پێدراوە کە جیامان دەکاتەوە لە هەموو مرۆڤەکانی تر لەم سەر زەویەدا.

پەنجەمۆر بەشێوەیەکی گشتی بەوە پێناسەدەکرێت کە بریتییە لەو مۆرە خوداییە ناوازەیەی کە بەهۆیەوە مرۆڤەکانی لەیەکتر جودا کردۆتەوە، بەشێوەیەك هەموو مرۆڤێك لە ئێمە مۆرێکی تایبەت بەخۆی هەیە لە سەرەپەنجە و دەنگ و بۆن و چاو و گوێ و .....هتد.

ئەوەی مایەی سەرنجدانە ئەوەیە کە چۆن پەنجەمۆرەکانی مرۆڤ جیاوازن و چۆن دروستدەبن؟! چۆن ڕوخسار و جەستەکان جۆراوجۆرن و چۆن ئەمە دروستدەبێت؟! چەندێك ڕەنگەکان و سیفاتەکان جیاواز و جودان؟ ئەمانە هەمووی بەڵگە ونیشانەی دەسەڵاتی پەروەردگارن لە دروستکراوەکانیدا.

مرۆڤەکان هەموو جەستەیان پەنجەمۆری تایبەتی هەیە، پەنجەمۆر لە دەست و پێ و ڕۆشتن و لێوەکان و گوێکان و خوێن و لیك و موو و چاو و مێشك و...هتد بوونی هەیە، پەنجەمۆرەکانی جەستەی مرۆڤ بە بەردەوامیی نهێنیەکی گەورەیی دەسەڵاتی خوای پەروەردگارە لە دروستکراوەکانیدا، کە ئەمەش ئەم ووتەیەی پەروەردگار دەسەلمێنێت: ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (النحل:٨٨)، واتە: ئەمە دروستکراوی ئەو خودایەیە کە هەمووشتێکی بەوپەڕی ڕێك وپێکی دروست کردووە، دەبا تێبڕوانین کە چەند بەڵگەیەکی گەورەی ناساندنی خالیقی گەردوونە.

﴿يَاأَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار: ٦-٨)، واتە: ئەی ئینسان! چی وای لێکردویت کە سەرکەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبان و بەڕێزت، بەمەرجێك ئەو پەروەردگارە تۆی دروستکردووە بەرێکوپێکترین شێوە و جیای کردویتەوە لە هەموو گیانلەبەرانی تر، لەسەر هەر وێنەیەك (تایبەت)دا کەخۆی ویستبێتی دروستی کردوویت.

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ (التغابن:٣)، واتە: خودا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە بەحەق و راستی، و ئێوەشی لە جوانترین و ناوازەترین شێوەدا وێناکردووە و سەرەنجامیش هەر بۆلای ئەوە.

لەلایەکی ترەوە ئەم تایبەتمەندییانە رێزلێنانێکی گەورەی مرۆڤە بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ (الإسراء:٧٠) واتە: بێگومان رێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە ووشکانی و لە دەریادا هەڵمانگرتن (بەسواری و گەرانمان) و رۆزی پاك وخاوێنمان پێداون و رێزمانداون بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانمان بەرێزلێنانێکی گەورە، ئەوەش بەوەیە کە پەروەردگار بەدەستی پیرۆزی خۆی مرۆڤی یەکەمی دروستکرد و لە رۆحی خۆی کرد بە بەریدا و فەرمانی بە فریشتەکانیشی کرد کڕنووشی بۆ بەرن وەك رێزلێنانێکی گەورە بۆی، لەنەوەکانی ئەم بوو پەروەردگار پەیامبەر و دۆست و کەلیم و وەلی و کەسە تایبەتەکانی خۆی هەڵبژارد، هەربۆیە خوای گەورە مرۆڤی بەجوانترین شێوە دروستکرد و تایبەتمەندی کرد: ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ (التغابن:٣) واتە: پەروەردگار شکڵ و وێنەی پێبەخشیون و لەجوانترین شێوەشدا وێنەی کێشاون، گەورەترین رێزلێنانیش بۆ مرۆڤەکان هیدایەتی خودایە بۆیان بەناردنی بەردەوامی

پەیامبەرەکانی بۆلایان و ناردنی بەرنامەیەك بۆ ژیانیان کە ئەگەر پابەندی بن خۆشگوزەرانی دونیا و پاشەڕۆژیان دەستدەکەوێت: ﴿قَدْ جَاءَكُمْ بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ (الأنعام:١٠٤) واتە: بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە ڕێ ڕۆشنکەرەوە و چەندین بەڵگەی ڕوونتان بۆ هاتووە، جا هەرکەس بیر لەراستی ئەو بەڵگانە دەکاتەوە و دەیبینێ ئەوە خۆی بەرچاوڕۆشن دەبێت و سوودی بۆ خۆیەتی، هەرکەسێکیش بیرناکاتەوە و کوێربووە ئەوە زیانی بۆ خۆیەتی و منیش چاودێرنیم بەسەرتانەوە، بەس ڕاگەیەنەرم.

قورئانی پیرۆز دواترین پەیامی خودایە کە بەدوایەمین پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ مرۆڤەکانی نارد ، ئەم پەیامە بەڵگەیەکی واشی لەخۆگرتووە کە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگارەکان مرۆڤەکان موعجیزەکەیان زیاتر بۆ ڕووندەبێتەوە: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل:٩٣) واتە: بڵێ هەموو سوپاسێك بۆ ئەو خودایەی لەداهاتوودا (بە بەردەوامی) بەڵگە و نیشانەکانی پیشانی ئێوە دەدات و ئێوەش دەیانناسنەوە و پەروەردگارتان بێئاگا نییە لەوەی ئێوە دەیکەن.

قورئان بەڕێزەوە باسی مرۆڤی کردووە لە ٦٥ شوێندا کە زۆر شتی تایبەت بە مرۆڤی باسکردووە: سەرەتای دروستبوونی، لەچیەوە دروستبووە، چۆنێتی دروستبوونی، ئەو قۆناغانەی پێیدا تێدەپەڕێت، ئەو سەرەنجامەی پێیدەگات، ئەو بارانەی تێیدا دەبێت، مرۆڤ کاتێك ڕێی ڕاست دەگرێت یان لادەدات، کاتێك دەوڵەمەند یان هەژار دەبێت، کاتێك لەشساغ دەبێت یان نەخۆش، کاتێك باوەڕدار دەبێت یان بێباوەڕ لە دونیا و دوارۆژدا، پیاو و ئافرەت و گەورە و بچووك دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات و حاکم و مەحکوم، بەشێوەیەکە ئەگەر ووردبببیتەوە لە ئایەتەکانی قورئان ئەوە تێدەگەیت و بڕیاری ئەوە دەدەیت کە قورئان نێردراوە

بۆ چارەسەر کردنی کەیسی مرۆڤایەتی، و ئەو ڕێگە ڕاستەی کەبیگرێت و ئەو ڕێگە چەوتانەی خۆی لێیان لابدات.

کەواتــە قورئــان بڕیــاری ئــەوە دەدات کــە مــرۆڤ دروســتکراوێکی بــەڕێزە و دروستکراوێکی سەربەخۆیەوە، یەکەم کەس لە زنجیرەی مرۆڤایـەتی ئـادەم (علیـە السـلام) بـوو پاشـان نـەوەکانی بـەزنجیرە بەدوایـدا هـاتن، و خـودا ئـەو هـەموو تایبەتمەندیەشی پێداون بۆ ئەوەی ناوازەیی خۆیان بزانن و ڕێزی یـەك بگـرن، نـەك وەك بــیردۆزە نازانســتییەکانی بێبــاوەڕان کــە باســی گەشــەکردنی مــرۆڤ لــە زیندەوەرەکانی ترەوە دەکەن و بێڕێزی دەکەن بەوەی دەیکەن بە نەوەی مەیمون و ئاژەڵەکان.

ئەم ڕێزەی قورئان بۆ مرۆڤەکانی دادەنێـت جیـاوازی ناکـات لـەنێوان تاکـەکانی مرۆڤایەتی چونکە هەموویان یەك پەروەردگاریان هەیە و هەموویان لە مرۆڤایەتیـدا یەکسانن، تەنها جیاوازی لە کەیفیەتی مرۆڤەکاندا کردووە کـە هەیانـە بـاوەڕدارە و هەشیانە بێباوەڕە، بۆیە ئەم پەیامە گفتوگۆ لەگەڵ هەموویاندا دەکـات بێجیـاوازی و دان بەیەکسانیاندا دەنێت لـە کەسـایەتیەکەیاندا، کەواتـە ڕێـزی خـودایی هـەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە و بەکارهێنانی هۆکارەکـانی ئـەم ڕێزگرتنـە دراوەتـە دەسـت مرۆڤەکان خۆیان و ئەوان بڕیاردەدەن کە ئایا کائینێکی ڕێزداربن و بگونجێن لگـەڵ بنەچەی دروستبوونیاندا، یان دابەزێتە ئاستی ئاژەڵێتی و بۆ خۆی ڕازی بێـت کـە ببێتــە بەنــدەی ئارەزووەکــانی و بیانکاتــە خودایــەك و بیانپەرســتێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ . ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ . إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ (التین:٤–٦) واتە: بەڕاستی مرۆڤمان لـە جـوانترین شـێوەدا دروستکرد، لەپاشان (ئەگەر بێباوەڕبێت) دەیخەینە نزمترینی شوێنە نزمەکان (لـە دۆزەخدا)، مەگەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کـردەوەی چـاکیان کـردووە، بـۆ ئەوان هەیە پاداشتی نەبڕاوە.

کەواتـە مرۆڤـەکان هەریـەکێکیان جیهـانێکی سـەربەخۆیە بـۆ خـۆی و خـاوەنی تایبەتمەندی تاکەکەسیی وەهایە کە لە هەموو مرۆڤەکانی تری جیادەکاتەوە، بۆیە هیچ کاتێك نابێت بەبێ هەق ئەم جیهانە تێکبدرێت، وەك لە رۆژگاری ئـەمڕۆدا ئـەو هەموو بێڕێزییە دەبینین کە بە مرۆڤەکان دەکرێت لـە هـەموو لایـەکی جیهانـدا کـە هەنـدێکی بـەناوی ئاینـەوە دەکرێـت بـەڵام ئـاین لەمـە بەرییـە، تێکچـوونی هـەموو ئاسمانـەکان و زەوی لای خـودا ئاسـانترە لـە کوشـتنی مرۆڤێـك بەناهـەق وەك لـە فەرموودەکانـدا هـاتووە، هـەروەها پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾ (المائدة: ٣٢) واتە: ئـەوەی تـەنیا کەسێك بکوژێت کە لە تۆڵەی کەسێکی کوژراودا نەبێت یان خراپـەکاری و ئـاژاوەی نابێتەوە لەسەر زەویدا ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی کوشتبێ.

## راسپاردەکان:

١- بەردەوامیـدان بـە توێژینـەوەکان و بەسـتنەوەی ئایەتـە پیرۆزەکـان بـە راستییە زانستییەکانەوە دەرخەری زیاتری ئیعجازی زانستییە لە قورئـانی پـیرۆزدا و هۆکارێکی گرنگی بانگەوازە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا.

٢- هەوڵـدان بـۆ فراوانکردنـی لێکدانـەوەکانمان بـۆ ئایەتـەکانی قورئـان و وەرگرتنی بۆچوونی زانستی نوێ لە ئایەتە پیرۆزەکان و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) و دەرخسـتنی لایەنـە بەسـوودەکانی پەرسـتش و ئـاداب و ئامۆژگارییـە ئیسلامییەکان، ئەویش لـەرێی ئەنجامـدانی توێژینـەوەی زانسـتیی لـەو بوارانـەدا و سـەلماندنی زیـاتری ئـەو بۆچـوونەی (ئیعجـازی قورئـان و سـوننەت هانـدەرن بـۆ توێژینەوەی زانستی).

## سەرچاوەکان:


١- پوختـەی تەفسـیری قورئـان- م.محمـد مـلا صـالح بـامۆکی- کتێبخانـەی تیشك- چاپی هەشتەم.

٢- تفسير القرآن العظيم-الإمام ابن كـثير- تحقيـق أ.د. حكمـت بـن بشـير بـن ياسين- دار ابن الجوزي-الطبعة الأولى١٤٣١هـ .

٣- تفسير الطبري (جامع البيان عن تأويل آي القـرآن)-الإمـام الطـبري-تحقيـق محمود محمد شاكر- دار المعارف بمصر.

٤- صفوة التفاسير- محمد علي الصابوني- دار إحياء الـتراث العربـي- الطبعـة الأولى ٢٠٠٤.

٥- في ظلال القرآن- سيد قطب- دار الشروق- الطبعة الرابعة والثلاثون-٢٠٠٤.

٦- علـم البصـمات وتحقيـق الشخصـية - العميـد عبـدالله بـن محمـد اليوسـف- منشورات جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية - الطبعة الأولى ٢٠١٢.

٧- التصـوير الفوتـوغرافي - الـدليل الجنـائي المـادي ودوره في إثبـات جـرائم الحدود والقصاص- جامعة نايف العربيـة للعلـوم الأمنيـة، (ج١-٢) - الطبعـة الأولى ١٩٩٤.

٨- هذا محمد رسول الله (ﷺ) وهذه براهين رسالته- د.عبدالله بـن عبـد العزيـز المصلح- الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة- الطبعة الثالثة ٢٠١٥.

٩- بابەتی (بصمات الأصابع)- سایتی (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة):

https://www.eajaz.org/index.php/Scientific-Miracles/Medicine-and-Life-Sciences/11396-Fingerprints

١٠- بابەتی (البصمات)- سایتی (جامعة الإيمان):

http://www.jameataleman.org/main/articles.aspx?article_no=1615

١١- بابەتی (بصمة الصوت)- سایتی (عبدالدائم الكحيل):
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-17-58/1829-2015-09-02-18-25-28
١٢- بابـەتی (بصـمة الرائحـة)- سـایتی (جريـدة الريـاض):
http://www.alriyadh.com/173091
١٣- بابـەتی (بصـمة الرائحـة ومـدى حجيتهـا فـى القـانون المقـارن)- سـایتی (منتدى المحامين العرب):
http://www.mohamoon.com/montada/Default.aspx?Action=Display&ID=630&Type=3
١٤- بابـەتی: Skin color. Could it be a new fingerprint? لەم سایتانە:
https://www.smj.org.sa/index.php/smj/article/view/7249/0
https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/21858392
١٥- بابەتی: الكرامة الإنسانية في القرآن الكـريم - د. عبـدالحكيم درقـاوي- لـە سایتی:
http://www.alukah.net/sharia/0/27723/
١٦- بابەتی: "الإنسان في القرآن" في دلالة التكريم- لە سایتی:
http://www.fikr.com
١٧- بابەتی: ولقد كرمنا بني آدم... - لە سایتی:
http://articles.islamweb.net/media/index.php?page=article&lang=A&id=173069
١٨- بابەتی: الإنسان في القرآن- لە سایتی:
http://www.tafsir.net/article/5009

19-https://www.fbi.gov/services/cjis/fingerprints-and-other-biometrics

20-http://biometrics.cse.msu.edu/Presentations/AnilJain_UniquenessOfFingerprints_NAS05.pdf
21- Olsen, Robert D., Sr. (1972) “The Chemical Composition of Palmar Sweat”, Fingerprint and Identification Magazine Vol 53(10).
22- Y. Wang, Q. Hao, A. Fatehpuria, D. L. Lau and L. G. Hassebrook (2009) "Data Acquisition and Quality Analysis of 3-Dimensional Fingerprints" IEEE conference on Biometrics, Identity and Security, Florida.
23- Y. Wang, D. L. Lau and L. G. Hassebrook (2010) "Fit-sphere unwrapping and performance analysis of 3D Fingerprints", Applied Optics, Vol. 49, Issue 4, pp. 592-600, Feb. 2010.
24- Engert, Gerald J. (1964) "International Corner" Identification News Vol 14(1).
25- Fingerprints Reveal Drug Use, Chemical & Engineering News (2008), p. 34.
26- Berthold Laufer (1912) “History of the finger-print system,” Smithsonian Institution Annual Report.
27- Ashbaugh (1999), page 17; see also Laufer (1912).
28- Herschel, William J (1916). The Origin of Finger-Printing. Oxford University Press.
29- Department Of Justice State Crime Lab (1996). Physical Evidence Hand Book 5Th – Edition Wisconsin.
30- https://www.slideshare.net/Alyssa10/csi-forensics-fingerprint-identification
31- http://www.onin.com/fp/fphistory.html
32- http://www.odec.ca/projects/2004/fren4j0/public_html/history_of_fingerprinting.htm

33- https://www.ncjrs.gov/pdffiles1/nij/225321.pdf
34- https://www.fbi.gov/file-repository/about-us-cjis-fingerprints_biometrics-biometric-center-of-excellences-fingerprint-recognition.pdf.
35- http://www.pslc.ws/macrog/kidsmac/firehouse/arson/fbiprint.htm
36- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/22558204
37- http://biometrics.cse.msu.edu/Publications/Fingerprint/JainetalTwinFpTechReport00.pdf
38- www.sciencedirect.com/science/article/pii/S0031320301002187
39- http://www.nytimes.com/2009/10/06/science/06qna.html
40- http://www.sciencefocus.com/qa/why-do-identical-twins-have-different-fingerprints
41- https://www.livescience.com/32247-do-identical-twins-have-identical-fingerprints.html
42- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC3338710/
43- https://www.science.gov/topicpages/f/fingerprint+ridge+density.html
44- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/21315302
45- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/20071110
46- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/20129427
47- https://www.researchgate.net/publication/282946342_Fingerprint_ridge_density_in_the_Argentinean_population_and_its_application_to_sex_inference_A_comparative_study?_sg=5MgYnnvNic6dxx1l3QBg8AKL9rjqv2qj23e2s3IWYxt5Pn2uCZX8HNp-2chrWsE5uf5bwwesNKvMgUA4r19vUiuWzevmNH9XqOteFb1ImovUjQ

48- https://www.researchgate.net/publication/312419718_Sex_prediction_using_ridge_density_and_thickness_among_the_Hausa_ethnic_group_of_Kano_state_Nigeria
49- http://www.anthro.amu.edu.pl/pdf/ve/vol011/01kralik.pdf
50- https://www.omicsonline.org/determination-of-gender-differences-from-fingerprints-ridge-density-in-two-northern-indian-population-of-chandigarh-region-2157-7145.1000145.php?aid=4963
51- http://onlinelibrary.wiley.com/doi/10.1111/1556-4029.12092/abstract
52- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/10423851
53- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/7755377
54- https://www.livescience.com/5188-odor-unique-fingerprint.html
55- https://www.cia.gov/library/center-for-the-study-of-intelligence/kent-csi/vol5no2/html/v05i2a04p_0001.htm
56- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC2717541/
57- http://www.scienceworldreport.com/articles/11587/20131213/every-person-has-their-own-unique-scent.html
58- http://vb.mediu.edu.my/showthread.php?t=93160
59- http://www.dailymail.co.uk/sciencetech/article-1084423/How-unique-body-odour-identify-effectively-fingerprint.html
60- http://www.independent.co.uk/life-style/gadgets-and-tech/human-voices-are-unique-but-our-study-shows-we-re-not-that-good-at-recognising-them-a7796961.html

61- http://www.csis.pace.edu/~ctappert/srd2004/paper08.pdf
62- http://news.bbc.co.uk/2/hi/health/8382900.stm
63- https://www.nidcd.nih.gov/health/what-is-voice-speech-language
64- http://www.independent.co.uk/news/science/the-race-to-fingerprint-the-human-voice-8493867.html
65- http://theconversation.com/is-every-human-voice-and-fingerprint-really-unique-63739
66- http://humanorigins.si.edu/evidence/genetics/human-skin-color-variation/modern-human-diversity-skin-color
67- http://wonderopolis.org/wonder/why-are-people-all-different-colors
68- https://www.smj.org.sa/index.php/smj/article/view/7249/0
69- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/21858392
70- http://www.eajaz.org/eajaz_magz/isuue-54.pdf

لەگەڵ ئەو رۆڵە گرنگەی ئیعجازی زانستی دەیگێڕێت لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا و پشتگیری کردنی لەلایەن زوربەی زانایانی موسوڵمانانەوە، کەسانێکیش هەن رەخنەی لێدەگرن لەناو موسوڵماناندا کە زۆربەیان لەوانەن کە نایانەوێت زیادڕەوی تێدابکرێت و سنووری خۆی هەبێت، و نەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی لێکدانەوەکانی تر بۆ دەقە شەرعیەکان کە زانایانی تری باوەڕپێکراو لەکۆندا پێی هەستاون، ئەمەش کارێکی ئاساییە و سوننەتێکی خوداییە لەبوونی را و بیروبۆچوونە جیاوازەکان لەنێوان مرۆڤەکاندا بەتایبەتی لەو بابەتانەی کە عەقڵ و مەنتیق رۆڵی زیاتری تێدا دەبینێت، {وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ} (هود: ١١٨- ١١٩)، {وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً} (الكهف: ٥٤).

هەندێك دەڵێن قورئانی پیرۆز بۆیە دابەزی بۆ ئەوەی عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلام لێی تێبگەن، ئێمەی موسوڵمانیش دەبێت شوێنپێی ئەوان هەڵگرین لە تێگەیشتنیان بۆ ئایەتەکان بەپێی مانای ووشەکانی، ئیعجازی زانستیش زەرەر دەدات لە بەلاغەت و رەوانبێژی قورئان، لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی کە قورئان گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن کاتی دابەزینی ئەگەر ئەم مانایانەیان نەزانیایە ئەوە مانای ئەوەیە قورئان رەوانبێژ نیە چونکە باری ئەو کەسانەی قسەی لەگەڵ کردوون بەهەند وەرنەگرتووە، ئەگەر خەڵکیش پێشتر ئەم مانایانەیان بزانیایە ئەی بۆچی راپەڕینی زانستی عەرەب لەو رۆژەوەی قورئان دابەزی دەستی پێنەکرد، ئەینالێن قورئان زانستی پێشینەکان وداهاتووشی تێدایە؟!

دووبارە روونی دەکەینەوە کە قورئانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابەزیوە تا رۆژی دوایی بە جیاوازی رۆشنبیریی و زانیارییان، کاتێکیش گفتووگۆ لەگەڵ هەموو ئەم ژیرییانەدا دەکات هەر کەسە و بەپێی توانای خۆی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەگەر ژیریەکانیش بێتوانابوون لە تێگەیشتنی مانای هەندێك لە ئایەتەکان ئەوا

پێویسته پشت ببەستین بە گەورە زانا و لێکۆڵەرەوان چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (النحل: ٤٣)، زۆر جاریش زانایانی فیقه و لێکۆلەرەوان چەندین یاسا و حوکمیان له ئایەتەکانەوه دەرهێناوه کە خەڵکانی پێشین نەیانزانیوه، ئەویش لەبەرئەوەی قورئان سەمەرەکانی تەواونابن: (لاتنقضي عجائبه) وەك لە فەرموودەدا هاتووه.

یەکێك لە لایەنەکانی ئیعجازی قورئان بریتیە لەوەی دەستەواژەکانی چەندین مانا دەبەخشێت، کە لەوانەیە هەندێکیان لە سەردەمێکدا دەرکەوێت و هەندێکی تریشی لە زەمەنێکی داهاتوودا دەردەکەوێت لەگەڵ بەرەوپێش چوونی دۆزینەوه زانستیەکاندا، و پێویستە لەسەر زانایانی موسوڵمان لە هەموو سەردەمێکدا ئەم مانایانە بۆ خەڵکی روونبکەنەوه بەپێی ئەو زانست و زانیاریانەی لەبەردەستیاندایە.

لەلایەکی ترەوه کاتێك زانیاریی و زانستە گەردوونی و سروشتیەکان بەکاردەهێنین بۆ روونکردنەوەی ئایەتە قورئانیەکان و دەرخستنی لایەنی گەورەیی و ئیعجازیان ئەوا ئێمە بەم کارەمان وەك کاری زمانەوانەکان و رەوانبێژان دەکەین، خۆ لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەکارهێنانی زانستە زمانەوانیەکان لە دەرخستنی رووەکانی ئیعجازی قورئاندا نەبووه و سەردەمانی دواتر پەیدابوو، کە هەموو زانایان کۆکن لەسەر بەکارهێنانیان بۆ روونکردنەوەی لایەنەکانی ئیعجازی قورئان، کەواتە بۆچی ئێمە رێبدەین بە زانایانی زمانەوانی و رێنەدەین بە زانایانی گەردوون و سروشت کە زانستەکانیان بخەنە خزمەتی دەرخستنی لایەنەکانی ئیعجازی زانستی ئایەتە گەردوونییەکان لەقورئاندا؟!

مامۆستا (عمر عبید حسنه) دەڵێت[١٢٤]: " یەکێك لە ترسناکترین ئەو دەردانەی تووشی ژیریی مرۆڤی موسوڵمان بووه و رێگربووه لە تێڕوانین و شکاندنی کۆت

[١٢٤] بڕوانە: (کیف نتعامل مع القرآن: الشیخ محمد الغزالي) – المعهد العالمي للفكر الإسلامي – ص ١٦.

وبەندەکان و هێنانەدی تێڕوانینی گشتگیری قورئان و بەکارهێنانی بۆ چارەسەری ئێستا و درێژبوونەوە بۆ داهاتوو، ئەو وەهم وخەیاڵەیە کە ئەو بنەما فیکریانەی پێشتر لە قورئانەوە وەرگیرا لە سەردەمی یەکەمدا ئیتر کۆتایی هەوڵەکانە و تێگەیشتن لە دوورییەکانی دەقەکان بەمانەوە بەستراوە لە هەموو شوێن و ساتێکدا، کە ئەمە مایەی گەمارۆدانی دەقە قورئانیەکانە و کورتکردنەوەی تێگەیشتنە لێی بە سەردەمێکی دیاریکراوەوە وبەندکردنی ژیریەکانە بەتێڕوانینی ئەو سەردەمە و کۆت وبەندکردنی عەقڵە و ترساندنە لەبیرکردنەوە، ئەمە رێگری لە مرۆڤ دەکات کە تێبفکرێت و تێبڕوانێت بەو شێوەیەی دەقە قورئانیەکان خۆیان داوایدەکەن، ژینگەی شوێنکەوتن و تەقلید بووەتە میراتمان وبووەتە هۆی پەکخستنی ئیجتیهاد وکۆشش وداهێنان ودەستکەوتەکانمان بۆ چەندین سەدە، تەنانەت لە ئاستی هەڵس وکەوتیش نەماوین لەگەڵ قورئاندا ولە سوننەتەکانی تێناگەین لە ئاسۆکان و نەفسەکاندا وکورتمان کردووەتە لەلایەنە فیقهی وتەشریعیەکانی، بەڵام ئایەتەکان چەندین مەبەستیان هەیە: پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و گەردوونی و هۆکارەکانی دۆزینەوەی زانستی، کە لایەنی تەشریعی تەنها یەك لایەنی ئەم مەبەستانەیە".

هەندێکی تر دەڵێن: بەستنەوەی نێوان تەفسیری قورئان و بابەتە گەردوونیە بەردەوام گۆڕاوەکان کاردەکاتە سەر راستگۆیی قورئان.

بابزانرێت زۆربەی ئەوانەی بە تەفسیری زانستی قورئانەوە خەریکن پابەندن بە بەکارهێنانی زانیارییە زانستیە جێگیر و سەلمێنراوەکان کە گەیشتوونەتە قۆناغی راستیی و دڵنیایی و وەك یاسایان لێهاتووە، یان بیردۆزە زاڵبووەکانن، تەنانەت ئەگەر گۆڕانکاریش لەو زانیاریانەدا رووبدات هیچ زەرەرێکی بۆ قورئان نییە، چونکە ئەم جۆرە تەفسیرە کۆشش و ئیجتیهادێکە لە راڤەکردندا و دەتوانرێت بە راڤەکردنێکی تر راست بکرێتەوە لەژێر تیشکی زانیارییە نوێکاندا، بینیویشمانە کە

دەقە قورئانیەکان هەموو ئەو دۆزینەوە نوێیانەی لەخۆگرتووە، چونکە دەقە قورئانییەکان بەکۆمەڵێك زاراوەی گشتگیر هاتوون کە هەموو مانا راستەکانیان لەخۆگرتووە و نەوە بەنەوە بۆ مرۆڤەکان دەردەکەوێت.

روونکردنەوەی ئەمە هەر لە قورئان خۆیدا هەیە کە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ ...) کە دەرکەوتنی راستییەکانی بە بینین و سەیرکردنەوە بەستووەتەوە، چونکە هەر راستیەك کە کەوتە بواری بینینەوە ئیتر گومانی تێدا نامێنێت، کەواتە زەمانەتەکە بریتیە لە بینین، بۆنموونە بەربەستی نێوان دەریاکان ئەمرۆ بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە بینراوە و پێوانەی بۆدەکرێت، هەرچەندێکیش زانست بەرەوپێش بچێت، بینین و سەیرکردن بەجێگیریی دەمێنێتەوە، وهیچ کاتێك زانست نایەت بڵێت بەربەستی نێوان دەریاکان بوونی نییە، کەواتە ئیعجاز و تەفسیری زانستی بەو راستیە زانستیانە دەکرێت کە بینراوە و جێگیربووە.

ئەو رەخنانەی سەرەوە و رەخنەکانی پێشتریش کە وەڵاممان دانەوە دڵنیاین لە دڵسۆزی و پەرۆشییەوەیە بۆ قورئانی پیرۆز، بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانیە ئەوەیە کەسانێك هەن دەیانەوێت بەخەیاڵی خۆیان رەددی ئیعجازی زانستی بدەنەوە و ئینکاری ئەوە دەکەن کە قورئان ئاماژەی زانستی تێدابێت، بەڵام کاتێك ئەمەیان بۆ نەچووە سەر و نەیانتوانی ئینکاری و رەددی ئەو هەزاران ئامارە زانستییە بدەنەوە کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، هەستان بەهەڵبەستنی درۆیەکی تر کە گوایا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە بەوەرگرتنی ئەم زانیارییانە لە خەڵکان و میللەتانی تر، منیش بەیارمەتی پەروەردگار دەمەوێت رەددی هەندێك لەم گومانانە بدەمەوە و بەشێوەیەکی زانستی و مێژوویی بیسەلمێنم کە ئامارە زانسیتەکانی قورئان لەهیچ سەرچاوەیەکی ترەوە وەرنەگیراوە و موعجیزەیەکی ئاشکرا و بینراوی قورئان و سوننەتە.

## ڕەواندنەوەی ئەو گومانەی:
## ئیسلام کۆرپەلەزانی لە میللەتانی ترەوە وەرگرتووە[125]

بێباوەڕان بیانووی ئەوە دێننەوە کە ئەوەی محمد (ﷺ) هێناویەتی لە راستیی و زانیاریی دەربارەی کۆرپەلەزانی لە میللەتانی ترەوە وەریگرتووە وەك: یۆنانی و پزیشکە عەرەبەکان و خاوەنانی کتێبە ئاسمانیەکان.

ئەوە دەکەن بە بەڵگە کە (أبوقراط وأرسطو وجالینوس) باسی ئەو قۆناغانەیان کردووە کە کۆرپەلە پێیدا تێدەپەڕێت کە گوایە هەمان ئەو قۆناغانەیە کە قورئان باسی کردووە، هەروەها (الحارث بن كلدة والنضر بن الحارث) شارەزاییەکی زۆریان هەبووە بە زانستی پزیشکی و کۆرپەلەزانیدا، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئینجیل باسی قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلەی کردووە، ئەوەتا تێیدا هاتووە: (يداك كوَّنتاني وصنعتاني كلي جميعاً، أفتبتلعني، أذكر أنك جبلتني كالطين أفتعيدني الى التراب، ألم تصُبَّني كاللبن وخثَّرتَني كالجبن، كسوتني جلداً ولحماً فنسجتني بعظام وعصب) (أيوب:١٠:٨).

لێرەدا دەپرسن: ئێوە باسی چ ئیعجازێکی زانستی دەکەن لە قورئاندا، کە ئەمە تەنها چەند ئاماژەیەکە لە میللەتانی ترەوە وەریگرتووە؟!

بۆ وەڵام دەڵێین:

١- بۆچوونی میللەتانی تری پێش ئیسلام دەربارەی کۆرپەلە و دروستبوونی لە کۆمەڵێك ئەفسانە وخورافات دەرناچێت، و تەنها بەخەیاڵ دایانناوە و لەسەر بنەمای زانستی نەبووە بەهۆی نەبوونی هۆکارە زانستیەکان لەبەردەستیاندا، روونترین بەڵگەش لەسەر هەڵەکانیان لەمبوارەدا ئەوەیە کە (أبوقراط وأرسطو

---

١٢٥بڕوانە: موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات -- المجلد الثالث – بابەتی: دعوى اقتباس علم الأجنة من الأمم السابقة– سایتی: الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (www.eajaz.com).

وجالینوس) دەیانووت کۆرپەلە یان لەخوێنی مانگانەوە دروست دەبێت یان لەتۆوی پیاوەوە بەتەنها دروستدەبێت.



هەروەها دەیانووت گۆشت پێش ئێسقان دروستدەبێت، ئەوەبوو کە قورئان هات باسی نوتفەی تێکەڵاوی کرد (النطفةالأمشاج)[126] لە ئاوی پیاو وئاوی ئافرەت کە کۆرپەلە لە هەردووکیانەوە دروستدەبێت، وئێسك سەرەتا دروست دەبێت پاشان بە ماسولکە دادەپۆشرێت کە ئەم راستیانە یەکانگیرە لەگەڵ نوێترین دۆزینەوەکانی کۆرپەلەزانیدا[127].

---

[126] {إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً} (الإنسان:٢).

[127] بۆ مەسەلەی دروستبوونی ئێسك و ماسولکە لەرووی کۆرپەلەزانیەوە بروانە کتێبی (Langman's Medical Embryology) کە پرۆگرامی کۆلیجی پزیشکیە لە زانکۆکانی عێراق و کوردستان، بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بەشێوەیەکی گشتی باسی کۆرپەلە دەکات، بەڵام بەشی دووەمی تەرخانکردووە بۆ گەشە کردنی سیستەمەکانی لەشی کۆرپەلەکە، یەکەم سیستەمێك باسی دەکات کە گەشە دەکات لە لەشی کۆرپەلەکەدا بریتیە لە (Skeletal System) واتە کۆئەندامی پەیکەر یان ئێسکی لەش (بروانە لاپەڕە ١٢٥– ١٤٢)! پاشان دووەم سیستم کە گەشە دەکات دەڵێت بریتیە لە (Muscular System) واتە کۆئەندامی ماسولکە (یان گۆشت) (بروانە لاپەڕە ١٤٣– ١٤٩)! پاشان گەشەی سیستەمەکانی تر باسدەکات لە (کۆئەندامی سوڕانی خوێن و کۆئەندامی هەناسە و کۆئەندامی هەرس و میزەڕۆ و ...... تاد) ئەویش لەبەرئەوەی ریزبەندی سروشتی خۆی بەم شێوەیەیە، و ئەم دوو سیستمە (ئێسك و گۆشت) یەکەمین کۆئەندامن کە لە لەشی کۆرپەلەکەدا گەشە دەکەن بەدوای یەکدا.

باشە ئەگەر قورئان زانیاریی لە میللەتانی ترەوە وەرگرتووە ئەی بۆچی ئاوا جیاواز باسی کۆرپەلە دەکات؟

٢- زانستی پزیشکی لەناو نەتەوەی عەرەبدا لاوازترین زانست بوو لەلایان، لەگەڵ دەرکەوتنی کەسانی وەك (الحارث بن کلدة والنضر بن الحارث) چونکە لەسەر بنەمای سیحر وجادوو دامەزرابوو، و تەنها پشتی دەبەست بە هۆکارە سەرەتاییەکانی وەك: داخکردن و برینەوە و خوێنگرتن.

سەبارەت بە کۆرپەلەزانیش عەرەبەکان تەنها ئەوەندەیان لێدەزانی کە لە جوولەکەکانەوە وەریانگرتبوو لەگەڵ هەموو هەڵەکانیدا، باشە ئەگەر ئەمە حاڵی ئەو میللەتە بووبێت کە پێغەمبەر (ﷺ) لەناویاندا پەیدابوو، ئەی ئیتر چۆن زانیاریەکانی لەوانەوە وەرگرتووە کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە زانایان بەهۆیووردترین ئامێرەوە بەدەستیان هێناوە؟!.

٣- کتێبی پیرۆزی گاور وجوولەکە وەك لە دەقەکەی پێشتردا بەروونی دیارە باسی ئەوە دەکات کە کۆرپەلە لەخوێنی مانگانەوە دروستدەبێت، و تۆوی پیاو تەنها کاری هەڵهێنانێتی وەك چۆن هەوێن شیر هەڵدەهێنێت و دەیکاتە پەنیر، هەروەها دەشڵێت کۆرپەلە یەکەمجار پێست وگۆشتی دروستدەبێت پاشان ئێسك دروستدەبێت، کە دەبینین قورئان لەچەندین شوێندا پێچەوانەی ئەمە دەڵێت.[١٢٨]

---

[١٢٨] وەك: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى} (الحجرات:١٣)، {وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ{١٢} ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ{١٣} ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ{١٤} (المؤمنون).

## بۆچوونی هەندێك لە میللەتان لەسەر كۆرپەلەزانی:

### میسرییە كۆنەكان:

هەندێك تۆماری تایبەتی كە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سولالەكانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی فیرعەونی لە میسری كۆندا باسی ئەوە دەكات كە بە لایەنی كەمەوە ١٠ كەس نازناوی (هەڵدڕی وێلاشی شایانە- فاتح مشیمة الملك)یان هەڵگرتووە، مەراسیمی كەژاوەی شایانە وای دەخواست كەسێك ئالایەك هەڵگرێت لەبەردەم كەژاوەكەوە كە تەعبیر لە وێلاشی پاشا بكات، ئەویش لەبەرئەوەی باوەڕیان وابوو كە وێلاش (المشیمة) سیفاتی سیحریی هەیە، كە ئەم بۆچوونە تا سەردەمی یۆنانیەكان و دوای ئەوانیش هەر باو بوو و زانست بەسترایەوە بە سیحر و جادووەوە.

كۆنترین نووسراویش سەبارەت بە چۆنێتی خۆپاراستن لە سكپڕی (الوقایة من الحمل) بە زمانی هیری (كە زمانی كۆنی میسریەكان بوو پێش زمانی هیرۆگلیفی) نووسراوە و مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠-١٨٠٠ ساڵ پێش زایین كە لە پێكهاتەكانیدا پاشەڕۆی تیمساحی تێدابووە!! هەروەها میسرییە كۆنەكان نەشارەزا بوون بە رۆڵی تۆوی پیاو لە كرداری دروست بوونی كۆرپەلەدا، و باوەڕیان وابوو كە مەنی پیاو لە ناوچەی بڕبڕەی پشتەوە پەیدا دەبێت، كە ئەمە بیروبۆچوونی كاهن و قەشە ئاینیەكانیان بوو، بەلام میسریە كۆنەكان بە نزیكەیی ماوەی سكپڕیان دەزانی (دایان نابوو ماوەی ٢٧٥-٢٩٤ رۆژ دەخایەنێت).[١٢٩]

### هیندییە كۆنەكان:

لە زانستی پزیشكی لای هیندییە كۆنەكاندا نامەیەك بە زمانی سانسكریتی (Sanskrit) دۆزراوەتەوە كە باسی بۆچوونە كۆنەكان دەكات دەربارەی

---

[١٢٩] بڕوانە : علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة/الشیخ عبدالمجید الزنداني، من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة -(باكستان)/ ص ١٤.

گەشەکردنی کۆرپەلە کە دەڵێت: (لە یەکگرتنی خوێن و مەنییەوە کۆرپەلە پەیدا دەبێت، دوای تێپەڕبوونی حەوت شەو دەبێت بە تۆوێك، دوای ٢هەفتە کۆرپەلەکە دەبێت بە تۆپەڵێك و بارستەیەکی خڕ، دوای مانگێك دەبێت بەبارستەیەکی پتەو، دوای ٢مانگ سەری کۆرپەلەکە دروست دەبێت، دوای ٣مانگ جومگەکانی لەشی پەیدا دەبن)، کە ئاشکرایە ئەم بۆچوونانە چەند لە راستییەوە دوورن، و ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لە کۆندا خەیاڵ و تەصەوری بێبناغە چەند رۆڵی هەبووە لە تێگەیشتنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلەدا؟!.

**یۆنانی و رۆمانییەکان:**

یۆنانییە کۆنەکان یەکەم کەس بوون کە زانستیان بە مەنتیقەوە گرێدا نەك بەهێزە سیحرییەکانەوە، و ئەوەبوو بە شێوەیەکی مەنتیقی تێبینیەکانیان لێك دەدایەوە، بەڵام زۆر کات مەنتیق و خەیاڵات لەگەڵ راستیە زانستیەکاندا یەك ناگرێتەوە، یەکەم کەس کە لەم بوارەدا دوا زانای یۆنانی هیپوکراتس (أبوقراطHippocrates) بوو کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا ژیاوە، کە دەڵێت: (٢٠ هێلکە یان زیاتر بێنە و بیانخەرە ژێر دوو مریشك یان زیاترەوە، هەر رۆژەی هێلکەیەك بشکێنە و سەیری بکە، بە تەواوەتی ئەوە دەبینیت کە بۆمان روون کردیتەوە کە لەوانەیە سروشتی مرۆڤ چوونیەکی سروشتی باڵندە بێت).

لەم سەردەمەی مێژووی زانستی کۆرپەلەزانیدا نووسینەکانی (أرسطوطالیس) و (جالینۆس) زاڵ بوون لەگەڵ ئەوەشدا کە تەنیا بۆچوون نەبوون لەم بوارەدا، (أرسطو Aristotle) (٣٨٤-٣٢٢ی پێش زایین) بە بۆچوونەکانی دەربارەی کۆرپەلەزانی بەناوبانگ بوو کە وەسفی گەشە کردنی جووجك و کۆرپەلەی تری کردووە، لێرەوە بە دامەزرێنەری کۆرپەلەزانی دادەنرێت لەگەڵ ئەوەشدا کە بیروبۆچوونەکانی لە دەوری: (گەشەکردنی کۆرپەلە لە خوێنی مانگانەوە پاش ئەوەی کە لەلایەن تۆوی پیاوەوە چالاك دەکرێت) دەخولایەوە.

(جالینۆس Claudius Galen)یش له سەدەی دووەمی پێش زایینـدا کتێبێکی دانا لەسەر گەشە و خۆراکی کۆرپەلە، و دەربارەی وێلاشی دەوری کۆرپەلەش دواوە، کە بۆچوونەکانی تەنیا باسی قۆناغە کۆتاییەکانی گەشەی کۆرپەلە دەکات[130].

لەساڵی ٢٠٠ی پێش زایینەوە جۆرە ئاماژەیەکی ئەوتۆ بۆ زانستی کۆرپەلەزانی نەهاتووە لە کتێبە زانستیەکانی رۆژئاوادا، تەنانەت ئەگەر نووسەر و وەرگێڕە موسوڵمانەکان نەبوونایە ئەوا زۆرێك لە نووسراوە یۆنانیەکانیش دەفەوتان.

تەنیا ئەو فەرموودانەی قورئان و سوونەت نەبێت کە زۆر بە ووردی باسی گەشە کردنی کۆرپەلەیان کردووە، هیچ کەسێکی تر نەچووەتە ووردەکارییەکانی کۆرپەلەزانیەوە، زانای رۆمانی (کۆنستەنتین Constantinus Africanus) (١٠٢٠-١٠٨٧ی زایینی) نامەیەکی کورتی نووسیوە بە ناونیشانی سروشتی مرۆڤ (De Humana Natura) کە تێیدا باسی هەندێك قۆناغی گەشە کردنی کۆرپەلەی کردووە و بەستویەتیەوە بە هەسارەکانەوە، ئەمە بۆمان روون دەکاتەوە کە ئەو بیردۆزانەی تەنیا بەهۆی گومان و خەیاڵەوە دادەنرێن چۆن مرۆڤ بەرەو خورافات دەبات، لە سەدەی پانزەیەمدا زانا (لیوناردو دافینشی Leonardo Da Vinci) چەند وێنەیەکی ناو منالّدانی بلاو کردووەتەوە کە کۆرپەلە و پەردەکانی دەوری دەردەخات، کۆرپەلەکە بە تەواوەتی دەرکەوتووە، ئەمەش بلاویی بیردۆزی دروست بوونی تەواو دەسەلمێنێت لەو سەردەمانەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بۆچوونە باوبوو لەلای پزیشکان تا دوای دۆزینەوەی ووردبین (میکرۆسکۆب)یش لەسەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا بەلام موسوڵمانان بە

[130] بڕوانە: رد الشبهات حول علم الأجنة في القرآن والسنة- د. مصطفى عبدالمنعم- مقال منشور بموقع: موسوسة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة: (http://www.quran-m.com).

گشتی و زانایانی ئیسلام به تایبەتی ئەم بۆچوونەیان رەت کردووەتەوە، ئەمانەش هەندێك نموونەیە لە ووتەی زانایانی موسوڵمان لەم بوارەدا:

- ﴿ئیبن قەییمی جەوزیە﴾ کە لە ساڵی (٧٥١ ك) کۆچی دوایی کردووە دەڵێت: (ومني الرجل وحده لا يتولد منه الولد ما لم يمازجه مادة أخرى من الأنثى)[١٣١] واتە: مەنی پیاو بە تەنیا منداڵی لێوە دروست نابێت ئەگەر بێتو ماددەیەکی تری تێکەڵاو نەبێت لە ئافرەتەوە.

هەروەها دەڵێت: (الجنين يخلق من ماء الرجل وماء المرأة خلافاً لمن يزعم من الطبائعيين أنه إنما يخلق من ماء الرجل وحده)[١٣٢]، واتە: کۆرپەلە لەئاوی پیاو و ئافرەت هەردووکیانەوە دروستدەبێت بەپێچەوانەی ووتەی سروشتزانەکان کە دەڵێن کۆرپەلە تەنها لە مەنی پیاوەوە دروست دەبێت.

- هەروەها زانا ﴿ئیبن حەجەری عەسقەلانی﴾ کە لە (١٤٤٩ی زایینیدا)کۆچی دوایی کردووە لە پێشەکی راڤەی بۆ پەڕاوی (القدر) لە کتێبی (فتح الباری شرح صحيح البخاري)دا دەڵێت:

(وزعم كثير من أهل التشريح أن مني الرجل لا أثر له في الولد إلا في عقده، وأنه إنما يتكون من دم الحيض، وأحاديث الباب تبطل ذلك)[١٣٣]، دەڵێت: زۆرێك لە زانایانی توێکاری لەم سەردەمەماندا وا تصور دەکەن و دەڵێن کە تۆوی پیاو رۆڵی نییە لە دروست بوونی منداڵدا و تەنها وەك هەوێنێکە بۆ هەڵهاتنی، و کۆرپەلە لەسکی دایکدا تەنها لەخوێنی مانگانەی ئافرەتەوە دروست دەبێت، کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم قسەیە رەت دەکەنەوە و ئەم قسەیە راست نییە !.

---

[١٣١] بڕوانە کتێبی: التبيان في علوم القرآن/ لاپەڕە ٢٤٤.

[١٣٢] بڕوانە: تحفة المودود بأحكام المولود/ ص ٣٩٣.

[١٣٣] بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري (ج١١ ص٤٨٠).

- ئیمامی قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (بَيَّنَ الله تعالى في هذه الآية ﴿يقصد قوله تعالى: " يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ " (الحجرات ١٣) ﴾ أنه خلق الخلق من الذكر والأنثى.. وقد ذهب قوم من الأوائل، إلى أن الجنين إنما يكون من ماء الرجل وحده، ويتربى في رحم الأم ويستمد من الدم الذي يكون فيه.. والصحيح: أن الخلق إنما يكون من ماء الرجل والمرأة" لهذه الآية، فإنها نصٌّ لا يحتمل التأويل "[١٣٤] واتە: خوای گەورە لەو ئایەتەدا روونی کردووەتەوە کە مرۆڤەکانی لە نێر ومێ دروست کردووە، کە چەند خەڵکێکی پێش ئێمە بۆ ئەوەچوون کە کۆرپەلە تەنها لە ئاوی پیاوەوە دروستدەبێت، بەلآم قسەی راست ئەوەیە لە هەردوو پیاو و ئافرەتەوە دروست دەبێت چونکە دەقی ئایەتەکە بواری تەئویل و دەستکاری ماناکەی تێدانیە.

زانایانی موسوڵمان باوەڕی تەواویان هەبووە کە منداڵ لە هەردوو دایك و باوکەوە دروست دەبێت و زانست بەهەڵە باسی دروستبوونی کۆرپەلەی دەکرد، ئەویش بە پشت بەستن بە ئایەتە قورئانیەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەك فەرموودەی پەروەردگار: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ (القيامة: ٣٧).

کە ئەمەش نموونەیەکی ئاشکرایە لە پێشڕەوی و پێشکەوتنی قورئان و سوننەت بۆ هەموو ئەو زانیارییانەی کە لەلای زانایانی غەیری موسوڵمان بەدرێژایی سەدەکان جێگیربوو بوو.

دەبینین قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش زیاتر لە ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ئەم راستییە زانستیەی زۆر بەووردی باسکردووە ودووبارەی کردووەتەوە، کە وەکو باسمان کرد تەنها ٢٠٠ ساڵ دەبێت زانایان گەیشتوونەتە ئەم راستییانە، ولەمرۆماندا وەکو موعجیزەیەك سەیری دەکەین، ئێستاش فەرموون ئێوە و هەندێك لەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە:

---

[١٣٤] بڕوانە: الجامع لأحكام القرآن ٣٤٢/١٦.

-﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾ (الحجرات:١٣). واتــه: ئــەی خەڵكینە بە دڵنیاییەوە بزانن کە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێ دروست کردووە (واتـە نێر و مێ هەردووکیان پێویستن بۆ دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ).

- ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ (الدهر:٢). مانـای (أمشـاج) واتـە تێکـەڵ، کەواتـە مانـای ئایەتەکـە ئەوەیـە کـە دەفـەرموێت: ئێمـە مرۆڤمـان لـە نوتفەیەکی تێکەڵاو دروست کردووە (تێکەڵاو لەتۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت)، کـە ئەنجامی یەکگرتنیان لەناو منداڵداندا بریتییە لە دروسـت بـوونی هێلکـەی پیتێنـراو (Zygot).

- لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) هـاتووە: ﴿مَرَّ يَهُودي بِرَسول الله(ﷺ) وَهُوَ يُحَدِّثُ أَصْحابَهُ، فَقالت قُرَيش: يا يَهودي إِنَّ هَذا يَزْعُم أَنَّهُ نَبِيّ، فَقالَ: لَأَسْأَلَنَّه عَن شَيءٍ لا يَعْلَمُهُ إلاّ نَبِيّ، قال: فَجاء حَتَّى جَلس، ثُمَّ قال: يا مُحَمَّد مِمَّ يُخْلَقُ الأِنسان؟ فَقال رَسول الله (ﷺ): يَا يَهودي مِن كُلٍّ يُخْلَق: مِن نُطْفَة الرَّجُل وَنُطْفَة المَرْأَة﴾[١٣٥]، واتە: ڕۆژێـك جوولەكەیـەك بـەلای پێغەمبـەردا ڕۆیشـت کـە لـەو کاتـەدا قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد، لەو کاتەدا قورەیشیە بێباوەڕەکان پێیان ووت: ئەی جولەکە ئەم پیاوەی دەیبینیت وا خۆی پیشان دەدات کە دەڵێت مـن پێغەمبـەرم، جولەکەکەش ووتی: ئێستا پرسیارێکی لێدەکەم ئەگەر پێغەمبەر نـەبێت نایزانێـت، ئەوە بوو هات و لەلای پێغەمبەردا دانیشت وپاشان پرسیاری کرد: ئەی موحەممەد مرۆڤ لەچیەوە دروست دەبێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:ئەی جولەکـە بزانـە کە بنچینەی مرۆڤ لە هەردوو نوتفـەی پیـاو و نوتفـەی ئـافرەت بەیەکـەوە دروسـت دەبێت.

---

[١٣٥] رواه أحمد بسند صحيح.

# وەڵام بۆ رەخنەگرانی ئیعجازی زانستی لە قۆناغی (العلقە) لە قورئاندا[١٣٦]

پەروەردگار لەو کاتەی ئادەمیزادی بەدیهێناوە هەروا بەندەکانی بەبێ پێدانی بەرنامە پەراوێز نەخستووە، بەڵکو باشترین پرۆگرامی بۆ ناردوون، کە خۆشی و بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بەدەست بێنن، و دووربن لە سەرگەردانی و رێ لێ ونبوون، ئاشکرایە ئەم بەرنامەیەشی لە رێی نیگاوە بە باشترینی کەسانی سەر زەوی گەیاندووە، هەتا ئەوانیش بیگەیەننە مرۆڤایەتی.

گومانی تێدا نییە هەڵبژێردراوەکان (پێغەمبەران)، هەروا بە سادەیی نەهاتون بەخەڵکی بڵێن ئێمە نێرراوی پەروەردگارین، بەبێئەوەی بەڵگەی ڕۆشنیان پێدرابێت، کە ڕاستیی ووتەکەیان بسەلمێنێت! بەڵکو چەندین دەرئاسا و موعجیزەیان پێدراوە، کاتێك خەڵکی بینیویانە گومانیان نەماوە لەوەدا کە ئەمە بەتەنها ئیشی پەروەردگارە، بۆیە بەوپەڕی دڵفراوانی و بیروباوەڕەوە ئیمانیان پێهێناون و ئەوپەڕی تێکۆشانیشیان لەپێناودا کردووە.

پەروەردگار نێردراوەکانی یەك لەدوای یەك بۆ مرۆڤایەتی دەنارد، هەتا کۆتاییان بە باشترین هەڵبژێردراوی زەوی هات، ئەو باشترین کەسەی کە گەورەترین موعجیزەشی پێدرا، بەجۆرێك موعجیزەکەی هێندە گەورەبوو کە بەوەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، موعجیزەکەی وەفاتی نەکرد، و لەهەموو سەردەمەکاندا تا ڕۆژی دوایی ڕۆشنترین بەڵگەیە بۆ هەموو ئادەمیزاد، نەمریی وبەردەوامی ئەم موعجیزەیەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەم موعجیزەیە بەزانستی خودایی دابەزیوە، کە ئاگاداری نهێنییەکانی ئاسمانەکان وزەوییە، وەك دەفەرموێت:

---

١٣٦ ئم بابەتە بەهاوبەشی لەگەڵ (ئەندازیار خالید بەرزنجی) لە ژمارە (٦) و (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی گۆڤاری (ڕێگای شەرع)دا بڵاوکراوەتەوە.

﴿قُلْ أَيُّ شَيءٍ أَكْبَرُ شَهادَةً قُلِ اللهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذا القُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغ﴾ (الأنعام:١٩)، واتـه: بڵـێ چ شـتێك گـەورەترین شـایەتییە لەسەر ئەوەی تۆ لەلایەن خوداوە نێرراویت، پێیان بڵێ خودا ئـەو شـایەتیە دەدات بەوەی قورئانی بۆ نیگا کردووم، تا بەڵگە و ئینـزار بێـت بـۆ ئێـوە و ئەوانـەش کـە قورئانیـان پێـدەگات، واتـە سـەردەمانی دوای پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿لكن الله يشهد بما أنزل إليك أنزله بعلمه﴾ (النسـاء:١٦٦)، واتە: بەڵام خوای گـەورە شـایەتی دەدات کـە قورئـانی بـۆت دابەزانـدووە، بـەوەی زانسـتی خـودایی تێدایـە، ﴿قـل انزلـه الـذي يعلـم السـر في السـماوات والارض﴾ (الفرقان:٦)، واتە: ئەو کەسە قورئانی دابەزاندووە کە ئاگاداری هەموو نهێنییەکانە لە ئاسمان وزەویدا.

زانیارییـەکانی قورئـان، زانسـتی خـوداین، کـە ئاگـاداری نهێنییـەکانی هـەموو گەردوونە، بۆیە بەراود ناکرێت بە زانیارییەکانی مرۆڤ لە هەر سەردەمێکدا بێت، بە بـەراورد کردنـی جیاوازییـەکانی زانیـاریی مرۆڤـەکان و زانیارییـەکانی قورئـان، موعجیزە ڕۆشنەکە دەدرەوشێتەوە و ڕوون دەبێتەوە، چونکە ئـەم زانیارییانـە لـە سەرچاوەی مرۆییەوە نەهاتوون.

لەسەرەتای دابەزینی قورئاندا عـەرەب بـە ڕەوانبێـژی و ئەدەبیاتـەوە سـەرقاڵ بوبوون، بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز هەر بە کارەکـەی خـۆیـان تەحـەددای کـردن، بەجۆرێك ئەوەی وویژدان زیندوو بوو بەتەنها گوێ لێبوونی باوەڕی دەهێنا، ئەوەی ڕاستیشی نەوویستایە دەیوت ئەم وتانە جـادوو و سـیحرن، بێگومـان بـەکارهێنانی ووشەی (سیحر) بۆ قورئـان بـۆ خـۆی موعجیزەیـەکی ڕۆشـن بـوو، چـونکە پێشـتر ووشـەی سـیحر بـەکار نـەهێنرابوو بـۆ ووتـە وقسـەکردن، بـەڵام لـە هێـز و توانـای ووشەکانی قورئان و کاریگەریی لەسەر دڵی خەڵکی، نەیانـدەزانی چ وەسـفێکی بـۆ دانێن و چۆن دژایەتی بکەن، بۆیە بەناچاری ووتیان ئەم ووتانە سیحرن ! !

مـوعجیزەی قورئـان هێنـدە بـەهێزبوو بێبـاوەڕانی مەککـە هـیچ ڕێگەیـەکیان لەبەردەستدا نەمابوو تا بەرەنگاری قورئـان و موعجیزەکـەی ببنـەوە ئـەوە نـەبێت دەیـانووت: وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿وقالوا لا تسمعوا لهذا القرآن وألغوا فيه لعلكم تغلبون﴾ (فصلت:٢٦)، واتـە: کافرەکـان دەیـانوت گـوێ بـۆ ئـەم قورئانـە مەگرن و لەکاتی قورئان خوێندندا دەنگ بەرزبکەنەوە تا نەیبیسـتن! ! بـەڵکو بـەو جۆرە زاڵ ببن بەسەریدا! ئەوان دەیانزانی بـەس گـوێ لێبـوونی قورئـان ناچـاریان دەکات بە باوەڕهێنان، مەگەر زۆریان لە خۆیان بکردایـە یـان گوێیـان بئاخنیایـە و دەنگیان بەرز بکردایەتەوە تا گوێیان لێی نەبێت.

ئەمە لەو وڵاتانـەی عـەرەب بوون و بـە ئاسـانی لـە واتـا وڕەوانبێـژی قورئـان تێدەگەیشتن دیاربوو، هەرچی وڵاتانی دیکەشە کە بە ئاسانی ئیسلامیان وەرگرت هۆکەی هەر موعجیزە بوو، یەکێك لەو موعجیزانەش ئەو کتێبە ئاسمانیانە بـوو کـە لە بەردەستیاندا بوو و بـەردەوام دەیانخوێنـدەوە، کـە بـە ڕوونـی وەسـف و نـاو و ناونیشانی تـەواوی ئەو پێغەمبەرەی (صلى الله عليه وسلم) تێدابوو، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وإنه لفي زبر الأولين﴾ (الشـعراء:١٩٦)، واتـە: بـاس و ناونیشـانی موحەممەد لە پەڕاوە پێشینەکاندا هەیە.

کاتێك گەلانی خاوەن کتێب لەو سەردەمەدا دەیانبیست فریادڕەسێك بەڕێوەیـە ومرۆڤایەتی ڕزگار دەکات، هەمیشـە و بـەردەوام بـە تامەزرۆییـەوە چـاوەڕێی ئـەو ڕزگارکـەرە بـوون، تـا زووبێـت و ئیمـانی پێبێـنن و شـوێنی بکـەون، واتـە پێشـتر ئامادەباشـی دەروونییـان بـۆ شـوێنکەوتنی هـەبوو، یـەکێك لـەو خـاوەن کتێبانـە جوولەکـەکان بـوون، کـە بـەردەوام لـە پـەڕاوی تەوراتـدا باسـی پێغەمبـەری ئـاخر زەمانیان دەخوێندەوە و ناو و ناونیشـانیان بەدرێـژی بـۆ خـەڵك بـاس دەکـرد، بـە نموونە لە پێش جەنگـەکانیان دوعایـان دەکـرد و دەیـانوت: (اللـهم انصـرنا بـالنبي المبعـوث في آخـر الزمـان) واتــە: خودایـە بـەو پێغەمبــەرەی لـە کۆتـای زەمانـدا

دەینێریت سەرمانبخەیت، وە سروشتیان وابوو هەڕەشەیان لە دەور و پشتەکانیان دەکرد و دەیانووت نزیکە پێغەمبەری ئاخر زەمان بێت، ئەمەش ناو و ناونیشانەکەیەتی و ئێمەش یەکەمین کەسین شوێنی دەکەوین و بەهۆی ئەوەوە بەسەر هەمووتاندا سەردەکەوین.

بەلاَم کاتێك ئەو پێغەمبەرە ڕۆشنە هات، باوەڕیان پێنەهێنا و هەوڵی شاردنەوەی زانیارییەکانیان دەدا، ئەمەش تەنیا لەبەرئەوەی لە خۆیان نەبوو، هەرچەندە پێغەمبەریان وەك کوڕی خۆیان ناسیەوە و دڵنیا بوون ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە تەورات باسی کردووە، قورئان ئاشکرای کرد کە ئەوان وەك ڕۆڵەی خۆیان دەیانناسی وەك فەرموی: ﴿الذين آتيناهم الكتاب يعرفونه كما يعرفون أبنائهم﴾ (البقرة:١٤٦)، بەهیچ جۆرێکیش نکوڵیان نەکرد لەم ئایەتە کە نازانن ئەمە ئەوە یان ئەو نیە، بۆیە بەخێرایی هەوڵی شاردنەوەی زانیارییەکانی سەبارەت بە (موحەممەد) یان دەدا، بەلاَم شاردنەوەی زانیارییەکان تازە بێسوود بوو، چونکە ئەوەندە خەڵکی مەدینەیان پێ ترساندبوو، خەڵکەکە وەسفەکانیان لەبەر کردبوو، بۆیە خەڵکی مەدینە کاتێك هاتن بۆ مەککە و هەر کە پێغەمبەریان بینی وتیان: (والله إنه للنبي الذي توعدكم به اليهود فلا يسبقنكم اليه) واتە: سوێند بە خودا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکە هەڕەشەتان پێ لێدەکات، دە با ئەوان پێشمان نەکەون لە باوەڕهێنان پێی، ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی خەڵکی مەدینە ئاسانتر لە خەڵکی مەککە باوەڕی پێبێنن و بەکاتێکی کەم و بینینێکی کورت بە لێشاو بێنە بازنەی ئیسلامەوە.

ئەوەش جۆرێك بو لە موعجیزە کە تا ئێستاش موعجیزەیەکی ڕۆشنە و زیاتر خاوەن نامە و لێکۆڵەرەوان لە کتێبە ئاسمانیەکاندا ئەو هەقیقەتە دەزانن ﴿ويقول الذين كفروا لست مرسلا قل كفى بالله شهيدا بيني وبينكم ومن عنده علم الكتاب﴾ (الرعد: ٤٣) ...

ئاشكرایە قورئانی پیرۆز بە تەنها بۆ كۆمەڵێك نەهاتووە بەڵكو بۆ هەموو چین و توێژەكانی سەرزەوی بە هەمو ئاستە جیاواز و تەمەنەكانیانەوە هاتووە، بۆیە موعجیزەكەشی خوای گەورە بە جۆرێكی كردووە، تێگەشتنی بەس بێت بۆ هەموو خەڵكی، ئەویش بە هۆی بوونی زانیارییەكانی ناوی، كە زانیاریی خودایین، بەجۆرێك شوانێك لە دەشتێكدا و زانایەكی گەردوونی لەسەر تیلیسكۆبەكەیەوە، بەڵگەی تەواویان دەداتێ كە لەلایەن خوداوەیە، تەنها ئەوانە نەبێت كە بە دوای ڕاستیدا ناگەڕێن، و ئەگەر ڕێشیان لێی بكەوێت خۆیانی لێ لادەدەن و هەوڵی شاردنەوەی دەدەن.

قورئانی پیرۆز چەندین بواری زانیاریی لەخۆ گرتووە، كە تا كات بڕوات زانیارییەكانی زیاتر ئاشكرا دەبن، و مرۆڤەكان زیاتر لێی تێدەگەن، لەوانە دەرخستنی هەندێك نهێنییەكانی ڕابردوو، هەروەها دەرخستنی هەندێك لە نهێنییەكانی داهاتوو، هەروەها نزیكەی ١٣٠٠ ئایەت سەبارەت بە دیاردە گەردوونیەكان.

قورئانی پیرۆز بۆ خۆشبەختكردنی ژیانی خەڵكی هاتووە، چەندین فەرمانی تێدایە ئەگەر خاوەنەكەی جێبەجێییان بكات ئاسودەی هەردوو دونیا دەبێت، چەندین قەدەغەشی تێدایە هەر كەس خۆی لێ بەدوور بگرێت، خۆی لە خراپەی هەردوو دونیا پاراستووە، لەگەڵ ئەو فەرمان و قەدەغانەدا چەندین ئاماژەی گەردونی كردووە، تا خەڵكی بزانن ئەم پەرتوكە خوداییە وبۆ فەرمان وقەدەغەكانی گوێڕایەڵ بن، قورئان كتێبی ڕێنماییە، نەك كتێبێكی زانستی ڕووت كە خەڵك لێیەوە فێری هەموو زانستەكان ببن، ئەو زانیارییانەش كە تێیدایە بۆ ئەوەیە خەڵكی بزانن ئەمانە وتەی خودان.

لە ئاماژەكانی قورئان بۆ دیاردە گەردوونیەكان، چەندین نهێنی خراونەتە ڕوو، كە لە بەرچاوی چەندین نەوە و سەردەم شاراوە بوون، تاوەكو زانستی تاقیكاریی

هات و پـەردەی لەسـەر نهێنییـەکان هەڵدا و واتـای ئایەتـە قورئانیـەکانیش لەبـەر چاوی خەڵکیدا ڕوشـنتر بوونـەوە، بـەردەوامیش ئـەم حاڵەتـە دووبـارە دەبێتـەوە، بـەوەی بەپێشـکەوتنی زانسـتی زیـاتر ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ تێگەشـتن بـۆ ئایەتـە قورئانیـەکان زیـاتر دەبـن، بـەڵام لـە هـەر سـەردەمێکدا هێنـدە پـەردە لەسـەر نهێنییەکان لادەبرێن کە بەس بێت بۆ ئەوەی خەڵکی دڵنیابن لەلایـەن خوداوەیـە و باوەڕبێنن بە بەشەکەی تری کـە هێشـتا نهێنییـەکانی دەرنـەخراون، تێگەشـتن لـە هەموو زانیارییەکانی قورئان، پێویستی بە کات هەیە، هەندێکی لەسـەردەمی تـۆدا دەردەکەوێت، وهەندیکی تـری بـۆ نـەوەکانی داهـاتوو بـەجێ دەهێڵرێـت، لـە هـەر سەردەمێکیشـدا زانیارییـەکان پێگەشـتوو نـەبن و، هـەموو ڕووەکـانی دیاردەکـە دەرنەخرابێت لێکدانەوەی ئایەتە قورئانیەکەش پێگەشتوو نابێت، خوای گەورە لە بارەی ئەو کەسانەی کـە هێشـتا نـە زانیـاری تـەواویان بـە زانسـتەکە هەیـە، و نـە هێشتا دیاردەکە دەخراوە، بەڵام ئـەوان بـە درۆی دەخەنـەوە، دەفـەرموێت: ﴿بل كذبوا بما لم يحيطوا بعلمه ولما يأتيهم تأويله﴾ (يونس:٣٩).

لێکدانەوە بۆ ئایەتە گەردوونیـە قورئانییـەکان کـە پێویسـتی بـە زەمـەن هەیـە ڕاستیەکەی دەربکەوێت لە هەر سەردەمێکدا زانایانی باوەڕدار بـە هـەموو توانـا و ئیمکانیاتێـك کـە لەبەردەسـتیاندا بـووە، هـەوڵی لێکدانەوەیانـداوە، زۆرتـرین تێکۆشانیان لە پێناودا کردووە، تا لێی تێبگەن، بەڵام هەر کاتێك لێکدانـەوەکانیان بـە هـۆی زۆر پـەنهانی دیاردەکـە لا قـورس بووبێـت، وتویانـە بـەس خـودا خـۆی دەزانێت ئەمە چۆنە، وهەندێ جاریش خۆیان ڕاڤەیان بـەپێی تێگەشـتنی خۆیـان و توانا بەردەستەکانی ئەو کاتە بۆ کردووە، هیچ نەنگییەکیشیان لەسەرنییە، ئەگـەر لێکدانەوەکـەیان زانسـتی ڕاسـت نـەبووبێت، چـونکە چـۆنێتیەکەیان نـەزانیوە، و هێشـتا زانسـت بابەتەکـەی ڕوون نـەکردبووەوە وەك ئێسـتا لای ئێمـە هەنـدێکی ڕوونە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی تەفسیری نەکردبوو،

ئەوەش دیارە لەبەر حیکمەتێکی زۆر گەورە بوو، کە یان پەروەردگار فەرمانی پێکردبوو، یان خۆی بە باشی زانیبوو، کە بەجێی بێڵێت بۆ زەمەنەکانی داهاتوو، چونکە ئەگەر لێکدانەوەکانی بە پێی عەقڵ و ژیری ئەو سەردەمە بکردایە، ئەوا سەردەمەکانی دواتر پێی ڕازی نەدەبوون، وئەگەر بە پێی سەردەمانی داهاتوو زانستەکانی شیبکردایەتەوە، سەردەمەکانی ئەو کاتە پێی ڕازی نەدەبوون، بۆیە بۆ خەڵکی بەجێهێڵا.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستیدا نهێنییەکان ئاشکراتر دەبن، لەبەر ئەوە خیتابی قورئان بە پێی ئاستی تێگەشتنەکانە، وازهێنان لە بابەتە زانستییەکان بۆ کاتێك کە ژیرییەکان بە تەواوی کراوەتەوە و ئامادەیی تێدایە زۆر بەجوانی ئەو زانیارییانە وەربگرێت، کە لەسەرووی ئاستی ژیریی مرۆڤایەتییەوە بووە پێشتر، حیکمەتێکی خودایی تێدایە کە هەر خۆی باشتر دەزانێت، لە بارەی تەفسیری ئایەتی: (الذي خلق سبع سماوات ومن الأرض مثلهن) پرسیار لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس کرا، لە وەڵامدا ووتی: (وما يؤمنك أني إن أخبرتك بتفسيرها، كفرت؟! فإنك تكذب بها، وتكذيبك بها كفرك بها) (تەفسیری طەبەری: ١٥٣/٢٨)، (تەفسیری ئیبن کەسیر: ٣٦٨/٤)، واتە: گرەنتی چیە ئەگەر تەفسیرەکەیت پێ بڵێم، باوەڕی پێ دەکەیت؟ خۆ ئەگەر بە درۆی بزانیت، واتە بێباوەڕ بوویت پێی.

ئەو کاتەی قورئانی پیرۆز دابەزی، دنیا پڕبوو بوو لە نەزانی و دواکەوتنی زانستی، ئەگەر بیری یەکتاپەرستی لەسەرەتای بانگەوازەکەوە، کەوتە بەر ڕەخنە و بەسەرسوڕمانەوە دەیانوت، ئەو هەموو خودایەی تر واز لێبێنین؟! (قالوا أجئتنا لنعبد الله وحده ونذر ماكان يعبد آباؤنا) (الأعراف:٧٠)، بۆ ئەمە وابوون، ئەی سەرەنجامی باسکردنیووردەکارییە زانستییەکان چۆندەبوو؟ بێگومان بەرەو ڕووی ڕەخنەی زۆر توند دەبوویەوە، چونکە بیری ئەو کاتە هیچ ڕاستییەکی زانستی وەرنەدەگرت، زانیارییان بە لێکدانەوە گەردوونیەکان بە هیچ جۆرێ

نەبوو، ئاشکراشە هەمیشە موعجیزەی پێغەمبەران لەگەڵ باوی سەردەمەکاندا بووە، ئەوەش لەبەرئەوە بووە تا ببێتە بەڵگەیەکی ڕۆشن بۆیان.

خوای گەورە موعجیزەی پێغەمبەرێکی نەکردوّتەوە شتێك کە خەڵکی ئەو کاتە لێی تێنەگەن، بۆ نموونە لە سەردەمی سەرورمان مووسا پێغەمبەردا -دروودی لەسەر بێت- بایەخێکی زۆر بە "سیحر" دەدرا، بۆیە خوای گەورە موعجیزەیەکی وای بەم پێغەمبەرە پایەدارە بەخشی کە ئەو سیحرەی مایەی شانازیی میسرییەکانی ئەوسا بووە و بایەخیان پێداوە، پووچەڵ بکاتەوە و بەسەریدا زاڵ ببێت، ئەوەبوو گەورە ساحیرانی ئەو دەمە کە بۆ ئەوە هاتبوون دەعوای ئیعجازی مووسا پێغەمبەر -دروودی لەسەر بێت- هەڵبووەشێننەوە، هەر هەموویان لەمەیدانی پێشبڕکێدا سەری سوژدەیان بۆ خوای گەورە نایە سەرزەوی و موسوڵمان بوون وهاتنەسەر ئایینی (مووسا)، چونکە بۆیان دەرکەوت ئەوەی کە مووسا -دروودی لەسەر بێت- دەیڵێت و پێشچاوی دەخات گەلێ بەرزترە لە "سیحر" کە ئەوان خۆیان تیایدا پسپۆڕ و شارەزان و بایەخی پێ دەدەن.

لە سەردەمی حەزرەتی عیساشدا -دروودی لەسەر بێت- "پزیشکی" بایەخی پێدەدرا و شارستانێتیی ئەو ڕۆژگارە گەلێ شانازیی پێوە دەکرد، لەبەرئەوە خوای گەورە موعجیزەیەکی وای پێبەخشی کە دەستەوسانیی نەیارەکانی دەربخات و لە رووی "پزیشکی"یەوە بەسەر گرنگترین و بە برەوترینی شتانی ئەو ڕۆژگارەدا زاڵ ببێت، بەڵکو ئەم پێغەمبەرە سەرورە -دروودی لەسەربێت- لە ئاستێکی گەلێ بەرزتری پزیشکییەکەی ئەوانەوە موعجیزەی پێشکەش دەکرد، وەك قورئان دەیگێڕێتەوە: ﴿وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبرَصَ وَأُحيِي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ﴾ (آلعمران: ٤٩). واتە: کەسانی کوێر گولی چاککردووەتەوە و مردووی زیندوو کردووەتەوە (بەفەرمان و ڕێگەپێدانی خودا)، کە تەنانەت پزیشکیی ئێستاش ناتوانێت ئەنجامی بدات!

جا هەروەك موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو لە "شێوە" یان لە "ڕەگەز"ی ئەو جۆرە هونەر وزانست وشتە باوانەی ڕۆژگاری خۆیان بووە، پێغەمبەری سەروەریشمان -درودی لەسەر بێت- کاتێ کە خوای گەورە ناردی وکردی بەدواهەمین پێغەمبەر، گرنگترین هونەر کە لەناو نەتەوەی عەرەبدا بایەخی پێدەدرا ڕەوانبێژی و ڕەوانگۆیی بوو، چونکە لەبەرئەوەی نەتەوەیەکی نەخوێندەوار بوون نەیاندەتوانی ڕووداوەکانیان بە نووسین تۆمار بکەن، ناچار بەشیعر و بەووتاری جوان تۆماریان دەکردن و لە پێشینانەوە هەڵیان دەگرت و لەو ڕێیەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان دەگواستەوە و لەتیاچوون و فەوتان ڕزگاریان دەکرد، لەبەر ئەم پێویستییە سروشتییەی خۆیان، بایەخێکی گەلێ زۆریان بە "ڕەوانبێژی" دەدا و لەم ڕێیەوە بازاڕی ڕەوانبێژی برەوی تەواوی پەیدا کردبوو، هەروەك گەورە ئەدیبی سەردەم: "مصطفى صادق الرافعي" دەڵێت: (دەوڵەتی ڕەوانبیژی لەناو عەرەبدا دامەزرابوو، بەڵام پێویستی بە پادشایەك هەبوو بڕواتە سەر تەختی ئەو دەوڵەتە و تاجی پادشایی بکاتە سەری، ئەو پادشایەش تەنها هەر قورئانی پیرۆز بوو کە هات ئەو تاجەی کردە سەری و بوو بە پادشای سەر تەختی دەوڵەتی ڕەوانبێژی!).

لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز لەو شتانەی ئەوان تێی ناگەن دوور کەوتۆتەوە و پێغەمبەر -درودی لەسەربێت- هەموو ئایەتەکانی شینەکردۆتەوە و تەفسیری زۆرێك لە ئایەتەکانی بۆ کات بەجێهێشتووە، بۆ ئەو کاتەی خەڵکی ئامادەی قبوڵکردنی دەبن، لە ڕاستیدا ئەوان لەو شتانەی تێیدەگەشتن بەدرۆیان دەخستەوە، ئەی بۆ ئەوە چۆن دەبوون کەلێی تێناگەن؟ ﴿بل كذبوا بما لم يحيطو بعلمه ولما يأتهم تأويله﴾ (يونس:٣٩).

نموونەیەك دێنینەوە لەسەر ئەوە کە (ئیسرا ومیعراج)ە: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵەکەی بڵاوکردەوە چۆن بەرەنگاری بوونەوە، و بە

گاڵتەجاڕییەوە دەیانووت: وەرن بزانن هاوەڵەکەتان چی بەسەر هاتووە و چی دەڵێت؟! دەڵێت لە بەشێکی ئەمشەودا سەردانی (بیت المقدس)م کردووە و لەوێوە هەموو ئاسمانەکان گەڕاوم، لە کاتێکدا ئێمە بە مانگێك دەچینە (بیت المقدس) و بە مانگێکیش دەگەڕێینەوە، لەم گاڵتە کردنەدابوون، هەندێکیان ژیرتر بوون، ووتیان ئێستا کاتی گاڵتەکردن نییە، پێویستە ئەم هەلە لەدەست نەدەین، بیخەینە قاڵبی جددیاتەوە، چونکە دینەکەی شوێنکەوتەی زۆر بووە ولە زیادبووندان پێویستە ئەمە ڕاگرین، بۆیە یەکێك هاتە پێشەوە و لەڕووی جددیاتەوە ووتی: ئەی موحەممەد ئێمە دەزانین ئەمشەو چوویت بۆ (بیت المقدس)، بەلام پرسیارێکمان لێت هەیە: ئەگەر چووبیت بێگومان ئێستا دەزانیت (بیت المقدس) چۆنە و شێوەی پێکهاتن و دیوار و سەقف و شتەکانی تری چۆنن، ئایا دەتوانیت بۆمان وەسف بکەیت؟

لێرەدا پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) کەوتە بەر تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە، چونکە ئەو لە (بیت المقدس) سەرقاڵی خۆ ئامادەکردن بوو، بۆ چوونە ئاسمانەکان و حزوری پەروەردگاری (جل جلالە)، خۆی خەریك نەکردبوو بە سەیری دار و دیوارەکەیەوە، بۆیە وەلامەکەی لا قورس بوو، بەلام ئایا پەروەردگار وازی لێهێنا؟ بێگومان نەخێر (بیت المقدس)ی هێنایە پێش چاوی، تا سەیری کردوو دەستیکرد بە وەسفکردنی بەرد بە بەردی، وەسفەکان هێندە ووردبوون، خۆشیان کە چەند جار چوبوون نەیاندەتوانی بەو جۆرە وەسفی بکەن، ئەوەی ویستی ئەم هەلە بقۆسێتەوە، و پێغەمبەر بە درۆبخاتەوە بەسەر خۆیا شکایەوە و ئەوەندەی تر خەڵك دڵنیابوون کە هەواڵەکە ڕاستە، لەوێدا یەکێکی تر هەوڵیدا بە پرسیارێکی تر ئالای کافرەکان هەڵبگرێتەوە و بەڵکو پێغەمبەر بەدرۆ بخاتەوە، هەستاو ووتی: ئەی موحەممەد ئێمە قافڵەیەکمان چووە بۆ فەلەستین، ئایا دەزانیت ئەو قافڵەیە چۆنە و کەی دەگەڕێنەوە، لە وەلامدا پێغەمبەر (صلی الله

علیه وسلم) زۆر بەڕوونی شوێنی قافڵەکەی پێوتن لە کوێدایە و بە ووردی وەسفی قافڵەکەی بۆکردن، هەواڵیشی پێدان فلاَنە ڕۆژ دەگەنەوە ئێرە، دوای ئەوە خەڵکی چاوەڕێی مەوعیدەکەی پێغەمبەر بوون، هەتا ئەو ڕۆژە نەڕۆشت قافڵەکە دەرکەوت و بەو شێوەیەی وەسفی کردبوو هاتنەوە شاری مەککە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆری تر بێنە بازنەی ئیسلامەوە و باوەڕدارانیش بەم ڕووداوە هێندەی تر ئیمانیان پتەوتر بوو.

ئەمە سەبارەت بە ڕووداوی ئیسراو میعراج، چۆن بەرەنگاری هەواڵەکە بوونەوە، دواتر بەو شێوەیەی باسکرا خەڵکی دڵنیابوون ئەوەی پێغەمبەر باسیکرد ڕاستییە، بەلاَم لە باسکردنی زانست و گەردووندا و لێکدانەوەی ئایەتەکان بەو شێوە زانستییەی ئێستا چۆن دڵنیا دەبوون و تێدەگەشتن؟ تاوەکو پێشکەوتنی زانستی بە هەزاران ساڵ دوای ئەوە نهێنییەکان و تێگەشتنە قورسەکانی لەسەر هزری خەڵکی ئاسان کرد و بە ئاسانی وەریان گرت.

ئیعجازی ووشەکانی قورئان بە جۆرێکە کە ڕاستییە زانستییەکەی وەك هەقیقەتی بوونەکەی باسکردووە، واتە لە دوو توێی ووشەکانیدا بە کورتترین دەستەواژە و ئاسانترین دەربڕین چەندین ڕووی نهێنیەکانی خستۆتەڕوو، بەلاَم کاتێك تەفسیرزانێك تەفسیری ئایەتەکەی کردووە، زانیویەتی ئەو ووشەیە لە زمانی عەرەبیدا بە واتای چی دێت، بەلاَم ئەگەر بەو شێوەیەی کە واتای ڕاستەقینەی ووشەکەیە و عەرەب بەکاریهێناوە، بەو شێوەیە لێکی بدایەتەوە نەخۆی لێی تێدەگەشت، و نە خەڵکیش دەیانزانی باسی چی دەکات، بۆیە بەپێی زانیارییە کەم و کورتەکانی ئەو کاتە، ئەوپەڕی هەوڵیداوە نزیکترین تەفسیر لە ڕاستییەوە پێشکەش بکات، زۆر جاریش ڕاستیەکانیان وەك خۆی پێکاوە و هەقیقەتەکانیان وەك ئەوەی بینیبێتیان دەرخستووە، نمونەش لەسەر ئەوە زۆرن، بەلاَم کە هەندێك جار نەیانتوانیوە ڕاستیی واتاکە وەك خۆی بگەیەنن، ئەمە واتای ئەوە نیە

که قورئان هەر دەبێت بە پێی ڕای ئەو تەفسیرزانە ڕاڤە بکرێت، ئـەگینا لـە واتـای ڕاستەقینەی خـۆی لامـان داوە، و بڵـێین مـادام ئـەوان بـەو شـێوەیە تەفسـیریان کردووە، ئێمەش دەبێت هـەروا تەفسـیری بکـەین، بێگومـان ئـەو تەفسـیرزانە لـەم سەردەمەی ئێستادا بوایە کە نهێنیەکانی دیاردەکە بە ڕوونی دەرخـرابن، لـە ئێمـە باشتر واتای زانستی ئایەتەکەی شیدەکردەوە.

لێرەوە دەردەکـەوێت باسـکردنی واتـا و ڕاڤـەی هەنـدێ ئایـەتی گـەردوونی کـە پڕبوون لە نهێنی لەلایەن هەندێ یـان زۆر لـە تەفسـیر زانـانی ئـەو سـەردەمانە کـە پـەردە لەسـەر نهێنییـەکان لانـەبرابوون، لـە مـوعجیزەی قورئـان کـەم ناکاتـەوە، چونکە قورئان وەك خۆی دیاردەکەی باسـکردووە و ئـەو ووشانەشـی بـەکارهێناوە کە زۆربەی ڕاستییەکانی نهێنیەکان دەربخـات، ووتـەی ئـەو تەفسـیر زانانـەش کـە هەنـدێ جـار توانـای لێکدانـەوەی تـەواویان نـەبووە، نابێتـە تەفسـیری قطعـی بـۆ ئایەتەکە، ئەگەر وا بوایە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) خۆی ڕاڤەی دەکرد!.

کەم و کورتیەکە لە واتا و ووشەکانی قورئاندا نیـە، بـەڵکو لـە لێکدانـەوەی ڕای تەفسیر زانەکانە، کە وەك ووتمان هیچ گلەییەکیان لەسەر نیە، و ئەوپـەڕی توانـای خۆیان بەکارهێناوە، بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکە.

پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، دوعای بۆ (عبدالله ی کـوڕی عـەبباس) کـرد و فەرمووی: (اللهم فقه في الدين وعلمه التأويل) (ئیمام ئەحمەد لە موسنەددا: بەرگی ١/لاپـەڕە٢٦٦)، و ڕسـتەی یەکـەمی لـە (صـەحیحی بوخـاری: کیتـابی (الوضـوء) ژمارە: ١٤٣) گێڕاویانەتەوە، واتە: خودایە لە دینی بگەیەنـە و (تأویـل)ی فێربکـە، (تأویل) لێرەدا بە واتای زانینی واتاکانی کە قورئانی پێدابەزیوە، واتە تێگەشتن لە ووشـە و دەربڕینـەکان، پێکهاتـەی ڕسـتەکان، چـونکە قورئـان زمـانی عـەرەبی فەصیحە (ڕەوانە)، (قرآناً عربياً غيرَ ذِي عِوَج) (الزمر: ٢٨)، لای تـەفسیر زانەکانیش هەندێك جار بە (أهل التفسـير)یان وتـووە (أهـل التأويـل)، بـەلام ووشـەی (تأویـل)

بەواتای هاتنە دی (التحقق والوقوع) یش هاتووە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (بل كذبوا بما لم يحيطو بعلمه ولما يأتهم تأويله)(یـونس:٣٩)، لێرەدا واتـە هێشـتا هـەواڵی دەرخستنەکەی نەهاتووە، بەڵام ئەوان بە درۆی دەزانن، پێغەمبەر یوسف (صەڵات و سەلامی لێبێت) دوای ئەوەی خەوەکەی هاتە دی فەرموی: (هذا تأويل رؤياي من قبل) (یوسف: ١٠٠)، واتە: ئەمە هاتنەدی خەوەکەی پێشوومە.

تەفسیر زانـەکان لـە لێکدانـەوەی ووشـە و ڕاڤـەی ئایەتـەکان، شـارەزا بـوون، ئایــەتێك نــەماوە ڕاڤــەی بــۆ نەکــەن، بــەڵام ســەبارەت بــە چــۆنێتیەکەی و ووردەکارییەکانی هەندێ ئایەتی قورئان کە باسی لە نهێنیەکانی گەردون کـردووە، شارەزایی تەواویان نەبووە، هـەروەك تـا ئێسـتاش چـەندین ئایـەتی قورئـان هەیـە ئێمەش شارەزایی تەواومان دەربارەی نیە، چونکە هێشتا نەبوونەتە بینراو بۆمان.

ئەگەر ئێستا ئایەتێك هەبێت زاناکانی ئێستا ڕوونتر و ڕاستتر تەفسیری بکـەن، ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت ئێمـە یـان زانایـانی ئـەم سـەردەمە زانـاترن وباشـترین لـە زانایانی پێشتر، چونکە ئێمە زانیارییەکانمان لەوانەوە وەرگرتووە، تـەنها ئەوەنـدە هەیە ئێمە هەقیقەت و چۆنێتی و ووردەکارییەکانیمان دیوە، ئەمە وەك ئـەوە وایـە کەسێك دەچێتە شوێنێکی نیمچـە تاریکـەوە، و یـەکێکی تـر پێـی دەڵێـت وەسـفی شـوێنەکەم بـۆ بکـە ئـەویش ئەوەنـدەی ببینێـت هـەوڵی وەسـف کردنـی دەدات، پاشان ژوورەکە ڕووناك دەکرێتەوە و شتەکان لەبەردەمیا ڕۆشن دەبێتەوە، ئەگـەر منداڵێکیش بێت وەسفی بکات لە کەسی پێشتر باشتر وەسفی دەکات، ئەمە ئـەوە ناگەیەنێت منداڵەکە شارەزاترە لە کەسی پێشوو.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (لكل نبأ مستقر وسوف تعلمون) (الأنعـام:٦٧)، (ئیبن جەریری طـبري) لـە تەفسـیرەکەیدا دەڵێـت: (لكـل خـبر مسـتقر: يعـني قـرار يستقر عنده ونهاية ينتهـي إليهـا فيتـبين حقـه وصدقه مـن كذبـه وباطلـه (وسـوف تعلمـون) يقـول وسـوف تعلمـون أيهـا المكـذبين بصـحة مـا أخـبركم بـه) (بڕوانـە:

تەفسیری طـەبـەری بـەرگی٧/لاپـەڕە ٣٢٧)، واتـە: بـۆ هـەموو هـەواڵێك واتایـەكی جێگیر هەیە، بەجۆرێك لە كۆتاییدا واتاكەی جێگیر دەبێت، ئەوكاتـەش هـەقێتی و ڕاستێتیەكەی ڕوون دەبێتەوە، وبە بێبـاوەڕان دەفـەرموێت: لـە داهـاتوودا دەزانـن ڕاستێتی هەواڵەكانی.

هەروەها (ئیبن كەسیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (قال إبن عباس وغير واحد أي لكل نبأ حقيقة، أي لكل خبر وقوع ولو بعد حين، كما قال تعالى: (ولتعلمن نبأه بعد حين) ( تەفسیری ئیبن كەسیر بەرگی٢/لاپـەڕە٢٣)، واتـە: ئـیبن عـەبـاس و كەسانی تریش ووتویانە: بۆ هەموو هەواڵێك هەقیقەتێك هەیە، واتە هەموو هەواڵێك هاتنەدی هەیە، ئەگەر دوای ماوەیەكیش بێت.

لەبەرئەوە تەفسیر زانانی پێشین دەیانزانی بەڵێنی خودای گەورە دێتەدی و لـە داهاتوودا تەفسیری ئایەتەكان باشتر دەكرێن، (ئیبن حەجـەر) لـە (فـتح البـاري)دا ڕاڤەی فەرموودەی پێغەمبەر (صەلات و سەلامی لێبێت) دەكات كـە فەرموویـەتی: (ما من الانبياء نبي إلا أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيته وحيا أوحاه الله إلي فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة) (صـحيح البخـاري: كتاب فضائل القـرآن مـع شـرحه فـتح البـاري ٩/٣-٧)، واتـە: (هـیچ پێغەمبـەرێك نەهاتووە، خوای گەورە بەڵگەی ڕوشـنی نـەدابێتیّ و تـا خـەڵكی بـاوەڕی پێبێـنن، بەڵام ئەو بەڵگەیەی دراوە بە من ئەم نیگایەیە كـە خـوا بـۆی كـردووم، هیواخـوازم من زۆرترین شوێنكەوتەم هەبێت بە هۆی ئەم بەڵگەیەوە).

(ئیبن جەریر) لە ڕاڤەكەیـدا دەڵێـت: (ومعجـزة القـرآن مسـتمرة إلى يـوم القيامـة، وخرقه للعادة في أسلوبه وبلاغته وإخباره بالمغيبات ، فلا يمر عصر من الأعصار إلا ويظهر فيه شيء مما أخبر به أنه سيكون يدل على صحة دعواه، فعـم نفعـه مـن حضر ومن غاب ومن وجد ومن سيوجد)، واتـە: مـوعجیزەی قورئـان و دەرئاسـایی لەشێواز و ڕەوانبێژی و هەواڵدانێتی بەنهێنیەكان، كـە تـا ڕۆژی دوایـی بەردەوامـە،

وهیچ سەردەمێك لە سەردەمەكان ناڕوات، ئەو هەواڵانەی داویەتی بۆ داهاتوو دەرنەكەوێت، ئەوەش دەبێتە ڕاستێتی بانگەشەكەی، لەبەرئەوە سوودەكانی گشتییە بۆ ئامادەبوان و غائیبان و ئەوەی هەیە و ئەوەی دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق) (فصلت:٥٣)، واتە: لە داهاتوودا نیشانە و بەڵگەكانی خۆمان لە ئاسۆكان و خۆیاندا پیشاندەدەین، هەتا بۆیان ڕوونبێتەوە ئەم قورئانە هەقە و لەلایەن خوداوە هاتووە.

وشەی (آفاق) بەواتای هەموو گەردوون دێت: (وقال عطاء وابن زيد أيضا: في الآفاق يعني أقطار السماوات والأرض من الشمس والقمر والنجوم والليل والنهار والرياح والأمطار والرعد والبرق والصواعق والنبات والأشجار والجبال والبحار وغيرها، وفي الصحاح: الآفاق: النواحي) (تەفسیری طبری).

ئەمە بەڵێنی خودایە (سبحانه وتعالى)، كە ئەم موعجیزەیە بەردەوام لە تازەبوونەوەدایە و هەمیشە شایەتی دەدات كە لەلایەن خوداوەیە، تەفسیر زانەكان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وفي أنفسهم﴾ دەڵێن:

– (شەوكانی) دەڵێت: (سنريهم صدق دلالات صدق القرآن، وعلامة كونه من عند الله في الآفاق وفي أنفسهم)، واتە: لە داهاتوودا ڕاستێتی ئاماژەكانی قورئانی پیرۆز و بەڵگەی ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووە، لە ئاسۆكان و لە خودی خۆیاندا پیشان دەدەین ( فتح القدير ٤/٥٢٣).

– (ئیبن كەسیر) دەڵێت: (أي ستظهر لهم دلالاتنا، وحججنا، على كون القرآن حقاً منزلا من عند الله، على رسول الله بدلائل خارجية في الآفاق)، واتە: لە داهاتوودا بەڵگەكانمانیان بۆ دەردەخەین لەسەر ئەوەی قورئان هەقە و لەلایەن پەروەردگارەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر، بە بەڵگەی دەرەكی لە ئاسۆكاندا (تەفسیری ئیبن كەسیر ٤/١٥٧).

- (زەمەخشەری) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ومعناه أن هذا الموعود، من إظهار آيات الله في الآفاق، وفي أنفسهم سيرونه ويشاهدونه، فيتبينون عند ذلك أن القرآن تنزيل عالم الغيب، الذي هو على كل شيء شهيد، أي مطلع ومهيمن، يستوي عنده غيبه وشهادته، فيكفيهم ذلك دليلاً على أنه حق وأنه من عنده)، واتە: (واتای ئەوەیە ئەم بەڵێنپێدراوە لە دەرخستنی ئایەت و بەڵگەکانی خودا لە ئاسۆکان و لە خۆیاندا لەداهاتوودا دەیبینن و تەماشای دەکەن، ئەوکاتە بۆیان ڕووندەبێتەوە و دەسەلمێت قورئان دابەزێنراوی جیهانی غەیبە، کە بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە، واتە غەیب و پەنهانەکان و ئاشکراکانی لەلا وەکو یەکە، ئەوەش بەسیان دەبێت بۆ ئەوەی بیبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە قورئان هەقە و لەلایەن پەروەردگارەوەیە) (الكشاف ٣/٣٩٦).

- ئەبولعەبباس (ئیبن تەیمیە) لە فتواکانیدا دەڵێت: (وأما الطريق العياني: فهو أن يرى العباد من الآيات الأفقية والنفسية، ما يبين لهم أن الوحي الذي بلغته الرسل عن الله حق، كما قال تعالى :﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾)، واتە: (ئەوەی ڕێگای بەرچاوە ئەوەیە کە بەڵگە و ئایەتە گەردوونیەکان و مرۆییەکان پیشانی بەندەکان دەدرێن، کە بۆیان ڕوون دەکاتەوە ئەو نیگایەی گەشتووە بە پێغەمبەران لە خوداوە بووە، وەك دەفەرموێت: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق) (فصلت:٥٣).

لەمەوە دەردەکەوێت کە بەڵگە و موعجیزەکانی قورئان سەردەم لە دوای سەردەم نوێ دەبنەوە، بەڵێنی خودایە و پێشینانمان و تەفسیر زانانیش باش ئەوەیان زانیوە و دڵنیابوون لەو پێشبینییەی کە بەهۆی دەرخستنە گەردوونیەکان لە ئاسۆکان و لە خودی خۆیاندا ڕاستێتی و هەقێتی قورئان بۆ بێباوەڕان ڕوون و ئاشکرا دەبێت.

بۆیە ئیعجازی زانستیی قورئـان شـتێکی لـە ناکـاو نـەبوو، بـەوەی موسـوڵمانان پێشـتر چـاوەڕێیان نــەکردبێت و نــەیانزانیبێت بــەڵکو قورئــان بــەڵێنی پێــدابوو، هەروەها پێغەمبەر (صـلی الله علیـە وسـلم) بەڵێنیـدابوو و تەفسـیرزانەکانیش لێـی تێگەشتبوون، لەبەرئەوە ئیعجازی زانستی هاتنەدی بەڵێنەکەی خودا بووە.

دکتۆری بەناوبانگی فەڕەنسی (مۆریس بوکای) وویسـتی لێکۆڵینـەوە بکـات لـە قورئان و ئینجیل و تەورات، سـەرەتای لێکۆڵینەوەکـەی پرسـی: ئایـا لـە قورئانـدا باس لە دیاردە گەردونیەکان کراوە؟ لە وەڵامدا پێیان ووت: بـەڵێ زیـاتر لـە هـەزار ئایەتی قورئان باسی لەو دیاردانە کردووە، لە هەموو بـوارە جیاجیاکـانی زانسـتدا، ووتی: کەواتە من پێـوەرێکی مـاددیم بەدەسـتەوەیە، دەتـوانم بیسـەلمێنم قورئـان لەلایەن خودای گەورەوەیە یان هی خودی موحەممەد خۆیەتی.

وتی: مادام قورئان چـوّتە نـاو باسـی زانسـتە جیاجیاکانـەوە، بیگومـان ئەگـەر وتەی موحەممەد خۆی بێت، زانستەکانی ئەو کاتەی تیـا ڕەنگدەداتـەوە، سـەرەتا لێکۆڵینـەوەی لـە توانـا و زانیـاری ئـەو سـەردەمە کـرد، بینـی خـودی پێغەمبـەر نەخوێنـدەوار بـووە، پاشـان ئـەو ژینگەیـەی تیایـدا ژیـابوو بەهـەمووی حەڤـدە خوێنـدەواری تێـدابووە، ئـەوەی لـەو کاتـەدا سوارچـاکی و خوێنـدەواری بزانیایـە پێیان دەووت (الکامل) واتە: تێر و تەواو، ئەو ژینگەیەی ئەوی تیا ژیابوو دووربـوو لـە شارسـتانیەتەوە، لێکدانـەوەیان بـۆ دیـاردە گەردوونییـەکان نـەبوو، ئەگـەر هەشیانبوایە لەسەر بنەمای ئەفسانەو ئەستێرەگرەوە و فاڵچیەکانەوە بوو، پاشان (مۆریس بوکای) بەردەوام بوو لە لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە شارسـتانیەتەکانی ئـەو کاتـە، ئایـا لـە چ ئاسـتێکی زانسـتیدا بـوون؟ ئایـا توانیبویـان ڕووداوە گەردوونیەکان وەك خۆی لێکبدەنەوە و باسی بکەن؟

پێشکەوتووترین شارستانیەتی ئەو کاتە میسرییەکان و یۆنانیەکان و چینیەکان بـوون، یۆنانیـەکان لەبـەر بێدەسـەڵاتیان لـە لێکدانـەوەی دیاردەکانـدا بـۆ هـەر

دیاردەیەك خوایەكیان دانابوو، خوای باران بارین، خوای هەور، خوای ڕەشەبا و...تاد، هەرچی میسرییەكانیش بوو هەركات لافاوی نیل بهاتایە دەیانووت: ئەوە خوای نیل لە ناو ئاوەكەدا داوای بوكێكمان لێدەكات، بۆیە كیژێكی جوانیان دەرازاندەوە و بەبووكی هەڵیاندەدایە ناو ئاوەكەوە، تا لافاوەكەی بنیشێنێتەوە !.

چینیەكان لە هۆكاری هەورە گرمەدا دەیانوت خواكان كە تووڕەدەبن تەپڵ لێدەدەن، ئەو هەورە گرمەیەش ئەوەیە، شارستانیەتی ڕافیدەین بەلێدانی قامچی، و لای ئەرستۆ بە بای توند لێكدراوەتەوە، هەروەها لەبارەی هەورە بروسكەوە چینیەكان بە جوڵاندنی ئاوێنە لەلایەن خواكانیانەوە لەبەرامبەر تیشكی خۆردا لێك دەدایەوە، و لای یۆنانیەكان بە بریسكانەوەی ئاو لێكیان دەدایەوە[137].

هەرچی عەرەبەكانیشە لێكدانەوەیان زۆر كەمبوو بۆ دیاردەكان، چونكە دووربوون لە شارستانیەتی و وولاتەكەشیان وشكە بیابان و كەم باران بوو، لەمەوە (مۆریس بوكای) تێگەشت لێكدانەوەكانی ئەو كاتەی قورئانی تێدا دابەزی لێكدانەوەی ڕاست نەبوون و لەسەر بنچینەی خورافە بنیات نرابوون، لەپاش ئەمە هاتە سەر لێكۆڵینەوە لە قورئان و لەو دیاردە زۆر و جۆرا وجۆرانەی قورئانی پیرۆز باسی لێوە كردووە، پاشان بەراوردی كرد بە كتێبی تەورات و ئینجیل، سەرەنجامی ١٠ساڵ لێكۆڵینەوە (موریس بوكای) موسوڵمان بوو، و كتێبێكی بڵاو كردەوە لەسەر هەماهەنگی زانستەكانی قورئان و زانستی نوێ بە بەراورد لەگەڵ تەورات وئینجیلدا، ئەمەش لینكی دابەزاندنی كتێبەكەیەتی بە ئنگلیزی و بەعەرەبی:

http://www.saaid.net/book/open.php?cat=92&book=1494
http://www.4shared.com/file/194151243/6d7ff00b/_.html

---

137 Frisinger, H.H. The History of Meteorology to 1800. History Monograph Series. New York: American Meteorological Society ، Science History Publications.

لێرەدا ئەگەر یەکێك بڵێت لە پێش ئیسلامدا زانایەك هەبووە ئەو ڕاستیە گەردونیەی باسکردووە، لە وەڵامدا دەڵێین ئەگەر شتی واش هەبووبێت، ئەو بیروباوەڕە ڕای هەموو خەڵك و زاناکانی ئەو سەردەمانەی لەسەر نەبووە، وئەگەر ئەو زانایە لە لێکدانەوەی شتێکدا پێکابێتی بێگومان لە زۆرینەی شتەکانی تردا نەیپێکاوە، چونکە وەك ووتمان گەورەترینی شارستانیەتەکانی ئەو کاتە لێکدانەوەکانیان بۆ دیاردە گەردوونیەکان دووربووە لە ڕاستییەوە، تەنانەت فەیلەسوفەکانیش زۆرینەی لێکدانەوەکانیان هەڵە بوون.

ئینجا ئەگەر لە هەر وولاتێکیش کەسێك هەبووبێت هەندێ زانیاری ڕاستی بۆ لێکدانەوە گەردوونیەکان وتبێت، چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زانی تەنیا ڕای ئەو زانایە ڕاستە و هەموو زاناکانی تر هەڵەن؟! ئایا پێغەمبەر پەیوەندی هەبووە لەگەڵ هەموو زاناکانی ئەو کاتەدا؟! ئایا بەردەوام خەڵکی ناردووە پەیوەندی بکات بە زاناکانی ئەو کاتەی جیهانەوە لە هەموو شوێنێکی زەوی، تا زانیارییەکان هەمووی کۆبکاتەوە و ڕا جیاوازەکانی ئەو سەردەمە لە هەموو بوارەکانی زانستدا و لێکدانەوە زانستیەکان جەم بکات و ئینجا بە ژیریی خۆی ڕاستەکەیانی هەڵبژێرێت؟!

ئایا ژیانی هیچ کەسێك هەیە هێندەی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون و ئاشکرا بێت و هەموو ژیانەکەی بەبێئەوەی ووتەیەك و هەڵسوکەوتێکی بپەڕێنرێت، هەمووی باسکراوە و نوسراوەتەوە، باشە ئەگەر ئەوەشی کردبێت چۆن زانی لەم هەموو ڕا جیاوازانە، کامەیان ڕاستەکەیە؟! لە کاتێکدا لە هەزار ڕاو بۆچوون ئەگەر بە ڕێکەوت دانەیەکیان ڕاست بوایە! زۆر جاریش هەرگیز ڕای زانستی هەر بەدەمی کەسدا نەهاتووە و بە خەیاڵیش بۆی نەچوون، هەتا زانستی ئەم سەردەمە دەریخستن، یەك نموونە دێنمەوە لەو هەزاران نموونانەی لەبەردەستدان: پێغەمەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لا تقوم الساعة حتى تعود أرض

العرب مروجا وأنهارا)، واتـه قیامـەت هەڵناسـتێت تـا زەوی عـەرەب نەبێتـەوە بـە بێستان و ڕوبارگەل، واتە پێشتر وابووە و لە داهاتووشـدا وای لێدێتـەوە، ئایا کـێ دەیزانی کۆن زەوی عەرەب بێستان و ڕووبار گەل بـووە پـێش دەیـان هـەزار سـاڵ لەمـەو پـێش؟! ئەگـەر یـەکێك بڵێـت ڕۆمـان باسـی کـردووە و لـە ڕۆمانـەوە خوێندویەتەوە، ئەوە دەڵـێین کـۆنترین ڕۆمـان پـێش سـێ هـەزار سـاڵە!! گریمـان ڕۆمـان پێـی وتبـوو، ئـەی باشـە کـێ پێیـوت لـە داهـاتودا وای لێدێتـەوە خـۆ فەرموودەکـە صـەحیحە و (ئیمـام موسـلیم) گێڕاویێتیـەوە، ئـەم هەواڵـەی فەرموودەکەش لای زانا جێولۆجیەکان ئێستا ڕاستییەکی چەسپاو و سەلمێنراوە، کە زەوی ووشکی عەرەب بەو شێوەیە بووە و هەرواشی لێ دێتەوە. (سەیری ئـەم لینکە بکە): (http://haiv.org/sarata.php?readmore=29).

مـن نـازانم ئەگـەر کەسـێك لـە دژایەتیـەوە بـۆ ڕاسـتییەکانی قورئـان بڵێـت، موسـوڵمانی ئـەم سـەردەمە واتـای ووشـەکان بـەپێی حـەزی خۆیـان و بـۆ ئـەوەی لەگەڵ زانستەکەدا بگونجێت ڕێکدەخەن، ئەگینا ئەو دەقە ئەو ڕاستیە ناگەیەنێت، من پێی دەڵـێم ئایـا جگـە لـەو واتایـەی کـە بڵێیـت (قیامـەت هەڵناسێت تـا زەوی عەرەب نەبێتەوە بە بێستان و ڕووبار) ئایا واتای تـری لـێ هەڵدەهێنجرێت؟! ئایـا ئەم واتا کردنە ڕوون و ئاسان نییە؟ هـیچ پـێچ و پەنایـەکی تێدایـە؟ ئەمـە بـەڵێنی پـەروەردگارە و پاشـگەز بوونـەوەی نییـە، هـەر دەبێـت ڕاسـتییە گـەردوونی و زانستییەکان دەربخرێن و هـەقێتی قورئـان و فـەرمودەش بسـەلمێت، ئەمـە نـوری خودایە و بە فوی دەم ناکوژێتەوە، هەرچـەندە کـافران کـە ڕاسـتییە زانسـتییەکان هـەقێتی قورئانیـان سـەلماند مـەراق و خەفـەت دایانبگرێـت، ئەگـەر ڕوشێکیشـیان دەست بکـەوێت بـۆ ئـەوەی لـە بـەحری خنکانیـان ڕزگاریـان بێـت، دەسـتی پێـوە دەگرن و هەوڵی بەرپەرچدانەوەی دەدەن، وەك دەفەرموێت:

(یریدون لیطفئوا نور الله بافواههم والله متم نوره ولو کره الکافرون) (الصف:٨).

ئەوانەی نایەنەوێت ڕاستی تێبگەن، یان دوای تێگەشتنیان دەیشارنەوە، یەکێك لە ڕێگا پوکاوەکانیان بۆ بەرپەرچدانەوەی ئیعجازی زانستی قورئان، ئەو ڕێگایە بەکاردێنن، هەرکاتێك بینییان ئیعجازێکی ڕۆشن لە قورئاندا یان فەرموودەدا دەرکەوت و هەقیقەتەکەی زانست ئاشکرای کرد، لەهەموو هەوڵێك دەگەڕێن بۆ گومان دروستکردن و شاردنەوەی هەقیقەتەکە، بیر دەکەنەوە ئەم ئیعجازە ڕۆشنە چۆن پەردەی پیابدەن و لەبەرچاوی خەڵکی وونی بکەن، دەگەڕێن بە دوای ووتەی تەفسیرزانەکانی پێشوودا، بەڵکو تەفسیرزانێکی پێشینیان دەست بکەوێت ڕاستییە زانستیەکەی وەك خۆی باس نەکردبێت، هەتا بیکەنە بەڵگە کە واتای ئایەتەکە وەك هی ئەم تەفسیرزانەیە و موسوڵمانانی ئێستا واتا بنەڕەتیەکەی دەگۆڕن، بێگومان ئەم هەوڵەیان هەروەك دەستگرتنە بە پووشەوە لە دەریادا تا لە خنکان ڕزگاری بکات، چونکە وەك پێشتر بەدرێژی ڕوونمان کردەوە قورئان واتا و ووشەکانی زۆر ڕوونن، و ئەو دەستەواژە و واتایانەش ڕاستیەکە وەك خۆی دەگەیەنن، بەڵام ئەگەر لەبەر قورسی و نەبوونی هۆکاری تێگەشتن لە چۆنێتی و هەقیقەتی ئەو دیاردەیە، هەندێ لە تەفسیر زانان هەقیقەتەکەیان وەك خۆی باسنەکردووە ئیعجازەکە پەك ناخات، چونکە ووشەکان و واتاکان ڕوونن و دەستەواژەکانی عەرەبی ڕەوانن (قرانا عربيا غير ذي عوج) (الزمر:٢٨).

نموونەیەك دێنینەوە: قورئانی پیرۆز لە باسی جەنگی ڕۆم و فارسەکاندا دەفەرموێت جەنگەکە لە (أدنى الأرض) بوو، ئاشکرایە ووشەی (أدنى) بە نزیکتر و بەواتای نزمتریش هاتووە، ووشەیەکی ئاسانە ڕۆژانە بەرگوێمان دەکەوێت لە هەواڵەکانەوە دەڵێت: (نزل إلى أدنى مستوياتها)، واتای ووشەکە ڕوونە، زانا جیۆلۆجیەکان کاتێك دەریانخست نزمترین شوێنی ووشکانی زەوی ئەم شوێنەیە کە قورئان باسی کردووە، کافران و داپۆشەری ڕاستیەکان کەوتنە خۆیان و زانیان ئەم ئیعجازە زانستییە بەڵگەی زۆر ڕۆشنە لەسەر ڕاستێتی قورئان، بۆیە وەك

پیشەی هەمیشەییان بە ڕاست و بە چەپدا هەوڵەکانیان خستەگەڕ تا ئەم بەڵگە ئاشکرایە داپۆشن، و ئەگەر هیچیان پێنەکرێت گومان دروست بکەن لەبەردەم ئەم ئیعجازە ڕوونەدا، ئەویش بەوەی جارێك لە بێئاگاییان لە زانستەکە ووتیان ئەو شوێنە نزمترین شوێن نیە! بەڵکە ناو ئاوەکە نزمترین شوێنە! ئەوانە نازانن کت و مت ئەو شوێنەی لەسەر وشکانی جەنگەکەی لەسەر بەرپا بووە و سەرڕووی ئاوەکەش و بنی ئاوەکەش نزمترین شوێنە، لە لایەکی ترەوە گومانداران ووتیان هیچ تەفسیرزانێك لەم ئایەتەدا نەیوتووە (أدنی) بە واتای (أخفض) واتە نزمتر دێت، بێگومان تەفسیر زانەکان باش دەیانزانی یەکێك لە واتاکانی (أدنی) نزمترینە، بەڵام چۆن تێبگەشتنایە وخەڵکیان تیبگەیاندایە؟! چۆن بیازانیایە پێوانەی نزمترین شوێنی زەوی لەسەر چ بناغەیەکە؟ و بە چی پێوانە دەکرێت، کێ لەو کاتەدا ئەگەر باسیشیان بکردایە لێی تێدەگەیشت؟

خەڵکی ئەو کاتە بچوونایە سەر گردێك دەیانوت ئەمە بەرزاییە، لە دۆڵێکدا دەیانوت نزماییە، ئەم زانستەی ئێستایان لەبەر دەستدا نەبوو کە لەوانەیە دوور نەبووبێت ئەو دۆڵەی لە ناوچەیەك پێیانوتووە نزمایی، بەرزتر بووبێت لەو گردەی ئەوان پێیانوتووە بەرزایی، پاشان چۆن تێبگەشتایە لەوەی نزمترین شوێنی زەویە، ئەگەر گشت بەرزایی و نزماییەکانی زەوی دەستنیشان نەکرابێت؟ و پێوانەی ئاستی ڕووی دەریای بۆ نەکرابێت؟! تەفسیرزان هەرچەندە دەریای زانست بێت چۆن دەتوانێت بەو واتایە ووشەکە ڕاڤە بکات، کە سوریش دەیزانی یەکێك لە واتای ووشەی (أدنی) بە نزمتردێت، باشە بۆچی پەروەردگار وشەی (أقرب) (واتە نزیکیترین) ی بەکارنەهێنا؟ وشەی(أدنی) ی بەکار هێنا؟

نەیارانی قورئان هێندە دەرخستنی ئەم ئیعجازە زانستیانەیان لە لا قورسە، نزیکە هەوڵەکانیان چڕ بکەنەوە بۆ شاردنەوەی ئەم بەڵگە ڕۆشنانە، خۆ بە دڵنیاییەوە ئەگەر وەك جولەکە و گاورەکان کە تەورات و ئینجیل لەبەر دەستی

خۆیاندایـە، هـەر کاتێـك لـە سـەردەمی پێغەمبـەرەوە موسـوڵمانان دەقێکیـان دەرهێنابێت کـە بـەڕوونی نـاوی (موحەممـەد) و وەسـفەکانی بکـات، دەستبەجێ هەوڵی لابردنی ئەو دەقەیان لـە کتێبەکانیانـدا دەدا، هـەروەك کردووشـیانە، بـەڵام ئایا ئەم نەیارانی ڕاستیانەی ئێستا دەتـوانن دەقەکـەی قورئـان وەك گـاور و جـوو بسڕنەوە و لەو کتێبە پیرۆزەدا نەیهێڵن؟ بێگومان نەخێر.

بەپێچەوانەوە باوەڕداران هەرکات ئیعجازێکی زانستی نوێ ئاشکرا دەبێت دڵیان خۆشـدەبێت و سوپاسـی خـودا دەکـەن: ﴿وقل الحمد لله سيريكم اياته فتعرفونها﴾ (النمل:٩٣)، واتە: بڵێ سوپاس بۆ خودا کـە لـە داهـاتوودا ئایـەت و بەڵگـەکانیتان نیشـان دەدات و ئـەو کاتـەش باشـتر لێـی تێدەگـەن، لـە تەفسـیری (قورتـوبی)دا دەڵێـت: {سـيريكم آياتـه: أي في أنفسـكم وفي غيركـم، كمـا قـال: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم)، فتعرفونهـا: أي دلائـل قدرتـه و وحدانيتـه في أنفسـكم وفي السماوات وفي الأرض، نظيره قوله تعالى: (وفي الأرض آيات للموقنين وفي أنفسكم أفلا تبصرون)}.

تەفسیری (ئیبن کەسیر) دەڵێـت: {(وقل الحمد لله سيريكم آياته فتعرفونها): أي لله الحمد الذي لا يعذب أحدا إلا بعد قيام الحجة عليه ، والإعذار إليه " ولهذا قال: (سيريكم آياته فتعرفونها)، كما قال تعالى: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق) (فصلت : ٥٣)}....

# سەرەتایەك دەربارەی تەفسیر و
# بە زیندوو مانەوەی ئەم زانستە

سەرەتا با ئەوە بزانین کە قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەت و ڕێنموویی مرۆڤەکانە بۆ ڕێگای ڕاست، بەڵام پەروەردگار بەزانستی فراوانی خۆی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە تا ڕۆژی دوایی دەزانێت کە زانستی مرۆڤەکان بەرەو پێشکەوتنی بەردەوام دەڕوات بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا ئیشارەت و ئاماژەی بۆ هەموو زانستەکان و سەردەمەکان تێدایە بەمەبەستی نوێبوونەوەی موعجیزەی قورئان لە هەموو سەردەمێکدا: {ونزّلنا عليك الكتاب تبياناً لكل شيء....} (النحل:١٨٩)، ﴿لَّكِنِ اللهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً﴾ (النساء:١٦٦)، ئیمامی ڕاڤەکاری قورئان (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "ئەم قورئانە زانیاری و زانستی خودایی تێدایە کە ویستوویەتی نیشانی بەندەکانی بدات، هەروەها زانیاریشی تێدایە بە شتە غەیبی و نەزانراوەکان، لە ڕابوردوو و داهاتووشدا"[١٣٨]، دەربارەی ئەو مانایەش کە قورئان زانیاریی شاراوەی خودایی تێدایە زۆرێك لە موفەسیران هەمان بۆچوونیان هەیە وەك: (ابن الجوزي، الزمخشري، أبوحيّان، البيضاوي، النَّسَفي، الخازن، الآلوسي، الشوكاني).

پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی ئاماژەیداوە بە بەردەوامی موعجیزەی قورئان، کە لێیدەگێڕنەوە فەرموویەتی: (... ولاتنقضي عجائبه...)[١٣٩] واتە: هەرگیز سەمەرە و سەرسوڕهێنەکانی قورئان تەواو نابن، زانایانی ئیسلامیش باوەڕی تەواویان

---

[١٣٨] بڕوانە: تفسير القرآن العظيم (١/٥٦٠).

[١٣٩] جزء من حديث طويل رواه الترمذي والدارمي والطبراني في المعجم الكبير وابن حبان والحاكم في المستدرك، قال ابوعيسى: هذا حديث لانعرفه إلا من هذا الوجه (سنن الترمذي: ٥/ ٩٨)، والصحيح انه موقوف على ابن مسعود.

هەبووە بە بەردەوامی موعجیزەی قورئان و بەوەی بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان مرۆڤەکان تەفسیر و تێگەیشتنیان بۆ قورئان زیاتر دەبێت، لەوانە:

(ئیبن عەبباس) ڕەزای خوای لێبێت وەك (الطبري) لێی دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (التفسير على أربعة أوجه: وجه تعرفه العرب من كلامها، وتفسير لايعذر أحد بجهالته، وتفسير تعرفه العلماء، وتفسير لايعلمه إلا الله)[140] واتە: (تەفسیر بە چوار شێوە دەکرێت، ڕوویەکیان عەرەب شارەزاترن لەبەرئەوەی لە زمانی ئەوانە، ڕوویەکی تریان هەموو کەس لێی تێدەگات و کەس خاوەنی عوزر نیە بۆ نەزانینی، تەفسیرێکیش کە تەنها زانایان دەیزانن و لێی تێدەگەن، و تەفسیریکێش کە تەنها خودا خۆی دەیزانێت)، کەواتە زانایانیش هەموو کاتێك بەپێی تواناکانی خۆیان و تواناکانی سەردەمیان دەتوانن تەفسیرێکی ڕاستی قورئانی پیرۆز بکەن.

- (ئیبن مەسعود) ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: (من أراد علم الأولين والآخرين فليتدبر القرآن)[141] واتە: هەر کەسێك زانستەکانی پێشینەکان و دواینەکانی دەوێت با تێبڕوانێتە قورئان، کە ئەمە بە تەفسیر کردنی ڕووکەشیانەی ئایەتەکان نایەتەدی.

(حجة الإسلام أبوحامد الغزالي) (٤٥٠-٥٠٥ك) دەڵێت: (العلوم كلها داخلة في أفعال الله وصفاته، وفي القرآن شرح ذاته وأفعاله وصفاته، وهذه العلوم لا نهاية لها وفي القرآن إشارة الى مجامعها، بل كل ما أشكل فيه النظار في النظريات والمعقولات ففي القرآن إليه رموز ودلالات عليه، يختص أهل الفهم بدركها)[142] واتە: زانستەکان هەموویان دەچنەژێر کردارەکانی خودا و سیفاتەکانی، و لە قورئانیشدا وەسفی

---

[140] بڕوانە: التفسير والمفسرون ج١ ص٣٩.

[141] بڕوانە: إحياء علوم الدين ج١ ص٣٧٩.

[142] بڕوانە: إحياء علوم الدين (ج١ ص٣٧٩).

زات وکردار وسیفاتەکانی خودای تێدایە، ئەم زانستانەش کۆتاییان نییە و لە قورئاندا ئامـاژە بـۆ ووردەکاریـەکانیان کـراوە، تەنانـەت هـەموو ئەوانـەش لـە بیردۆزەکان و مەعقولاتـەکان کـە لێکۆڵـەرەوان لێیـان بـووە بەکێشـە، لـە قورئانـدا ئامازەی بۆ هاتووە کە خەڵکانی خاوەن تێگەیشتن پێیدەزانن و لێی تێدەگەن.

هەروەها لە کتێبی (جواهر القرآن)دا دەڵێت: ان علوم الطب والنجوم، وهيئة العالم وهيئة بدن الحيوان، وتشريح أعضائه، وعلم السحر، وعلم الطلسمات وغير ذلك يشير إليها القرآن بقوله تعالى: (وإذا مرضت فهو يشفين) (الشعراء: ٨٠)، وقوله سبحانه: (والشمس والقمر بحسبان) (الرحمن: ٥) ونحوه ما يشير إلى علم الهيئة (الفلك)، واتـە: زانسـتەکانی پزیشـکی و ئەستێرەناسـی و پێکهاتـەی جیهـان و پێکهاتەی ئاژەڵان و توێکاری ئەندامـەکانی و زانسـتی سیحر و شـتە شارراوەکان قورئان ئامازەی بۆ داون لە ئایەتەکانیدا.

ئیمامی (فخرالدين الرازي) (٥٤٤-٦٠٦ك) سەرەتا دەیووت قورئان باسی زانست ناکات و تەفسیری زانستی رەتدەکردەوە، بـەڵام کاتێك لێکۆڵینـەوەی لـە زانسـتی پراکتیکی کرد تەفسیرێکی دانا لەسەر بنەمای تەفسـیری زانسـتی بـەناوی (مفـاتیح الغیب)، کەتێیدا دەڵێت: (ربما جاء بعض الجهال والحمقى وقال: إنك أكثرت من تفسير كتاب الله من علم الهيأة والنجوم...)[١٤٣] واتە: لەوانەیە هەندێك گێل و نـەزان بێن و رەخنە بگرن وبڵێن تۆ زۆر تەفسیری کتـێبی پـەروەردگارت بـە زانسـتەکانی گەردوونزانی کردووە، هەروەها کتێبی (نهاية الإيجاز في دراسة الإعجاز)یشی داناوە.

(جلال الدين السيوطي) (٨٤٩-٩١١ك) وەك ئیمامی غـەزالی لەگـەڵ تەفسـیری زانسـتیدا بـووە و لـە کتێبـەکانی (الإتقان في علوم القرآن) و (الإكليل في استنباط التنزيل)دا بەدرێـژی باسـی کـردووە و بەڵگـەی لـە ئایـەت و فـەرموودەوە بـۆ هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی، وەك خۆی دەڵێت: (القرآن مشتمل على كل العلوم)

---

[١٤٣] بڕوانە: تفسير (مفاتيح الغيب) (١/١٨٥).

واتە قورئان هەموو زانستێکی تێدایە، ووتەیەکی (ابن سراقة) دێنێتەوە لە کتێبی (الإعجاز)دا کە (ابي بکر بن مجاهد) ووتوویەتی: (مامن شيء في العالم إلا وهو في کتاب الله)، واتە: هیچ شتێك لە جیهاندا نیە کە لە کتێبی پەروەردگاردا باسی نەهاتبێت[١٤٤].

شێخ (محمد الطاهر بن عاشور) کە لە تەفسیرەکەیدا (التحرير والتنوير) دەربارەی لێکدانەوە و تەفسیر کردنی قورئان دەڵێت[١٤٥]: رووەکانی ئیعجازی قورئان بۆ ٣ لایەن دەگەڕێتەوە: یەکەم ئەوەیە کە گەیوەتە ئەوپەڕی پلەی رەوانبێژیی زمانی عەرەبی، دووەم داهێنراوەکانی قورئانە لە هونەرەکانی صرف لەرێزمانی قسەدا کە پێشتر لای عەرەب ناشنانەبووە بەڵام لە چوارچێوەی زمانەوانی نەچۆتە دەرەوە، سێیەم ئەو گەوهەرانەیە کە تێیدا دانراوە لە حیکمەتەکان و ئاماژەدان بۆ راستیە عەقڵی و زانستیەکان کە ژیریی مرۆڤەکانی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان پێی نەگەیبوون و تا چەندین سەدەش دوای دابەزینی.

ئەم بەشە زانایانی پێشووی ئیعجازی قورئان درکیان پێنەکردووە، هەندێك کەس لایەنێکی چوارەمیش زیاد دەکەن کە ئەویش بریتیە لە هەواڵدانە غەیبییەکانی قورئان کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەلایەن (علّام الغيوب)ەوە هاتووە، دوو لایەنەکەی یەکەم بەتایبەت بۆ عەرەبە و روو لەوان دەکات کە رەوانبێژ و زمانەوانەکانیان دەستەوسان دەکات، لایەنی سێیەمیش بۆ هەموو مرۆڤایەتیە و لە هەموو سەردەمەکاندا بەردەوامە، و ئەم لایەنەش بۆ دەرخستنی رووی ئیعجازەکەی پێویستی بە زانیارییە دەربارەی بنەماکانی زانست، کە بۆ خەڵکی وورده وورده دەردەکەوێت وەك دەرکەوتنی رووناکی بەیانیان، ئەویش بەگوێرەی

---

[١٤٤] بڕوانە: الإتقان في علوم القرآن (ص ٧٢٦).

[١٤٥] بڕوانە: تفسير التحرير والتنوير – المقدمة العاشرة (في إعجاز القرآن)– (١ / ١٠٤).

ئەوەی لێی تێیدەگەین و راددەی پێشکەوتنی زانستەکان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووە چونکە کەسێکی نەخوێندەوار هێناویێتی[١٤٦].

دکتۆر (مۆریس بۆکای)[١٤٧] دەڵێت: کاتێك لێکۆڵینەوەم کرد لە قورئان بەتایبەتی ئەو وەسفەی دەیکات بۆ زۆرێك لە دیاردە سروشتیەکان، لەراستیدا سەرمسوڕما لەو ووردەکاریەی کە هەندێك لەو دیاردانەی پێباسکراوە، کە مەحاڵ بووە بۆ هەر مرۆڤێك لە سەردەمی (محمد)دا بچووکترین زانیاریی دەربارەیان هەبووبێت، بەتەواوەتی سەرمسوڕما لە یەکگرتنەوەی ئەو ئاماژانە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنانەی ئەمڕۆ هەمانە دەربارەی ئەو دیاردانە، دوای ئەمەش چەندین نوسراوم خوێندەوە کە چەند نوسەرێکی موسوڵمان دەربارەی لایەنە زانستیەکانی قورئان نوسیویانە، یەکەم شتێك کە مایەی تێڕامان و سەرسوڕمانی ئەو کەسانەیە کە رووبەرووی ئەم دەقانە دەبنەوە بریتیە لە دەوڵەمەندی ئەو بابەتانەی کە باسیان لێوەکراوە: لەوانە لایەنی بەدیهاتن و گەردوونزانی و خستنەرووی هەندێك بابەت دەربارەی زەوی، وجیهانی ئاژەڵ و رووەك، و زاووزێی مرۆڤ، ئێمە لەکاتێکدا هەڵەی گەورەی زانستی لە تەوراتدا دەدۆزینەوە لە قورئاندا هیچ هەڵەیەك نادۆزینەوە، ئەمە وایلێکردم پرسیار بکەم: ئەگەر نووسەری قورئان مرۆڤێك بووایە باشە چۆن توانی لە سەدەی حەوتەمی مەسیحیدا چەند شتێك بنووسێت کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆمان دەرکەوتووە ویەکانگیرە لەگەڵ زانستە نوێکاندا[١٤٨].

---

[١٤٦] بڕوانە: تفسير التحرير والتنوير – المقدمة العاشرة– (١ / ١٢٧).

[١٤٧] دەربارەی (موریس بوکای): پزیشکێکی هەناوی بەناوبانگی فەرەنسی بووە (١٩٢٠–١٩٩٨ز)، لەسەر ئاینی مەسیحی گەورەبوو، وەك پێشتریش ووتمان دوای ئەوەی لە کتێبە ئاسمانیەکانی جولەکە و موسوڵمانی کۆڵیەوە دەربارەی چیرۆکی فیرعەون و بەراوردی کرد لەگەڵ زانستی نوێدا موسوسڵمان بوونی خۆی ئاشکراکرد، و کتێبی (تەورات و ئینجیل و قورئان و لێکۆڵینەوەیان لەژێر رۆشنایی زانستی نوێدا) نووسی کە بۆ ١٧ زمان وەرگێڕدراوە.

[١٤٨] بڕوانە: القران الكريم والتوراة والانجيل والعلم/ ص ١٥٠– ١٥٢.

لەلایەکی ترەوە هەندێك کەس ئەو رەخنەیە دەگرن کە: قورئانی پیرۆز بۆیە دابەزی بۆ ئەوەی عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلام لێی تێبگەن، ئێمەی موسوڵمانیش دەبێت شوێنپێی ئەوان هەڵگرین لە تێگەیشتنیان بۆ ئایەتەکان بەپێی مانای ووشەکانی.

بابزانین قورئانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابەزیوە تا رۆژی دوایی بە جیاوازی رۆشنبیریی و زانیارییان، کاتێکیش گفتووگۆ لەگەڵ هەموو ئەم ژیرییانەدا دەکات هەر کەسە و بەپێی توانای خۆی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەگەر ژیریەکانیش بێتوانابوون لە تێگەیشتنی مانای هەندێك لە ئایەتەکان ئەوا پێویستە پشت ببەستین بە گەورە زانا و لێکۆڵەرەوان چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: (فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون) ﴿النحل: ٤٣﴾، زۆر جاریش زانایانی فیقە و لێکۆلەرەوان چەندین یاسا و حوکمیان لە ئایەتەکانەوە دەرهێناوە کە خەڵکانی پێشین نەیانزانیوە، لەمڕۆشدا زانایانی زانستە گەردوونیەکان دەتوانن مانای هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان بکەن بەزانستی ئەمڕۆ و روونی بکەنەوە بۆمان، بەمەرجی رەچاوکردنی بنەماکانی تەفسیر و مانا زمانەوانیەکان، ئەویش لەبەرئەوەی قورئان: (ولاتنقضي عجائبه) سەمەرەکانی کۆتاییان نایەت.

کاتێك زانیاریی و زانستە گەردوونی و سروشتییەکان بەکاردەهێنین بۆ روونکردنەوەی ئایەتە قورئانیەکان و دەرخستنی لایەنی گەورەیی و ئیعجازیان ئێمە بەم کارەمان وەك کاری زمانەوانەکان و رەوانبێژان دەکەین، خۆ لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەکارهێنانی زانستە زمانەوانیەکان لە دەرخستنی رووەکانی ئیعجازی قورئاندا نەبووە و سەردەمانی دواتر پەیدابوو کە هەموو زانایان کۆکن لەسەر بەکارهێنانیان بۆ روونکردنەوەی لایەنەکانی ئیعجازی قورئان، کەواتە بۆچی ئێمە رێبدەین بەزانایانی زمانەوانی و رێنەدەین بە زانایانی گەردوون و سروشت کە زانستەکانیان بخەنە خزمەتی دەرخستنی لایەنەکانی ئیعجازی زانستی لەقورئاندا.

# ماناى (علقة) لەنێوان موفەسیران و زانایانی کۆرپەلەزانیدا

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ (المؤمنون:١٢-١٣). واتە: ئێمە بنچینەی مرۆڤمان لە پوختەیەکی گڵەوە دروست کردووە، پاشان نەوەکانی لە (نطفة)یەکەوە دروست دەبن کە لە شوێنێکی دامەزراودایە، پاشان ئەم (نطفة)یە دەبێت بە (علقة)، لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ (العلق: ١-٢)، واتە: بخوێنە ئەی محمد (ﷺ) بە ناوی ئەو خودایەی کە دروستکەرە، مرۆڤی دروست کردووە لە (علق)، هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٦-٣٨)، واتە: ئایا مرۆڤ وا گومان دەبات کە هەروا بەجێ بهێڵرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت لە دوارۆژدا، بۆ وا خۆی بە گەورە دەزانێت، ئەی بۆ ئەو بیرناکاتەوە و سەیر ناکات سەرەتا کە دروست بوو (نطفة) بوو کە بەشێکی لە ئاوی پیاوەوە بووە، پاشان بوو بە (علقة) کە دوایی دروست کراو رێك وپێك کرا.

یەکێك لە بنەما گرنگەکانی زانستی تەفسیر کە زانایان لەسەری کۆکن بریتیە لە لێکدانەوەی زمانەوانی ووشەکانی ئایەتەکان، لەو ئایەتانەی سەرەوە ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە مرۆڤ لە قۆناغێکی سەرەتایی دروستبوونیدا (علقة) دەبێت، ووشەی (العلقة) لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بەم مانایانە هاتووە: ١- مُشتقّة من (عَلَق) وهو: الإلْتِصاق و التَّعَلُّق بشيءٍ ما. ٢- والعلقة: دودة في الماء تَمْتَص دم الحيوانات و تَلْتَصق بها و تعيش في البرك و جمعها (العَلَقْ)، وعَلقت الدّابَة إذا شَرِبَت الماءَ فعَلَقَت بِها العَلَقة. ٣-والعلق: الدم عامة، و الشديد الحمرة أو الغليظ أو الجامد. ٤-الدم الرطب.

واتاکانیان: ١-بە مانای خۆ نووساندن و خۆ هەڵواسین بە شتێکدا. ٢-بەمانای جۆرە کرمێك دێت کە لە زۆنگاودا دەژی و خۆی دەنووسێنێت بە قورگی ئاژەڵەوە و خوێنی دەمژێت، شێوەی لەشی ئەم کرمە پارچە پارچەی بازنەییە (ئەم کرمە بە ئینگلیزی پێی دەووترێت Leech). ٣-مانای علق: خوێن دەگەیەنێت بەگشتی، هەروەها خوێنی زۆر سوور، یان خوێنێکی ئەستوور، یان خوێنی وەستاو. ٤-خوێنی گەش و تازە. (بڕوانە ئەم فەرهەنگانەی زمانی عەرەبی: (الصحاح للجوهري: والعلقة دودة في الماء تمتص الدم والجمع: علق)، (لسان العرب: والعلق: دود أسود في الماء معروف والواحدة: علقة)، هەروەها فەرهەنگەکانی: (مقاييس اللغة)، (القاموس المحيط).

ووشەی (علقة) لە قورئان دا بە ڕەهایی هاتووە کە ئەو مانایانەی سەرەوە هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە ماناکردنی (علقة یان علق) بە کرمی زەروو شتێکی نوێ نیە و زانایانی زمانەوانی لە کۆن و نوێدا بەمشێوەیە مانایان کردووە، هەربۆیە هەندێك موفەسیری قورئانیش مانای (علقة)یان بە کرمی زەروو کردووە، وەك موفەسیری گەورەی قورئان (ابن کثیر) لە مانای (ثُمّ خلقنا النطفة علقة)دا دەڵێت: (فصارت علقة حمراء على شكل العلقة مستطيلة)، واتە: دەبێت بە عەلەقەیەکی سوور لەسەر شێوەی کرمی زەروو کە درێژکۆلەیە (ج٤ ص٤٦٩).(بڕوانە وێنەی ١)



هەروەها زانای موفەسیری ناسراو (الراغب الأصفهاني) (٤٢٥ك وەفاتی کردووە) لە لێکدانەوەی زاراوەی (عەلەقە) لە کتێبی (مفردات ألفاظ القرآن–ص ٥٧٩)دا دەڵێت: (والعلق: دود يتعلق بالحلق)، واتە: عەلەق کرمێکە دەنووسێت بە قوڕگەوە (واتە: کرمی زەروو).

هەروەها خاوەنی تەفسیری (التحرير والتنوير) (محمد الطاهر بن عاشور)[149] دەڵێت: (العلق) کۆی عەلەقەیە کە پارچەیەکی بچووکی خوێنێکی ئەستوورە، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە بۆ شوبهاندنی بە کرمێکی بچووکە کە ناوی عەلەقەیە (واتە کرمی زەروو) کە ڕەنگی سووری تۆخە و لە ئاوی شیریندا دەژی و خوێن لە ئاژەڵان دەمژێت کاتێك بە پێست یان قوڕگیانەوە دەنووسێت) (ج١٥ ص٤٣٨).

کەواتە لەگەڵ لێکدانەوەکانی تری ووشەی (العلقة) مانای کرمی زەروو بۆ ئەم زاراوەیەش هاتووە و بەکارهێنراوە لەلایەن موفەسیرەکانەوە.

ئەگەر بچینە ناو ووردەکارییە زانستییەکانی بابەتەکە و لە ڕووی زانستی کۆرپەلەزانییەوە بەراوردی نێوان شکڵی کۆرپەلە و کرمی زەروو بکەین ئەم لێکچوونەمان بەئاشکرا بۆ دەردەکەوێت.

دوای دروستبوونی هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت) و پاشان یەکەم خانەی سەرەتایی مرۆڤ و دابەشبوونی، ئەم زایگۆتە هەڵدەستێت بە گەشتێکی درێژ و سەرسوڕهێنەر لە سەرەتای بۆری مناڵدانەوە بۆ گەیشتن بۆ ناو مناڵدان، پاش

---

[149] زانا (محمد الطاهر بن عاشور) (١٨٧٩– ١٩٧٢ز) زانایەکی ناسراوی تونسیە، لە زانکۆی (زەیتونە) خوێندوویەتی کە دواتر بوو بە یەکێك لە گەورەترین مامۆستاکانی، لە ساڵی (١٩٣٢ز) بوو بە موفتی تونس و پاشتریش بوو بە (شيخ الإسلام المالكي)، پاشان بوو بە سەرۆکی زانکۆی زەیتونە و بەهۆکاری سیاسی لابرا ساڵی (١٩٤٥ز)، دوای سەربەخۆیی تونس گەڕایەوە بۆ کارەکەی تا ساڵی (١٩٥٦ز)، خاوەنی چەندین دانراوی زانستیە لەوانە: (تفسير التحرير والتنوير کە بە ٥٠ ساڵ نووسیویەتی، أصول الإنشاء والخطابة، موجز علم البلاغة، أليس الصبح بقريب، أصول النظام الاجتماعي في الإسلام، مقاصد التشريع الإسلامي، الوقف وآثاره في الإسلام).

گەیشتنی بۆ ناو منداڵدان هەڵدەستێت بە هەڵکۆڵینی دیواری منداڵدان (کە دەوڵەمەندە بە لوولەکانی خوێن) و گۆماوێك خوێن لە دەوری کۆدەبێتەوە و شکڵی کلۆیەك خوێن بە کۆرپەلەکە دەدات، هەروەها لە کاتی خۆ چاندنی کۆرپەلە بۆ ناو دیواری منداڵدان کردارێکی تر روو دەدات کە ئەویش بریتیە لە گۆڕانی شکڵی کۆرپەلەکە، کە شکڵی ووردە ووردە لە خڕییەوە بەرەو درێژکۆلەیی دەگۆڕێت (ئەویش بەهۆی پەیدابوونی پەتی پشتەوە (Notochord) دەبێت، لەهەمان کاتدا پەیدابوونی چینی ناوەڕاست (Mesoderm) لەشی کۆرپەلەکە رەق دەکات تا شێوەی کۆرپەلەکە لە کرم دەچێت (سەری ئەستوور دەبێت و ناوەڕاستی باریك دەبێتەوە و خەتێکی درێژ بەدرێژایی ناوەڕاستی پەیدا دەبێت)، بە تایبەتی ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو شکڵەی کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە کە ئەویش کرمی زەروو (العلق)ە، دەبینین بە تەواوەتی لە یەك دەچن لە شێوە و قەبارەدا، تەنانەت شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکەش هەروەکو ئەو کرمە پارچە پارچەی بازنەیی دەبێت، ئەم بازنانە بەهۆی پەیدابوونی چینی ناوەڕاست (Mesoderm) و سەرەتا دەمارییەکان لە لەشی کۆرپەلەکەدا پەیدادەبن، کە پاشان بارستە لەشییە بازنەییەکان (Somites) دروست دەکەن و لەشی کۆرپەلەکە دەبێتە شێوەی پارچە پارچەی بازنەیی. (وێنەی ٢).



وێنەی ٢




کردارێکی گرنگ کە دەبێتە هۆی پێدانی شێوەی لەشیی بە کۆرپەلەکە بریتیە لە هاتنەوەیەك و لۆچبوونی خەپلە سێ چینیە تەختەکەی کۆرپەلەکە بۆ شێوەیەکی درێژکۆڵەی قووچەکی ( پرۆفیسۆر مۆر) ...

هەروەها کۆرپەلە لەو قۆناغەدا دەستدەکات بە وەرگرتنی خۆراك و ئۆکسجین لە دایکەکەوە (واتە: لە خوێنی دایکەکەوە خۆراك و ئۆکسجین دەمژێت و خوێ دەژێنێت) بە تەواوەتی وەکو کرمی (علق) کە ووتمان ئەم کرمە بە هۆی مژینی خوێنی پێست و قورگی ئاژەڵەوە دەژی.

بۆ روونکردنەوەی زیاتری بابەتەکە لەرووی کۆرپەلەزانییەوە هەندێك برگە لە کتێبی ( The Developing Human) دەهێنینەوە کە یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی کۆرپەلەزانی لە جیهاندا و دانراوی پرۆفیسۆر (کیث مۆر)ە کە لە بەناوبانگترین زاناکانی کۆرپەلەزانیە لە جیهاندا، دەڵێت: ( A significant event in the establishment of body form is folding of the flat trilaminar embryonic disc into a somewhat cylinderical embryo) واتە: کردارێکی گرنگ کە دەبێتە هۆی پێدانی شێوەی لەشیی بە کۆرپەلەکە بریتیە لە هاتنەوەیەك و لۆچبوونی خەپلە سێ چینیە تەختەکەی کۆرپەلەکە بۆ شێوەیەکی درێژکۆڵەی قووچەکی. (بڕوانە وێنەی ٣)

ئەم گۆڕانکارییە لەگەڵ پەیدابوونی پێکهاتەکانی تری لەشی کۆرپەلەکە وادەکات کە لە کۆتاییدا شکلێکی درێژکۆلە وەرگرێت و بەشی سەریی گەورە

دەبێت و ناوەڕاستی باریکتر دەبێت و کەمێك دەچێتەوە یەك، بەم شێوەیە شکڵی دەرەوەی زۆر نزیکدەبێتەوە لە شکڵی کرمی زەروو، ئەمەش زانای موفەسیر (ئیبن کەسیر) پێش چەندین سەدە ئامـاژەی پێداوە لە تەفسیرەکەیدا کە دەڵێت: (فصارت علقة حمراء على شكل العلقة مستطيلة)، واتە: دەبێت بە عەلەقەیەکی سوور لەسەر شێوەی کرمی زەروو کە درێژکۆلەیە.

زۆرێك لە زانایانی بەناوبانگی بواری کۆرپەلەزانی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا شایەتییان داوە بۆ ئەم دەستپێشخەرییە قورئانییە، دەربارەی شایەتیدانی زانایانی ڕۆژئاوا لەسەر ڕاستیی زانیارییە قورئانییەکان دەربارەی کۆرپەلەزانی ووتەی ٤ پرۆفیسۆری ڕۆژئاوایی لەم لینکانەدا دەبینن:

– سەرەتا پرۆفیسۆر (کیپ مۆر) لەم ڤیدیۆیەدا شایەتی بۆ دەدات:

http://www.youtube.com/watch?v=-Ss4UOaGfSQ&feature=player_ mbedded

– ئەمەش ڤیدیۆیەکی تری هەمان زانایە:

http://www.youtube.com/watch?v=PJefjhpR1Ds

– ئەمەش لینکێکی تری هەمان ڤیدیۆیە:

http://www.youtube.com/watch?v=J_Dllu42eEA&feature=related

– ئەمەی خـوارەوەش ڤیدیۆیـەکی تـرە کـە هـەمان زانـا دەردەخـات کـە موحازەرەیـەك دەدات لەسـەر کۆرپەلـەزانی قورئـانی لـە زانکـۆی (ئیلینـۆی) لـە شیکاگۆی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لەبـەرواری (٨/٥/١٩٩٠)، کـە تێیدا دەیسـەلمێنێت کـە هـەموو زانیـاریی و زاراوە قورئانیـەکان یـەکانگیرە لەگـەڵ کۆرپەلـەزانیی نوێـدا، و زۆر بـە جەریئانـە ئـەم زانیـاریی و قەناعەتـەی خـۆی لـە وولاتـانی ڕۆژئـاوا باسـکردووە و موناقەشـەی کـردووە، تەنانـەت لـە تەلـەفیزیۆنی کەنەدی چەندین سـەعات بـە ڕاسـتەوخۆیی بەرنامەیـەکی کـردووە و ئـەم بابەتـەی

باسکردووه و وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە، ئەمانە رەتی ئەو قسەیە دەداتەوە کە دەڵێت (پرۆفیسۆر مۆر) نەیوێراوە زیادکردنە ئیسلامیەکانی کتێبەکەی لە رۆژئاوا بڵاوبکاتەوە، نەك هەر بڵاویکردۆتەوە و چاپێکی ئەصڵی کتێبەکەیەتی کە (چاپی سێیەمە) بەڵکو موناقشە و گفتوگۆی خەڵکیشی کردووە لەسەر ئەم بابەتە و چەندین کۆڕ و موحازەرەی لەسەرداوە لە زانکۆکانی رۆژئاوادا:

http://www.youtube.com/watch?v=upa4BSH7ua4&feature=related

– ئەم ڤیدیۆیەش شایەتی چوار گەورە زانای رۆژئاوایە لە کۆرپەلەزانیدا بۆ راستیی زانیارییە قورئانیەکان:

http://www.youtube.com/watch?v=BX6yQyfbrb4&feature=related

– لەم ڤیدیۆیەشدا پرسیار لە (پرۆفیسۆر مۆر) دەکرێت کە ئایا تۆ موسوڵمان بوویت؟ دەڵێت: من باوەڕم بە راستیی ناردنی موحەممەد لەلایەن خوداوە هەیە، هەرچەندە من باوەڕی تەواوم بەخودا هەیە و دەیپەرستم لەسەر ئاینی مەسیحی، بەلام قەناعەتم بەوە هەیە کە موحەممەد و مەسیح لە یەك سەرچاوەوە نێردراون، زۆر پرۆفیسۆر و زانای هاوەڵی منیش موسوڵمان بوون:

http://www.youtubc.com/watch?v=IObOzMAQ3hI

– ئەم وێنەیەش لە نوێترین چاپی کتێبی (The Developing Human) (9th Edition -2013) وەرگیراوە کە پارچە پارچەیی لەشی کۆرپەلە دەردەخات بە هاوشێوەی کرمی (زەروو)، بەڕاستیی خوای پەروەردگار زۆر جوانی فەرموووە:

(ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً) (المؤمنون): (بڕوانە وێنەی ٤)

{وەرگیراوە لە کتێبی ( پرۆفیسۆر مۆر)}
هێڵکاری کۆرپەلەیەکی سەرەتایی، کە پارچە پارچەیی لاشەی روون دەکاتەوە

## وەڵام بۆ گومانەکان دەربارەی مانای زاراوەی (علقة) لە قورئاندا

لێکچوونی نێوان شـکڵی کۆرپەلـە و کرمـی زەروو لێکدانـەوەی چـەند زانایـەکی ئیسلامیی هاوچەرخیشە، چەند زانایەکی پزیشکیی ناوداری جیهـانیی کۆرپەلـە کـە موسوڵمان نین دانیان پێداناوە و هەیانە لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە و گوتاریشـی لەسەر داوە، بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە، دەمانەوێت ئەوە بڵـێین لـە بنەڕەتدا وتووێژی ئێمە و بێباوەڕان و گومانکاران لەسەر خودی ئەم شـتە نیـە کـە ئـەو زانایانــە بــە موســڵمان و ناموســوڵمانیانەوە باســیان کــردووە و لای ئێمــە لێکدانەوەیەکی ڕاستە، بەڵکو وتووێژی بناغـەیی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوەدا ئەوەیـە کـە ئێوە —بەڕای ئێمە— باوەڕتان بە خـودای گـەورە، وەك بەدیهێنـەر نییـە، و لـە زۆر شـوێندا بـەهۆ و بێهـۆ ئـەو نیەتـەتان ئاشـکرا کـردووە و دەیکـەن، واتـە دژایـەتی گومانکاران بەتایبەتی بۆ ئیعجازی زانستی نییە بەقەد ئەوەی دژایەتیانە بۆ خـودی دین و زاتی خودا و کەسایەتی پێغەمبەر (دروودی لەسەربێت).

بێگومـان ئامـانجی سـەرەکی باسـکردنی قۆناغـەکانی کۆرپەلـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا، تێرامـان و لێووردبوونەوەیـە لـەو دروسـتکراوە مەزنـە، هـەروا لەڕێیـەوە پەیبردنە بە بەدیهێنەر و نەخشێنەرێکی بێهاوتا، دانا، زانا، توانا، شارەزا، ژێنـەر، ڕۆزیدەر و بینا(البصیر)......تاد.

چونکە هەر خانەیەك، بەشێك، ئەندامێك و هـەر کۆئەنـدامێك کـە لـە دڵۆپێـك و لـەو شـوێنەدا دروسـتدەکرێت پێمـان دەڵێـت: ئەمـە کـاری خـالقێکی بەتوانایـە، هەروەها دانانی هەر خانەیەك و هەر ئەندامێك لـە شـوێنی دروسـتی خۆیدا، پێمان دەڵێـت ئەمـە کـاری کـارزانێکی زۆر دانایـە، دواتـر، دوای ئـەوەی چـەندین قۆنـاغ تێدەپەڕێنێت، بەخشینی وێنەیەکی جوان بەو بارستەیە دووبارە گەواهیـدەری ئـەو ڕاستیەیە کە ئەو کارە تەنها لە بەدیهێنەرێکی کارلەجێ دەوەشێتەوە، وپاڵدانی بۆ هـەر کەسـێك یـا شـتێکی دی، وەك وەپاڵـدانی درووسـتکردنی خـۆر و زەویـە بـۆ

منداڵێکی ساوا!! کە ئەگەر مەمەیەکی شیر لە تەنیشت سەریەوە دابنێیت، لەبرسان دەمرێت بەڵام توانای خواردنی شیرەکەی نیە.

وەك دەزانرێت سەرەتا هێلکەی پیتێنراو دڵۆپێکە و شێوەکەی گۆییە، قورئانی پیرۆز لێرەدا وشەی "نطفة أمشاج "ی بۆ بەکاربردووە و دواتر لە منداڵداندا قۆناغێك دەچێتە پێشەوە وشێوە خڕییەکەی بۆ شێوەیەکی درێژکۆلە دەگۆڕێت و شێوەی زەروو وەردەگرێت (وەك لە وێنەکاندا دیارە)، دواتریش شێوە لاکێشەییەکەی ون دەکات و دەچەمێتەوە وشێوەیەکی ناڕێکوپێك وەردەگرێت وچەندین هەڵاوسان و چاڵوچۆڵی لەسەر دەردەکەوێت، لەم قۆناغەدا جگە لەشتێکی جوراو لەهیچ شتێکی دیاریکراو ناچێت هەروەك قورئان بۆ ئەو قۆناغەش وشەی (المضغة) ی بەکاربردووە، لەکۆتاییدا لە دوای ئەوەی کۆرپەلە بەو شێوانەدا دەڕوات، بەهۆی دەرکەوتنی کۆئەندامی ئێسکە پەیکەر و پاشان بە ماسولکە داپۆشرانی، جوانترین وێنە و شێوەی پێدەبەخشرێت، بۆیە دووبارە ئەم وێنەپێدان و نەخشاندنە تەنها دەبێت کاری وێنەبەخش و جوانکار (المصور والبدیع) بێت، ئەگەر واش نیە ئایا دەکرێت زانایی یان شارەزایی لە نەزان و نەشارەزاوە سەرچاوە بگرێت؟! ئایا دەکرێت ئەو ئامێرە ئەندازیارییە پێشکەوتوانەی ڕۆژانە بەکاریان دێنین کەسێکی نەزان و نەشارەزا دروستیکردبن؟! ئایا دەکرێت ئەو سێتە پێشکەوتووانە لە یەکێکەوە بێت هیچ زانیارییەکی لەسەر ئەندازە و دیزاین نەبێت؟

هەربۆیە جارێکی دیکە دەڵێین کێشەی گومانکاران باوەڕنەبوونە —خۆ گەلێکمان پێخۆشە لەم بۆچونەماندا بەهەڵەدا چووبین— ئێوە دان بەم ڕاستیانەدا نانێن، ڕۆژانە ئەو هەموو ڕێکوپێکی و ئەندازەگیریە لە دروستکراوەکاندا دەبینن بەڵام نایگەڕێننەوە بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی، وتەنها بۆ ئەوەی دان بە خودایەتی خوادا نەنێن، خۆ لەو هەموو ناوازەیی و ڕێکی و بێهەڵەییە کە بە ئاشکرا

و بـێ خۆمانـدووکردن لـە دروستکراوەکاندا هەسـت پێـدەکرێن نـەزان دەکـەن و، وەپاڵ خودایەکی درۆینە یا خەیاڵکرد یا هیچ لـەبارا نـەبوویان دەدەن، دیارە هـیچ وەڵامێکی شیاو و زانستیشتان پێ نیە کە چۆن دەبێت لە پشت ئەم سیستەمە ورد و تۆکمە و ئەندازەیی و بـێ وێنەیـەی گـەردوون و خـودی مـرۆڤ خۆیـدا، زاتێکـی کارزان و بەتوانا و زانا نەبێت؟

چۆن دەکرێت زاتێکی عەلیم لەپشت دروستکردنی مێشکی مرۆڤەوە نەبێت کـە لەگـەڵ ئـەم هـەموو پێشـکەوتن و زانینـەدا تائێسـتا کـەمتر لـە ٢٥٪ی فرمـانی بەشەکانی زانراوە؟ چ ئاوەزێك ئەوە بە ڕاست دەزانێت کـە مـرۆ تـەنها بـۆ ئـەوەی تاکە یەك هەناسە بدات، سەدان و بگرە هەزاران هۆ و پێداویستی بۆ ڕام و فەراهەم کراون، ئەدی ئەو هەموو چالاکی و کارانەی بەشە جیاوازەکانی لەشی مرۆ و گشـت بوونەوەر و هەموو گەردوون تێکڕا، دەگونجێت لـە خـۆوە لـە خودایـەکی درۆینـەی بەستەزمانی بێدەسەڵاتەوە ڕێکخرابن و دروستکرابن؟ ئەوە چ ژیرییەکـە جیـاوازی لـە نێـوان هۆکـار و خـودای فەراهـەمهێنی هۆکـاردا نەکـەیت، هۆکارانێـك کـە خـودا بۆمـەی ڕامکـردون تـا بـژین، لێـت ببنـە خـودا و خـودای ڕەخسـێنەری هۆکـاران نەبینیت؟ وەلێ ئێمە لێرەدا دەپرسین: ئایا لەم گەردوونەدا دروستکراوێك هەیە لـە بچـوکترین تـا گـەورەترین، لـە زەڕەیـەك تـا مەجەڕەیـەك دروسـتکەرەکەیت —کـە خـودای کارلەجێیـە— پـێ نەناسـێنێت؟ بێگومـان بـە کـەمترین بیرکردنـەوە، مـرۆ دەگاتـە دەرەنجامی بـوونی خـالقێکی دانـا، زانـا وبێخـەوش وبەڕێوەبـەری هـەموو گـەردوون بـە مـرۆ وگشـت دروسـتکراوەکانی تریشـەوە، کـە ویسـتی هەیـە لـە ڕێکخستنی کارەکانیدا و بەردەوام ئاگـای لێیانـە: (إن الله يمسك السموات والارض أن تزولا ولئن زالتا إن أمسكهما من أحد من بعده إنه كان حليما غفورا) (فاطر:٤١).

بۆیە هیوادارین لەو کەسانە نەبین کە خوای گـەورە لەبارەیانـەوە دەفـەرموێت: (وكأين من آية في السماوات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون) (يوسف:١٠٥).

وتووێژی سەرەکی ئێمە لەگەڵ گومانکاراندا ئەم باسەیە، لە دوای ئەوە کە لەم خاڵەدا گەیشتینە ئەنجام، ئەو کات دەبێت دەستبکەین بە وتووێژ لەسەر پێغەمبەرێتی موحەممەد (درودی لەسەربێت) و بەڵگە ڕۆشنەکەی کە قورئانی پیرۆزە، ئەو کتێبەی کە ڕاستێتی پێغەمبەر ئاشکرا دەکات و گەورەترین شایەتی بۆ دەدات: (قل أي شيء أكبر شهادة قل الله شهيد بيني وبينكم وأوحي إلي هذا القران لأنذركم به ومن بلغ) (الأنعام:١٩).

بێگومان ئەو شاهیدیەیش بە هۆی ئەوەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان زانیاری خوداییان لە خۆ گرتووە: (لكن الله يشهد بما أنزل إليك أنزله بعلمه) (النساء:١٦٦).

باسکردنی کۆرپەلە و قۆناغەکانی لەقورئاندا، جگە لەوەی بەڵگەیە بۆ ناسینی بەدیهێنەرەکەی، باسکردنی خەلقە تا لە ڕێیەوە خالق بناسرێت، بیرخستنەوەی ڕۆژی دواییشە، وەپێشچاوخستنی ساتی وەرگرتنی پاداشتی چاکە و سزای خراپەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

(أيحسب الإنسان أن يترك سدى، ألم يك نطفة من مني يمنى، ثم كان علقة فخلق فسوى، فجعل منه الزوجين الذكر والأنثى، أليس ذلك بقادر على أن يحي الموتى) (القيامة:٣٦–٤٠).

ئێمە هەمیشە ئەوە دووپات دەکەینەوە کە: قورئان کتێبی هیدایەتە، پەرتووکی ناساندنی خودا و کێشانی نەخشەی فیکر و ئاکاری مرۆیە، ونیشاندانی ئەو دوو ڕێگەیەیە کە یەکیان مرۆ بۆ سەر جەحەندەم و ئەوی تریشیان بۆ ناو بەهەشتی دەبات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە ئایەتەکانی هەندێك ئاماژەی زانستییان تێدان، تا لەلایەکەوە شاهید بن لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەر (درودی لەسەربێت)، ولەلایەکی تریشەوە باوەڕی باوەڕهێن بەهێزترکەن و ملهوڕانیش پێیان زیاتر لەدین دەرچن، کە دیارە یەکێك لە هۆی بەموعجیزە مانەوەی قورئان ئەو ئامارە زانستیانەن –کە ئێوە نایانسەلمێنن– کە تا ڕۆژی هەستانەوە بەردەوام دەزانرێن و دەردەکەون.

(أيحسب الإنسان أن يترك سدى، ألم يك نطفة من مني يمنى، ثم كان علقة فخلق فسوى، فجعل منه الزوجين الذكر والأنثى، أليس ذلك بقادر على أن يحي الموتى) (القيامة:٣٦—٤٠).

لێرەدا پەروەردگار دەفەرموێت: ئایا مرۆڤ لای وایە هەروا وێڵی دەکەین؟ ئینجا ئەوە دەسەلمێنێت کە گومانێکی وا گەلەك پوچە و ڕاستی تێدانییە، دەفەرموێت: ئاخۆ ئەو دلۆپێك نەبوو، پاشان بوو بە عەلەقە و دروستی کرد و بە ئێسکە پەیکەر ڕاستی کردەوە، هەر لەو دلۆپە نێرو مێی چێکرد، ئاخۆ بەدیهێنەرێکی وا ناتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوە؟؟

وەك لە ئایەتە پیرۆزەکانەوە ئاشکرا دەردەکەوێت ئامانج لە هێنان و ڕیزبەندکردنی قۆناغەکانی کۆرپەلە، ڕیزبەندکردنێکی کۆرپەلەزانیانە و تۆمارکردنێکی ڕۆژ بە ڕۆژی گەشە و گۆڕانکارییەکانی کۆرپەلە نییە، بەڵکو ئاگادارکردنەوەی مرۆڤە لە چەند ڕاستیەك:

یەکەمیان: وێڵنەکردنی مرۆڤە لەهەمبەر هەر کارێك، چ باش چ خراپ، کە لە دونیادا دەیکات.

دووەم: نیشاندانی لاوازی مرۆڤ و بیرهێنانەوەیەتی کە ئەو تەنها دلۆپێك بوو، خودا سازی کرد و بە مرۆڤی چێکرد.

سێیەم: نیشاندانی ئەوەی ئەو خودایەی کە مرۆیەکی ساز و تەواوی لە دلۆپێك چێکرد، دەتوانێت مردووان زیندو و گۆڕبەدەر کاتەوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و هەر بۆ هەمان مەبەست کە مرۆ خودا بە خودا بناسێت و، بیر لە لاوازی خۆی بکاتەوە و نەخۆی و نە هیچ درووستکراوێکی تری لێنەبێتە خودا، خۆ بەپێچەوانەوە نەك خۆی خودا نیە بەڵکو هەر کارێکیش کە دەیکات لەسەری حسابە، جا پاداشت بۆ چاکەکان و سزاش لەسەر خراپەکان وەردەگرێت.

بـەڵێ لەگـەڵ ئەمانەشـدا و بـۆ هـەمان مەبەسـت، هـیچ لـەنگی تێدانییـە چـەند ئاماژەیـەکی تـەواو و دروسـتی زانسـتی لـە ڕیزبەنـدکردنی قۆناغـەکانی کۆرپەلـەدا هەبن، کە زانست ڕۆژ دوای ڕۆژ ئـەوە زیـاتر دەسـەلمێنێت کـە ڕیزبەندیەکـە تـەواو وەك ئـەوە وایـە کـە کۆرپەلـە پێیـدا تێدەپـەڕێت، وهـیچ جـۆرە نـا تەبابیـەك لـە قۆناخـەکان و ڕیزبەندیـە قورئانیەکـەدا نیـە، دیـارە هـەر دەبێـت وابێـت، خـودای بەدیهێنەری کۆرپەلە و خودای نێرەری قورئان هەر یەك نیە؟

لێرەدا ئـەوە دەڵـێین: ئێمـە دەزانـین قورئانەکـەمان چـی تێدایـە و باسـی چـی دەکـات، زۆر بـاش دەزانـین چـی لێمـان دەوێـت و چـیمان پێـدەدات، دەزانـین سەرەکیترین کاری ڕێنوێنی مرۆڤە بۆ ناسینی خودا ونیشـاندانی ئـەو ڕێگەیەیـە کـە دەیباتە نێو بەهەشت، وئاگادارکردنەوەشیەتی لـەوەیان کـە بـۆ نێـو جەحەنـدەمی دەبات، ئێمە نەمان گوتووە قورئانەکەمان پەرتووکێکی کۆرپەلەزانیە و سات دوای سات هەموو گۆڕانکاری وڕووداوەکـانی کۆرپەلـەی هـەر لـە ئـانی یـەکگرتنی تـۆو و هێلکـەوە هـەتا لـەدایك بـوون تێدایـە، ئاشکراشـە ناکرێـت ئـەوە لـە پـەرتووکێکی ئاسمانی چاوەڕوان بکرێت.

بەڵکو مە دەڵێین: وێڕای ڕوونکردنەوەی ئامانجـەکانی بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوان لەلایـەن خـودای باڵادەسـتەوە، وبـۆ هـەمان مەبەسـت قورئـان چـەندین ئامـاژە وئیعجازی زانستی لە خۆ گرتووە وبە تێپەڕینی کات ئەو ئیعجازە زانستییانە زۆرتـر ئاشکرا دەبن وزیاتر دەدرەوشێنەوە، ئەمەش لایەنێکی تەواوکاریی لایەنەکانی تری ئیعجاز و تەحەدی قورئانە، کە بەرانبەر هەردوو بنیادەم و جنۆکـان ڕایگەیانـدووە، کـە وان گـەر هـەردوو یـەکبگرن و زانسـت وڕەوانبێـژی و هەرچـی دی کـە دەیـزانن لەسەریەکی کەڵەکە بکەن هەتا ڕۆژی دوایی، ناتوانن بە وێنەی یەك سوورەتیشـی بێنن، واتە بەلای مەوە ئیعجازی زانستی بەشێکی لەو تەحەددایە تێدایە کە قورئان ڕایگەیاندووە، ئەوجا گەر ئێوە باوەڕدارن بە قورئـان بـەڵام لـە ئیعجـازی زانسـتیدا

لەگەڵمان یەکنایەنەوە و ڕاتان لـە ئیعجـازی زانسـتی نییـە، ئـەوە وەك هەنـدێك لـە موسوڵمانان کە وانیش زۆر لەگەڵ بابەتی ئیعجـاز لەگـەڵ مـە تـەبا نـین، برامـانن و ڕێزی بۆچوونەکەتان لە بان سـەر و چـاو دادەنـێین و ئـەو جیاوازییـە لـە بۆچـووندا جگە ڕێز هیچ بۆ نێوانمان زیاد ناکات.

بــەڵام ئەگــەر خوانەخواســتە ئێــوە هــەر باوەڕتــان بــە خــودا و قورئــان و پێغەمبەرەکەشمان نەبێت، بەڕاستی ئەمـە کارەساتە و لـە پێشدا داوای خێرتـان لەخودای دلۆڤان بۆدەکەین و دەڵێین: خودای گەورە لەسەر ئەو ڕێیەتان لادات کـە بۆ ناوەڕاستی ئاگری جەحەندەمتان دەبات، خۆ گەر بێدینی خۆتان ئاشـکرا کـرد و بـەردەوامیش بـوون لەسـەری، ئـەوا بـە پشـت ئەسـتوور بـە خـودای کارلـەجێ و بـاوەڕبوونی تـەواو بـە ڕاسـتێتی قورئانەکـەمان، یـەك یـەك گومانـەکانتان پـووچ دەکەینــەوە و ئــەو ڕیســە چــڵکنەی بــۆ گــرتنی بــەری خــۆری ڕاســتی و چــاوی ساویلکانتان ڕستووە، بۆتان دەکەینەوە بەو خوریە کـە وەك دڵـی کـافران و کـاری دووڕووان قەترانیە: (بل نقذف بالحق علي الباطل فيدمغهه فاذا هو زاهق ولكم الويل مما تصفون) (الأنبياء:١٨).

هــەروەها ئــەوەتان بـۆ دەسـەلمێنین کـە ئەوانـەی بـەنیازی بەدرۆخستنەوەی قورئان هاتوونە مەیدان، ئەوا یا لە کۆتاییـدا ڕاسـتییان بـۆ دەردەکـەوێت و خۆیـان دەبنە پارێزەر و خزمەتکاری قورئان —کە ئێمە پڕ بەدڵ ئەمـەیان بـۆ دەخـوازین— یا لانـی کـەم بۆیـان ئاشـکرا دەبێـت کـە چ خودکوژیـەکیان کـردووە بـە گیرکردنـی قۆچی ڕزیو وشکاوی خۆیان لە چیای پتەوی ڕاستییەکانی قورئان، وچۆن بوونەتـە پاشقافڵەی ئەو کاروانەی کە ئـەبو جـەهل سـەرقافڵەیەتی، وبەچاوساخی شـەیتان بەرەو شیوەکانی دۆزەخ شۆڕدەبێتەوە، و جگە مایە پووچی هیچ بـۆ سـەر باریـان زیاد ناکەن، خودا پەنامان بدات، کە ئێمە ئەمە بۆ کەس ناخوازین.

لێرەشدا هەندێ تێبینی دەخەینەڕوو سەبارەت بەو گومانەی کە دەڵێن قورئـان نەیفەرمووە: (شيء مثل علقة)، واتە: شتێکی وەك عەلەقە:

دەڵێین: قورئان کتێبی ڕێنماییـە وکتـێبی زانسـتیی ڕووت نیـە بـاس لـە هـەموو زانستەکان بە درێژی بکات، ئەو ئاماژە زانستیانەش کە لە قورئاندا هەن یەکێك لـە ئامانجەکانی ئەوەیە کە بزانرێت ئەم زانیارییانە خودایین و دواتر کە دڵنیابوون ئەم کتێبە بـە نیگـا هـاتووە، فەرمانبـەردار و گوێڕایـەڵی ووتـەکانی بـن کـە سـەرەنجام بەختەوەری دونیا و سەرفرازی دوارۆژ بەدوای خۆیدا دێنێت.

قورئانی پیرۆز نەك لـە باسـە زانسـتیەکاندا بـەڵکو لەهـەموو دارشـتنەکانیدا بـە شایەتی هەموو شارەزایان لە بەرزترین ئاستی ڕەوانبێژیدایە، ڕوویەکی ڕەوانبێژیش ئەوەیـە لـە کـەمترین ووشـەدا جـوانترین و دروسـتترین واتـا ببەخشـێت، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: (أوتيت جوامع الكلم) واتـە: کـۆکراوەی ووشـەکانم پێـدراوە، زانایان لەبارەی واتای ئەم فەرمودەیەوە دەڵێن: (يعني القرآن، بقرينة قوله: بعثت، والقرآن هو الغاية في إيجاز اللفظ ، واتساع المعاني) واتـە: قورئـانی پێـدراوە کـە لەوپەڕی کورتی دەربڕین و فراوانی واتادایە.

لەمـەوە ڕوون دەبێتـەوە کـە دەربڕینـەکانی قورئـان کـورتن بـەڵام زۆرتـرین و ڕاستترین واتا دەبەخشن، هەر بۆیە زۆر ئاساییە ووشـەیەك لـە قورئانـدا هـەبێت و چەند واتایەك ببەخشێت و هەموویشیان ڕاسـت بـن، کـە نموونـەکان زۆرن، لەسـەر ئەمە یەك نمونە دێنمەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (الله الذي يرسل الرياح فتثير سحابا) (الـروم:٤٨)، لێـرەدا پەیوەنـدی بـا و هـەور خـوای گـەورە بـە ووشـەیەك بەیەکیان دەبەستێتەوە کە (تثير)ە، وشەی (تثير) لە زمانی عەرەبیدا بـە دوو واتـا هاتووە: ١- (الاظهار) دەرخستن. ٢- (التهييج) جوڵاندن و ووروژاندن.

زانایـان دەڵـێن بـا هـەم هۆکـاری ووروژانـدنی هەورەکانـە و هـەم هۆکـاری دەرخستنیانە، ئەگەر بوترێـت (الريـاح تهيج السحاب) یـان بوترێـت (الريـاح تظهـر

السحاب) هـەردووکیان ڕاسـتن، بـەڵام تـەنیا لایـەنێکی پەوەندییەکـە دەبەخشـێت، لەبەرئـەوە هـەتا واتـای زیـاتر ببەخشـێت دەبێـت بڵـێین: (الریـاح تهـیج السـحاب وتظهـره) لـەم کاتەیشـدا دەربڕینەکـە درێـژ دەبێتـەوە، بۆیـە ڕاسـترین دەربـڕین ووشەکەی قورئانە کە (تثیر)ە.

لێـرەدا دەپرسـین؟ کاتێـك تەفسـیرزانانی پێشـین ئـەم ووشـەیەی قورئـان لێکدەدەنـەوە، دەبێـت کـام واتایـەیان هەڵبـژێرن؟ بێگومـان واتـای جوڵانـدن هەڵدەبژێرن، هۆیەکەیشی ئاسانە ئەوەیە کە لەگەڵ ئـەوەی زمانی خۆیـان بـووە و زانیویانـە ئـەم وشـەیە دوو واتـا دەگەیـەنێت، بـەڵام واتـای دەرخسـتن یـان بـاس نەکردووە، چونکە زانستی ئەو کاتە نەگەیشتبووە ئەو ڕاستییەی کە باکـان دەبنـە هۆی بەدەرکەوتنی هەورەکان.

ئینجـا لـە باسـکردنی قۆناغـەکانی کۆرپەلـە قورئـانی پـیرۆز چـەندین زاراوە و دەبـڕینی نـوێ بـەکاردەهێنێت کـە لـە کـەمترین ووشـە و دەربرینـدا زۆرتـرین و ڕاسترین واتا ببەخشن، با لێرەدا وشەی (علقة) وەربگرین ، کە لە زمانی عەرەبیدا بە چەندین واتا هاتووە لەوانە:

١- پێوەنووسان و هەڵواسین بە شتێکەوە.

٢- خوێنی وەستاو.

٣- خوێنی تەڕ.

٤- کرمی زەروو.

لەم قۆناغـەدا کۆرپەلـە دیـارترین ڕووداو کـە تیایـدا ڕوودەدات دەتـوانین بڵـێین واتای ووشەکانی (علقة)یە، چونکە بـە دیـواری منداڵدانـەوە دەنووسـێت، هـەروەها سوڕی خوێن دروست دەبێت بەڵام نەکەوتوەتـە جوڵـە و وەسـتاوە لەگـەڵ ئـەوەی خوێنەکە تەڕە پاشـان شـێوەی کۆرپەکـە لـە (نطفـة) وە کـە خـڕ و گۆییـە درێـژ و لاکێشەیی دەبێتەوە کە تا شێوەی زەروو وەردەگرێت.

له کتێبی (جواهر البلاغة–سید أحمد الهاشمي–طبعة دار الفكر ١٩٩٤– لاپەڕە ٢٣٤ و ٢٤٠)دا دەڵێت: بەهێزترین و ڕەوانبێژترین بەراوردکردن وشوبهاندن (تشبیه) ئەوەیە کە ئامرازی تەشبیهەکە و ڕووی شوبهاندنەکە (وجه الشبه) لابرابێت، بۆ نموونە گەر بڵێین: علي كالأسد (أو مثل أسد) في الشجاعة، ئەگەر ئامرازی شوبهاندنەکە (کاف، مثل) لاببەین، و بڵێین: (علي أسدٌ في الشجاعة) ئەوا ڕەوانبێژتر دەبێت، خۆ ئەگەر ڕووی شوبهاندنەکەیش لابرێت، ڕەوانبێژییەکەی زیاتر دەبێت، واتە بڵێین: (علي أسدٌ)، لەبەر ئەوە کە بەراوردێك کرا و ئامراز و ڕووی شوبهاندنەکە لابرا بوو، ئەوە ناگەیەنێت وەسفکراوەکە خۆی ئەو شتەیە، بۆ نموونە بڵێین: (علي أسدٌ) واتە: عەلی خۆی ئاژەڵی شێرە!! هەروایش کە دەوترێت کۆرپەلە بەراورد کراوە بە (علقة) واتای وا نیە کۆرپەلەکە زەرووە...

ئینجا شتێکی تری گرنگ کە پێویستە باسبکرێت، ئەوەیە کە کاتێك گومانکاران دەڵێن نابێت وشەی (علقة) بە واتای زەروو لێك بدرێتەوە چونکە بە ڕای وان ئەگەر وا لێکدرایەوە ئەوا واتاکەی دەبێتە ئەوەی کۆرپەکە زەرووە، دیارە ئەوەیش هەڵەیە خۆ کۆرپەلە زەروو نیە، وەڵامی ئەمەیش وەك بەشێکی لەسەرەوە درایەوە بەشێکی تری ئەوەیە: کە زانایان لە دانانی ووشەیەك (زاراوەیەك) بۆ قۆناغێکی کۆرپەلە، یاسای تایبەتیان هەیە هەتا زاراوەیەکی گونجاو بۆ هەر قۆناغێکی کۆرپەلە دابنێن، بە جۆرێك لە قۆناغی پێش خۆی و دوای خۆی بە ئاسانی جیای بکاتەوە و دووری بکات لە بەیەکداچوون، ئەو یاسایەنەیش ئەمانەیە:

١– دەبێت وەسفی ڕووکەشەکەی بکات.

٢– دەبێت ئەو کردارانەی لە هەر قۆناغێکدا ڕودەدەن تێیدا ڕەنگ بداتەوە.

٣– دەبێت دوور بێت لە بەیەکداچون و تێکەڵکردن لە سەرەتا و کۆتاییەکەیدا.

(وەرگیراوە لە لێکۆڵینەوەی هاوبەشی پرۆفسۆر .کیث مۆر و عبدالمجید زیندانی و د.مصطفی أحمد) کە لە کۆنگرەی یەکەمی ئیعجازی زانستی پێشکەشیان کرد).

به پێی ئەو ئالۆزییە زۆرەی کە لە قۆناغەکانی کۆرپەلەی مرۆڤدا هەیە، کە لە ماوەی گەشەکردنەکەیدا گۆڕانی بەردەوامی بەسەردا دێت، زانایان لە ڕێکخستنی گەشەی کۆرپەلە بۆ چەند قۆناغێك بەرەو ڕووی دژواری و گرفت بوونەوە. هەربۆیە ئەم یاسایانەیان دانا تا لە جیاکردنەوەی قۆناغەکاندا سەرکەوتووبن.

نمونەیەك لەسەر ئەوە: لە قۆناغی سەرەتای کۆرپەلە دوای پیتاندنی هێلکە زانایان زاراوەی (Morula) یان بۆ دانا، کە واتای (تووە) ئەویش لەبەرئەوەیە کە لەو قۆناغەدا کۆرپەلە کەمێك شێوەی توو وەردەگرێت، ئایا دەکرێت بڵێین چۆن کۆرپەلە بە توو ناودەبرێت، ئایا کۆرپەلە تووە؟!

ئایا دەبێت بڵێین ئەم قۆناغە شلە بەڵام توو شل نیە لەبەرئەوە زانایان بە هەڵەدا چوون، یان ڕەنگی توو لەگەڵ ڕەنگی ئەم قۆناغە جیاوازە، بێگومان زانایان ئەگەر ووشەیەکی دیکەیان بدۆزیایەتەوە کە هەم شێوەی دەرەوە و کرداری ناوەوە و بەجۆرێك لێکچونی زیاتری هەبوایە بەو قۆناغە بێگومان ئەو وشەیەیان دادەنا بەڵام کاتێك ئەو یاسایانەیان دانا بۆ ناونانی هەر قۆناغێك، ئایا بۆ هەموو قۆناغێك زاراوەی وا دەدۆزرێتەوە هەموو یاساکەی بەسەردا جێ بەجێ بێت؟ بێگومان نەخێر، بەڵام هەوڵ دەدەن زاراوەیك بێت باشترین بێت، هەروا زاراوەی تۆو sperm یان هێلکە ovum....تاد، ئایا ئەو زاراوانە غەڵەتن لەبەر ئەوەی چوێنراوە بەو شتانە؟؟

کاتێك یەکێکی وەك (پرۆفیسۆر مارشاڵ جۆنسن) کە زانایەکە جیهانییە و سەرۆکی بەشی توێکاری و بەڕێوەبەری پەیمانکای (دانیال)ە لە زانکۆی (تۆماس جیفرسۆن) لە (فلادلفیا)ی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاش ئەوەی زاراوە قورئانیەکانی بۆ باسکرا لەبەردەم زاناکانی تردا هەڵسا و لێکۆڵینەوەکەی لەسەر ئیعجازی زاراوە قورئانیەکان پێشکەشکرد، کە لە یەکێك لە وتەکانیدا وتی:

“The Quran describes not only the development of external form, but emphasizes also the internal stages,

the stages inside the embryo, of its creation and development, emphasizing major events recognized by contemporary science".

واتە: لە ڕاستیدا جگە لەوەی قورئان ڕاڤەی قۆناغە دەرەکیەکانی کردووە، جەختی لەسەر ئەو قۆناغانەش کردۆتەوە، کە لەکاتی دروست بوون و گەشەکردنیدا بەسەر ناوەوەی کۆرپەلەدا دێن، ئەمەش بۆ جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەو ڕووداوە سەرەکیانەی، زاناکانی ئەمڕۆ شارەزای بوون، ئەمەیش وتەکەیەتی بە ڤیدیۆ:

http://www.youtube.com/watch?feature=player_embedded&v=oVAF1y-nvCM!#

یەکێکی دیکە لە بەناوبانگترین زاناکانی جیهان لە کۆرپەلەزانیدا (پرفیسۆر کیث مۆر) لە بارەی زارەوە قورئانیەکانەوە بۆ قۆناغەکانی کۆرپەلە لەبەرچاوی سەدان زانای جیهانی وتی:

–Because the staging of human embryos is complex, owing to the continuous process of change during development, it is proposed that a new system of classification could be developed using the terms mentioned in the Quran and Sunnah. The proposed system is simple, comprehensive, and conforms with present embryological knowledge.

واتە: بەهۆی ئەو گۆڕانە بەردەوامانەی بەسەر کۆرپەلەدا دێت، لێکۆڵینەوە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە ئاڵۆزە، لەبەرئەوە دەکرێت سیستمێکی نوێ بۆ جیاکردنەوەی قۆناغەکان بنیات بنرێت، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو زاراوە و چەمکانەی کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراون، بێگومان ئەم سیستمە نوێیەش بە ئاسانی تێگەشتن و وردییەکەی جیادەکرێتەوە، زیاد لەوەش لەگەڵ زانستی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆدا ڕێك دەکەوێت.

"The intensive studies of the Quran and Hadith in the last four years have revealed a system of classifying human embryos that is amazing since it was recorded in the seventh century A.D… the descriptions in the Quran cannot be based on scientific knowledge in the seventh century…"

واته: لێکۆڵینەوە چڕوپڕەکانی ئەم چوار ساڵەی دوایی دەربارەی قورئان و فەرمودە سیستمێکی پۆلێن کردنی قۆناغەکانی کۆرپەلەی مرۆڤی بۆ دەرخستین، کە ئەوەش جێگای سەرسامیە چونکە ئەو زانیارییانە لە سەدەی حەوتەمدا تۆمار کراوە.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەسفکردنی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قورئاندا ناگونجێت لەسەر مەعریفەی زانستیی سەدەی حەوتەم بنیات نرابێت، ئەمەیش ووتەکانی ئەو پرۆفیسۆرەیە بە ڤیدیۆ:

- http://www.youtube.com/watch?feature=player_embedded&v=ywfB-OqBRww
- http://www.youtube.com/watch?v=PJefjhpR1Ds
- http://www.youtube.com/watch?v=upa4BSH7ua4&feature=related

هەندێك لە گومانكاران دەڵێن ئەم پرۆفیسۆرە هەڵخەڵەتاوە، لەوەڵامدا دەڵێم ئایا چ هۆكارێك هەیە لە پشت پێویست بوونی هەڵخەڵەتاندنی ئەو پزیشكەوە لەكاتێكدا ئەو خۆی كەسێكی ناسراوی بواری پزیشكییە و مامۆستای زانكۆیە ودانەری كتێبی (گەشەكردنی مرۆڤە) كە بۆ چەندان زمان وەرگێڕدراوە، دیارە كەسێكی ناسراوی مامۆستای زانكۆ كە هەزاران دانە لە كتێبەكەی فرۆشرابێت پێویستیشی بە پارە نییە ئەمە لە كاتێكدا كە ئەو پیاوە تەمەنی نزیكەی ٦٠ساڵەو بابایەكی ڕۆژئاواییە وزیاتر لەگەڵ ئەوە دەڕوات پێویستی بە دەركەوتن نەبێت (كە خۆی پێشتر دەركەوتووە) وەك چۆن هەندێك لای خۆمان دیار نین و بە ئەنجامدانی كاری نەشیاو وناقۆڵا گەرەكیانە دەربكەون وبناسرێن.

دەڵێن (کیث مۆر) شارەزای زمانی عەرەبی نییە بۆیە هەڵیانخەڵەتاندووە، ئەم قسەیە کاتێك ڕاستە کە بۆ واتای ووشە قورئانیەکان وەرگێڕانی ناڕاستی بۆ کرابێت وپێی وترابێت واتای ئەم ووشەیە ئەمە دەگەیەنێت، بۆ نموونە پێی بڵێن: (نطفة أمشاج) واتای( تووە)، ئەویش هێندە خۆشباوەڕ بێت خێرا ئەو قسەیە بە جیهان بگەیەنێت لە کۆنگرەکاندا لەبەردەم زانا بەناوبانگەکانی تری کۆرپەلەزانیدا ئاشکرای بکات! لەبەرئەوە ئەم گومانە جگە لەقسەیەکەی بێ بنەما هیچی تر نیە.

یان لە واتای ووشەی (علقة)دا کاتێك واتاکانی وشەی (علقة)ی پیشاندرا واتایەکی بە درۆ پێ وترابێت کە لە زمانی عەرەبیدا و لە (لسان العرب) و (معجم)ەکاندا نەهاتبێت؟؟ بێگومان نەخێر.

پاشان (کیث مۆر) مرۆڤێکی لێکۆڵەرە گەر عەرەبیش نەزانێت توانای گەڕانی دوو فەرهەنگ و سەرچاوەی زمانەوانی هەیە کە بزانێت واتای ئەو ووشانەی کە پێی وتراوە چییە، (کیث مۆر) کاتێك بەراوردی کۆرپەلەی بە (زەروو) کرد، لە چەندین کۆنگرەدا لەبەردەم دەیان زانای ئەو بوارەدا باسی دەکرد، باشە ئەگەر ئەو هەڵخەڵەتابوو بۆچی کەسیان هەڵنەسایەوە بڵێت ئەمانەی تۆ دەیڵێیت ڕاست نین، بەپێچەوانەوە چوار لە پرۆفیسۆرە جیهانیەکانی تری ئەو بوارە قەناعەت پێبکات و ئەوانیش بەشداری لە نیشاندانی ئیعجازەکانی قورئان و سوننەت لە کۆرپەلەدا بکەن، و لە کۆنگرەکاندا بە بەرچاوی زانایانەوە گەورەیی قورئان لەو بوارەدا باسبکەن و دواتریش لێکۆڵینەوەکانیان بکرێتە کتێب و بڵاو ببێتەوە:

http://www.youtube.com/watch?v=zj96vVTBU9o&feature=relmfu

http://www.youtube.com/watch?v=RU3MHtlEkeA&feature=relmfu

لە دوو توێی کتێبی ناو ئەم لینکەدا لێکۆڵینەوەکان باسکراوە:

http://www.islamhouse.com/p/339047

ئایا ئەو زانایانەش هەڵخەڵەتێنران؟! ئایا کەسیان کە پێشەنگن لەو بوارەدا نەیاندەزانی کە کۆرپەلە لە (زەروو) ناچێت، یان لە (شتێکی جوراو) ناچێت، یان ئەو هەموو وەسفانەی قورئان و سوننەت کە بۆ کۆرپەلەی کردووە و دەیان زانیاریی دەبێت، بۆچی یەکێکیان لە کۆنگرەکاندا هەڵنەسایەوە یان دوای کۆنگرەکان ئاشکرای بکات ئەو زانیارییانە هەڵەن:

http://haiv.org/test/?p=2633%D8%A6%DB%95%D9%85%DB%95

ئەم لینکەی سەرەوە لیکۆڵینەوەکەی (کیث مۆر)ە، کە بە تەنیا پێی نەوتراوە (علقة) واتای (زەرووە)، هەموو واتاکانی تریش خۆی باسی دەکات.

ئەمەیش لێکۆڵینەوەکەی (مارشاڵ جۆنسن)ە:

http://haiv.org/test/?p=2164

پاشان ئەمان پسپۆڕی ئەم زانستەن ئەگەر گومانکاران خۆیان لەمانە بە شارەزاتر دەزانن ئەوە قسەمان نییە!!!

بۆ دانانی زاراوەیەك زاناکانی کۆرپەلە دەگەڕێن بۆ ناوێك تا زۆرترین یاسا بگرێتەخۆی وەك پێشتر باسی یاساکانیمان کرد، ئینجا ئەو پرۆفیسۆرانە ئیشی خۆیانە باشتر دەزانن کاتێك ووشەکانی قورئانیان پێووتن لەگەڵ واتاکانی هەر ووشەیەك زانییان ئەو زاراوانەی قورئان وردترین وەسفی قۆناغەکەن، هەربۆیە تووشی سەرسوڕمان بوون لەو ئاستە بەرزەی خۆیاندا، ودەستیانکردە ووتاردان لەسەر ووشەکانی قورئان لەسەر کۆرپەلە.

سەبارەت بەو وێنە هێڵکارییەی روونکەرەوەی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەیە (ووردتر بڵێین لە سەرەوە گیراوە نەك لەلاوە) پرۆفیسۆر (کیث مۆر) لە کتێبی (The Developing Human)دا دەڵێت:

Diagrammatic Sketches of dorsal views of the embryonic disc showing how it lengthens and changes shape during the third week....chapter4 - page57.

واته: وێنەیەکی هێڵکاریی ڕووی پشتیی خەپلەی کۆرپەلەیە کە پیشانی دەدات چۆن شکڵی کۆرپەلە درێژدەبێت ودەگۆڕێت لە هەفتەی سێیەمیدا، کە ئەمە ڕوخساری دەرەوەیە نەك پێکهاتەی ناوەوە، کۆرپەلە لەم سەرەتایەدا ناوەوەی تەنها چینێك خانەی ترە و گۆڕانکارییەکان لە دەرەوە بۆ ناوەوە دەستپێدەکات.




ئەو وێنە هێڵکارییە دەقاودەق لە وێنەی ڕاستەقینەوە وەرگیراوە و ڕوونکەرەوەی ڕاستەقینەی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەیە لەو قۆناغەدا، ئێمە لەم وێنەیەدا باسی لێکچوون لەشکڵ (شکڵی دەرەوە) و کرداردا دەکەین لەنێوان کۆرپەلەی سەرەتایی و زەرووددا (نەك لە پێکهاتەی لەشیاندا)، کە ئاشکرایە کرمی زەروو و کۆرپەلە زۆر جیاوازن لە پێکهاتەی لەشیاندا (کە ئەمە هەموو کەسێکی سادەش دەیبینێت)، بەڵام لەشێوەدا لەم قۆناغەدا کە وێنەی کۆرپەلە دەبینین (جا ڕاستەقینە بێت یان هێڵکاریی) و بەراوردی بکەین لەگەڵ کرمی زەرووددا لێکچوونێکی تەواو دەبینین (هەردووکیان سەرێکی گەورە، لەشێکی پارچە پارچە یان بەش بەش، کلکێکی باریکتریان هەیە و هەردووکیشیان بەخوێن مژین لە قوڕگ یان پێست لەلایەن زەرووەوە و کۆرپەلەش بەمژینی پێویستیەکانی لەخوێنی دایکیەوە دەژین).

بابـەتی زاراوە قورئانیـەکان، کـە پێشـتر باسمـانکرد بـە شـایەتی پێـنج زانـای ناسراوی پزیشکی و کۆرپەلەزانی رۆژئاوا باشترین زاراوەن بۆ وەسفی کۆرپەلە لـەو قۆناغانـەدا، ئەمـە پێویسـتی بـە کـۆنگرەی جیهـانی هەیـە بـۆ جێگیرکردنـی ئـەم زاراوانـەو گـۆڕینی زاراوە کۆنـەکان (لەگـەڵ بـوونی ئینصـاف و دوورکەوتنـەوە لـە دەمارگیریی ئاینی و نەتەوەیی) کـە چـەند هـەوڵێکی سـەرەتایی لـەوبوارەدا نـراوە بەڵام کاری زیاتری دەوێت، هەربۆیە لە سەرچاوەکانی کۆرپەلەزانیدا جـارێ باسـی زاراوە قورئانیـەکان نـەکراوە بـۆ وەسـفی قۆناغـەکانی گەشـەکردنی کۆرپەلـە، هەرکەسـێك کـە خـاوەنی سەرچـاوەیەکی بـاوەڕپێکراوی زانسـتی بێـت نایـەت لەخۆیەوە زاراوەکان بگۆڕێ و زاراوەی نوێ جێگیربکات تـاوەکو کـۆدەنگی لەسـەر نەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو وەسفەی بۆ کۆرپەلە کراوە لەم قۆناغەی گەشـەکرنیدا لە هەموو سەرچاوەکانی کۆرپەلەزانیدا لەگەڵ وێنەکانیـدا بـە تـەواوەتی لـە شـکڵی دەرەوە و کرداریدا لە کرمی زەروو دەچێت، هەرئەوەندەیـە کـە نـاوی نـاهێنن بـەو شێوەیە.

موفەســـیرەکانی قورئـــان زاراوەی زەروویـــان هێنـــاوە و کۆرپەلەشـــیان پێشوبهاندووە کە پێشـتر هەرئەوەنـدەیان زانیـوە کـە کۆرپەلـە وەك کرمـی زەروو رەنگـی سـوورە و ووردەکـاریی تریـان نـەزانیوە، بـەڵام کـە زانسـتی کۆرپەلـەزانی پێشکەوت ئینجا ووردەکارییەکانی تری شکڵی دەرەوە و کـرداری کۆرپەلـەیان لـەو قۆناغەدا بۆ باسکردین کە دەقاودەق لە زەروو دەچێت تەنانەت لە رەنگیشدا.

سەبارەت بە مەنهەجی راغیبی ئەصفەهانی لە کتێبی (مفردات ألفـاظ القـرآن)دا، ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ کەسێکی شـارەزا و زانـا بـە مەنهـەجی ئەصـفەهانی (کـە کەسێکی پسـپۆڕە لـەم بـوارەدا!!!) ئـەویش موحـەقیقی کتێبەکەیـەتی (صـفوان عدنان داودی)، دەبینین ئەصـفەهانی موفەسـیرێکی گـەورەی قورئـان بـووە پـێش ئەوەی زمانزان بێت، و خاوەنی ئەم تەفسـیرانەیە: (جـامع التفسـیر کـە درێژەکـەی

١٠بەرگ و کورتکراوەکەی ١ بەرگە، تفسیر متشابهات القرآن، تحقیق البیان في تأویل القرآن)، لە کتێبی (مفردات ألفاظ القرآن)یشدا مەنهەجی بریتیە لە تەفسیر کردنی زاراوە قورئانیەکان و لێکدانەوەی ماناکانیان و بەستنەوەی مانا زمانەوانیەکانیان بەلێکدانەوە تەفسیرییەکان، کە سەرەتا بە زاراوە قورئانیەکانی تر (تفسیر القرآن بالقرآن) پاشان بە فەرموودەکان و ووتەکانی هاوەڵان و تابیعییەکان، کەواتە مەنهەجەکەی مەنهەجێکی تەفسیرییە بۆ زاراوە قورئانییەکان.

سەبارەت بە ئاشنانەبوونی زانایان و پسپۆڕانی بوارە زانستییە جۆراوجۆرەکان بە ئاماژە و زاراوە زانستییە قورئانییەکان، ئەمەیان خەتای موسوڵمانانە کە نەهاتوون ئەم زانستە بەجیهان بگەیەنین، کە دڵنیام زانای زۆر بەئینصاف هەن کە کاتێك هەقیقەت دەبینن دانی پێدادەنێن و شایەتی بۆ دەدەن، وەك چۆن تەنها یەك کەس کە پرۆفیسۆر (عبدالمجید زیندانیە) توانی قەناعەت بە ١٤ زانای زانستە جۆراوجۆرەکان بکات کە شایەتی بۆ راستێتی و دەستپێشخەریی قورئان بدەن کە پێنجیان لە گەورە زانایانی پزیشکی و کۆرپەلەزانین.

تێبینی: خوێنەری بەڕێز تکایە سەیری وێنەکانی هاوپێچی وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەرە (٥٢٣-٥٢٤) بکە بۆ روونبوونەوەی زیاتری بابەتەکە.

# ڕەواندنەوەی چەند گومانێك سەبارەت بە ئیعجازی پێشەسەر (الناصیة)لەنێوان قورئان و زانستدا[150]

ئیعجازی زانستی پێشەسەر لە قورئان و فەرموودەدا لە ڕووی زمانەوانی و هەم لە ڕووی زانستی پزیشکیەوە ئیعجازێکی ڕۆشنە، بەلآم هەندێك کەس گومان بۆ ئەم بابەتە دروستدەکەن و پێیان وایە ئەم باسە ڕووی ئیعجازی تێدانیە، لە وەلآمی ئەوانەدا سەرەتا دەڵێین:

باسی پێشەسەر لە قورئان و فەرمودەدا یەك جار باسنەکراوە، بەڵکو چەندین جار دووبارە کراوەتەوە و ڕایگەیاندوە پێشی سەر جیا لە هەموو ئەندامەکانی تر تایبەتمەندی خۆی هەیە، بێگومان ئەم دووبارە کردنەوانە لە قورئان وفەرموودەدا بەمەبەست هاتوون و بەڵگەن لەسەر دووپاتکردنەوەی ئەو ڕاستیە زانستیەی باسی پێشەسەر (ناصیة) دەکات کە چەند سیفەتێکی دراوەتەپاڵ و مرۆڤایەتی تا سەدەی نوێ نەبێت نەیزانیوە، ئەو ئایەت و فەرمودانەش کە باسی پێشەسەری تێدا هاتووە ئەمانەن:

- {إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ} (هود ٥٦)، واتە: بەڕاستی من پشتم بەخودا بەستووە کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێك نییە کە خودا بگری پێشەسەری نەبێت (لەژێر ڕکێفی خوای گەورەدا نەبێت)، بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە.

[150] ئم بابەتە بەهاوبەشی لەگەڵ (ئەندازیار خالد حسن علی) لە ژمارە (٣٢)ی ساڵی (٢٠١٣)ی گۆڤاری (هەیف)دا بڵاوکراوەتەوە.

- {يُعْرَفُ الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ فَيُؤْخَذُ بِالنَّوَاصِي وَالْأَقْدَامِ} (الرحمن: ٤١)، واته: خراپەکاران بە رووخسارياندا دەناسرێنەوە ئەمجا راتەکێشرێن بە پێشەسەريان و بەقاچيان بۆ ناو دۆزەخ.

- {كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ * نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ} (العلق: ١٥-١٦)، واته: بەڕاستی ئەگەر وازنەهێنێ (ئەبو جەهل) رايدەکێشين بەتوندی بەپێشەسەری، کە پێشەسەرێکی درۆزنی بەهەڵەدا چووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: {ما أصاب أحداً قط هم ولا حزن فقال: اللهم انى عبدك وابن عبدك وابن أمتك، ناصيتى بيدك، ماضٍ فى حكمك عدل فى قضاؤك أسألك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو علمته أحداً من خلقك أو أنزلته فى كتابك أو استأثرت به فى علم الغيب عندك أن تجعل القرآن ربيع قلبى، ونور صدرى، وجلاء حزنى، وذهاب همى، إلا أذهب الله همه وحزنه و أبدله مكانه فرجاً} (حديث صحيح رواه الإمام أحمد).

ئەو گومانانەی بۆ ئەم ئیعجازە دروستدەکرێن، ئەمانەن:

**گومانی یەکەم** دەڵێت: وشەی (الناصية) لە بنەڕەتی زمانی عەرەبیدا بە واتای پێشەسەر نایەت، بەڵکو بە مووی پێشی سەر دەوترێت، و هەموو قاموس و فەرهەنگەکان دەڵێن قژی پێشەسەر، ئایا قژ سەنتەری درۆ و هەڵەی تێدایە؟! لەبەرئەوە لەڕووی زمانەوانیەوە، ئیعجازەکە هەڵدەوەشێتەوە.

وەڵام: ئەم گومانە بنەمایەکی نیە و دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا وشەی (الناصية) بە زۆری بە (پێشی سەر) هاتووە، بۆ نمونە:

لە فەرهەنگەکانی (المعجم الوسيط، معجم اللغة العربية المعاصر ، المعجم الرائد ، المعجم الغني ، معجم المصطلحات الفقهية) ...

دەڵێن: (النَّاصِيَةُ) بریتیە لە(مُقدَّمُ الرَّأْس) واتە: پێشەسەر، دووەم واتا دەڵێن بە موی پێشەسەریش دێت.

لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (قال الأزهري الناصية عند العرب منبت الشعر في مقدم الرأس لا الشعر الذي تسميه العامة الناصية وسمي الشعر ناصية لنباته من ذلك الموضع وقيل في قوله تعالى لنسفعن بالناصية أي لنسودن وجهه)، واتە: پێشەسەر لای عەرەب بریتییە لەو شوێنەی کە قژەسەری لێدەڕوێت لە پێشەوەی سەردا، نەك قژەکەی پێشەسەر کە لە ناو خەڵك وا دەڵێن، تەنانەت قژەکەش کە پێیدەوترێت پێشەسەر لەبەر ئەوەیە کە لەو شوێنەوە دەڕوێت. هەروەها هەر لە (لسان العرب) هاتووە: ( وقال الفراء في قوله عز وجل: لَنَسْفَعَنْ بالنَّاصِيةِ" ناصِيَتُه مقدَّمُ رأْسه) واتە: لە ئایەتەکەدا مەبەستی پێشی سەرە.

هەورەها لە فەرهەنگی (المصباح المنير223)دا هەمان واتا لێکدەداتەوە و دەڵێت:(وتسميتهم كل موضع باسم يخصه كالصريح في أن الناصية مقدم الرأس).

**گومانی دووەم** دەڵێت: موفەسیرەکان هەمویان (الناصية)یان تەنیا بە موی پێشی سەر بەکار هێناوە نەك پێشەسەر.

وەڵام: ئەم گومانەش ناڕاستە، چونکە چەندین موفەسیر بە پێشی سەر لێکیان داوەتەوە بۆ نمونە:

موفەسیرانی گەورەی قورئان ئیبن کەسیر و قورتوبی ( ج٢٠ ص١٢٦) لە تەفسیری ئایەتی (ناصية كاذبة خاطئة)دا دەڵێن: {ناصية أبي جهل كاذبة في مقالها خاطئة في أفعالها} واتە: پێشەسەری (ئەبو جەهل) لە وتەکانیدا درۆدەکات و لە کردارەکانیدا هەڵە و تاوان دەکات.

هەروەها تەفسیری (روح المعاني) زانای گەورە ئالوسی لە ئایەتی (مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا) دەڵێت: (والناصية مقدم الرأس) واتە: (ناصية) پێشی

سەرە. هەروەها لە (التفسير الكبير ج١٨ ص١٢) ی زانا فـەخرەدینی ڕازی دەڵێت: الناصية عند العرب منبت الشعر في مقدم الرأس ويسمى الشعر النابت هناك ناصية باسم منبته. واتە: لای عەرەب الناصية پێشی سەرە و بەو مووەی پیشی سەریش وتراوەالناصية بە ناوی شوێنەکەیەوە ناونراوە کە لێی دەڕوێت، هەروەها دەڵێت: (عرَّف الله الناصية بحرف التعريف" كأنه تعالى يقول: الناصية المعروفة عندكم ذاتها لكنها مجهولة عندكم صفاتها، ناصية وأي ناصية! كاذبة قولًا، خاطئة فعلًا)واتە: خوای گەورە (ناصية)ی ناساندووە بە پیتی تەعریف، هەروەك ئەوەی پەروەردگار بڵێت: (ناصیة) هەر ئەو شوێنەیە کە ئێوە دەیزانن کە پێشەسەرە بەڵام سیفەتەکانی لای ئێوە نادیارە، ئیتر چۆن پێشەسەرێکە! کە لە ووتەدا درۆ دەکات و لە کرداردا تاوان دەکات.

هەروەها تەفسیری مەراغی (١٠/٥٦٥) دەڵێت: (ألا إن تلك الناصية لكاذبة لغرورها بقوتها، مع أنها في قبضة خالقها، وإنها لخاطئة)، واتە: هەر ئەو پێشەسەرەیە کە درۆزنە بەهۆی لەخۆبایی بوونی بە بەهێزییەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەژێر توانای پەروەردگاردایە، و هەرئەویشە کە تاوانکارە، هەروەها ئیبن جەوزی لە (زاد المسير ج٩ ص١٧٨)دا و موحەممەد غەرناتی لە (التسهيل لعلوم التنزيل ج٤ ص٢٠٩) دەڵێن: والناصية مقدم الرأس، واتە: پێشی سەرە، هەروەها لە (محاسن التأويل للقاسمي ٦ / ٥). دەڵێت: الناصية: منبت الشعر من مقدم الرأس، وتطلق على الشعر النابت فيها أيضًا تسمية للحال باسم المحل، واتە: بریتیە لە شوێنی ڕووانی قژ لە پێشەسەردا، هەروەها بەو قژەش دەووترێت کە لێوەی دەڕوێت، ئەویش هەروەك ناونانی شتێك بەناوی شوێنەکەیەوە.

**گومانی سێهەم** دەڵێت: موفەسیرەکان لە ئایەتی (ناصية كاذبة خاطئة) دەڵێن مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە (ناصية كاذب خاطىء) پێشەسەری کەسێکی درۆزنی تاوانکار، نەك پێشەسەرەکە خۆی درۆزن و تاوانکار بێت، کاتێك پێشی سەر بە

درۆزن و تاوانکـار هـاتووه بـۆ کینایەیـە، لەبەرئـەوە دەبێـت ڕای موفەسـیرین وەربگرین و نابێت لەڕای ئەوان لابدەین.

وەلاّم: لە ڕاستیدا ئـەو دوو ڕستەیە زۆر جیاوازن، (ناصیة کاذبة خاطئة) کـە (صفه و موصوف) و هەروەها (ناصیةکاذبخاطیء) کە (مضاف و مضاف إلیه) یـە، خوای زانا ئەگەر مەبەستی ئەوە بووە بۆچی ڕاستەوخۆ نەیفـەرمو: (ناصیة کـاذب خـاطیء) ئـەوکات پێویسـتی بـە کینایـە و لـە جیاتی(ئیـدیۆم) نـەدەکرد! ؟ بـەلاّم موفەسیرەکان کە لە ئێمە زۆر شارەزاتر بوون لە زمانی عەرەبیدا و زانیویانـە ئـەو دوو ڕستەیە لێك جیاوازن بۆچی واتاکەیان بەو جۆرە کردووە کینایە؟ لـە وەلاّمـدا دەڵێین: بێگومان لەبەرئەوەبوە کە ئەوان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) ئەم ڕاستییە زانستییانەیان نەزانیوە و، بەو مەبەستەی قورئان بەشتێك تەفسیر نەکرێت کـە لـە سەردەمی ئەواندا نەزانراوە ئەویش بۆ ئەوەی بیپارێزن لە بەدرۆخستنەوەی نـەزان و بێباوەڕەکان، چونکە لەو سەردەمانەدا نەزانراوە پێشەسـەر شـوێنی درۆکـردن و تاوانکارییـە، بـە دڵنیاییـەوە ئەگـەر لـە سـەردەمی ئەوانـدا ئـەم ڕاسـتییانە دەربکەوتنایە، ئەم تەئویل و کینایـەیان بەکارنـەدەهێنا و ئایەتەکـەیان وەك خـۆی تەفسیر دەکرد، وەك باسیشمان کرد بەشێك لە موفەسیرەکان وەك خـۆی لێکیـان داوەتەوە و تەئویلیان نەکردووە و وتویانە پێشەسەرەکە خۆی درۆزن و تاوانکارە.

**گومانی چوارەم** دەڵێت: لەئایـەتی (لَنَسْـفَعًا بِالنَّاصِـيَةِ * نَاصِـيَةٍ كَاذِبَـةٍ خَاطِئَـةٍ) وشەی (الناصية) ی یەکەم بە واتـای مـووی پێشـی سـەر دێـت، چـونکە ڕاکێشـانی پێشەسـەر تـەنیا بـە قـژ ئـەبێت و سـەر گـیرەی نیـە بـۆ ڕاکێشـان، بـەوەیش کـە (الناصية)ی یەکەم بە واتای قژی پێشەسەر دێت، حوکم بەسەر (ناصية) ی دووەم دەدات کە ئەبێت هەر بەهەمان واتا لێکبدرێتـەوە، چـونکە ناگونجێـت دوو وشـەی وەك یـەك، لـە یـەك ئایەتـدا هـەر جـارەو بـە واتایـەك بکرێـت! ؟ هـەروەها ئایـەتی (فَيُؤْخَذُ بِالنَّوَاصِي وَالْأَقْدَامِ) هەمان واتای قژی پێشەسەر دەبەخشێت.

وەلآم: موفەسـیرەکانی ئالوسـی لـە (روح المعـاني ج٣٠ ص١٨٧) و ڕازی لـە (التفسير الكبير ج٣٢ ص٢٤) وەلآمی ئەمە دەدەنـەوەو دەڵـێن:( وناصـية بـدل مـن الناصية، وجاز إبدالها عن المعرفة، وهي نكرة" لأنها وصفت بقوله سبحانه : نَاصِيَةٍ كَاذِبَـةٍ خَاطِئَةٍفاسـتقلت بالإفـادة) واتـە: ئـەوەی دووەم بەدەلـە لـەوەی یەکـەم، دروستیشە بـەدەل بکرێت لـە مەعریفەکـە لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە خـۆی نەکیرەیـە، چونکە بەو ووتانەی پەروەردگار وەسف کراوە، کەواتە سەربەخۆیە لە ماناکەیدا.

ئەمە واتای ئەوەیە کـە (ناصـية) ی دووەم واتایـەکی تـر دەبەخشـێت، لەگـەڵ ئەوەی کە چەندین موفەسیر لە (ناصية)ی یەکەمیشدا هەر بـە واتـای پێشـی سـەر لێکیـان داوەتـەوە، هـەروەك لـە (تنـوير المقباس)تەفسـیری ئـیبن عـەبباس( ج١ ص٥١٥) دەڵێت:لنأخذن ناصيته وهو مقدم رأسه، واتە: (الناصية)ی دەگرین، کـە پێشی سەریەتی. هەروەها لە ئایـەتی(فَيُؤْخَـذُ بِالنَّوَاصِـي وَالْأَقْـدَامِ) موفەسـیرەکان لەوانە (زاد المسير) ی ئیبن جەوزی(١١٩/٨) دەڵێن قاچ و پێشی سـەر پێکـەوە بـە زنجیر دەبەسـترێنەوە و پاشـان فـڕێ دەدرێتـە دۆزەخـەوە، واتـا پێویسـت بـە قـژ ناکات تا وەك گیرە بەکاربهێنرێت، چونکە خۆ کەسی واش هەیە قـژی پێشەسـەری نیە.

**گومانی پێنجەم** دەڵێـت: ئایـەتی (لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِـيَةِ * نَاصِـيَةٍ كَاذِبَـةٍ خَاطِئَـةٍ) تایبەتە بە ئەبوجەهلـەوەو ناکرێـت گشـتاندن بکرێـت بـۆ هـەموو مرۆڤێـك، کەواتـە تایبەتە بە ئەبو جەهلەوە، نەوەك هـەموو (ناصـية)یـەك، هەربۆیـە (ناصـية) وەکـو کینایەت بۆ شتی باشیش بەکاردێت، وەکو ئـەوەی عـەرەب دەڵـێن: (هَـذِه نَاصِـيَةٌ مُبَارَكَةٌ) واتە ئەو کەسە کەسێکی پاك و چـاکە، ئـەی بـۆ نـاڵێن ئەمـە باسـی ئـەوە دەکات کە (Frontal lobe) ئەم سەنتەرەشی تێدایە، یان ئـەو فەرموودەیـەی دەڵێت:(الخيل معقود بنواصيها الخير).

وەلاًم: لە ڕاستیدا ئـەم گومانـەش پـوچ دەبێتـەوە، چونکە ئەگـەر ئەبوجـەهل پێشەسەری درۆزن و تاوانکار بێت، بێگومان ئەویش مرۆڤێکە وەك مرۆڤەکان، ئایـا دەگونجێت تەنیا مێشکی ئەو بەو جۆرە بێت، نـەخێر چـونکە مرۆڤـەکان هـەمویان پێکهاتەیان وەك یەکە، قورتوبی لە (الجامع لأحكام القرآن ٢٠ / ١٢٥) لە تەفسـیری ئەو ئایەتەدا دەڵێت: (والآية وإن كانت في أبي جهل فهي عظة للناس، وتهديد لمن يمتنع أو يمنع غيره عن الطاعة) واتـە: ئایەتەکـە لەگـەڵ ئەوەشدا لەسـەر (ئـەبو جەهلە) بەلاًم ئامۆژگارییە بۆ هەموو خەڵك، و هەڕەشەشە بـۆ هـەموو ئەوانـەی واز لە گوێڕایەڵی خودا دەهێنن یان ڕێگری لە خەڵکی تر دەکـەن کـە گوێڕایـەڵی خـودا بکەن.

پاشان ئێمە نـەمان وتـوە کـە پێشەسـەر تـەنیا تایبەتـە بـە درۆکـردن و هەڵـە، بـەڵکو دەڵـێین پێشەسـەر سـەنتەری بڕیارەکـان و ڕاسـتی و درۆکـان و چـاکەو خراپەکانە، ئەو فەرمودەیەش بەڵگەیەکی تـرە لەسـەر دوپاتکردنـەوە ئیعجازەکـە، هەم لە ئەرکی پێشەسەر هەم لەوەی کە ئەو سیفەتە ئـاژەڵانی تـریش دەگرێتـەوە کە مێشکیان هەبێت، لە ڕووی زانستیشەوە سەلمێنراوە، و ئایەتی (مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا) هەمان ڕاستی دووپاتدەکاتەوە.

**گومـــــانی شەشـــــەم** دەڵێــت: ناوچـــەوانی ئـــادەمیزاد تـــەنها پێســـتێك و ئێسك (FrontaL bone)ێکە ، خۆ بـە مانایپلیپێشـەوەی مێشـك نایـەت، ئـەو پلە لە زانستیپزیشکیدا تەنها بەهۆی نزیکی لەو ناوچەیەوە ئەو ناوەی لێنراوە.

وەلاًم: (الناصـية) لـە زمـانی عەرەبیـدا وەك پێشـتر ڕونکرایـەوە لای زۆر لـە زمانەوانەکان و موفەسیرەکان واتە مقدم الراس (پێشـی سـەر)، ئایـا پێشـی سـەر تـەنیا پێسـت و ئێسـکەکە دەگرێتـەوە !؟ خـوای گـەورە نافـەرموێت (جـبین) یـان (جبهة) کە واتای ناوچەوانە، وەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا لـەبارەی ئـەم

دوو وشەیەوە دەڵێن: (الجبهة من الوجه) یان ( ما بین الحاجبین إلى قصاص الشعر) واتە: تەوێڵ و ناوچەوان لە نێوان برۆکان بۆ موی پێشی سەرە، بەڵام (الناصیة) پێشی سەر هەمووی دەگرێتەوە بە پێشی مێشکیشەوە.

زانستی ئەمڕۆش کە ئەگەر لەبەر نزیکی یان بەکارنەهێنانی زاراوەیکی وورد و ڕاست لە ناوچەوانەوە ناوی ناوە ناوچەوانە پل و ناوی نەناوە پێشەسەر پل، بەڵام خۆ قورئانی پیرۆز ناوی نەناوە ناوچەوان، شێخ مەعروفی نۆدێ باوکی کاك ئەحمەدی شێخ لە فەرهەنگە هۆنراوە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی (ئەحمەدی) ئەم جیاوازیە ئەکات و دەڵێت:

(ناصیة) چیەپێشە سەرە ........(إبل) حوشتر (حمار) کەرە

(جبین)و (جبهة) تەوێڵە .........(مکر)و (کید) و (حیلة) فێڵە

ڕازیش لە تەفسیرەکەیدا ( ١٦ / ٢٥) لە ئایەتی (ناصیة کاذبة خاطئة) دەڵێت: (ثم إنه تعالى کنى هاهنا عن الوجه والرأس بالناصیة) واتە: پەروەردگار لێرەدا لەبەری دەمووچاو و سەر بە کینایە (ناصیة)ی هێناوە.

**گومانی حەوتەم** دەڵێت: (Cortex)ی مرۆڤ بەرپرسی بیرکردنەوە و لێکدانەوەیە،کە ئەمەش ناوچەی دیواری و پشتەسەر و قەباغییش ئەگرێتەوە، بۆیە لە باشترین حاڵەتیشدا هەر ئەو مانایە نادات.. چونکە ئەوکات بەهیچ شێوەیەك ناتوانن ناوچەوان یەکسانی پلی پێشەوەی مێشك بکەن.

وەڵام: ئەو گومانەش لە ڕووی زانستی پزیشکیەوە ڕاست نیە چونکە توێکڵی پێشەوەی مێشك (Frontal Cortex) ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پشت ناوچەوان و بریتییە لە پێشەسەری مرۆڤ، و کۆنترۆڵکەر و ئاراستەکەری ئەوهەڵسوکەوتانەی مرۆڤە کە وابەستەیە بەکەسایەتیەکەیەوە لە: ڕاستگۆیی و درۆکردن، و چاکە و تاوان، با کەمێك درێژتر ڕوونی بکەینەوە:

دەماغ (Brain) گرنگترین بەشی کۆئەندامی دەمارە لە مرۆڤدا، کە پێکهاتووە لە: مێشك و مێشکۆکە و قەدی مێشك، مێشك (Cerebrum) لە مرۆڤدا ناسراوە بە بەشی پێشەوەی دەماغ (Forebrain)، کە لەرووی پێکهاتەی شانەییەوە دەبێت بە دوو بەشەوە: ماددەی خۆڵەمێشی (Grey Matter) کە دەمارەخانەکانن و ماددەی سپی (White Matter) کە ریشاڵەکانی دەمارە خانەکانن.

بەم دوو بەشەش پێکەوە دەووترێت توێکڵی مێشك (Cerebral Cortex).

لە رووی بەشەکانی و ناوچەکانی مێشکی مرۆڤ دابەش دەبێت بۆ ٦ پل: ١پلی پێشەوە، ٢پلی لاتەنیشت، ٢پلی دیواریی، ١پلی دواوە.

پلی پێشەوەیان ناوچەوانەپل(Frontal Lobe): کە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی مێشك و گەورەترین پلی مێشکە، پێنج سەنتەری دەماری تێدایە کە جیاوازن لەرووی شوێن و فرمانەکانیان:

١- توێکڵی پێشەوە ( Prefrontal cortex): کە راستەوخۆ دەکەوێتە پشت ناوچەوان و بەشی هەرە گەورەی پلی پێشەوەیە، کردارەکانی وابەستەیە بەدروستکردنی کەسایەتی تاکەکان و تواناکانی وەك: وویست و ئیرادە، دەستپێشخەری کردن، توانای پلان دانان، وەرگرتنی بریارەکان، هەست و سۆز، بریاردان لەشتەکان و جیاکاریی نێوانیان، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و رووبەرووبوونەوەی کێشەکان، کارلێکردن لەگەڵ کەسانی تردا و ووردبینی لە شتەکاندا و دامەزراویی سۆزداریی، هەروەها سەنتەری ئەندێشە و خەیاڵ (Imagination) لەخۆدەگرێت.

٢- سەنتەری جووڵەی سەرەتایی (Primary Motor Area): هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای چەپی لەش.

٣- سەنتەری جوولەی ناسەرەکی پێشەوە (Secondary Motor Area): هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای راستی لەش.

٤ - کێڵگەی بینینی پێشەوە (Frontal eye Field): هەڵدەستێت بەکرداری هاوئاهەنگیجووڵاندنیچاوەکانبۆ لایەکی دیاریکراو.

٥- سەنتەری بروکا بۆ جووڵەکانی قسەکردن (Motor speech Area of Broca): هەڵدەستێت بە هاوئاهەنگی کردن لەنێوان ئەو ئەندامانەی بەشدارن لە کرداری قسەکردندا: کە بریتین لە: (قورقوڕاگە، زمان، و روخسار).

## لێکۆڵینەوەی ئەلیکترۆنی مێشك:

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئامێرێکی نوێی لێکۆڵینەوەی کاری ئەندامەکانی لەش هەیە کە پێیدەوترێت: (functional Magnetic Resonance Imaging) یان (fMRI)، کە بەهۆی بەکارهێنانی شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان دەتوانێت پێوانەی کار وچالاکی ئەندامەکان دەکات، لەکاتی لێکۆڵینەوەی کارەبایی کاری مێشك لەو کەسانەی تووشی زیانگەیشتن بە پلی پێشەسەری مێشکیان بوون، بابزانین چی روودەدات لەو کەسانەدا؟

١- دەناڵێنن بەدەست دابەزینی توانا عەقڵییەکانیانو کەم وکورتی لە هەڵس وکەوتی ئاساییان.

٢- دابەزینی بەها رەووشتیەکانیان، وەبیرهاتنەوە، و توانای چارەسەری مەسەلە و کێشە عەقڵییەکان.

هەروەها دەرکەوتووە کە چەند بەشێکی پلی پێشەوەی مێشك سەنتەری دەستپێشخەرین بۆ درۆکردن، هەر لێرەدا ئەو کردارانەی پەیوەستن بە درۆکردنەوە چالاك دەکرێن، هەروەها کردەوە خراپەکان و تاوانەکان هەر لە سەنتەرەکانی پلی پێشەوەدا پلانی بۆ دادەنرێت پێش ئەوەی ئەم فرمانانە بگوێزرێنەوە بۆ ئەندامەکان بۆ جێبەجێ کردنی، کەواتە ئەو توێکڵی مێشکەی لە

قـوولایی پێشەسـەردا شـاردراوەتەوە بەرپرسـیارە لـە تاوانـەکان، چـونکە ئێـرە سەنتەری ئاراستەکردن و کۆنترۆڵ کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤە.

## ئامێرێکی نوێی دەرخستنی درۆ:

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بێسوودیی ئـامێرە کۆنـەکانی درۆدەرخسـتن دەرکـەوتووە، چونکە زۆر لە تاوانبارە زیرەکەکان دەتوانن لەم پشکنینانەدا دەربچن و بەراسـتگۆ لەقەڵەم دەدرێن، بەڵام بەهۆی ئەم ئـامێرە نوێیـەی پشـکنینی کـاری ئەندامـەکانی لەشەوە توانراوە رێگەیەکی نوێ بۆ درۆ دەرخستن دابهێنرێـت کـە هـیچ تاوانبارێـك ناتوانێـت لێـی دەربچـێت، لێـرەدا چـالاکی سـەنتەرەکانی درۆکـردن لەمێشـکدا دەپێورێت، بە بەکارهێنانی ئەم رێگا نوێیە لە وولاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە ساڵەکانی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٦ لە چەند زانکۆیەکی بـەناوبانگی وەك (زانکـۆی مێشـیگان) چەندین توێژینەوە ئەنجامدرا بۆ پێوانی چالاکی کارۆموگناتیسی ناوچەکانی مێشـك لـە کـاتی کـردارە جۆراوجۆرەکانـدا، بەتایبـەتی لـەکاتی درۆکردنـدا بینـرا کـە سـەنتەرەکانی پلـی پێشـەوەی مێشـك تـەواو چـالاك دەبـن، کـە سـەلماندیان فەرمانکردن بەدرۆ لەم سەنتەرانەی پێشەسەرەوە دەردەچن.

هەروەها بینییان کە لـەکاتی درۆکردنـدا چـالاکییەکی زۆر لەمێشـکدا روودەدات کە ووزەیەکی زۆر بەفیڕۆدەدات، بـەڵام لـەکاتی راسـتگۆییدا چـالاکی سـەنتەرەکان زۆر کەمترە و نزیکە لەحاڵـەتی ئاسایی مێشك، کـە ئەمـە وایلێکـردن بڵـێن حاڵـەتی ئاسایی مێشك بریتییە لە راسـتگۆیی (Truth is Brain's Default mode) بەڵام درۆکردن حاڵەتێکی زۆر نائاساییە و ووزەیەکی زۆر بەفیڕۆ دەدات.

هەروەها بۆیان دەرکەوت کـە لـەکاتی ئەنجامـدانی کـردەوەی خـراپ و تاوانـدا چـالاکی پلـی پێشەسـەری مـرۆڤ زۆر زیـاتر دەبێـت، کـە ئەمـەش بـۆی سـەلماندن سەنتەری تاوان یان چاکەکردن لەپلی پێشەوەی مێشکدایە.

له توێژینەوەیەکی تردا له زانکۆی (پەنسلڤانیا) لە ئەمریکا زانایان تەنانەت گەیشتنە ئەو راستییەی کە پێشەسەری مرۆڤ بەپرسە لە باوەڕهێنان و بێباوەڕی (ئیمان و کوفر)، هەروەها پێشەسەری ئەو کەسانەی کە داهێنان دەکەن زۆر چالاکترە لە خەڵکانی تر، کەبۆیان دەرکەوت پلی پێشەسەری مێشك بەرپرسە لە ئیبداع و داهێنان.

**لێکدانەوەی زانستی ئایەتی:( ١٥ ، ١٦ )ی سورەتی ( العلق ):** قورئانی پیرۆز وەسفی پێشەسەری (أبو جهل) دەکات بەوەی درۆزن و تاوانکارە هەربۆیە شایەنی راکێشانی توند و سزادانە.

**تەفسیری ئایەتی ٥٦ی سوورەتی هود:** ئیمامی (ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت:(أی تحت قوته وقدرته) واته پێشەسەری هەموو گیانلەبەران لەژێر هێز وتوانی پەروەردگاردایە.

ئیمامی (الطبري) دەڵێت: (لا یوجد شیء یتحرك فوق هذه الأرض ما لم یکن مملوکا ویتحرك بمشیئة الله وحده). کەواته پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە هەموو دروستکراوەکان بە وویستی ئەو دەجوولێنەوە، کە ئەمەش لەرێی کۆنترۆڵ کردنی پێشەسەریانەوە دەبێت.

ئەوەی لە ئایەتەکەوە تێدەگەین و موفەسیرەکان ئاماژەیان پێداوە ئەوەیە کە پێشەسەر ئەو شوێنەیە کە فەرماندەیی و کۆنترۆڵی هەڵس وکەوتی هەموو دروستکراوەکانی سەر زەوی دەکات (لە مرۆڤ و گیانەوەرەکان).

کەواتەقورئان وسوننەتبڕیار دەدەن کە:

١- سزادانی پێشەسەر ئاماژەیە بۆ کۆنترۆڵ کردنی تەواوی هەموو گیانەوەرێکی سەر زەوی.

٢- پێشەسەر بریتییە لە سەنتەری دروستکردنی تاوانەکان، و ئەنجامدانی درۆکردن.

## لایەنی ئیعجازیی

١- ئایەتە پیرۆزەکان و فەرموودەکان بە ووردەکارییەکی زانستی تەواوەوە ئاماژەیان داوە بۆ ئەوەی تویکلی پلی پێشەوەی مێشك کە شاراوەتەوە لە قوولایی پێشەسەردا بریتییە لە سەنتەری بریاردان لە مرۆڤدا بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەڵس و کەوتەکانی لە: راستگۆیی و درۆکردن، خێرکاریی و تاوانکردن، و سەنگینیی و لادان، کە راستییە زانستییەکان لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە ئەمەیان سەلماند.

٢- پلی پێشەوە سەنتەرەکانی جووڵە لەخۆدەگرێت کە کۆنترۆڵی هەموو جووڵە خۆویستەکانی لەش دەکات.

٣- سەنتەری هاوئاهەنگی جووڵەی چاوەکانیش لەخۆدەگرێت، کە وادەکات چاوەکان پێکەوە ئاماژەکانی تویکلی پلی پێشەوەی مێشك جێبەجێ بکەن.

٤- هەروەها سەنتەری هاوئاهەنگی ئەندامەکانی قسەکردن دەکەوێتە پلی پێشەوە کە ئەوەی روودەدات لەپلی پێشەوەدا دەکات بە ووشە.

کەواتە ئایەتە پیرۆزەکان چەند راستییەك بریاردەدەن کە پێشتر و دوای هاتنی قورئان و پاشتریش تا سەدەکانی نۆزدە و بیست کەس نەیزانیوە، بەڵام ئامـاژەی ئایەتە پیرۆزەکان زۆر ئاشکرایە کە (كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ)ی کردووە بە سیفەتی (نَاصِيَةٍ) خۆی، و نەیکردووە بە سیفەتی ئەو جەهل خۆی کە بڵێت (ناصية كاذب خاطئ)، لێرەوە ئیعجازی زانستی ئایەتە پیرۆزەکان بە تەواوەتی دەردەکەوێت و بۆمان دەسەلمێنێت کە قورئان دانراوی مرۆڤ نییە چونکە هیچ مرۆڤێك پێش ١٤٠٠ ساڵ ئەم راستییانەی نەزانیوە دەربارەی پێشەسەر تەنانەت دوای ١٢٠٠ ساڵی تریش نەیانزانیوە، کەواتە دەبێت شایەتی بدەین کە قورئان تەنها لەلایەن پەروەردگاری مرۆڤەکانەوە نێردراوە کە ئاگاداری هەموو نهێنییەکانە: {قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً} ...

**سەرچاوەکان:**


- تەفسیرەکانی زانایان (ابن کثیر، الطبري، القرطبي).

- تەفسیری (تیسیر الکریم الرحمن في تفسیر کلام المنان) دانراوی (عبدالرحمن السعدي).

- تەفسیری (موفرەداتی قورئان) دانراوی: م. محمد مەلا صالح بامۆکی.

- فەرهەنگی (لسان العرب) دانراوی (ابن منظور).

- ئینتەرنێت بابەتی: (لمحات إعجازیة إیمانیة عن الناصیة فی القرآن والسنة)– للأستاذ الدکتور مجاهد أبو المجد.

- ناوچەوان و کاری ناوچەوانەپل لە مێشکدا {لێکۆڵینەوەیەکی ئیعجازیی سوورەتی (العلق)}– لە کتێبی (بەڵگە ئاشکراکان)–نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون.

- ئینتەرنێت بابەتی: (موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات: الزعم أن وصف القرآن للناصیة بالکذب لا إعجاز فیه)– الهیئة العالمیة للإعجاز العلمي في القرآن والسنة.

- ئینتەرنێت بابەتی: (نَاصِیَةٍ کَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ)– الشیخ عبدالمجید الزنداني – رئیس جامعة الإیمان– صنعاء/ الیمن.

- ئینتەرنێت بابەتی: الناصیةبین العلم والإیمان– للمهندس عبدالدائم الکحیل.

- Guyton`s Textbook of Medical Physiology \ W. B. Saunders - 12th Edition.

# ووتەی کۆتایی و دەرەنجامەکان

- هەر لە کۆنەوە دوژمنانی ئیسلام وویستوویانە گومان بۆ قورئان دروست بکەن بە مەبەستی دوورخستنەوەی خەڵك لە پەیامە پیرۆزەکەی.

- ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لەرۆژگاری ئەمرۆماندا بریتیە لە موعجیزە نوێیەکەی قورئان کە زانایان و مرۆڤەکان سەرسام دەکات.

- پەروەردگار بۆ ئەوەی بەڵگە و حوججە لەسەر خەڵکی ئەمرۆ دامەزرێنێت دەبینین لە قورئانەکەیدا لە سەدان ئایەتدا ئاماژەیداوە بە بوونەوەر و پێکهاتە و دیاردەکانی بە ووردییەکی زانستیانەی بەرچاوەوە.

- نووسین لە بواری (تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن) و لایەنەکانی تری ئیعجازی قورئان بەزمانی کوردی زۆر بوارێکی گرنگ و پێویستە و بەکەمی باسی لێوەکراوە.

- لەگەڵ پشتگیری کردنی ئیعجازی زانستی لەلایەن زوربەی زانایانی موسوڵمانانەوە، کەسانێکیش هەن کە رەخنەی لێدەگرن لەناو موسوڵماناندا و زۆربەیان لەوانەن کە نایانەوێت زیادڕەوی تێدابکرێت و سنووری خۆی هەبێت، و نەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی لێکدانەوەکانی تر بۆ دەقە شەرعیەکان.

- ئەوانەی پشتگیری لە ئیعجازی زانستی دەکەن دوو کۆمەڵەی سەرەکین:

١- ئەوانەی لە باوەڕیانەوە بە ئیعجازی رەهای قورئانی پیرۆز باوەڕیان بە ئیعجازی زانستی قورئان هەیە، ئەمانیش بەتایبەتی زۆرێك لە زانایانی پێشین بوون کە ئەو هۆکارە زانستیانەیان لەبەردەستدا نەبووە کە ئەم راستیەی پێبسەلمێنن.

٢- ئەوانەی پشتگیری ئیعجازی زانستی دەکەن لەباوەڕیانەوە بە موعجیزەی بەردەوامی قورئانی پیرۆز، کە ئەمان زانستە گەردوونیەکانیان لەبەردەستدا بووە کە بەهۆیەوە لە ئاماژە زانستیەکانی قورئان تێگەیشتوون، کە یان خۆیان لە

پسـپۆڕانی زانسـته گەردوونیـەکانن یـان لـەو زانـا ئایینیانـەن کـە زانسـتە گەردوونیەکانیان لەبەردەستدایە.

– ئەوانەی ڕەخنە لە ئیعجازی زانستی دەگرن بـریتین لـە ٣ دەسـتە لـەڕووی پاڵنەرەکانیان بۆ ڕەخنەگرتن و ڕەتکردنەوەی:

١– ئەوانەن کـە دەترسـن ڕاسـتگۆیی قورئـان گومـانی تێبکـەوێت ئەگـەر بێتـو تەفسیرەکەی پابەند بکرێت بە زانستە گەردوونیەکانەوە کە بەردەوام زانیارییـەکانی دەگۆڕێت، کـە ئەمـە کاریگـەریی دەبێـت لەسـەر جێگیربـوونی تەفسـیری زانسـتی قورئان، هەروەها لەوەش دەترسن کە مانای ووشـەکان ملکـەچ بکرێـت بـۆ ئـەوەی زانسـتە گەردوونیـەکان پێیگـەیوە، کەواتـە ئـەمان ئیعجـازی زانسـتی و تەفسـیری زانستی ڕەتدەکەنەوە بەهۆی خەمخۆریان بۆ قورئانی پیرۆز.

٢– ئەوانـەن کـە بەڵگـە نـابینن لەسـەر ئیعجـازی زانسـتی، و تـەنها ڕازیـن بـە ئیعجازی زمانەوانی و ڕەوانبێژی قورئان.

٣– ئەوانــەن کــە ئیعجــازی زانســتی ڕەتدەکەنــەوە بــەهۆی بێباوەڕیــان و کافربوونیان بە قورئان، یان بەهۆی قین و ئیرەییان لە قورئان کـە زاڵبـووە بەسـەر هـەموو کتێبـە ئایینیـەکانی تـر بـەهۆی ئیعجـازی هەمەلایەنیـەوە کـە ئیعجـازی زانستیش بەشێکێتی.

– ئیمـامی (شـاطیبی) لـەکۆتایی سـەدەی هەشـتەمی کۆچـیدا سەرمەشـقی بزوتنـەوەی ڕەتکردنەوەکـە بـوو، کـە ڕەخنـەکانی لەسـەر زیـادڕەوی و لەسـنوور دەرچوونە لە تەفسیری زانستیدا.

– زۆرێـك لـە زانایـانی موسـوڵمانی پێشـین و سـەردەم وەڵامـی بۆچـوونەکانی (شاطیبی)یان داوەتەوە، و بە بەڵگەی بەهێز گرنگی بابەتەکانی تەفسیری زانسـتی و ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتیان بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان سەلماندووە.

– ڕەخنەکانی ڕەخنەگرانی ئیعجازی زانستی تێنەگەیشتنی تێدایە بۆ بابەتی ئیعجازی زانستی و حاڵی نەبوون هەیە لەو بنەمایانەی کە ئەم لایەنەی لەسەر دامەزراوە، لەگەڵ لێکدانەوەی بەڵگەکانیان لەم بوارەدا دەگەینە ئەوەی کە ئەم بەڵگانە بابەتە ڕەتناکەنەوە بەڵکو لەزۆر شوێندا خۆیان دەبنە بەڵگە لەسەر ڕاستیی و گرنگی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

– تەفسیر کردنی قورئان دوو ڕێڕەوی سەرەکی هەیە: (التفسیر بالمأثور) بریتیە لە ڕاڤە کردنی قورئان سەرەتا بە دەقەکانی تری قورئان پاشان بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و ووتەی هاوەڵەکان و تابیعینەکان، هەروەها (التفسیر بالرأي) یان تەفسیری عەقڵی کە بریتیە لە ئیجتیهاد کردنێکی ڕاست بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئان لەلایەن موفەسیرەوە دوای بەدیهاتنی چەند مەرجێك تێیدا و شارەزابوونی بە چەند زانستێك کە گرنگترینیان زمانەوانی زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی ووشەکانی زمانی عەرەبیە.

– تەفسیری زانستی قورئان دەچێتە جۆری دووەمەوە کە تەفسیرکردنە بە بۆچوون (الرأي)، تەفسیری زانستی بریتیە لەو تەفسیرەی کە زاراوە زانستیەکان بەکاردەهێنێت بۆ لێکدانەوەی دەستەواژە قورئانیەکان و کۆشش دەکات بۆ دەرهێنانی ئاماژە زانستیە جۆراوجۆرەکان لێیەوە.

–کەسانێك هەن ئینکاری ئەوە دەکەن کە قورئان ئامازەی زانستی تێدابێت، بەڵام کاتێك ئەمەیان بۆ نەچووە سەر و نەیانتوانی ئینکاری و ڕەددی ئەو هەزاران ئامازە زانستیە بدەنەوە کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، هەستان بەهەڵبەستنی درۆیەکی تر کە گوایا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە بەوەرگرتنی ئەم زانیارییە لە خەڵکان و میللەتانی تر.

– بێباوەڕان بیانووی ئەوە دێننەوە کە ئەوەی محمد (ﷺ) هێناویێتی لە ڕاستیی و زانیاریی دەربارەی کۆرپەلەزانی لە میللەتانی ترەوە وەریگرتووە وەك: یۆنانی و پزیشکە عەرەبەکان و خاوەنانی کتێبە ئاسمانیەکان.

– بۆچوونی میللەتانی تری پێش ئیسلام دەربارەی کۆرپەلە و دروستبوونی مرۆڤ لە کۆمەڵێك ئەفسانە وخورافات دەرناچێت، و تەنها بەخەیاڵ دایاننـاوە و لەسەر بنەمای زانستی نەبووە بەهۆی نەبوونی هۆکارە زانستیەکان لەبەردەستیاندا.

– زانایانی موسوڵمان باوەڕی تەواویان هەبووە کە منداڵ لە هەردوو دایك و باوکەوە دروست دەبێت و زانست بەهەڵە باسی دروست بوونی کۆرپەلەی دەکرد، ئەویش بە پشت بەستن بە ئایەتە قورئانیەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

– قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش زیاتر لە ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ڕاستییە زانستیەکانی کۆرپەلەزانی و شێوازی دروستبوونی مرۆڤی زۆر بەووردی باسکردووە ودووبارەیکردووەتەوە، کە تەنها دووسەد ساڵ دەبێت زانایان گەیشتوونەتە ئەم ڕاستییانە، ولەمڕۆماندا وەکو موعجیزەیەك سەیری دەکەین.

# ئیعجازی زانستی له ئایەتی:

## {وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ} (سورة الطور:٦)




رسم تخطيطي لتكون الجزر البركانية ـ من مثل جزر هاواي ـ من جراء اندفاع الصهارة من نطاق الضعف الأرضي عبر صدوع قيعان المحيطات



بنی زەریا و دەریاكان لەبەر بوونی هەزاران بوركان بە بەردەوامی داگیرساوە، وەك لەو وێنە راستەقینانەی لە خوارەوە دەیبینین، هێڵكارییەكەی سەرەوەش ئەوە روونەدەكاتەوە كە ئەم تەقینەوە بوركانیانەی ژێر دەریاكان هەندێك جار دەبێتەهۆی دروست بوونی دورگەی نوێ





**لەم وێنانەدا کاریگەریی ڕوودانی تەقینەوە بورکانییەکان و بوومەلەرزەکانی بنی دەریا دەبینین لەسەر ڕووی دەریا و زەریاکان ، خۆی لە دروستبوونی شە پۆلی ( تسونامی ) کاولکەردا دەبینێتەوە**




گەردوون لە سەدان ملیار گەلەستێرە و ئەستێرە پێکهاتووە







هەندێك لـــەو وێنانەی کە بـــە سوپەر کۆمپیوتەر گیراون بۆ شێوەی گەردوون کە وەك تۆڕێك یـــان قوماشێکی چنراو دەردەکەوێت.






**چەند بڕگەیەکی تۆڕی گەردوون کاتێك گەورەکراوە و شیکراوەتەوە پێکهاتەکەی دەبینین لە ئەستێرە و گەلەستێرەکان**

أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ

كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا




بعد خلق الكون بـ ٤٥٠ مليون سنة




بعد خلق الكون بـ ٦٠٠٠ مليون سنة



وێنەیەکی تری هاوشێوەی گەردوون
کە سوپەر کۆمپیوتەر کێشاویەتی



ئەو وێنەیەی کە سوپەر کۆمپیوتەر بۆ گەردوونی کێشاوە و،
وەکو تۆڕی جاڵجاڵۆکە دەردەکەوێت

## ئیعجازی زانستی لە فەرموودەی پەروەردگار

(فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، ومَا لا تُبْصِرُونَ)



چاوی مرۆڤ پێکهاتەیەکی وورد و سەرنجراکێشی هەیە

وێنەی خوارەوە پێکهاتەی وورد و ئاڵۆزی تۆڕی چاو ڕووندەکاتەوە













هەندێك لەو زیندەوەرە ووردانەی بەچاوی ئاسایی نابینرێن، تەنها بەهۆی ووردبینەوە نەبێت مرۆڤ هەست بەم جیهانە ووردە ناکات

وێنەی
کرۆمۆسۆمەکان
کەلە ترشی
DNA
پێکهاتوون
بەڵام بەچاوی
ئاسایی نابینرێن







شە پۆلە کارۆموگناتیسییەکان
تەنها یەك بەش لە ملیارێك بەشی بەچاوی ئاسایی مرۆڤ دەبینرێت

# سەرەتایەك دەربارەی زانستی خۆپارێزی پزیشكی (الطب الوقائي) لە ئیسلامدا





ڕەشبوونەوەی ددانەکان و هەوکردنی ناودەم بەهۆی سیواك نەکردن و بەردەوام نەبوون لەسەر پاککردنەوەیان





هەوکردنی گەرووی و میکرۆبی دەم وچاو و قاچ بەهۆی دەستنوێژ نەکردن و پاك نەکردنەوەی





هەوکردنی جۆرا و جۆر لە پێست و چاو و لووتدا بەهۆی بەردەوام نەبوون لەسەر خۆشتن و لووت پاك کردنەوە

# نەخۆشی دەردەباریکە (سیل - التدرن) (Tuberculosis)
# و خۆپاراستن لێی







دیمەنی بەکتریای چیلکەیی نەخۆشی ( سیل ) لەژێر ووردبینی ئاسایی و ووردبینی ئەلیکترۆنیدا

**دیمەنی سییەکی تووشبوو بە سیل**






**٢٢ وولاتەکەی جیهان کە زۆرترین ڕێژەی ( سیل )یان هەیە ( زیاتر لە ٨٠٪ی هەموو نەخۆشەکانی جیهان لەم وولاتانەدان )**

## تیشکدانی ئیعجازی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە رۆژگاری دۆزینەوە زانستییەکاندا

پلەبەندیی رەنگەکان لە سوورەوە بۆ شین




پلەبەندیی گەرمی لە گەرمەوە بۆ گەرمتر

## رەنگی ئاگر پەیوەندی بە راددەی گەرمییەکەیەوە هەیە



# هەورە بروسکە دیاردەیەکـــی جوان و سەرنج ڕاکێش و ترسێنەر و سەرسوڕهێنەرە

وجد العلماء أن البرق لا يتشكل إلا في الغيوم الثقيلة، وهذا ما أشار إليه القرآن في آية عظيمة ربط فيها الحق تبارك وتعالى بين البرق والسحاب الثقال، يقول تعالى ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾ [الرعد: 12]. إن هذه الآية لا يمكن أن تكون من تأليف بشر عاش قبل 1400 سنة، لأن العلوم كانت محدودة ولم يكن أحد من البشر يعلم شيئاً عن البرق أو الغيوم الثقيلة، ولكن القرآن ذكر هذه الحقيقة لتكون شاهداً على صدق كتاب الله تبارك وتعالى!



## لوحات كونية

﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾﴾

الرعد (١٢ ـ ١٣)



صورة البرق والبركان وهي من أجمل أنواع البرق حيث تمتزج النار بالنار ويشع ضوء البرق بألوان زاهية تشهد على قدرة الخالق عز وجل. ربما تكون ظاهرة البرق من أكثر الظواهر إثارة في الطبيعة فهي ظاهرة مخيفة وجميلة، ولكن يزداد الأمر إثارة عندما تمتزج مع تدفق الحمم المنصهرة من البراكين! فحرارة الحمم المقذوفة تبلغ آلاف الدرجات المئوية، وحرارة شعاع البرق تبلغ ثلاثين ألف درجة مئوية، فتأملوا معي هذا المشهد الشديد الحرارة. والعجيب أن هذا البركان يسرع عملية حدوث البرق، عندما تهبط شحنة كهربائية من الغيمة باتجاه البركان وتتفاعل مع الشحنة التي يحملها البركان، لتنطلق شرارة البرق المحرقة، ولكن تصوروا معي أن نار جهنم أشد حراً، يقول تعالى: (قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ) [التوبة: 81]. إن هذا المشهد يدعو للتفكر في عظمة الخالق عز وجل.

# هەورە بروسكە چۆن روودەدات؟



## بریتییە لە بەیەکگەشتنی بارگە موجەب و سالبەکان



### المرحلة الأولى

ينزل شعاع كهربائي سالب من الغيمة باتجاه الأرض، وذلك خلال زمن قصير جداً، يبلغ عدة أجزاء من الألف من الثانية.



## المرحلة الثانية

يقترب هذا الشعاع من سطح الأرض حيث يلتقي مع الشحنة الموجبة الموجودة على سطح الأرض.



## المرحلة الثالثة

يصطدم الشعاع الموجب مع الشحنة السالبة وتتولد شرارة كهربائية عنيفة، تتجه باتجاه الأعلى.



## المرحلة الرابعة

يتولد أخيراً الشعاع الراجع الذي نراه وهو يحوي حرارة البرق وطاقته. وتتم كل هذه العمليات في ٢٥ ميلي ثانية تقريباً.

الميلي ثانية: هو جزء من الألف من الثانية

## زانایانی وەکالەتی ناسا ووتەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) بەکاردێنن

یەکێك لە زانایانی وەکالەتی NASA کاتێك باسی هەورەبروسکە دەکات دەڵێت:

**A lightning strike can heat the air in a fraction of a second. When air is heated that quickly, it expands violently and then contracts, like an explosion that happens in the blink of an eye.**

*( Steve Goodman, A Lightning Primer, www.nasa.gov )*

ومعنى هذا الكلام أن ضربة البرق تحدث في طرفة عين! وهذا ما قاله نبيّنا ﷺ قبل ١٤ قرناً!!!

خڕۆکەیەکی سپی جۆری ( T ) کە تووشی ڤایرۆسی ئایدز بووە

وێنەیەکی ڕاستەقینەی ووردبینی ئەلیکترۆنی ڤایرۆسی ئەیدز

هەڵتۆقینی ڤایرۆسی ئەیدز لە دیواری لیمفە خانەکانەوە ( وێنەیەکی ڕاستەقینەیە )

WORLD AIDS DAY
Imagine A World without AIDS
INTERNATIONAL AIDS VACCINE INITIATIVE WWW.IAVI.ORG
12.01

نەخۆشی ئەیدز بریتییە لە تاعونی سەردەم کە یەکێکە لەسەرەنجامەکانی بەدڕەوشتی




پێكهاتەی ڤایرۆسی ئایدز

## هەندێك لە دەرەنجامەكانی نەخۆشی ئەیدز



دەم و چاوی كەسێكی توشبوو



دەم و زمانی كەسێكی توشبوو



دوو پێی كەسێكی تووشبوو







**هەوكردن بەهۆی میکرۆبە هەلپەرستەکانەوە (Opportunistic infections)**

## ( پوختەی پەتای ئەیدز لە جیهاندا -٢٠١٠ )

### Global summary of the AIDS epidemic | 2010

| | | |
|---|---|---|
| Number of people living with HIV<br>هەلگرانی ئەیدز | Total | 34.0 million [31.6 million–35.2 million] |
| | Adults | 30.1 million [28.4 million–31.5 million] |
| | Women | 16.8 million [15.8 million–17.6 million] |
| | Children (<15 years) | 3.4 million [3.0 million–3.8 million] |
| People newly infected with HIV in 2010<br>تازە تووشبووان -٢٠١٠ | Total | 2.7 million [2.4 million–2.9 million] |
| | Adults | 2.3 million [2.1 million–2.5 million] |
| | Children (<15 years) | 390 000 [340 000–450 000] |
| AIDS deaths in 2010<br>مردووان بە ئەیدز-٢٠١٠ | Total | 1.8 million [1.6 million–1.9 million] |
| | Adults | 1.5 million [1.4 million–1.6 million] |
| | Children (<15 years) | 250 000 [220 000–290 000] |







### HIV and AIDS worldwide

*Data for 2009 (most recent available)*




ڕێژەی تووشبوون بە ئەیدز لە پێگەیشتووان لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا ( ساڵی ٢٠٠٩ )

# دیاردەی سکاڵا و گەلەکۆمەکی لە لەشدا







«تشبه الخلية الدماغية أخطبوطاً نحيفاً متعدد الأرجل لحكمة بالغة إذ ما إن يحدث تمزق في العضلات والأوعية الدموية حتى تنبعث إشارات ونبضات تمثل في حقيقتها استغاثات من العضو المصاب إلى مختلف مراكز الجسم».

# سیستمی هۆرمۆنی – دەماریی لە لەشی مرۆڤدا
# Neuro – Endocrinal System















رۆمۆسۆمەکانی مرۆڤ کـە ٤٦ دانەن، و لەناو جینەکانیاندا هەموو سیفاتەکانی مرۆڤ هەلگیراو







**وێنەیەکی راستەقینەی مایکرۆسکۆپی شریتی سەرەتایی**

**ئەم وێنانە جیاوازبوونی کۆرپەلەکە بۆ دوو بارستە خانە، و دروستبوونی دیسکی کۆرپەلەکە و جیاواز بوونی چینەکانی، و پەیدابوون و گەشە کردنی شریتی سەرەتایی (Primitive Streak) روون دەکاتەوە.**




چینی ناوەڕاستی کۆرپەلە لە خانەکانی شریتی سەرەتاییەوە دروست دەبێت
Cut edge of amnion
Yolk sac
A
Primitive streak
گرێی سەرەتایی
Primitive node
B
Primitive streak
Epiblast
Amnion
Invaginating mesoderm cells
Hypoblast
Yolk sac


بەردەوام بوونی پرۆسەی کۆچ کردنەکە
تا دروست بوونی چینی ناوەڕاست
Prochordal plate
Cut edge of amnion
Notochordal process
Primitive node
Primitive streak
Future cloacal membrane
A
Amniotic cavity
چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم)
Epiblast
Primitive pit
Prochordal plate
Notochordal process
Primitive streak
Allantois
B
دوای دروستبوونی شریتی سەرەتایی هەر لەمەوە چینی ناوەڕاستی کۆرپەلەکەش دروست دەبێت


گەشە کردنی کۆرپەلە تا مانگە کۆتاییەکانی دووگیانی
a
b
c
d
e
f
g
«١٧» أسبوعاً
«١٤» أسبوعاً
«١٣» أسبوعاً
«١٠» أسابيع
«٩» أسابيع
«٨» أسابيع

## تەحەددایەکی قورئانیی بەردەوام

{ مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ } (الأحزاب:٤)






دوو وێنەی دووانەی بەیەکدا نووساو، کە بریتی‌یە لە جۆرێك لە شێواوی زگماکی کۆرپەلە.

# ئیعجازی زانستی پێشەسەر (الناصیة)
# لەنێوان قورئان و زانستی نوێدا




## سەنتەرەكانی پلی پێشەوە

### ١- تویكلی پێشەوە

### Prefrontal cortex

ڕاستەوخۆ دەكەوێتە پشت ناوچەوان

بەشی هەرە گەورەی پلی پێشەوەیە

كردارەكانی وابەستەیە بەدروستكردنی كەسایەتی تاكەكان

دەست پێشخەری كردن ، توانای پلان دانان ، وەرگرتنی بڕیارەكان

هەست و سۆز، بڕیاردان لەشتەكان و جیاكاریی نێوانیان، هەستكردن بە بەرپرسیارێتی و ڕووبەڕووبوونەوەی كێشەكان

سەنتەرەکانی پلی پێشەوە

٢- سەنتەری جووڵەی سەرەتایی

Primary Motor Area

هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای چەپی لەش

سەنتەرەکانی پلی پێشەوە

٣- سەنتەری جووڵەی ناسەرەکی پێشەوە

Secondary Motor Area

هەڵدەستێت بە جووڵاندنی ماسولکە خۆویستەکانی لای راستی لەش

سەنتەرەکانی پلی پێشەوە

٤ - کێڵگەی بینینی پێشەوە

Frontal eye Field

هەڵدەستێت بەکرداری هاوئاهەنگی جووڵاندنی چاوەکان بۆ لایەکی دیاریکراو

# سەنتەرەکانی پلی پێشەوە

٥- سەنتەری بروکا بۆ جووڵەکانی قسەکردن

Motor speech Area of Broca

هەڵدەستێت بە هاوئاهەنگی کردن لەنێوان ئەو ئەندامانەی بەشدارن لە کرداری قسەکردندا

قورقوراگە

زمان

روخسار

## توێکڵی پێشەوەی مێشك

ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پشت ناوچەوان

بریتییە لە پێشەسەری مرۆڤ

ئاراستەکەری هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤە کە وابەستە بە کەسایەتیەکەیەوە

راستگۆیی

درۆکردن

چاکە

تاوان


سەنتەرەکانی
پلی پێشەوە
Skilled movements
Basic movements
Central fissure
Motor cortex
Emotion, behavior
Awareness, memory
Frontal lobe
Parietal lobe
Somatosensory cortex
Speech (Broca's area)
Visual recognition
Hearing
Occipital lobe
Vision
Smell
Lateral fissure
Temporal lobe
Balance and muscle coordination


سەنتەرەکانی
پلی پێشەوە
Primary motor cortex
Central sulcus
Primary somesthetic cortex
Premotor area
Taste area
Somesthetic association area
Prefrontal area
Visual association area
Visual cortex
Motor speech area (Broca's area)
Sensory speech area (Wernicke's area)
Auditory association area
Primary auditory cortex


ئامێری
MRI

## چالاکی پلی پێشەسەر لە کاتی درۆکردندا








چالاکی پلی پێشەسەر لەکاتی درۆکردن و تاوان کردندا

**لەرووی زانستییەوە و بە بەکارهێنانی ئامێری زانستی پێشکەوتووی وێنەگرتنی مێشک سەلماوە کە پلی پێشەوەی مێشک بەرپرسیارە لە درۆکردن و تاوانکردن**

# سیستمی هۆرمۆنی سەرەتای سوورەتی (مریم)




# پەیوەندی هاوبەشی نێوان پێنج نیشانەکەی سەرەتای سوورەتی (مریم)





**وێنەی ( ١٩/ هـ )**

ئەم وێنەیەدا چەند پارچە مایتۆکۆندریایەك دەبینین ( ڕەنگیان زەردە ) لە پشتی سەری سپێرمێکەوە، ئەم مالەووزانەن کە هێزی جوولە و دەرپەڕان دەبەخشن بە سپێرمەکان



**وێنەی ( ٢٠/ هـ )**

لێرەدا هێلکۆکەیەکی دەرپەڕیو دەبینین لەناو لۆچەکانی سەرەتای بۆری منالداندا، کە ڕەنگی زەرد دیارە، ئەمەش دەقاودەق لەگەڵ فەرموودەی: «ماء المرأة أصفر» ( رواه مسلم ) یەکدەگرێتەوە.


Skull
Cranial bones
Parietal
Frontal
Temporal
Occipital
Maxilla
Mandible
Clavicle (collarbone)
Sternum (breastbone)
Scapula (shoulder blade)
Ribs
Vertebral column
Humerus
Intervertebral disc
Ulna
Radius
Ilium
Pubis
Pelvic girdle
Sacrum
Ischium
Carpals
Metacarpals
Phalanges
Femur
Patella
Tibia
Fibula
Tarsals
Metatarsals
Phalanges
پەیکەری
ئێسکی
مرۆڤ

# ئیعجازی زانستی لە فەرموودەی ( وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ... )

## شەق بوونی گوێ و چاو




قۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبوونی گوێ؛ کە لە چینی دەرەوە توورەکەی بیستن (Otic Vesicle) جیادەبێتەوە و شەق دەبێت، بەپێی فەرموودەی: وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ ..




لەتبوون و شەقبوونی داپۆشەری گوێی دەرەوە و کرانەوەی لە سەرەتای دروست بوونیدا




لەم هێلکارییانەدا دەبینین کە چۆن پەردەی داپۆشەری ڕەشێنەی چاو شەق دەبات و دەکرێتەوە و نامێنێت لە هەفتەی (٢٠) دا.

لەم هێلکارییانەدا دەبینین چۆن تووڕەکەی بینین لە چینی دەرەوە جیادەبێتەوە و شەق دەبێت و ئوقم دەبێت لەناو چالایی بینیندا، وەک فەرموودەکەی پێغەمبەر دەفەرموێت: «وشق سمعه وبصره ...»




## چەند دیمەنێکی ڕاستەقینەی دروست بوونی چاوەکان لەرێی شەقبوونەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ۝١٠﴾ [سورة الملك: ١٠]

من دعاء الرسول ﷺ في السجود

« سجد وجهي للذي فطره وصوره وشق سمعه وبصره »

الصورة اليمنى: لجنين في أسبوعه الخامس. الصورة اليسرى: لنفس الجنين في أسبوعه السادس.

لاحظ التجاويف المشقوقة في وجه الجنين والتي سيتم خلق أعضاء السمع والبصر فيها فيما بعد.

« صورة تم تكبيرها مئات المرات لجنين داخل رحم أمه »

يقول الله تعالى: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾

[سورة النجم: ٣ - ٤]

## لەنێوان ٢ بەشدا




وێنەیەکی توێکاری خوێنبەر و خوێنهێنەری گون، کە ڕاستەوخۆ خوێن دەدەن بە گونەکان ونیشانی دەدات کە چۆن لە خوێنبەر و خوێنهێنەری گەورەوە لەناو سکدا دروست دەبن لە ناوچەیەکدا کە دەکەوێتە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکانەوە.

ئەم وێنەیە بڕگەیەکی لەشی کۆرپەلەکە نیشاندەدات تا کاتی دابەزینی گونەکان لە هەفتەی (٢٨)دوە، بینراوە هۆرمۆنی نێرینە دەبێتە هۆی دابەزاندنیان، و لە هەمان کاتدا ماسولکەی (Gubernaculum) ئاراستەکەی بۆ دیاری دەکات بۆ ناو توورەکەی گون، کەواتە شوێنی سەرەتایی گون لە نێوان پشت و پەراسووەکاندایە.



گەشە کردنی کۆرپەلە تا مانگە کۆتاییەکانی سکپڕی
a
b
c
d
e
f
g
«٨» أسابيع
«٩» أسابيع
«١٠» أسابيع
«١٣» أسبوعاً
«١٤» أسبوعاً
«١٧» أسبوعاً

# کەمترین ماوەی دووگیانی ئافرەت موعجیزەیەکی قورئانیە



... لە کاتی بووندا کێشی ٧٢٥گرامە

A 25-week-old normal female newborn ...
Dean Barringer and Marnie Danzinger)




گــەشە کردنی سیەکان و بۆرییەکانی هەناسە لە کۆرپەلەدا، بڕوانە سەرەتای هەموو ئەندامەکان و لە خوارەوەش گەشە کردنی سیستمی هەناسەدان روون کراوەتەوە.

# زیانە تەندروستیەکانی جگەرەکێشان








## سییەکانی کەسێکی جگەرەکێش

SAMPLE REPRESENTATION - FOR REFERENCE ONLY
WARNINGS FOR SMOKED TOBACCO PRODUCTS 2006



**WARNING:**
SMOKING CAUSES GANGRENE
QUIT: 1800-438-2000



**WARNING:**
SMOKING INCREASES MISCARRIAGE RISK
QUIT 1800-438-2000



**WARNING:**
SMOKING CAUSES
92% OF ORAL CANCERS
QUIT: 1800-438-2000



**WARNING:**
SMOKING CAUSES
NECK CANCER
QUIT 1800-438-2000



**WARNING:**
SMOKING CAUSES MOUTH DISEASES
QUIT: 1800-438-2000



**WARNING:**
SMOKING CAUSES
92% OF ORAL CANCERS
QUIT: 1800-438-2000

**دەرە نجامی جگەرەکێشان وکاریگەریی لەسەر دەم وددان لەگەڵ دروستکردنی دەیان جۆری شێر پە نجەی ئەندامە جۆراوجۆرەکانی لەش**

# پەنجەمۆرە تاکەکەسیەکان لەنێوان قورئان وزانستدا




تۆپەڵ یان ئاڵۆز — کەوانەی داخراو — کەوانە

هێڵەکانی پەنجەمۆری سەرە پەنجەکان شێوەی جۆراوجۆر وەردەگرن



# Fingerprints

- No 2 people have the same fingerprints
- Fingerprints can solve crimes.
- Fingerprints are impressions created by ridges on the skin.
- Ridges form before a baby is born and maintain their pattern throughout life.
- As you grow, the pattern gets larger, but does not change.




په نجه‌مۆری سه‌ره‌په نجه‌كان له مرۆڤه‌كاندا زۆر ناوازه‌یه




Friction Ridge Skin & Pattern Formation During the Critical Stage: Fact & Theory، Centennial Conference، June، 2001 Kasey Wertheim and Alice Maceo

چۆنیتی گه‌شه‌كردنی هێڵه‌كانی په‌نجه‌مۆر له‌سه‌ر سه‌ره‌په‌نجه‌كان




ناسینەوەی ڕەگەزی مرۆڤ ( نێر یان مێ ) لەڕێی شکڵی پەنجەمۆری سەرە پەنجەکانیانەوە بەهۆی شکڵ و پێکهاتەی ناوازەی هەریەکەیان



پەنجەمۆری شێوەی لێوەکان      پەنجەمۆری گوێ      پەنجەمۆری ناولەپی قاچ      پەنجەمۆری ناولەپی دەست



پەنجەمۆری شکڵی تۆڕی بینین لەچاودا



پێکهاتە و شکڵ و ڕەنگی ڕەشێنەی چاو یان (کۆرنیا ) وەك پەنجەمۆرێکی جیاکەرەوە دادەنرێت
















رەنگەکانی پێستی مرۆڤ بە پێی پلەکانی فیتزپاتریك




چەند نموونەیەك لە جیاوازی رەنگی پێستی دووانە لەیەکچووەکان

# وەڵام بۆ ڕەخنەگرانی ئیعجازی زانستی لە قۆناغی ( العلقة ) لە قورئاندا




{وەرگیراوە لە کتێبی ( پرۆفیسۆر مۆر)}
هێڵکاری کۆرپەلەیەکی سەرەتایی، کە پارچە پارچەیی لاشەی ڕوون دەکاتەوە




A. Embryo at 24-25 days




B. Leech or bloodsucker




C. Embryo at 26-30 days




لەم وێنانەی کۆرپەلەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە شێوەی کۆرپەلە لە سەرەتای دروستبوونیدا بەتەواوەی لە کرمی زەروو دەچێت بەتایبەتی درێژ بوونەوەی و پارچە پارچەبوونی لەشی

وێنەکەی لای چەپە
ووردەکارییەکانی لەشی کۆرپەلەکە روون دەکاتەوە

وێنەکەی لای راستە
ووردەکارییەکانی لەشی کۆرپەلەکە روون دەکاتەوە

وێنەی (٩٢/هـ): لەم وێنانەوە دەبینین چۆن بە تەواوی کۆرپەلە لە کرمی زەروو دەچێت (لە ناوەڕاستدایە)، ئەویش چونکە سەری گەورەیە وەك کرمی زەروو (عەلەقە)، و لەشی پارچە پارچەیە، و کلکی باریکە و نوشتانەوەیەکی کەمی تێدایە، وەك ئەوەی ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی پێداوە:
{ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً ...} (المؤمنون: ١٤).

A. Human Embryo
کۆرپەلە
cut edge of amnion
forebrain
heart

وێنەی ژمارە (٣١)
بەراوردێکی نێوان کرمی علق (سەرەوە) و کۆرپەلە (خوارەوە) کە ١٠٠٪ لەیەك دەچن

B. Leech
کرمی زەروو

ئەم وێنانەش هەمان بابەت رووندەکەنەوە کە کۆرپەلە لە قۆناغی (علقة)دا بەتەواوەتی لە کرمی زەروو دەچێت

# سەرچاوە گشتییەکان بۆ هەموو بابەتەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢-تەفسیری (جامع البيان في تفسير القرآن) ناسراو بە تەفسیری (الطبري)/ دانراوی: (أبو جعفر محمد بن جرير الطبري)/ دار المعرفة- ١٩٨٦.

٣- تەفسیری (تفسير القرآن العظيم) ناسراو بە تەفسیری (إبن كثير)/ دانراوی: أبي الفداء إسماعيل ابن كثير/ دار الكتاب العربي- ٢٠٠٤.

٤- تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن) ناسراو بە تەفسیری (القرطبي)/ دانراوی: (أبو عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي)/ دار إحياء التراث العربي.

٥- تەفسیری (فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير)/ دانراوی: محمد بن علي الشوكاني/ دار ابن كثير/ الطبعة الثانية- ١٩٩٨.

٦- تەفسیری (الجلالين)/ دانراوی هەردوو زانا: (جلال الدين السيوطي وجلال الدين المحلي)/ دار إحياء التراث العربي.

٧- تەفسیری (روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثاني)/ الآلوسي البغدادي- دار إحياء التراث العربي- بيروت.

٨- تفسير التحرير والتنوير- محمد الطاهر ابن عاشور - الدار التونسية للنشر- بدون تأريخ.

٩- تفسير المحرر والوجيز- أبي محمد عبدالحق بن عطية الأندلسي- تحقيق: عبدالسلام عبدالشافي محمد- دارالكتب العلمية- بيروت- ٢٠٠١.

١٠- التفسير الكبير و مفاتيح الغيب- الإمام الفخر الرازي- دار الفكر- بيروت- ١٩٨١.

١١- مفردات ألفاظ القرآن/ الراغب الأصفهاني- تحقيق: صفوان عدنان داودي- دارالقلم-دمشق.

١٢- خۆلاصەی تەفسیری نامی- مەلا عبدالکریمی مدرس- ناوەندی ئارا- ٢٠١٠.

١٣- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان/ م. بورهان محمد أمین / چاپی شەشەم - ٢٠٠٤.

١٤- پوختەی تەفسیری قورئان (موفرەداتی قورئان)/ مامۆستا محمد مەلا صالح بامۆکی/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٥.

١٥- تەفسیری رامان- ئەحمەد کاکە مەحمود- چاپی یەکەم-٢٠٠٧.

١٦-فتح الباري شرح صحيحالبخاري/الإمام ابن حجر العسقلاني/ مكتبة دار السلام/ الطبعة الثالثة-٢٠٠٠.

١٧-صحيح مسلم بشرح الإمام النووي/الإمام يحيى بن شرف النووي/ دار المعرفة/ الطبعة السادسة - ١٩٩٩.

١٨-معجم (لسان العرب)/الإبن منظور / دار صادر- بيروت.

١٩-معجم (القاموس المحيط)/ مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروزآبادي/ دار الفكر/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٣.

٢٠- التفسير والمفسرون - د. محمد حسين الذهبي - آوند دانش - ٢٠٠٥.

٢١- نحو منهج لتفسير القرآن- محمد الصادق عرجون- الدار السعودية للنشر والتوزيع- الطبعة الثالثة- ١٩٧٣.

٢٢- إحياء علوم الدين -أبي حامد الغزالي - دارالحديث- القاهرة - ٢٠٠٤.

٢٣- جواهر القرآن- أبي حامد الغزالي- برنامج الكتروني.

٢٤- الإتقان في علوم القرآن- جلال الدين السيوطي- حققه: فواز أحمد زمرلي- دار الكتاب العربي - بيروت - ٢٠٠٥.

٢٥- مناهل العرفان في علوم القرآن - محمد عبدالعظيم الزرقاني - حققه واعتنى به: فواز أحمد زمرلي - دار الكتاب العربي - بيروت - ١٩٩٥.

٢٦- التبيان في علوم القرآن- ابن قيم الجوزية.

٢٧- تحفة المودود بأحكام المولود- ابن قيم الجوزية- مطبوعات مجمع الفقه الإسلامي/ جدة.

٢٨- الموافقات في اصول الشريعة-لأبي اسحاق الشاطبي- تحقيق: الشيخ عبدالله دراز- الطبعة الثانية-١٩٧٥.

٢٩- القران الكريم والتوراة والانجيل والعلم (دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة)- د.موريس بوكاي- مكتبة مدبولي-القاهرة-٢٠٠٤.

٣٠- إعجاز القرآن - مصطفى صادق الرافعي.

٣١- القرآن يتحدى- عزالدين أحمد - دار السعادة.

٣٢- مفهوم الإعجاز القرآني - د. أحمد جمال العمري- دار المعارف بمصر.

٣٣- كيف نتعامل مع القرآن- محمد الغزالي- سلسلة قضايا الفكر الإسلامي(٥) المعهد العالمي للفكر الإسلامي ـ مكتب القاهرة- ط ٣، ١٩٩٣.

٣٤- كيف نتعامل مع القرآن العظيم؟ - الشيخ يوسف القرضاوي- دار الشروق- الطبعة الأولى- ١٩٩٩.

٣٥- مستندات التوفيق بين النصوص القرآنية وبين النتائج العلمية الصحيحة - د.سعاد يلدرم - المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي للقرآن والسنة: إسلام أباد ، ١٤٠٨هـ (١٩٨٧م).

٣٦- خلاصة بحث التفسير العلمي للقرآن، بين المجيزين والمانعين - محمد أمين ولد الشيخ - المؤتمر العلمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة: إسلام أباد، ١٤٠٨هـ (١٩٨٧م).

٣٧- الإسلام والطب الحديث : المقدمة - د. عبدالعزيز إسماعيل.

٣٨- طبائع الإستبداد ومصارع الإستعباد- عبدالرحمن الكواكبي- تقديم: الدكتور أسعد السحمراني- الناشر: دار النفائس- ٢٠٠٦م.

٣٩- موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات - المجلد الثالث - سايتى: الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (www.eajaz.com).

٤٠- علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة - الشيخ عبدالمجيد الزنداني، د. مصطفى أحمد،بمشاركة مجموعة من علماء الأجنة الغربيين المعروفين:
(Marshal E. Johnson, Gerald C. Goeringer, Joe Leigh Simpson, Keith L. Moore, and T. V. N. Persaud)
من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (إسلام آباد- باكستان) - من إصدارات: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة) - مطابع رابطة العالم الإسلامي.

٤١-إنه الحق- عبدالمجيد الزنداني - هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة / الطبعة الثالثة - ١٤٢٠هـ.

٤٢- تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة - من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (إسلام آباد/ باكستان) - من إصدارات (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)- ١٩٨٧ز.

٤٣- المعجزة العلمية في القرآن والسنة (تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)- الشيخ عبالمجيد الزنداني.

٤٤- التفسير العلمي للقرآن، بين المجيزين والمانعين- محمد أمين ولدالشيخ- المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي - إسلام أباد، ١٤٠٨هـ .

٤٥- ئامارەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د.کاوە فەرەج سەعدون/ ناوەندی رۆشنبیر/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.

٤٦- رۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە - د.کاوە فەرەج سەعدون - لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی- چاپی یەکەم- ٢٠٠٥.

٤٧- حديث (إن تحت البحر نارا) ومطابقة ذلك للحقائق العلمية- عبد الواسع بن يحيى بن محمد المعزبي- جامعة الإيمان / صنعاء- ٢٠٠٧.

٤٨- موقـف الأصـوليين والعلمـاء (قـداماهم ومحـدثيهم) مـن التفسـير العلمـي- د.محمد فتحي الدريني- مجلة أسماء (١) هـ (١٩٨٨م).

49- Langman's Medical Embryology \ T. W. Sadler \ Lippincott Williams & Wilkins \ 10th edition - 2006.

٥٠- الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة: الأستاذ الدكتور كارم السيد غنيم (أستاذ علم الحشرات ـ جامعة الأزهر- أمين عام جمعية الإعجاز العلمي في القرآن والسنة في الأزهر)، سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=644

٥١- المعارضـون للإعجـاز العلمـي في القـرآن والسـنة (مناقشـة الآراء ودحـض الحجج)- د.كارم السيد غنيم، سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=175

٥٢- التفسير العلمي للآيات القرآنية الكونية بين المؤيدين والمعارضين- د. كارم السيد غنيم- سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=393

٥٣- في الرد على منكر الإعجاز العلمي في القرآن الكريم (النتيجـة الحتميـة للجهـل بالآيات القرآنية وإنكـار المعجـزات الإلهيـة) - أ.د. نظمـي خليـل أبوالعطـا موسـى - سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=878

٥٤- أوهام - منهزم - حول الإعجاز العلمي - هشام طلبـة- سـايتى: موسـوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=881

٥٥- نقد شبهة أن علمـاء الإعجـاز ( يسـرقون جهـود ) علمـاء الغـرب وينسـبونها للإعجاز القرآني - د. عبـد الـرحيم الشـريف- سـايتى: موسـوعة الإعجـاز العلمـي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=392

٥٦- رد الشبهات حول علم الأجنة في القرآن والسنة- د. مصطفى عبدالمنعم- مقال منشور بموقع: موسوسة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/firas/arabicold/?page=show_det&id=1787&select_page=23
٥٧- شبهات حول مراحل تكون الجنين -إعداد:د. عبد الرحيم الشريف - سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:
http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=406
٥٨- موسوعة(ويكيبيديا) على شبكة الأنترنت.

# پێڕستی بابەتەکان



- دکتۆر **کاوە فەرەج سەعدون**.
- لەدایکبووی: ساڵی ١٩٧٣ لە شاری سلێمانی.
- هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە پزیشکی و نەشتەرگەری گشتیدا (M. B. Ch. B) لە زانکۆی سلێمانی ساڵی ١٩٩٧-١٩٩٨.
- بڕوانامەی ماستەر (M.Sc.) لە نەخۆشییەکانی سنگ - ٢٠١٠.
- پزیشکی پسپۆڕ لە نەخۆشیەکانی سنگ و کۆئەندامی هەناسەدان.
- ماوەی ٢٠ ساڵە کاردەکات لە نەخۆشخانەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەریدا.
- لە (سەنتەری راوێژکاریی نەخۆشیەکانی سنگ) و (سەنتەری رەبو و حەساسیەت) لە شاری سلێمانی کاردەکات.
- ماوەی ٢٥ ساڵ زیاترە کاردەکات لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بە نووسین و وەرگێڕان و ووتاردان.
- خاوەنی بیرۆکە و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) لە سلێمانی.
- بەشداری چەندین کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی کردووە لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان.
- خاوەنی دەیان بابەت و توێژینەوە و نوسینی پەروەردەیی، زانستیی، و پزیشکییە، هەروەها دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە لە چەندین گۆڤار و رۆژنامە و سایتەکانی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا لە کوردستان بڵاوکراونەتەوە.

- سەدان بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و رادیۆیی تۆمارکردووە دەربارەی بابەتە پزیشکییەکان، و زانست و ئیمان، و بابەتەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە لە چەندین کەناڵی سەتەلایت و ناوخۆیی و کەناڵی رادیۆییەوە پەخشکراون.

## دانراوەکانی نووسەر:

١- (**بەڵگە ئاشکراکان**): دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا -٢ جار چاپکراوەتەوە- لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

٢- (**رۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە**): راستییە زانستییەکان دەربارەی رۆژوو، لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی.

٣- (**ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا**): لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر لە سلێمانی.

٤- (**قەیرانی وویست و وویژدانی موسوڵمان**): لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی.

٥- (**رۆڵی زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا**) - لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشك و کتێبخانەی سارا - ٢جار چاپکراوەتەوە.

٦- محمد (ﷺ) رێبازی ژیان - بەرگی پێنجەم- بەناونیشانی: **چەند موعجیزەیەکی پرشنگدار لە فەرموودە و رەووشتی پێغەمبەری رێزدار** (ﷺ)- لە بڵاوکراوەکانی رێکخراوی قوتابیانی کوردستان.

٧- **ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا** - بەرگی یەکەم.

٨- **ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا** - بەرگی دووەم- ئامادەی چاپە.

